# سەرجەم بەرهەمەکانی





# دکتۆر کەمال مەزهەر

بەرگی دووەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر        دکتۆر دڵشاد مەحموود

دکتۆر ئازاد عوبێد        دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ٢٠٢٢

# سەرجەم بەرهەمەکانی
# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی دووەم

ئامادەکردنی


دکتۆر جەبار قادر — دکتۆر دڵشاد مەحموود

دکتۆر ئازاد عوبێد — دکتۆر کامەران محەمەد



هەولێر ٢٠٢٢

* ناوی کتێب: سەرجەم بەرهەمەکانی - دکتۆر کەمال مەزهەر- بەرگی دووەم
* ئامادەکردنی: لیژنەی کۆکردنەوەی نووسین و بەرهەمەکانی پ. د. کەمال مەزهەر
* گشت کارە هونەریەکان و سەرپەرشتی چاپ: عوسمان پیرداود کواز
* وێنەی سەر بەرگ: هونەرمەند نورەدین جاف
* چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٢٢
* تیراژ: (١٠٠٠) دانە
* چاپخانە: چاپخانەی دانیشفەڕ- هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩١٨) ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.
* نرخ (٦٠،٠٠٠) دینار

## بەرگی دووەم:
## ئەم کتێبانە لەخۆ دەگرێت:

* تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا.
* چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد - بەرگی یەکەم.

## پێشەکی

مایەی شانازی لیژنەی تایبەتی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی مێژووناسی ناودار و پەروەردەکاری گەورەی کۆچکردوو پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەرە، سەرجەم بەرهەمەکانی لە (١٠) بەرگدا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بخاتە بەردەستی خوێنەرە بەڕێزەکان. لەو دە بەرگە شەشی یەکەمیان بە زمانی کوردیین و ئەوانی دیکەشیان، واتا لە حەوتەمەوە تا دەیەم بە زمانی عەرەبیین. ئەمە بەشی یەکەمی ئەو پرۆژە گەورەیەیە کە ئامانجەکەی ئەوەیە سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆبکاتەوە و سەرلەنوێ لە چاپیان بداتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد پێشەنگی لێکۆڵەرانی مێژووی نوێی کورد و کوردستانە و بگرە بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەتیی مێژوویی کورد دەژمێردرێت؛ چونکە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە چەندین نەوە بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ئەوەوە سەبارەت بە کورد و کوردستان ئاشنای میتۆدی زانستی بوون لە بواری مێژوودا، کە پێشتر پێی ڕانەهاتبوون. تا ئەو ڕۆژانە خوێنەرانی کورد بەو چیرۆک و ئەفسانانە ڕاهاتبوون کە باسیان لە مێرخاسی و ئازایی میر و سەرکردە خۆجێیەکانیان دەکرد و ئەوانەیان بە سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی دادەنا. کتێب و وتارە مێژووییەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کارێکی وایان کرد، خوێنەرانی ئاسایی و ڕووناکبیرانی نەوەی نوێی کورد، مێژوویان لە لا خۆشەویست بێت و هەوڵبدەن توانای خۆیان بۆ لێکدانەوەی مێژووی نەتەوە ستەملێکراوەکەیان بخەنەگەڕ، ئەوە سەرباری ئەوەی کە دکتۆر کەمال دەورێکی گەورەی هەبوو لە هاندانی چەندین خوێندکار لە بەشەکانی مێژووی زانکۆکان بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە بواری مێژوودا لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق. جگە لەوەش وانەکانی بۆ قوتابیان کە زۆربەیان کوردیش نەبوون هەمان دەوریان هەبوو لە ڕووکردنە خوێندنی باڵا بۆ خوێندنی مێژوو بە ڕێبازێکی زانستی، ئەو شاگردانە بە درێژایی تەمەنیان و کاروانی زانستییان

بە دڵسۆزی و وەفاداری بۆ مامۆستای گەورەیان مانەوە. ئەم کارانەی تەنیا خوێندکارانی کوردی نەدەگرتەوە، بەڵکو هەموو ئەو خوێندکارانەشی دەگرتەوە کە سەرپەرشتی نامە و تێزەکانی کردوون یان بۆ پرس و ڕاوێژ ڕوویان لێی ناوە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی لێکۆڵینەوە و پڕۆژەی توێژینەوە زانستییەکانیان.

دکتۆر کەمال بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کەوا بواری مێژووی کورد وەک کێڵگەیەکی نەکێڵراو و نەچێندراوە، بۆیە ئەو ئەرکە مەزنە پێویستی بە چەندین نەوەی توێژەر هەیە بۆ ئەوەی بەشێکی بەجێبێنن. دکتۆر کەمال زۆر بەوە دڵخۆش بوو کاتێ ئاوڕی دواوەی دەدایەوە بەرهەمی کاری پەروەردەیی خۆی دەبینی، کە چەندین توێژەر و پسپۆڕ لە بواری مێژووی کورددا لەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداریی لە پێگەیاندنیاندا کردبوو خەریکی کارکردنن لەسەر مێژووی کورد و کوردستان. ئەوانەی سەرپەرشتی نامە و تێزە زانستییەکانیانی کردبوو یا لە ڕێی کتێب و وتار و توێژینەوە مێژوویییەکانییەوە کاریگەری لەسەر دانابوون. بەرهەمی زانستیی دکتۆر کەمال مەزهەر جێی بایەخی کۆڕ و ناوەندی بەرفراوانی خوێنەران و ڕووناکبیرانی کورد و عێراقییەکان بوو.

گومان لەوەدا نییە کە کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی مێژووناسێکی پڕ بەرهەمی وەک کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر پێویستی بە پاڵپشتی و هاوکاریی چەندین توێژەر و ڕووناکبیر هەیە، تەنانەت ئەوە ئەرکی دامەزراوەیەکی تایبەتمەندە لەگەڵ چەندین کادیری زانستی و کارگێڕی تەرخانکراو بۆ ئەو کارە، نەک ئەرکی لێژنەیەکی خۆبەخشی چوار کەسیی، کە لێرە و لەوێ کار دەکەن و سێ کەسیان لە هەمان کاتدا مامۆستای زانکۆن و دەبێ سەرقاڵی وانە وتنەوەو و کاری زانستیی خۆیان بن.

ئەم لێژنەیە بەر لە کۆچی دوایی زانای گەورەمان بە چەند ڕۆژێک پێکهات، بە مەبەستی کۆکردنەوەی کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی و

پۆلێنکردنیان و پاشان لە چاپدان و بڵاوکردنەوەیان. لیژنەکە پێی باشە کۆی بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو بەم شێوەیەی خوارەوە بەسەر شەش بەشدا دابەش بکات:

**بەشی یەکەم:** کە بە خۆشحاڵییەوە وا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران، کە هەموو کتێبە بڵاوکراوەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە دە بەرگدا دەگرێتە خۆ. سەرلەبەری لاپەڕەکانی ئەم بەشە حەوت هەزار و دوو سەد و پەنجا لاپەڕەن.

**بەشی دووەم:** ئەو لێکۆڵینەوە زانستی و وتارانەن کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە. لیژنەکەمان بەشێکی لەو وتارانە بەدەستهێناوە و وێنەیانی گرتووە، بەڵام لەم بوارە هێشتا کاری زۆر ماوە، پێویستی بە هاوکاری ژمارەیەکی زیاتر لە ئەندامانی لیژنەی سەرپەرشتیار هەیە.

**بەشی سێیەم:** ئەم بەشە ئەو کارە زانستی و رۆژنامەوانییانەی دکتۆر کەمال مەزهەر دەگرنەوە کە بە زمانی ڕووسی نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە و خۆیان لە هەزار و پێنج سەد لاپەڕە دەدەن. ئەمانەیان پێویستە بکرێن بە کوردی، لیژنە هەنگاوی یەکەمی بۆ ئەمە ناوە. لە بەسەرکردنەوەی لیستی دانراو و توێژینەوەکانیدا بۆ لیژنەکە دەرکەوت کە هەندێ لەم توێژینەوە و وتارانە لە کاتی خۆیدا خوالێخۆشبوو کردوونی بە کوردی یان عەرەبی یانیش لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی دواتری خۆیدا بەکاری هێناون.

**بەشی چوارەم:** ئەم بەشەیان تەرخانکراوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو پێشەکییانەی بۆ ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێب و دانراوی توێژەرانی کورد و عەرەب نووسیوونی، وێڕای ئەو یادداشتنامانەی کە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەی کردوون و پێشەکی بۆ نووسیون. ئەو پێشەکییانە زانیاری و لێکدانەوەی گرنگیان تێدان و وا پێویست دەکات بایەخ بە کۆکردنەوەیان بدەین لە زیاتر لە بەرگێکدا.

**بەشی پێنجەم:** لێژنە هەوڵدەدات ئەم بەشە بۆ ئەو دیمانە و دیدار و چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیانە تەرخان بکات کە لەگەڵ دکتۆر کەمالدا کراون، کە تێیاندا بیروبۆچوون و لێکدانەوەکانی بۆ زۆر پرسی زانستی و هزری و ڕووناکبیری دەربڕیون. ئەمانە شایەتی بۆ ئەوە دەدەن کە ئاگاداریی بەرفراوانی لەمەڕ پرسەکان هەبووە و ڕاستیی و دروستیی گەلێ لە بۆچوونەکانی و قووڵیی لێکدانەوەکانی دەردەخەن. ئەمەشیان بابەتگەلێکی دەوڵەمەندن؛ بۆ توێژینەوە و لێکدانەوە لە بیروبۆچوونە هزری و ڕووگە ڕووناکبیرەکانی.

**بەشی شەشەم:** بە ئومێدی ئەوەین ئەم بەشەیان هەموو ئەو نووسینانە بگرێتەخۆ کە لەبارەی کۆچکردووەوە نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، جا چ کتێب و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا بن یان لێکۆڵینەوە و وتار کە لە سەروبەندی کۆچکردنی یان لە بیرەوەری یەکساڵەی کۆچی دوایی گوتران. پێمانوایە ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانە کە پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد سەرپەرشتی کردوون و بەپێی ڕێنماییەکان توێژینەوەی هاوبەشن، لەم بەشەدا جێیان بکەینەوە. کۆچکردوو لە داڕشتنی کاری زانستی خوێندکارانیدا داهێنەر بوو، لە پرۆژەی ماستەرنامە و کارنامەکانی دکتۆرا لە بیرۆکە و ناوونیشانی بابەت و پلانی لێکۆڵینەوە بگرە تا دەگەیشتە لێکدانەوە و ڕێکخستنیان، بۆیە بە پێویست زانرا پێڕستێک بە ناوونیشانی ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانەی کە سەرپەرشتی کردوون و ناوی خوێندکار، و ئاستی کارەکە و مێژووەکەیان لەم بەشەدا جێگە بکرێنەوە. جێی خۆیەتی لێرە ئاماژە بە بەشداریی پڕجۆش و دەوڵەمەندانەی دکتۆر کەمال بکەین لە گفتوگۆی دەیان نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرادا کە پڕ بوون لە زانیاری دەگمەن و بیرۆکەی هێژا. لەبەر ئەوەی ئەو گفتوگۆیانە بە وێنە و دەنگ تۆمار کراون؛ هەوڵدەدەین پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندیدارەوە بکەین بۆ ئەوەی ئەو تۆمارانە دەست بخەین، لە داهاتوودا بخرێنە سەر کاغەز و لە چوارچێوەی سەرجەم بەرهەمەکانیدا

بڵاو بکرێنەوە. هەروەها لیژنەی تایبەت پەیوەندی بە خوێندکارە بەتواناکانی کۆچکردووەوە دەکات بۆ ئەوەی وتاری بابەتیانە سەبارەت بە شێوازی وانەوتنەوەکانی بنووسن.

لیژنەی تایبەت کە لەم بەڕێزانە پێکهاتووە: پرۆفیسۆر دکتۆر جەبار قادر، پرۆفیسۆر دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر کامەران محەمەد حاجی، لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بیبلیۆگرافیایەکی سەرەتایی بۆ سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر ئامادە کردووە، ئەوە وێڕای ئامادەکردنی کتێبە دانراو و وەرگێڕانەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بۆ چاپ، کە ئەم بەشەیە وا لێرەدا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران و توێژەران.

خۆشبەختانە ئەندامانی لیژنەکە دەستیان گەیشت بە بەشێکی گرنگ لە نووسین و بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی خۆیدا پارێزراون. ئەوەی لەوێدا کەوتە بەرچاویان وێنەیان گرتن و هەندێ کاریان لەسەر کراوە. هاوڕێ و دۆستانیش لە دەرەوەی لیژنەکە لە هەبوونی کۆمەڵێ وتار و توێژینەوە و کتێب کە پەیوەندییان بە کۆچکردووەوە هەیە ئاگاداریان کردینەوە. بەشێکیش لەو توێژینەوە، وەرگێڕان، لێدوان یان ئەو نووسینانەی خوێندکارەکانی و مامۆستاکانیان و هەڤاڵانی کۆچکردوو لەبارەی ژیانی تایبەتی و زانستی ئەوەوە نووسیوویانە دۆسیی تایبەتییان بۆ ڕێکخراون. لیژنە ژمارەیەک وتار و توێژینەوەی مامۆستای کۆچکردوویان تایپ کردووەتەوە و بە وردی پێیانداچوونەوەتەوە و هەڵەچنیان بۆ کردوون.

لیژنەکە دوابەدوای بڵاوکردنەوەی سەرجەمی کتێبەکانی بە کوردی و عەرەبی، کە ئەم بەشەی پرۆژەکە پێکدێنن، کۆشش بۆ تەواوکردنی بەشەکانی دیکەی ئەم پڕۆژە زانستی و ڕووناکبیرییە گەورەیە دەکات؛ ئەم کارە بۆ خزمەتی ڕاستی و مێژووە و بەرز ڕاگرتنی بەخششی ئەم مرۆڤە مێژووزان و پەروەردەکارە مەزنەی نەتەوەی کورد کە بەدەگمەن هاوشێوە و هاوتای دووبارە دەبێتەوە. لێرەوە لیژنەی سەرپەرشتیار داوا لە توێژەران

و ئەو خوێنەرانە دەكات كە بایەخ بە بەرهەم و داهێنانەكانی ئەم پیاوە مەزنە دەدەن دەستی یارمەتی بۆ لێژنەكە درێژ بكەن و هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەكیان لە لا پەیدا دەبێ كە لێكۆڵینەوە، وتار یان دیدار و چاوپێكەوتنی ڕۆژنامەوانی بڵاوكراوەی كۆچكردوویان لە لایە، بیخەنە بەردەستی لێژنەكە. بێگومان هاوكاری و یارمەتی هەمووان لەم بارەیەوە دەبێتە بنەما و بناغە بۆ دامەزراندنی كتێبخانەیەكی مێژوویی و مۆزەخانەیەكی تایبەت بە كۆچكردوو كە دەكرێ هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەبێت تێیدا كۆبكرێتەوە و بپارێزرێت. دابەشكردنی كتێب و بەرهەمەكانی كۆچكردووی گەورە لە ڕووی بابەت و ژمارەی لاپەڕەكانەوە بەسەر بەرگەكانی ئەم چاپەدا كێشەیەكی هەندێ ئاڵۆز بوو لە بەردەم لێژنەكەدا، لەم بارەیەوە گفتوگۆی زۆر كرا تا ئەوەی لە كۆتاییدا لەسەر ئەم شێوە دابەشكردنەی خوارەوە گیرساینەوە:

**بەرگی یەكەم:** "كوردستان لە ساڵەكانی شەڕی یەكەمی جیهاندا"، "مێژوو-كورتە باسێكی زانستی مێژوو و كورد و مێژوو"، "خەباتی ڕزگاریخوازی كورد و ئازەر لە ئێراندا".

**بەرگی دووەم:** "تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی كوردیدا"، "چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد – بەرگی یەكەم".

**بەرگی سێیەم:** "چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد – بەرگی دووەم".

**بەرگی چوارەم:** وەرگێڕانی كوردیی كتێبی: "وردبونەوەیەكی مێژوویی دەربارەی مەكیاڤیللی و مەكیاڤیللیزم"، "ڕێنیسانس لەگەڵ باسێكی تر بە ناونیشانی ئەدیب و ئەركەكانی قۆناغ"، "ئافرەت لە مێژوودا- كورتە باسێكی مێژوویی و كۆمەڵایەتی"، "چینی كرێكارانی عێراق - دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی".

**بەرگی پێنجەم:** "كورد و كوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەكانی حكوومەتی بەریتانیادا – بەرگی یەكەم".

**بەرگی شەشەم:** "كورد و كوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەكانی حكوومەتی بەریتانیادا – بەرگی دووەم".

**بەرگی حەوتەم:** وەرگێڕانی عەرەبیی کتێبی: "كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى" و کتێبی "كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير- دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق".

**بەرگی هەشتەم:** "دراسات في تاريخ إيران الحديث والمعاصر"، "أضواء على قضايا دولية في الشرق الأوسط"، "النهضة".

**بەرگی نۆیەم:** "صفحات من تاريخ العراق المعاصر- دراسات تحليلية"، "الطبقة العاملة العراقية- التكون وبدايات التحرك"، "ثورة العشرين في الإستشراق السوفيتي"، "رأي للمناقشة: الإطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر".

**بەرگی دەیەم:** "دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية"، "إنتفاضة عام ١٩٢٥ الكردية في تركيا - دراسة تحليلية"، "حول مسألة الإقطاع بين الكرد"، "ميكافيلي والميكافيلية"، "محاضرات في تاريخ الدول الكبرى بين الحربين العالميتين". وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، شەش بەرگی یەکەمی بە زمانی کوردین و چوار بەرگی دواییش بە زمانی عەرەبیین.

لە کۆتاییدا لیژنەکەمان سوپاسی هەموو ئەو ناوەند و بەڕێزانە دەکات کە ئامادەییان دەربڕی پشتگیری مادی یا مەعنەوی لە پرۆژەکە بکەن، دیارە بە ژمارە زۆرن، لە پێشەوەشیان سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولفەتاح بۆتانی، کە ژوورێکی تایبەتی بۆ ئەم لیژنەیە لە ئەکادیمیا تەرخان کرد. هەروەها سوپاسی دۆستی هێژا پرۆفیسۆر دکتۆر عیماد جەواهیری دەکەین کە تێبینی و سەرنجەکانی ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە زیادکردنی تەوەرێکی نوێ بۆ بەشی شەشەمی پرۆژەکە. هەروەها سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە ئەرکیان کێشا و لیژنەکەیان لە وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆچکردوو ئاگادار کردەوە. هەروەها لیژنەکە سوپاسی مامۆستا جەلال زەنگابادی دەکات کە دڵسۆزانە بۆ سەرخستنی پرۆژەکە بە باشترین شێوە کار دەکات.

**لیژنەی تایبەت بە کۆکردنەوە و**
**بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر**

له چاپكراوه‌كانی كۆڕی زانیاری كورد

# "تێگه‌یشتنی ڕاستی"

## و شوێنی له ڕۆژنامه‌نوسی كورديدا

د. كه‌مال مه‌زهه‌ر ئه‌حمه‌د

چاپخانه‌ی كۆڕی زانیاری كورد

بغداد — ١٩٧٨

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد

# "تێگەیشتنی ڕاستی"

# و

# شوێنی لە ڕۆژنامەنوسی کوردیدا

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بغـداد ـــ ١٩٧٨

## پێشکەشە

بەو زانا پایە بڵندەی « تێگەیشتنی ڕاستی »ی لە فەوتان ڕزگار کرد ..
بە « ئەنستاس ماریَ کەرمەلیَ » ! .

بەو « شوکریلفەضلی »یەی ئەگەر کورد بوبێ زۆر بەرز بووە و ،
ئەگەر عەرەبیش بوبێ دەها بەرزتر !

# پێشەکی

زۆر کەمن ئەوانەی تا ئێستا بە نووسین لە چەند ڕوویەکی ڕۆژنامەنووسیی [1] کوردیی کۆڵیونەتەوە . مامۆستا ئەمین زەکی یەکەم کوردە کە بە شێوەیەکی بیبلیۆگرافیایی بەکورتی باسی ئەم لایەنە گرنگەی ژیانی کولتووریی کوردیی کردووە [2] . دوای ئەو مامۆستا عەلائەددین سەجادییش بە هەمان دەستوور شوێنێکی دیاریی لە چاپی یەکەم و دووەمی (مێژووی ئەدەبی کوردی)یەکەیدا بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان تەرخان کردووە و بە پێی ساڵی دەرچوونیان ڕیزی کردوون و چەند زانیارییەکی کورتیشی

---

(1) نووسەرانی کورد زاراوی (ڕۆژنامەگەریی) بۆ «الصحافة» بەکاردێنن . منیش نیازم بوو ناوی کتێبەکەم بنێم « تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا» ، بەڵام قسەی چەند برادەرێکی شارەزا وای لێ کردم (ڕۆژنامەنووسی) بەکاربێنم چونکە زیاتر لەگەڵ دەستووری زمانی کوردیدا دەگونجێ ، یەکەم لەبەر ئەوەی قیاسی هەیە ، وەك (دوعانووسی)، دووەمیش لەبەرئەوەی بۆ «صحفی» (ڕۆژنامەنووس) نەك (ڕۆژنامەگەر) بەکاردێنین . (گەر)یش پاشگرێکە بۆ نیشانەی پیشە وەك (ئاسنگەر) و (زەڕنگەر) و شتیوا .

(2) بڕوانە : محمد امين زکی ، خلاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان ، جلدی اول (جزمی دوەم) ، بغدا ، ١٩٣١ . (هەروەها بڕوانە : ل ٣٧٠ – ٣٧٣ی چاپی عەرەبیی ئەم کتێبە) .

دەربارەیان بڵاو کردووەتەوە (٣) . دوای شۆڕشی تەمۆزی ساڵی ١٩٥٨یش ژمارەیەك نوسەری تری کورد چەند بەرهەمێکی سەربەخۆیان لەبارەی لایەنە جیاکانی ڕۆژنامەنوسی کوردی‌یەوە بڵاوکردەوە (٤) .

نوسەرانی کورد ، بە زمانی‌تر ، زۆر یا کەم ، باسی ڕۆژنامەنوسیی کوردی‌یان کردووە . بەشی زۆری ئەو بەرهەمانە بە زمانی عەرەبین (٥) . بە زمانە ئەورۆپایی‌یەکانیش ژمارەیەك نوسەر لە سنوری توانا و پێویستدا ڕۆی جیاوازی ئەو باسەیان خستۆتە بەر چاو (٦) . غەیری کوردیش جاروبار

(٣) علاءالدین سجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، چاپی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٥٢ ، ل ٥٥١-٥٥٨ ؛ چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٦٠٩-٦٢٦ .

(٤) بڕوانە : عبدالجبار محمد جەباری ، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی ، کەرکوك - سلێمانی ، ١٩٧٠ ( ١٩٠ ل ) ( ئەمە یەکەم کتێبی سەربەخۆی کوردی‌یە دەربارەی ڕۆژنامەنوسی کوردی) . دوکتۆر کەمال فوئاد بەشی زۆری ژمارەکانی «کوردستان»ی بە زەنکۆگراف چاپ‌کردەوە و کردی‌یە کتێبێکی سەربەخۆ (بڕوانە : «کوردستان - یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ - ١٩٠٢» ، کۆکردنەوە و پێشەکی دوکتۆر کەمال فوئاد ، بەغدا ، ١٩٧٢ ) ؛ جمال خزنەدار ، رابەری ڕۆژنامەگەری کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ (کارگێڕی گشتی ڕۆناکبیری کوردی ئەم کتێبەی لەگەڵ «ڕۆژی کوردستان»ەکەی شێخ مەحمودا بەبۆنەی حەفتا و پێنج ساڵەی ڕۆژنامەنوسی کوردی‌یەوە بڵاوکردەوە . یەکەمیان بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی چاپ‌کراوە ) . جگە لەمانە ژمارەیەك وتار لەسەر هەمان باس لە ڕۆژنامە و گۆڤاری جیاوازی کوردیدا بڵاوکراونەتەوە ، ناوی هەندێکیان لە بەشی سەرچاوەکانی ئەم باسەدا نوسراون .

(٥) بڕوانە : الدکتور عزالدین مصطفی رسول ، حول الصحافة الکردیة ، بغداد ، ١٩٧٣ ؛ جبار جباري ، تاریخ الصحافة الکردیة في العراق ، بغداد ، ١٩٧٥ . زۆر نوسەری کورد وتار و زانیاری بەکەڵکیان دەربارەی مێژوی ڕۆژنامەنوسی کوردی بڵاوکردۆتەوە (بە وێنە بڕوانە : محمد الملا عبدالکریم ، الصحافة الکردیة درب شائك و مسیرة مجیدة ، - « التآخي » ، بغداد ، ١٥ حزیران ١٩٧٠ ) .

(٦) دوکتۆر کەمال فوئاد لەو کتێبەیدا کە بە زمانی ئەڵەمانی دەری‌کردووە و بۆ دەسنوسی کوردی تەرخان کردووە باسی ژمارەکانی «کوردستان»ی =

هاتونەتە سەر باسی رۆژنامەنوسی کوردی • مێژونوس مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی باسی گەلێك لەو رۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەی کردووە کە لە عیراق دەرچون [(٧)] • ژمارەیەك لە کوردناسانی سۆڤیەت ، بەتایبەتی دوکتور و • ڤیلچێڤسکی [(٨)] و دوکتور م• س• لازەرێڤ [(٩)] ، زانیارییان

---

= یەکەم رۆژنامەی کوردی کردووە کە لە کتێبخانەی ماربورگ پارێزراون ( بڕوانە :

(( Kurdische Handschriften )), beschrieben van Kamal Fuad, Wiesbaden, 1970, P. XVIII ).

دوکتور مارف خەزنەدار لە نامەی دوکتورێکەیدا کە بە روسی چاپکراوە ( بڕوانە :

**Хазнадар М., Очерк истории современной курдской литературы, Москва, 1967.**

م. خەزنەدار ، کورتەی مێژوی ئەدەبی کوردی هاوچەرخ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ) . خاوەنی ئەم کتێبەش لە هەردو نامەی دوکتورێکەی کە یەکەمیان بە روسی چاپکراوە و لە وتارێکی سەربەخۆدا باسی باری رۆژنامەنوسی و چەند رۆژنامە و گۆڤارێکی کردووە . ئەو وتارەی کە دیسان بە روسی بلاوی کردۆتەوە بەم ناوەوەیە :

**Камаль М.А., К истории издания первой курдской газеты,-"Народы Азии и Африки", 1968, № 4.**

کمال م. ا. ، دەربارەی مێژوی یەکەم رۆژنامەی کوردی ، ــ گۆڤاری « گەلانی ئاسیا و ئەفەریقا» ، مۆسکۆ ، ژمارە ٤ ، ١٩٦٨ ، ل ١٦١ــ١٦٤ .

(٧) بڕوانە : عبدالرزاق الحسني ، تاريخ الصحافة العراقية في طبعته الثالثة الموسعة ، الجزء الاول ، صيدا ، ١٩٧١ .

(٨) بڕوانە :

**Вильчевский О., Библиографический обзор зарубежных курдских печатных изданий в XX столетии,-" Иранские Языки ", т.I, Москва, Ленинград, 1945, стр. 147-181.**

و. ڤیلچێڤسکی، سەرنجێکی بیبلیوگرافی لە چاپەمەنی کوردی دەرەوەی=

دەربارەی هەندێك پەخشە و رۆژنـامەی کوردیی بڵاو کردۆتـەوە . لـە رۆژئاواییەکان س. ج. ئەدمۆندس لە هەموان زیاتر بایەخی بەم لایەنـەی ژیـانی رونـاکبیریی کـورد داوە [١٠] . نیکیتـین [١١] و ئیگلتن [١٢] و

---

= (سۆڤێت ـ ك.م.) لە سەدەی بیستدا، لە کتێبی : «زمانە ئێرانییەکان»، بەشی یەکەم ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، ١٩٤٥ ، ل ١٤٧ ـ ١٨١ .

(٩) لە هەردوو کتێبەکەیـدا .

Лазарев М.С., Курдистан и курдская проблема ( 90-е годы XIX века-1917 ), Москва, 1964.

م.س. لازارێڤ، کوردستان و کێشەی کورد (نەوەتەکانی سەدەی نۆزدە ـ ١٩١٧) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ، لە گەلێ شوێن و لاپەڕەدا .

Лазарев М.С., Курдский вопрос ( 1891-1917 ), Москва, 1972.

م.س. لازارێڤ، مەسەلەی کورد ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢، لە گەلێ شـوێن و لاپـەڕەدا .

(١٠) ئەدمۆندس یەکەم بێگانەیە کە لە چەند بەرهەمێکیدا باسی دەرچـون و ناوەرۆکی چەند رۆژنامەیەکی دەگمەنی وەك «بـانگی حـەق» و « رۆژی کوردستان »ی کردووە ( بڕوانە :

C. J. Edmonds, A Kurdish Newspaper : ((Rozhi — Kurdistan)), — (( Jonrnal of the Central Asian Society )), Vol. XII, Part I, 1925, PP. 83 — 90; C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, London, 1957, PP. 58 — 59, 301 — 302, 319 ; C. J. Edmonds, The Kurds of Iraq, — (( The Middle East Journal )), Vol. XI, No. 1, 1957, P. 55.

(١١) بەتایبەتی :

B. Nikitine, (( Ria Teze )), Journal Kurde d'Erevan, — (( Afrique et l'Asie)), Paris, No. 3, 1958, P. 57.

(١٢) زۆر بـەکورتی لـە قوژبنی مێـژوی بەسـەرهـاتی مەهـابادەوە بـاسی رۆژنامەنوسی ئەو دەورەی لە کتێبەکەیدا کردووە ( بڕوانە :

W. Eagleton, The Kurdish Republic of 1946, London, 1963, PP. 8, 59, 68, 78, 101 etc.

رۆندۆ (١٣) و سـەتۆن (١٤) و هیٖتر (١٥) لە بەرهەمەکانیـاندا زۆر یا کەم هاتونەتە سەر باسی رۆژنامەنوسیٖ کوردیٖ ٠

بیٖ گومان ئەم بەرهەمانە هەر یەکەیان بایەخ و سەنگی خۆی هەیـە و کەلەبەرێکی باشی پڕ کردۆتەوە ٠ بەڵام هیچ کامیان ، لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرای بەدەر لە دەسەڵات ، لـە کەم و کورتی و هەڵە بیٖبـەش نیٖیە ٠ نوسەرانی کورد تا ئیستە نەیانتوانیوە وێنەیەکی هەمو لایەنیٖ دەربـارەی رۆژنامەنوسیٖ کوردیٖ پێشـکەش کەن ٠ دیـارە ئـەم کارە لە توانـای کوردناسانیشدا نیٖیە ٠ ئەمان لەمەدا جیٖی رەخنە نین ، هەرچەندە دەشیانتوانی وێنەیەکی کامڵتر لەم مەیدانەدا بخەنە بەر چاو ٠ جگە لەوە وا دیارە پەیدابونی رۆژنامەنوسیٖ کوردیٖ و خەبات و هونەری رۆژنامەنوسـانی کورد بە لای هەندێك نوسەری رۆژئاواییٖیەوە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی ناوخۆ نیٖیە ٠ بە وێنە دڵسۆزی و لانەدانی شێخ نوریٖ شێخ صالح وەك سـەرنوسەری « رۆژی

---

(١٣) بڕوانە :
P. Rondot, Publication Kurde en caractéres latins (( Hawar, Komela Kurdi )) Revue Kurde . . . )), — (( Bulletin d'études Orientales )), T. II, 1932, PP. 300 — 304.

(١٤)
L. P. Elwell — Sutton, The Press in Iran to—day,— (( Journal of the Royal Asian Society )), Vol. XXXV, July — October, 1948, Parts III and IV, PP. 209 — 219.

(١٥) بە وێنـە بڕوانە :

"Роже - Курд",-"Восточный Сборник", СПб., Изд. Об-ва Русских Ориенталистов, 1913. кн. I.

« رۆژی کورد » ـ « کۆمەڵە بەرهەمی رۆژهەڵاتیٖ » ، پەتروسبورگ ، بلاوکراوەی رۆژهەڵاتناسانی رۆس ، ١٩١٣ ، کتێبی یەکەم ، ل ٢٣٣ ـ ٢٣٤ ٠

کوردستان » بە لای ئەدمۆندسەوە بەرهەمی ئەوە بێ کە بە «خزمایەتی دەگەیشتە ژنی دووەمی شێخ مەحمود » [١٦] • ئەدمۆندس دان بەوەدا دەنێ کە شێخ نوری زوربەی وتارە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی « رۆژی کوردستان»ی دەنوسی ، بەڵام دەشڵێ بەشی زۆری ئەو بەرهەمانەی « لە کتیبە تورکیە کۆنەکان» وەردەگرت [١٧] • وەك بەڵگەش ئەدمۆندس بە دەستکاریەوە ناوی ژمارەیەك لە وتارەکانی شێخ نوری هێناوەتەوە کە ئێمە وا لێرەدا وەك دەقی کوردیەکەی پێشکەشیان دەکەین :

«بانگی کوردستان ــ رۆژی کوردستان » [١٨] ، « مەتانەت و سەباتی قەومی کورد» [١٩] ، «فەنی و ئیجتیماعی ــ میللەت» [٢٠] ، «موجادەلەی حەیات» [٢١] ، « ویلایەتی موسڵ لە لۆزاندا» [٢٢] ، « سیاسی • داوای حقوقی مەشروعە » [٢٣] ، «قسەی ناحەق رەد ئەکرێتەوە » [٢٤] ، «لە فەلاکەت عیبرەت» [٢٥] •

دیارە پێویست بە لێکۆڵینەوە و دەمەتەقێ ناکا بۆ ساغکردنەوەی ئەوە

---

(١٦) C. J. Edmonds, A Kurdish Newspaper, P. 85 .

(١٧) Ibid, P. 86.

(١٨) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ١ ، ١٥ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٢ . باسی ئەوە دەکات بۆچی «بانگی کوردستان» داخرا و «رۆژی کوردستان» جێگەی گرتەوە .

(١٩) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ٢ ، ٢٢ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٢ .

(٢٠) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ٤ ، ١٣ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢ .

(٢١) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ٥ ، ٢٠ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢ .

(٢٢) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ٦ ، ٢٧ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢ .

(٢٣) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ٨ ، ١٠ی کانونی دووەمی ١٩٢٣ .

(٢٤) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ١٠ ، ٢٤ی کانونی دووەمی ١٩٢٣ . وەڵامە بۆ وتارێکی رۆژنامەی «العراق» .

(٢٥) «رۆژ کوردستان» ، ژمارە ١٤ ، ٢٤ی شوباتی ١٩٢٣ . بەکورتی باسی ئەو دەردی سەریانە دەکات کە لە شەڕی یەکەمەوە بەسەر کوردا هاتن و ئامادەیی فیداکاری بۆ رزگاری نیشان دەدا .

که ئیلهامی بیری شاعیرێکی خاوەن بەهرە بۆ ئەم جۆرە باســانە دەبێ باری نالەباری کورد بۆبێ کە ئەدمۆندس بۆ خۆی یەکێك بۆ لەوانەی دەستیان لە دروستکردنیدا هەبۆ • جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئەوەش بهێنینەوە یاد کە شێخ نوریێ شێخ صالح یەکەمی ئەو پێشبڕکە دەرچۆ کە مێجەر ســۆن بۆ نوسینی کوردی بەر لە دەرچــونی «رۆژی کوردستــان» لە رۆژنــامەی «پێشکەوتن»دا کردی • وەك «پێشکەوتن» باسی دەکا یازدە کەس لــەو پێشبڕکەیەدا بەشدار بۆن ، بەڵام نوسینی هەشتیان رەتکرایەوە چــونکە وەرگیراو بۆن و سیانەکەی‌تریان لەبەر رەسەنی یەکەم و دووەم و سێیــەم دەرچــۆن (٢٦) •

باسی رۆژنامەی «تێگەیشتنی راستیێ» بۆ خۆی بەڵگەیەکی مانــاداری باری لێکۆڵینەوەی رۆژنامەنوسیێ کوردی‌یە • مامۆستا عەلائەددین سەجادی یەکەم کەسە کە باسی ئەم رۆژنامەیەی کردووە • بەڵام ئەو باسە لە هەردۆ چاپی «مێژۆی ئەدەبی کوردی»یەکەیدا لەوە زیاتر نی‌یە کە دەڵێ :

«تێگەیشتنی راستیێ» «رۆژنــامەیەکی حەفتــەیی کوردی پیلانی ـــ سیاسی کۆمەڵایەتی بووە ، ئیحتیلالی ئینگلیزی لە ساڵی ١٩١٨ لە بەغــدا دەری‌کردووە • ژمارەی ٢٠ی بەر ١١ی مارتی ١٩١٨ کەوتووە ، ئیتر نازانم چەن ژمارەی لێ دەرچووە » (٢٧) • نوسەرانی‌تری کورد هەر یەکەیان بــە جۆریێ ئەم قسەیەیان لە بەرهەمەکانیاندا دوبارە کردۆتەوە (٢٨) • زاهیــدە

---

(٢٦) «پێشکەوتن» ، سلێمانی ، ژمارە بیستو حەوت ، ٢٨ی ئۆکتۆبەر و ژمارە بیستو هەشت ، ٤ی نۆڤەمبەر و ژمارە سێ ، ١٨ی نۆڤەمبەری ١٩٢٠ . لە شوێنێکی‌تری ئەم کتێبەدا دێینەوە سەر هەمان باس .

(٢٧) علاءالدین سجادی ، سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی یەکەم ، ل ٥٥٢ ـــ ٥٥٣ ؛ چاپی دووەم ، ل ٦١١ .

(٢٨) بڕوانە : عبدالجبار محمد جەباری ، مێژۆی رۆژنامەگەریێ کوردیێ ، ل ٧٥؛ جبار جباري ، تاريخ الصحافة الكردية في العراق ، ص٢٦؛ جمال =

ئیبراهیم لەو رابەری رۆژنامەنوسی‌یەیدا کە سالی ۱۹۷٦ بلاوی کردۆتەوە دەلی « تێگەیشتنی راستی » رۆژنامەیەکی سیاسی و کۆمەلایەتی بووە وای نیشان دەدا گوایە دەرچونی سالی ۱۹۱۷ دەستی پێ کردووە و سالی ۱۹۱۹ وەستێنراوە و بەسەر یەکەوە ٦٥ ژمارەی لێ دەرچووە [٢٩] • خۆشم لەو کتێبەدا کە بە زمانی روسی دەرمکردووە تەنها باسی ئەوەم کردووە کە ئینگلیزەکان بۆ کاری پرۆپاگەندەی خۆیان دوای گرتنی بەغدا «تێگەیشتنی راستی »یان بە زمانی کوردی بلاوکردەوە [٣٠] •

لەمە زیاتر هیچ دەربارەی «تێگەیشتنی راستی» بلاونەکراوەتەوە • تەنانەت ئارنۆلد ویلسنی وەکیلی حاکمی سیاسی ئینگلیزیش لە عیراق هیچ باسێکی ئەو رۆژنامەیەی نەکردووە هەرچەندە لە کتێبەکەی خۆیدا چەند جارێ هاتۆتە سەر باسی ئەو رۆژنامانەی ئینگلیز لە گرتنی بەسرەوە

---

= خزنەدار ، رابەری رۆژنامەگەری کوردی ، ل ٢٣ ؛ محەمەدی مەلا کەریم، سەرچاوەی ناوبراو .

(٢٩) زاهدة ابراهیم ، کشاف الجرائد والمجلات العراقیة ، بغداد ، ١٩٧٦ ، ص ٥١ . خاوەنی ئەم کتێبە ناوی زۆر رۆژنامە و گۆڤاری کوردی هێناوە کە ژمارەیەکیان بە هەلە تۆمار کراون و هی وایان تێدایە تا ئێستە هیچمان دەربارەیان نەبیستووە . بۆ نمونە لە لاپەرە ٤٤ی کتێبەکەیدا دەلێ : « جریدة بلدي کوردستان . جریدة یومیة سیاسیة . صاحبها : مصطفی باشا . صدرت في : ؟ و الغي امتیازها سنة ١٩٤١ » . دور نی‌یە مستەفا پاشا مافی دەرکردنی رۆژنامەیەکی بەم ناوەوە وەرگرتبێ و بلاوی نەکردبێتەوە .

(٣٠) بڕوانە :

**Камаль М.А., Национально-освободительное движение в Иракском Курдистане 1918-1932, Баку, 1967, стр.67.**

کەمال مەزهەر ئەحمەد ، بزوتنەوەی نەتەوەیی ـ رزگاریخواز لە کوردستانی عیراق سالانی ١٩١٨ ـ ١٩٣٢ ، باکو ، ١٩٦٧ ، ل ٦٧ .

دەستیان‌کرد بە بڵاوکردنەوەیان و دەوری مێجەر سۆنی وەك رۆژنامەنوسێکی چالاك نیشان‌داوە [٣١] •

ئەو زانیاری‌یانەی دەربارەی «تێگەیشتنی راستی» بڵاوکراونەتەوە سەرەڕای ئەوەی یەکجار کەمن لە هەڵەش بەدوور نین • مامۆستا سەجادی تەنها ژمارە بیستی ئەو رۆژنامەیەی دیوە و نەیزانیوە تەنانەت ئەو ژمارەیەش دوو جار چاپ‌کراوە • زاهیدە ئیبراهیم لەبەر ئەوەی لە بریتی ساڵی ١٩١٨ بە هەڵە ساڵی ١٩١٧ لەسەر لاپەڕەیەکی ژمارە یەکی «تێگەیشتنی راستی» چاپ‌کراوە ساڵێکی رەبەقی خستوتە سەر تەمەنی رۆژنامەکە • جگە لەوە «تێگەیشتنی راستی» وەك دوایی باسی دەکەین ٦٧ ژمارەی لێ دەرچووە نەك ٦٥ وەك ئەو دەڵێ • دیارە «تێگەیشتنی راستی» لەلایەن فەرماندەی گشتی لەشکری ئینگلیزەوە دەرکرا نەك «لەلایەن باڵیوزخانەی بەریتانی‌یەوە لە شاری بەغدا » [٣٢] کە تا ساڵی ١٩٣٢ شتێك بەوناوەوە نەبوو •

وادیارە زاناو قەشەی بەناوبانگ ئەنەستاس ماری کەرمەلی تاقە کەسە کاتی خۆی هەموو ژمارەکانی «تێگەیشتنی راستی» لە بەرگێکی تایبەتیدا پاراستووە [٣٣] • ئەو بەرگە لەگەڵ کتێبخانەکەی ماری کەرمەلیدا دوای وەفاتی کەوتە دەست کتێبخانەی موزەخانەی عیراقی و ئیستە لەوێ پارێزراوە [٣٤] •

---

(٣١) لە بەشی سێیەمدا دێینەوە سەر ئەم باسە .

(٣٢) جمال خزنەدار ، رابەری رۆژنامەگەری کوردی ، ل ٢٣ .

(٣٣) مۆرێك بەم‌ناوەوە «المكتبة الشرقية العراقية للاباء المرسلين الكرمليين في بغداد ١٩١٨» بە لاپەڕە یەکی ژمارە یەك و لاپەڕە یەکی ژمارە پەنجا و دو و لاپەڕەی دوا ژمارەی «تێگەیشتنی راستی»یەوە نراوە .

(٣٤) کلێسەی کەرمەلی‌یەکان ساڵی ١٩٤٩ پتر لە حەوت هەزار کتێب و بەرگی تەواوی رۆژنامە و گۆڤار و دەستنوسی هەمەچەشنەی ئەنەستاس ماری کەرمەلی بە دیاری دا بە موزەخانەی عیراقی . دەوروبەری ١٣٠٠ دەستنوس لەناو ئەو دیاری‌یانەدا هەیە کە بەشێکیان کەرمەلی خۆی =

کاتێك لەگەڵ ژمارەکانی «تێگەیشتنی راستی»دا وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی خەریك بوم تێگەیشتم کە ئەم رۆژنامەیە لاپەڕەیەکی گرنگ و سەیری نەزانراو لە مێژوی رۆژنامەنوسی کوردیدا پێکدەهێنێ و هەستم کرد دڵسۆزێك لە هەزاران سەربازی نەناسراوی کورد لە کاتێکی ناسکدا هەوڵی داوە بە پێی تێگەیشتنی سەردەمی خۆی خزمەتی گەلی کورد و زمان و ئەدەب و مێژوی بکا . تا لە خوێندنەوەی هەمو ژمارەکانی بومەوە هاتمە سەر ئەو بیرەی «تێگەیشتنی راستی» پێویستی بە لێکۆلینەوەیەکی دور و درێژە . بەو جۆرە هەمو ژمارەکانیم نوسیەوە [٣٥] بەنیازی ئامادەکردنی ئەم بەرهەمە. هیوادارم بەهەڵەدا نەچوبم و توانیبێتم هەنگاوێکی نوێ لە مەیدانی لێکۆلینەوەی مێژوی رۆژنامەنوسی کوردیدا بنێم .

بە پێویستم زانی بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بۆ باسی « چەند لاپەڕەیەك لە مێژو و بایەخی رۆژنامەنوسی» بەشێوەیەکی گشتی تەرخان بکەم . لەم بەشەدا هەوڵمداوە هەندێك زانیاری نوێ لە قالبێکی نوێدا عەرز بکەم . بەشی دووەم «چمکێك لە مێژوی رۆژنامەنوسی کوردی» کارێکی پێویستە بۆئەوەی بتوانین دەرچونی «تێگەیشتنی راستی» لە چوارچێوەی مێژویی

---

= نوسیونی. شایانی باسە ئەم زانایە دو دەسنوسی خۆی بۆ باسی کورد تەرخان کردووە ، یەکەمیانی ساڵی ١٨٩٧ نوسیوە و ناوی‌ناوە «تحقيقات عن الكرد» ، ئەوی تریانی ساڵی ١٩١٩ نوسیوە و ناوی ناوە « تاریخ الكرد»، یەکەمیان لە موزەخانەی عیراقی‌یە (بڕوانە : كوركيس عواد، الاب انستاس ماري الكرملي . حياته و مؤلفاته ( ١٨٦٦ ـ ١٩٤٧ ) ، بغداد ، ١٩٦٦ ، ص ٢٨ ـ ٣٠ ، ٢٣٣ ـ ٢٣٤ ؛ كوركيس عواد ، المخطوطات التاريخية في مكتبة المتحف العراقي ، بغداد ، ١٩٥٧ ، ص ٤٩ ) .

(٣٥) بەدەگمەن شتی‌وای تێدابە پەڕاندبێتم و نەمنوسیبێتەوە . ئەمەش بۆ خۆی جۆرە بەڵگەیەکە بۆ گرنگی ناوەرۆك و خۆشی شێوازی نوسینی « تێگەیشتنی راستی » ، ئەگینا نوسینەوەی ٦٧ ژمارەی رۆژنامەیەك کارێکی هەروا ئاسان نی‌یە .

راستی خۆیدا ببینین • دیسان لەم بەشەدا هەولمداوە هەندێك زانیاری نەزانراو بخەمە بەرچاو و گەلێك جاریش بەتایبەتی باسی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەم کردووە کە زانیاری هەڵەیان دەربارە بڵاوکراوەتەوە • بەشەکانی‌تر بۆ باسی‌کەی و چۆنی دەرچونی «تێگەیشتنی راستی» و هونەری رۆژنامەنوسی ئەو و شوێنی زمان و ئەدەب و مێژوی کورد لەسەر لاپەڕەکانی و چەند باسێکی‌تر تەرخان کراون • لەو بەشانەشدا بەپێی‌توانا هەولمداوە باسەکانی «تێگەیشتنی راستی» بەجۆرێکی دابڕاو لە رۆژنامەنوسی کوردی عەرز نەکەم •

ئەو شیعرانەی نالی و حاجی قادری کۆیی و کوردی و مەحوی و شاعیرانی‌تر کە لە بەشی پێنجەمدا بڵاو کراونەتەوە لەگەڵ دیوانە چاپکراوەکانی ئەو شاعیرانەدا بەراورد کراون و جیاوازی‌یەکانی نێوانیان نیشاندراون ، لەوانەیە سودیان بۆ شارەزایانی ئەدەب هەبێ • وەك دەبینین زۆر جار توشی جیاوازی دێین لەنێوان شیعرەکانی ناو «تێگەیشتنی راستی» و ئەوانەی ناو دیوانەکان ، بەتایبەتی لە شیعرەکانی نالیدا • دور نی‌یە دەسنوسی جیاوازی ئەو شاعیرانە لای شوکریلفەضلی یا لای مێجەر سۆن هەبوبێ •

لە راستیدا گۆڕینی رێنوسی وتار و باسەکانی ناو «تێگەیشتنی راستی» و ساغ‌کردنەوەی وشە و رستەکانی کارێکی زۆر گران نی‌یە ، بەڵام ئاسانیش نی‌یە ، زۆر جار پێویستی بە بیرکردنەوە و وردبونەوە هەیە • وا لێرەدا چەند نمونەیەکی کەم دەخەمە بەر چاو :

« هتا هاتین علما صنعته تنزلمان کرد» [٣٦] واتە «هەتا هاتین عیلمەن و صنعە تەن تەنەزولمان کرد» ؛ «امجا ری حج» [٣٧] واتە «ئەمجا رێی حەج» ؛ «لە عجایبتر چیە او ترقیە اوروپاییەکان بە حوتصد صال کردیان ژاپونەکان

(٣٦) بڕوانە : سەروتاری ژمارە سێو حەوت ، ١٥ی تەموزی ١٩١٨ .
(٣٧) بڕوانە : ژمارە پەنجا ، ١٤ی تەشرینی یەکەمی ١٩١٨ .

بسی صالی بویان میسر بو » [٣٨] واتە « لەمە عەجایەبتر چیە ئەو تەرەقی‌یەی ئەوروپاییەکان بە حەوت‌صەد ساڵ کردیان ژاپۆنەکان بە سێ ساڵ بۆیان مەیسەر بۆ » ؛ «چونکە همو متفکریك امرو فکری امە بە کە لە دنیادا بشریتیکی سالم و مساوی حکم‌فرما بێ » [٣٩] واتە : «چونکە هەمو موتەفەکیرێك ئەمڕۆ فیکری ئەمەیە کە لە دونیادا بەشەری‌یەتێکی سالم و مساوێ حوکم‌فەرما بێ» ؛ «ری و شوین باوباپیریان بی کم دکن » [٤٠] واتە «ڕێ و شوێنی باو و باپیریان پێ گوم دەکەن » •

دەستکاریێ شێوازی نوسینەکانی ناو «تێگەیشتنی ڕاستی»مان بە پێویست زانی ئەگینا لەوانەبێ خوێنەر بەئاسانی لە مەبەست نەگا و بەدەست خوێندنەوەی وتار و بەشە وەرگێراوەکانی‌یەوە هیلاك بێ • لەوەش زیاتر کە نیشانمان‌دا دەستکاریێ شێوازی نوسینەکان نەکراوە تا ئەوانەی مەبەستیانە باشتر لەو ئاڵوگۆڕانە بگەن کە بەسەر ڕێنوس و شێوازی نوسینی کوردیدا هاتون • زۆر بەدەگمەن بەنیازی قوتارکردنی ڕستەکان لە لەنگی‌یەکی زەق ناچار بوین تاك (مفرد) بکەینە کۆ (جمع) یا بە پێچەوانەوە • ئەوجۆرە دەستکاری‌یە کەمانەمان خستۆتە نێوان دوێ کەوانەوە • لێرەدا نمونەیەك دەخەینە بەرچاو :

«تێگەیشتنی ڕاستی» لە بەشی «ئەدەبیاتی کورد»ی ژمارە هەشتیدا ئەم ڕستەیەی وەها نوسیوە : «••• لەو ڕۆژنامە کوردانە کە لەمەوپێش نەشرکرا •••» ، بەنیازی ڕونکردنەوە ئێمە لە شوێنی خۆیدا وامان لێ کردووە : « ••• لەو ڕۆژنامە (کوردی‌یانەی) کە لەمەوپێش نەشر(کران)•••» •

---

(٣٨) بڕوانە : ژمارە پەنجاو شەش ، ٢٥ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ •
(٣٩) هەمان ژمارە •
(٤٠) بڕوانە : سەروتاری ژمارە هەشت ، ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩١٨ •

هیوادارم ئەم بەرهەمە شوێنی خۆی لە کتێبخانەی کوردیدا بگرێ و مایەی ڕەزامەندی خوێنەر و شارەزایانی کورد بێ •

کۆتایی سوپاسی بێ‌پایانم پێشکەش ئەو برادەرانە دەکەم کە هەریەکەیان بەجۆرێ دەستیان لە دەرکردنی ئەم بەرهەمەدا هەیە ، تایبەت ئەو دڵسۆزانەی بەر لە من هەوڵی بایەخداریان بۆ ساغ کردنـــەوەی گەلێ ڕۆی نــەزانراوی ڕۆژنامەنوسی کوردی داوە• پڕ بە دڵ سوپاسی هاوڕێ و برای بەڕێز ئەندامی یاریدەری «کۆڕی زانیاری کورد» کاك محەمەدی مـــەلا کەریـــم دەکەم بۆ یاریدەی هەمە جۆری • زۆر سوپـــاسی برایان هێمنی شـــاعیر و زەبیحـــی ڕۆژنامەنوس و صەلاح سەعدوڵلای ئەندازیار دەکەم کە هەریەکەیان بەجۆرێ دەســـتی یاریدەیان بۆ درێژ کردم• برایانی چاپخانەی « کۆڕی زانیـــاری کورد »یش ، تایبەت کاك کامیل مەنسوری بەڕێوەبەری ، جێگەی سوپاسی تایبەتیمن •



# بەشی یەکەم

## چەند لاپەڕەیەك دەربارەی مێژوو و بایەخی ڕۆژنامەنوسی

( دیاز )ی سەرکۆماری مەکسیك کاتی خۆی وتویە : «حەزم‌دەکرد خاوەنی ئەو کارگانە بوومایە کە کاغەز و مەرەکەب دروست‌دەکەن تاوەکو هەموویانم بسوتاندایە » • لە ماری کریستینی شاژنی ئیسپانیاش دەگێڕنەوە کە وتویەتی : «تەنانەت لەناو مار و مێروشدا توشی ڕۆژنامەنوس دێیت»• دەڵێن حاکمی ڤەنزەوێلاش وتویە : «لەوە ناترسم دەرگای دۆزەخم بۆ بکرێتەوە ، بەڵام لەجیڕەی قەڵەمی ڕۆژنامەنوسێك گیانم دێتە لەرزین » • قسەکانی ناپلیۆنیش هەر لەم بارەیەوە گەلێك مانا بەخشن : « سێ ڕۆژنامە لە سەد هەزار سەرباز زیاتر دەمترسێنن» [1] •ڤۆلتێریش ڕاست دەکا کە دەڵێ : «ڕۆژنامەنوسی دەزگایەکە بە کەس ناشکێ ، بەڵام ئەو جیهانی کۆن دەڕوخێنێ بۆئەوەی جیهانێکی نوێ دامەزرێنێ » •

نمونەی ئەم قسانە زۆرە و هەر یەکەشیان بەجۆرێك گرنگی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنوسی دەخاتە ڕوو • زۆرکەس ڕۆژنامە و گۆڤار بە «دەسەڵاتی

---

(۱) بڕوانە : «الدستور» ، بیروت ، العدد ۳٤۹ ، کانون الاول ۱۹۷٦، ص ۱۹ .

چوارەم»[٢] ناودەبەن • لەراستیشدا لەگەڵ وەرچەرخانی هەمو رژێمێکدا سەر لە بن ئەم « دەسەڵاتی چوارەمە » وەك سێ دەسەڵاتەکەی تر (تەشریعی و تنفیذی و قضائی) دەگۆڕرێت •

رۆژنامە و رۆژنامەنوسی مێژۆیەکی دۆر و درێژی پڕ لە رۆداو و ئالوگۆڕیان هەیە [٣] • لە شارستانەتی کۆندا چەند نمونەیەکی سەیر هەیە کە هەریەکەیان بە جۆر و شێوازێك لە رۆژنامە دەکەن ، یان بە لای کەمەوە بە خزمایەتی پێی دەگەنەوە • چەند هەزار ساڵێك لەمەوبەر فەرمانڕەوا کۆنەکانی میسر کاروباری وڵات و شەڕەکانی سوپا و گەلێك شتیتری لەو بابەتەیان بەشێوەیەکی رازاوە لەسەر بەرد هەڵدەکەند و دوایی لەگەڵ خۆیان دەیانبردە ناو گۆڕەوە یان بۆ نەوەی دوای خۆیانیان بەجێدەهێشت • سەرەڕای ئەوە زوربەیان دەنگوباسیان لەسەر دیواری بتخانەکان هەڵدەکەند بۆئەوەی خەڵك بیانبینن • هەر شتێکی گرنگ روی بدایە لەسەر تاشە بەردی نوێ هەڵیاندەکەند و بە دیوارا هەڵیاندەواسی • دوای ئەوەی میسری‌یەکان توانی‌یان کاغەز لە (بەردێ) دروست بکەن فەرمانڕەوایانیان کەوتنە بڵاوکردنەوەی ئەوی مەبەستیان بۆ لەسەر ئەو جۆرە کاغەزە • لە موزەخانەی لۆڤەری پاریس پارچە کاغەزێکی لەو بابەتە هەیە کە دەگەڕێتەوە دەوروبەری ٣٧٥٠ ساڵ لەمەوبەرو بە وتاری یەکێك لە وەزیرەکانی ئەو سەردەمە پڕکراوەتەوە کە تیایدا باسی دەوڵەت و کارەکانی دەکات • لەوەش

(٢) «السلطة الرابعة» . بۆ یەکەمجار ساڵی ١٨٢٨ ئەم زاراوە بۆ رۆژنامە و رۆژنامەنۆسی بەکارهێنرا بەتایبەتی دوای ئەوەی رۆژنامەنۆسان کەوتنە عەودالی ئەو هەواڵانەی پەیوەندی‌یان بەکار و رەفتاری میری و کاربەدەستانەوە هەیە .

(٣) بەشێك لە زانیاری‌یەکانی ئەم بەشە لە سەرچاوەی ئەنسکلۆپیدی جیاواز وەرگیراون . ناو و لاپەڕەی ئەو سەرچاوانە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا تۆمار کراون .

سەیرتر ئەوەتە کە مێژوونوسی بەناوبانگی کۆن هیرۆدۆت [٤] باسی ئـەوە دەکات کە گوایە میسری‌یە کۆنەکان رۆژنامەی رەخنە و گاڵتـە و گەپیـان هەبووە کـە یەکێکیان نـاوی « رۆژنامــەی کۆشــك » بـووە و دەڵێ نوسەرەکانی باسی رابواردنی شەوانی پاشا و خوا پیاوەکانیان دەکرد و بە بیانوی قسەی خۆشەوە توانجیان تێ دەگرتن[٥] ٠

رۆژنامە کۆنەکانیش کە دەستی باڵایان لە رازاندنەوەی شـارستانەتی زودا هەیە دەوری خۆیان لە پێشخستنی رۆژنامەنوسی سەرەتـاییی کۆنـدا بینی و دەسکەوتی رۆژهەڵاتی‌یەکانیان لەم مەیدانەدا بەرەوپێش برد ٠ پتر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر یۆلیۆس قەیسەر دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ئەو وتار و لێکۆڵینەوە و دەمەقاڵێ و باس و خواسانەی لەناو «ئەنجومەنی پیران» (مجلس الشیوخ)دا رویان‌دەدا ٠ تا ئەوکاتە ئەو هەواڵانە لـە چوارچێوەی ئەنجومەنی ناوبراو و ئەندامانی و فەرمانڕەوایان نەدەچونە دەرێ ٠ ئەم کارە هێند ئەنجامدار بۆ وای لێ‌هـات بووە کارێـکی رۆژانــە و سـەرەتای هەنگاوێکی گرنگی‌تر بـۆ مەیدانی خۆی ٠ زۆری نەخایاند هەر لە رۆمای کۆن و سەردەمی یۆلیۆس قەیسەردا بڵاوکراوەیەکی رۆژانە پەیدا بۆ کە بە ناویش خزمایەتی نزیکی خۆی لەگەڵ رۆژنامــەنوسی نوێدا دەگەیێنێـت (( Acta diurna Urbis )) واتە «روداوی رۆژانە»[٦]٠هەروەکو بە ناوەکەیدا دیارە ئەم «روداوی رۆژانە»یە باس و خواس و بەســەرهات و خـۆشی و ناخۆشی وڵات و خەڵکی بڵاو دەکردەوە ٠ سەیر ئەوەیە تەنانەت هەواڵی وەك ژن خواستن و منداڵ بون و نابوتێ و بڕیاری قورسی دادگاکان و باســی

---

(٤) مێژوونوسی هەرە بەناوبانگی ئەغریقە کۆنــەکان هـیرۆدۆت لە ســەدەی پێنجەمی بەر لە عیسا ژیاوە .

(٥) بڕوانە : الدکتور محمد نجیب ابواللیل ، الصحافة الفرنسیة في مصر منذ نشأتها حتی نهایة الثورة العرابیة ، القاهرة ، ١٩٥٣ ، ص ١٥ ـ ١٦ .

(٦) « الحوادث الیومیة » .

وەرزش و هونەر و هەواڵی دەگمەن و سەیری بڵاودەکردەوە • «روداوی رۆژانە» لە شوێنە گشتییەکان هەڵدەواسرا و نوسەری تایبەتی رۆنوسی ناوەرۆکیان دەکرد و بە شار و ناوچەکانی وڵاتدا بڵاویان دەکردەوە • ئەم بڵاوکراوەیەی یۆلیۆس قەیسەر دایمەزراند نزیکەی پێنج سەدە ژیا ( لە سەدەی یەکەمی بەر لە دایك بونی عیسا تا سەدەی چوارەمی پاش عیسا )•

یەکێك لە هەنگاوە گرنگە کۆنەکانی ئەم مەیدانە چینییەکان نایان • ئەوانیش لە سەدەی حەوتەمدا بڵاوکراوەیەکی تایبەتییان هەبو کە لە «روداوی رۆژانە»کەی یۆلیۆس قەیسەر زیاتر لە رۆژنامەی ئیمڕۆی دەکردە• چینییەکانیش یاسا و بڕیار و روداوەکانی ژیانی رۆژانەی کۆشکی پاشایان بڵاو دەکردەوە و ئەوانیش ناوێکی تایبەتی ماناداریان بۆ هەڵبژاردبو : « دی باو » واتە (هەواڵەکانی پایتەخت) • ئەمەش بۆ خۆی یەکێکە لە ناوە هەرە کۆنە دەگمەنەکان کە لە ناوی رۆژنامەی ئەم سەردەمەی دەکرد •

دیسان لە ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەندا بڵاوکراوەیەك بە ناوی «پامفلێت» ( Pamphlet )ەوە پەیدا بو [٧] کە لە شێوەی پەخشە «نشرة» و کتێبی پچوکدا بڵاو دەکرایەوە • ئەم پامفلێتانە لە سەدەی پازدەوە لە زۆر شوێنی ئەوروپای رۆژئاوا بڵاو دەکرانەوە • گەلێك لە پیاوە ناودارەکانی ئەو سەردەمە بیر و را و هەستی خۆیان لەو رێگەیەوە بە خەڵك دەگەیاند • زوربەی ناوەرۆکی ئەو «پامفلێت»انە بۆ مەبەستی سیاسی و رەخنە لە زۆرداری رژێم تەرخان دەکران • تەنانەت چەند بزوتنەوەیەکی جوتیارانی ئەوروپای ئەو سەردەمە «پامفلێت»ی تایبەتی خۆیانیان بڵاو دەکردەوە • لەو بڵاوکراوانەدا باسی زوڵم و زۆری دەرەبەگایەتی و کاربەدەستانیان دەکرد و داواکانی خۆیانیان رادەگەیاند •

---

(٧) لە Pamphilius ی لاتینییەوە وەرگیراوە . دو مانای هەیە : کومیدیا و گاڵتەجاڕ و هیجا یا کورتە باس و کتێبی پچوك .

هەر لەو سەردەمەشدا لە ئەنجامی پەرەسەندنی پەیوەنـدی بازرگانی لەنێوان شار و ولاتاندا ، لەنێوان ئەوروپـا و ئاسیـادا خـاوەن مـاڵ و خەلکی‌تریش زیاتر لە جاران کەوتنـە عەودالی هـەوالی ئەو شـوێنانەی کەلوپەلیان بۆ دەناردن یا کەلوپەلیان لێوە دەهێنان • لەوکاتەوە بەندەر و شارە گەورەکانی ئەوروپا بوونە مەلبەندی کۆکردنـەوە و بلاوکردنـەوەی دەنگوباسی هەمەجۆر • لە سەدەی شازدەهەمدا لە شاری ڤینیسیا (بندقیة) دەزگایەکی تایبەتی بۆ کۆکردنـەوەی هەواڵ و دەنگوبـاس دامەزرێنرا • پیشەیەکی نوێش بە ناوی «نوسەری دەنگوبـاس»ەوە داهات • لە شـارە گەورەکاندا هێ وا هەبوون خۆیان بەتایبەتی بۆ ئەو کارە تەرخـان دەکرد و هەواڵ و دەنگوباسی فەرمانڕەوایان و رووداوی شاران و بـاری بازرگانی و گەلێ شتی‌تریان کۆدەکردەوە و ڕێکیان دەخست و ئینجا بلاویان دەکردەوە• هەر لەمەشەوە نـاوی «غەزەتـە» پەیدا بو [8] ، چونکە ئـەو بلاوکراوەی دەنگوباسە لە شاری ڤینیسیا یەکی بە غەزەتـەیەك دەفرۆشرا و غەزەتـەش (( Gazzetta )) ناوی پـارەیەکی لە زیو دروستکراوی ئەو شـارە بو • ئەم ناوە لە ولاتەکانی ئەوروپادا وردە وردە بۆ مانا تازەکەی بلاو بۆوە [9] •

ئەم ئاڵوگۆڕانە دوا هەنگاو بوون بۆ پەیدا بوونی «رۆژنامە» بەوجۆرەی ئیمڕۆ دەیبینین ، بەتایبەتی چونکە بونە یەکێکیش لە هەوێنـە گرنـگەکانی دۆزینەوەی چاپ کە بێ ئەو رۆژنامەنوسی نەیدەتوانی بگاتە پلەی ئیستەی •

چاپیش مێژوی تایبەتی خۆی هەیە کە یەکێـکە لە ئەنجـامە هـەرە

---

(٨) لە سەرەتادا و بۆ ماوەی نیو سەدەیەك کوردیش «غەزەتـە»یان لەبریتی رۆژنامە بەکاردەهێنا . وادیارە ئەو وشـە ئەوروپایی‌یە لە رێگەی زمـانی تورکی‌یەوە گەیشتۆتە کوردی .

(٩) بەتایبـەتی دوای ئـەوەی رونـاکبیرێکی فەرەنسـەیی ( ت. رینـودو T. Renaudot ) لە سـالی ١٦٣١ وە دەستی‌کرد بە بلاوکردنەوەی La Gazette

گرنگەکانی پەیدابونی نوسین و دانانی کتێب • لەوەتەی نوسین پەیدا بووە و ئادەمیزاد دەستی کردووە بە نانی هەنگاوی گەورە لە مەیدانی بەرەو پێش چونی شارەستانەتیدا ، کتێب بووەتە رۆی هەرە گرنگ و بزوێنەری هەرە پێویستی ئەو بەرەو پێش چونە • لە سەردەمی ئاشوری‌یەکانەوە کتێب و کتێبخانە پەیدا بون • کتێبی ئەو سەردەمە بە بارست گەورە و بە سەنگ قورس و بە ناوەرۆك پچوك بون ـ کتێبێك چەند تەنێك دەبو ، گواستنەوەی چەند عەرەبانەیەکی پێ دەویست ، کەچی خوێندنەوەی بە حونجە لەوانە بۆ تاقە سەعاتێك نەخایەنێ • لەم دواییەشدا کار گەیشت بەوەی دوو دانە کتێبی چەند سەد لاپەرەیی بەئاسانی لە پاکەتە شقارتەیەکدا جێگەیان بێتەوە • سالی ١٨٩٦ لە بەرلین فەرهەنگێك چاپ‌کرا کە برتی بو لە ٥٠٠ لاپەرە و هەر لاپەرەیەکیشی ٢٧ دێر و هەر دێرێکی ٧٠ پیتی تێدا بو بەلام بارستی هەموی برتی بو لە ٣٢ × ٢٤ × ٨ ملیمەتر ، واتە چەند سانتیمەترێکی سێ گۆشە کە لە قوتووە شقارتەیەك پچوکترە [١٠] •

دیارە ئەم گۆرانە گەورەیە ماوەیەکی دور و درێژی پێویست بو • گەلانی رۆژهەلات لەو ماوەیەدا چەند دەستکەوتێکی گرنگیان بەدی هێنا کە دەوری دیاریان هەبو بۆ کورت‌کردنەوەی رێگەی گەیشتن بە چاپ • میسری‌یەکان یەکەم جۆری کاغەزیان لە (بەردێ) دروست کردە دوای ئەوان هەر لە رۆژهەلات دروست‌کردنی جۆری‌تری کاغەز دۆزرایەوە کە تارادەیەك لە کاغەزی ئێستەی دەکرد • ئەو جۆرە کاغەزە بۆ یەکەم جار لە سەدەی یەکەمدا لەلایەن چینی‌یەکانەوە بەکارهێنرا ، بەلام لەسەر خۆ بلاو بۆوە • لە

(١٠) بڕوانە :

Богданов Н. и Вяземский Б., Справочник журналиста, Ленинград, 1965, стр.652.

ن. بەگدانۆف و ب. ڤیازێمسکی ، رابەری رۆژنامەنوسی ، بە زمانی رۆسی ، لێنینگراد ، ١٩٦٥ ، ل ٦٥٢ •

سەمەرقەند ساڵی ٦٥٠ و لە بەغدا ساڵی ٨٨٠ [11] و لە قـاهیرە دەوروبەری ١١٠٠ دەستیان کردە بەکارهێنانی • بەڵام هیچکام لە گەلانی ئەوروپـا تـا نزیـك سـەدەی سیـازدە ئەو کاغەزەیـان نـەدەزانی و ئەوسـاش لـە ڕۆژهەڵاتی‌یەکانەوە فێری بون •

هەر لە ڕۆژهەڵاتیش یەکەم جـۆری سەرەتـایی چـاپ پەیـدا بو • چینی‌یەکان لە دەوروبەری کۆتایی سەدەی شەشەمەوە [12] فێری ئەوە بـون لە سەر پارچە تەختەی گەورە پیت و وشە و وێنە بە جوانی و ڕێکوپێـکی هەڵکەنن و بە هۆی مەرەکەبی ڕەنگاو ڕەنگەوە چەند هەزار دانەیەکی لـێ چاپ بکەن • ئەوروپایی‌یەکان لە دەوروبەری کۆتایی سەدەکانی ناوەندا لـە چینی‌یەکانەوە فێری ئەم جۆرە چاپە بون • دیسان چینی‌یەکان یەکەم گەل بون کە بەر لە ئەوروپایی‌یەکان بە نزیکەی چوار سەدە یەکەم هەنگاویان نـا بۆ دروستکردنی شتێك کە تارادەیەك لە ماکینەی چاپی دەکرد •

ئەم دۆزینەوانە هەرچەندە پێویست و گرنگ بون ، بەڵام ئەنجامیـان کەم و کێشەیان زۆر بو • بۆ وێنە چاپکردن بە هۆی هەڵکەندنی تەختەوە ماوەیەکی زۆری پێ‌دەویست و دەشبو ئەو پیت و وێنانەی هەڵدەکەنرێـن گەورە و بێ پێچ و پەنا بن • بۆ هەر لاپەڕەیەك پێویسـت بو تەختـەیەکی تایبەتی هەڵکەندرێ و دوایی فڕێ بدرێ •

بۆ زاڵبون بەسەر ئەم کۆسپانەدا دەبو جۆرە پیتێکی‌تر بدۆزرێتەوە ، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە «چەرخی بوژاندنەوەی ئەوروپادا» [13] خوێندن و

(١١) هەندێك سەرچاوە باسی ئەوە دەکەن گوایـە ژمارەیـەك چینی لەلایـەن عەرەبەوە بە دیل گیراون و لەوانـەوە فێری کاغـەز دروسـتکردن بون ( بڕوانە : محمد نصر ، صحافة الملايين ، القاهرة ، ١٩٦٥ ، ص ١٥ ) .

(١٢)
S. Natarjan, A history of the Press in India, London, 1962, P. 3.

(١٣) « عصر النهضة الأوروبية » .

خوێندەواری پەرەیان سەند و نوسەران کەوتنە ئەوەی بە زمانی خەڵك بنوسن نەك لاتینی ، واتە دوای ئەوەی کتێب وەك بەرهەمێکی روناکبیری کەوتــە بازاڕەوە (١٤) بۆیەکا وای لێهات دەسنــوسی گران یا بەرهەمی پچــوکی چاپکراو بە تەختــەی هەڵکەندراو دادی خــەڵك نەدەن • ئەوســا بیری ئادەمیزاد بۆ ئەوە چو پیتی جیا جیا لە قوڕ دروستبکات و لە کورەدا سوری بکاتەوە • راستە ئەم جۆرە پیتانە زۆر زو دەســوان یا دەشکان ، بــەڵام دۆزینەوەیان هەنگاوێکی گەورە بو بۆ نزیك کەوتنەوەی تــەواو لە چــاپی نوێ • وردە وردە مس و ئاسن جێگەی قوڕیان گرتــەوەو بەوجــۆرە پیتی لەبارتر پەیــدا بو •

هەرچەندە کۆششی چەند کەسێك رێگەی ئەم دۆزینەوەیەی دوایــان خۆش کرد بەڵام داهێنانی چاپی نوێ بە پیتی نەچەسپاو «متحرك» بە ناوی داهێنەری ئەڵەمانی یۆحەنــا گۆتینبورگەوە ( Johannes Gutenberg ) (١٤٠٠ ــ ١٤٦٨) بەستراوە (١٥) کە دەوروبــەری ســاڵی ١٤٤٥ تــوانی

---

(١٤) تا دەوروبەری کۆتایی سەدەکانی ناوەند کتێب تەنها بۆ ئەندامانی چینەکانی ژوروی کۆمەڵ بو ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە لاتینی‌یان دەزانی . نوســەر و زاناکانی ئەوروپا بە زمانی نەتەوەیی خۆیــان نەیاندەنوســی ، هەمویــان لاتینی‌یان بەکاردەهێنا . سەرەڕای ئەوە دەسنوس گران بو ، بۆیــەکا زۆر بەدەگمەن دەکەوتە بازاڕەوە ، شوێنی ئاســایی ئەوســای کتێبخــانەی کڵێســە و دەســەڵاتدار و دەوڵەمــەندان بو . لە سەرەتــای «چــەرخی بوژاندنەوە »وە نوسەران کەوتنە بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی .

(١٥) شوێنی یۆحەنا گۆتینبــورگ ( ١٤٠٠ ــ ١٤٦٨ ) لــە بەرەوپێشچــونی شارستانەتی مرۆڤدا تایبەتی‌یە ، بەهۆی داهێنانەکەی ئەوەوە زادی بیری زانایان بووە موڵکی هەموان . بەداخەوە بەڵگە لەبارەی ژیــانی‌یەوە زۆر کەمە ، تا ئێستە تەنانەت ساڵی لەدایکبونی تەواو نەزانراوە . هەرچۆن بێ کارەکەی گۆتینبورگ وەك نوسەری رۆژئاوایی گ. سێلێری دەڵێ «لەو جۆرە کارانەیە کە تاقە جارێك رو دەدەن و دوبارە نابنەوە» (بڕوانە:ــ G. C. Sellery, The Renaissance. Its Nature and Origins, Madison, 1962, P. 234 ).

مەکینەیەکی چاپی تەختە دروستبکات کە بە دەست ئیشی دەکرد • دوای ڕێکخستنی لاپەڕەی پێویست بە پیتی نەچەسپاو چەند لاپەڕە مەبەست بوایە بەو مەکینەیە چاپ دەکرا و ئینجا پیتەکان دیسان بەسەر قاسەی تایبەتیدا دابەش دەکرانەوە بۆ بەکارهێنانیتریان • ئەم یەکەم مەکینەی چاپەی گۆتینبورگ لە سەعاتێکدا صەد لاپەڕەی چاپ دەکرد [١٦] • ئەمە خێراییەکی بێهاوتا بو بۆ کاتی خۆی • جگە لەوە بەهۆی ئەم مەکینەیەوە توانرا هەڵەی ناو کتێب کەم بکرێتەوە و یەکیەتی ناوەرۆکی بپارێزرێ کە نەبونی بە کێشەیەکی گەورەی دەستوسە کۆنەکان دادەنرێ ، چونکە زۆر جار ئەوانەی رونوسی ئەو دەستوسانەیان دەکرد دەستیان لە ناوەرۆکیان دەدا و بە ئارەزو و بە پێوانەی تێگەیشتنی خۆیان لێیان لادەبرد یا شتی نوێیان دەخستە سەر •

ئەم کارەی گۆتینبورگ گەورەترین دەسکەوتی روناکبیریێ سەرتاپای گەلی ئەڵەمانیە لە سەدەی پازدەدا ، بەتایبەتی چونکە بووە سەرەتای بەرپابونی شۆڕشێکی گەورە لە ژیانی روناکبیریێ گەلانی ئەوروپا و ئینجا هەمو جیهاندا • داهێنانی چاپی نوێ رێگەی پێشکەوتنی زانست و بوژاندنەوەی کەلەپور و بڵاوبونەوەی بیری نەتەوەییێ ئاسان و خۆش کرد • گەر ئەو دەسکەوتە گەورەیە نەبوایە خوێندن و خوێندەواری هەروەك جاری جاران لە قاوغێکی تەسك و مەودایەکی تایبەتیدا دەمایەوە • بەلام دوای هەرزان و زۆر بونی کتێبی خوێندن فێرگەش زۆر بو • لێرەدا جێگەی خۆیەتی باسی ئەوە بکەین کە یەکێك لەو کتێبە کەمانەی گۆتینبورگ بۆ یەکەمجار بە مەکینەکەی خۆی چاپی کردن «رێزمانی لاتینی» بو بۆ فێرگەکان• گۆتینبورگ ئەو کتێبەی چەند جارێك لەچاپ دایەوە و دور نیە ئەو «رێزمانی لاتینی»یە لەمەدا تاقانە بوبێ • لە هەمانکاتدا داهێنانی چاپی نوێ

---

(١٦) بڕوانە : ن. بەگدانۆف و ب. ڤیازێمسکی ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٤٣٧.

بووه هۆیەکی یاریدەری گرنگ بۆ خێرا بونی چەند ئالوگۆڕێکی کۆمەڵایەتی کە بەر لەوە بە ماوەیەکی کەم دەستیان پێ کردبو ، وەك یەکگرتنی زمانە نەتەوەییە ئەوروپاییەکان و پەیدابون و پەرەسەندن و بڵاوبونەوەی ئەدەبی نەتەوەیی ، بەتایبەتی دوای ئەوەی بازاڕ بووە شوێنی فرۆشتنی کتێب .

وەك چاوەڕوان دەکرا چاپی نوێ بەخێرایی بە ئەوروپادا بڵاوبۆوە ، هەرچەندە گۆتینبورگ و هاوەڵەکانی دەیانویست نهێنی ماکینەکەیان بپارێزن . لە ماوەی نیوسەدەدا (تاوەکو ساڵی ١٥٠٠) نزیکەی ٣٠ هەزار کتێبی چاپکراو کەوتە بازاڕەوە کە لە هەر یەکەیان دەوروبەری ٣٠٠ دانە چاپ دەکرا . واتە ژمارەی هەمو ئەو کتێبانەی لە ماوەی ئەو نیو سەدەیەدا چاپکران خۆی دەدا لە نزیکەی ٩ ملیۆن دانە . ئەمەش بۆخۆی سەرەتایەکی گرنگ بو بۆ گۆڕینی ڕوی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕوناکبیری لە هەمو جیهاندا .

شایانی باسە هەر زو دەستکرا بە چاپکردنی بەرهەمی ئەدەبی و کتێبی کۆن . بۆ وێنە یەکێك لەو کتێبانەی گۆتینبورگ بۆ یەکەمجار بە مەکینەکەی خۆی چاپیکردن داستانێکی ئەڵەمانییە کە بە شیعر هۆنراوەتەوە . لە هەمانکاتدا چاپخانەکان دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەو زانا و نوسەرانەی کە بە بیر و باوەڕ دژی ڕژێمی سیاسی و ئابوری دەرەبەگی بون و داوای گۆڕینی کۆمەڵیان دەکرد [17] . هەر لەبەرئەوەش بو کلێسە و دەسەڵاتداران لە سەرەتاوە بە توندی دژی داهێنانی چاپی نوێ وەستان و تەنانەت لە چەند بەیاننامەیەکی تایبەتیدا تیر و پڕ بە سەر و پۆتەڵاکی گۆتینبورگ و مەکینەکەیدا هاتن و دۆزینەوەی چاپی نوێیان بە کارێکی خراپ و نالەبار لەقەڵەم دا !! . پاپا و کاردینالەکان لەوە دەترسان ئینجیل بە شێوەیەکی فراوان بڵاو بێتەوە و بگاتە دەست هەمو کەس و ئەمەش بێتە

(١٧) وەك بەرهەمە بەناوبانگەکانی تۆماس مۆر و ئارازمس و گەلێکی تری وەك ئەوان .

هۆی ئەوەی خەڵکی بۆخۆیان لە ناوەرۆکی تێبگەن و بەوجۆرە پەردە لـە ڕوی ئەوان و دورکەوتنەوەیان لە ڕێگەی ئایینی دروست هەڵبماڵرێ [18] .
ئینجیلیش یەکەم کتێب بو کە گۆتینبورگ بە مەکینەکەی خۆی چاپی کرد .
دیارە هێز نەبو بتوانێ بڵاوبونەوە و پێشکەوتنی خێرای چاپ و چاپەمەنێ بوەستێنێ بۆیەکا تاریك پەرستان بە نـاچاری پەنـایان بردە بەر ڕێگەیتر بەنیازی کەمکردنەوەی «زیـانە کوشندەکانی» چاپ . لە سـالی ١٥٥٩وە کلێسە دەستی کردە دەرکردنی لیستەی قەدەغەکردنی کتێب . ژمارەی ئـەو لیستانە [19] تائێستە لە ٤٠ تێپەڕیوە و نـاوی هەزارەهـا کتێبی گرنـگی هەمەجۆریان تێدایە . شایانی باسە بەشێکی زۆر لەو کتێبانە دەستیان لـە کاری کلێسە نەداوە ، زوربەیـان کتێبی فەلسـەفی و روناکبـیری ڕۆتن .
کتێبیوا هەیە ناوی لەسەر ئەوە خراوەتە ناو ئەو لیستانەوە چونکە خاوەنەکەی چەند سەدەیەك لەمەوبەر زاتی ئەوەی کردووە بلێ زەوی خڕە . ناوی زۆر ناوداری کەم هاوتای وەك ڤۆلتێر و هۆبس و دیکارت و برۆدۆن لاپەڕەکانی ئەو لیستانەیان « ڕازاندۆتەوە » .

سەرەڕای ئەوە و هەر لەبەرئەوەش وادیارە دەبێ مەکینەی چاپی تازە داهاتو لەبەر چاوەزار بە خوێن سور بکرێ . کۆنەپەرستانی ئەوروپا هەر زۆ دەستیان نایە بینی یەکێك لە خاوەن چاپخانە روناکبیرە ناودارەکان تـا بێکەنە عیبرەت بۆ ئەوانیتر . سالی ١٥٤٦ دۆلییەی نوسەر و فەیلەسوف و

---

(١٨) پاپا و کاردینالەکان دەمێك بێ بە ئارەزوی خۆیان ناوەرۆکی ئینجیلیـان لێكدەدایەوە و بیری ئایینی وایـان بڵاو دەکردەوە کە لەگەڵ ئینجیلـدا نەدەگونجـان . هەر لەبەرئەوەش بێ پاپـاکان بەر لـە داهـاتنی چـاپ خوێندنەوەی سەربەخۆی ئینجیلیان قەدەغە کردبێ ، دەبێ پیاوی ئـایین تایبەتی ئینجیل بۆ خەڵك بخوێننەوە و بۆیانی شەرح کەن .

(١٩) ناوی ئەو لیستەیە بە لاتینی بەمجۆرەیە :
(( Indet librorum Prohibitorum )) .

خاوەنی یەکێك لە چاپخانەکانی شـاری لیۆن [٢٠] لە نـاوەڕاستی پـاریسی پایتەختدا و بە بەرچاوی خەلکەوە لە هەڕەتی لاوێتییدا سوتێنرا • بـەلام زۆری نەخایاند نەوەی ئەو خەلکە و مێژو حوکمی رەوای خۆیاندا ــ سالی ١٨٨٩ هەر لەو شوێنەدا کە دۆلییەی تیا سوتێنرا پەیکەرێـکی پڕ شـانازی بەرزبۆوە بۆئەوەی هەتا هەتایە چیرۆکێکی مانادار بۆ هەموکەس بگێڕێتەوە•

داهێنانی چاپ گەورەترین کاری کردە سەر رۆژنامەنوسی • بەرلەوەی سەدەی پازدە کۆتایی بێ ، واتە ماوەیەکی کەم دوای دۆزینەوەی چاپی نوێ، هەندێك لەو پامفلێتانەی ئەوروپـا کە باسـمانکردن بە چـاپکراوی بلاو دەکرانەوە • دوای ئەوە بە ماوەیەك لە ژمارەیە ولاتی وەك ئەلەمانیا دەستکرا بە چاپکردنی رۆژنامە کە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەوە بەجۆرێکی هەست پێکراو کەوتە بلاوبونەوە و پەرەسەندن • رۆژنامەیوا پەیدا بو کە چەنـد هەزار دانەیەکی لێ چاپ دەکرا • لەگەل ئەوەشدا تا ئەو کاتە نە توانا هەبو نە پێویستی بۆ دەرکردنی رۆژنامەی رۆژانە • زوربەی ئـەو رۆژنامـانەی دەردەچون مانگانە و کەمێکیان هەفتـانە بون • سـالی ١٦٦١ لە لایپزگی ئەلەمـانیا بۆ یەکەمجـار لە مێـژودا رۆژنـامەیەکی رۆژانـە بە نـاوی (( Leipziger Zeitung )) وە کەوتە بازاڕەوە • ئەمە هەنگاوێکی زۆر گەورە بو بۆ سەردەمی خۆی • ولاتێکی پێشکەوتوی وەك ئینگیلتەرە تا سالی ١٧٠٢ توانای دەرکردنی رۆژنامەیەکی وەك ئەوەی لایپزگی نەبو • بەلام بە تێکڕا سەدەی هەژدە و نۆزدە بە سەرەتای پەرەسـەندنی خێرای رۆژنـامەنوسی ئەوروپا دادەنرێن • رۆژنامەی بەناوبانگی «تایمس» ( The Times ) کە لـە سالی ١٧٨٥وە دەسـتی بە دەرچـون کرد سـالی ١٨١٥ تەنها پێنج هەزار

---

(٢٠) دۆلییـە ( Dolet ) (١٥٠٩ ــ ١٥٤٦) یەکێـکە لـە نوسـەر و زانـا ناودارەکانی فەرەنسـای نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەهەم . کە سوتێنرا تەمەنی ٣٧ سـال بو .

دانەی لێ چاپ دەکرا ، بەڵام لە ناوەندی هەمان سەدەدا ژمارەی چاپکراوی گەیشتە ٥٢ هەزار و بەر لە کۆتایی ئەو سەدەیە گەیشتە ٨٠ هەزار دانە لــە رۆژێــکدا •

گەلانی‌تر لە ئەوروپاییەکانەوە فێری بەکارهێنانی چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی نوێ بون • هەر زۆ ژمارەیەك لە خاوەن چاپخانەکانی ئەوروپــا دەستیان کردە داڕشتنی پیتی عەرەبی بۆ وڵاتە موسڵمــانەکان • بەوێنە لــە سەرەتای سەدەی شــازدەدا یەکێك لە چاپخــانەکانی ئیتــالیا پیتی عەرەبی تایبەتی خۆی هەبو • ئەو چاپخانەیە بۆ یەکەم جار قورئانی چاپ‌کرد • هەر لەو دەورو بەرەشدا لە هەمان چاپخانە بەرهەمی ژمارەیەك زانای عەرەب و موسڵمانی وەك (ابن سینا) چاپ کرا • ڤاتیکانیش بۆ مەبەستی ئایینی خۆی زۆر زۆ کەوتە وەرگێڕان و چاپ‌کردنی زنجیرە کتێبێکی ئایینی گاورەکان و بە رۆژهەڵاتدا بڵاوی کردنــەوە •

بڵاوبونەوەی رۆژنامە لەبەر چەند هۆیەك کە دوایی باسیان دەکەیــن زۆر لەوە دواکەوت • لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتای پەیدابونی رۆژنامەنوســی وڵاتــانی رۆژهــەڵات تا رادەیــەکی زۆر بەرهــەمی هــاتن و ســیاسەتی ئەوروپاییەکانە • لە زۆر شــوێن کۆلۆنیســتە ئەوروپــاییەکان بۆ کاری پڕۆپاگەندەی خۆیان و لەبەر خــاتری ئەو ژمــارە زۆرەیان کە رژابونــە رۆژهەڵات دەستیان کردە دامەزرانــدنی چاپ و رۆژنــامە کە بەشێکیــان بەدەست میسیانیر (مبشر)ەکانەوە بو • بەم جــۆرە ئینگلیزەکان لە ســاڵی ١٧٨٤وە دەستیــان کــرد بــە بڵاوکردنــەوەی « غەزەتــەی کەلکەتــا » ( Calcutta Gazette ) • دوابەدوای ئەوە لە بەنــگال و چین و شوێنی‌تر رۆژنامەی لەوبابەتە پەیدا بو • عوسمانی‌یەکانیش لەو شوێنانەی فەرمانڕەوا بون دەستیان‌کرد بە دەرکردنی رۆژنامەی رەسمی کە بەدەگمــەن لە باســی یاسا و فەرمانەکانی سولتان و کاروباری دەوڵەت بەولاوە شتێکی‌تریان بڵاو

دەکردەوە • یەکێك لەو رۆژنامانە «الزوراء»[21] بۆ کە لە ١٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٨٦٩وە عوسمانی‌یەکان لە بەغدا دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی و بەوجۆرە دەبێتە یەکەم رۆژنامەی عیراق [22] • سەیر ئەوەیە ئەم رۆژنامەیە دەوروبەری ٤٨ ساڵ (تاوەکو داگیرکردنی بەغدا لەلایەن ئینگلیزەوە ساڵی ١٩١٧) ژیا و ئەوەش بۆ خۆی درێژترین تەمەنە لە سەرتاپای مێژۆی رۆژنامەنوسی عیراقدا •

زۆری نەخایاند رۆژنامەی نیشتمانیش لە رۆژهەڵات سەری دەرهێنا • بەڵام مەودای گەشەکردنی ئەم رۆژنامانە کەم بو • بەوێنە لە وڵاتێکی گەورە و خاوەن شارستانەتی کۆنی وەك چین تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە رێگەی دەرکردنی رۆژنامەیەکی رۆژانە بە زمانی نەتەوەیی نەدرا •

رۆژنامە لە هەمو شوێنێك دەتوانێ دو دەوری زۆر جیاواز ببینێ ــ دەورێکی پێشکەوتوی پڕ لە بیتا و پەروەردە و هاندانی چاکە یا دەورێکی کۆنەپەرستی رۆخێنەر • لە سەردەمی ئاڵوگۆڕی گەورەی وەك شۆڕشدا ئەم دو رووە جیاوازەی رۆژنامەنوسی زۆر رون دەردەکەون • شۆڕشی ئەمەریکا و شۆڕشی فەرەنسا دو نمونەی پڕ بەڵگەی ئەم راستی‌یەن ــ لە

---

(٢١) «زوراء» یەکێکە لە ناوەکانی شاری بەغدا .

(٢٢) ژمارەیە لە نوسەران باسی ئەوە دەکەن گوایە یەکەم رۆژنامە لە مێژوی عیراقدا ساڵی ١٨١٦ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی داود پاشادا دەرچووە (بڕوانە : فائق بطي ، الصحافة العراقية . میلادها ــ تطورها ، بغداد ، ١٩٦١، ص ٢١٣). بەڵام ئەمە تاوەکو ئێستە ساغ نەبۆتەوە و وادیارە قەت ساغ نابێتەوە چونکە لە دروستکراو دەچێت . جگە لەوە زۆر وڵاتی‌تری عەرەب ئەو سەردەمە لە عیراق پێشکەوتوتر بون کەچی کەسیان خاوەنی رۆژنامەی خۆیان نەبون . یەکەم رۆژنامەی نەتەوەیی عەرەبی رزقەڵلا حەسون حەلەبی لە ئەستەمۆل ساڵی ١٨٥٤ بە ناوی «مرآة الاحوال »ەوە دەری کرد و بەر لەوەش محەمەد عەلی گەورە لە قاهیرە ئۆرگانێکی میری بە ناوی «الوقائع المصرية»وە بڵاوکردەوە ( بڕوانە : فلیپ دی طرازي ، تاريخ الصحافة العربية ، بیروت ، ١٩١٣ ، ص ٣٢ ، ٤٩ــ ٥٠ ) .

رۆژانی شۆڕشی ئەمەریکادا (١٧٧٥ ــ ١٧٨٣) چەند رۆژنامەیەکی کەم لایەنی ئینگلیزە داگیرکەرەکانیان گرت و ئەوە بووە هۆی مردنیــان • زوربــەی رۆژنامەکانیتر بە گەرمی لایەنی شۆڕشیان گرت و دەورێکی باشیــان لــە ریسواکردنی دوژمن و بەرزکردنەوەی دروشمە نیشتمانیەکاندا بینی [٢٣]•
ئەم کارە لە روداوەکانی شۆڕشی فەرەنسەدا زیاتر رەنگی دایەوە • لە ماوەی دە سالی دوای شۆڕشی گەورەی ئەم ولاتە (١٧٨٩ ــ ١٨٠٠) نزیکەی ١٣٥٠ رۆژنامەی نویێ کەوتە بازاڕەوە • رۆژانی شۆڕشی ١٨٤٨ ــ ١٨٤٩ بەلای کەمەوە ٦٠٠ رۆژنامەی نوێ بە زمانی فەرەنسی دەستیان بە دەرچون کرد • کۆمۆنەی پاریسیش (سالی ١٨٧١) تەنها لە پاریس نزیکەی ١٣٠ رۆژنامە و گۆڤاری نوێی خستە بازاڕەوە •

هەنگاو بە هــەنگاو لەگەل پێشــکەوتنی مــرۆڤ دەورو جێــگەی رۆژنامەنوسی لە ژیانی گەلاندا پەرە دەسێنێ • ئیمڕۆ رۆژنامەی وا هەیــە ژمارەی لاپەڕەکانی لە ٤٠ تێدەپەڕێ [٢٤] • دەمێــکە زانســت و مێژو و ئەدەب و وەرزش و هونەر و هەمو روێەکی ژیانی کۆمەلایەتی تێکەل بــە لاپەڕەکانی رۆژنامە بون • رۆژنامە و گۆڤاری تایبەتی هەمەچەشنە هــاتونە مەیدانەوە (وەك هی وەرزش [٢٥] و ئافرەت و مندال و هونــەر و ئەدەب و قوتابی و لاوان و گەلێکیتر ) • رۆژنــامەنوسی بۆتە هــۆی بەهێــزبونی پەیوەندی لەنێوان خەلك و شار و لادێ و ولاتاندا • بەکورتی ئەم پیشــە گرنگە و بەرهەمەکانی بونەتە بەشێکی نەپچڕاوی ژیانی مرۆڤ • وەك نەهرۆ

---

(٢٣) بڕوانە :
Th. E. Berry, Journalism to day. Its Development and Practical Applications, Second Printing, New York, 1958, PP. 10 — 12.

(٢٤) دێینەوە سەر ئەم باســە .

(٢٥) لە سەرەتای سەدەی بیستەوە لە ئەمەریکا دەستکرا بە بایەخ پێدانی وەرزش لەلایەن رۆژنامەنوسانەوە . ئیستە بەدەگمەن رۆژنامەیەکی ئەوتۆ هەیە هەمو رۆژ بەشێك بۆ هەوالەکانی وەرزش تەرخان نەکات .

دەڵێ : «ئەوی بە لای کەمەوە رۆژی رۆژنامەیەك نەخوێنێتەوە رونـاکبیر نیيە» • لە راستیشدا بەپێی ژمارەیەك سەرچاوەی باوەڕ پێ‌کراو لە وڵاتـە پێشکەوتووەکاندا هەر کەسێ لە سەرو تەمـەنی منداڵییەوە بێ رۆژی ٤٠ تاوەکو ٤٥ دەقیقە بە خوێندنەوەی رۆژنامەوە دەبەنە سەر [٢٦] • بۆ زیـاتر رۆنکردنەوەی ئەم مەبەستە چەند نمونە و ژمارەیەکی مانادار دەخەینە بەرچاو •

بەپێی راپۆرتێکی یونسکۆ ساڵی ١٩٥٩ لە هەمو جیهاندا رۆژی ٢٥٠ ملیۆن دانە رۆژنامەی هەمەجۆر بڵاو دەکرایەوە • ئەم ژمارەیە ، بەپێی هەمـان راپۆرت ، ساڵی ١٩٦٥ گەیشتـە ٣٠٠ ملیـۆن • لەگەڵ ئـەوەش بـەپێی راپۆرتێکی‌تری یونسکۆ ساڵی ١٩٦٢ دو ملیار کەس ، واتە نیوەی خەڵـکی جیهان ، لە رۆژنامە بێ‌بـەش بون [٢٧] • بـەم جۆرە بۆ تێگەیشـتنی رۆی جیاوازی رۆژنامەنوسێ پێویستە چەند نمونەیەك لە وڵاتە پێشکەوتووەکان بهێنینـەوە •

دەمێکە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا هەر ٢٤ سەعاتەی پتر لە ٥٥ ملیۆن رۆژنامە دەفرۆشرێ [٢٨] ، واتە هەر ساڵەی ٢٠ بلیۆن دانە •

---

(٢٦) بڕوانـە :
(( Journalism Tomorrow )), Edited by W. C. Clark, New York, 1958, P. 8.

(٢٧) بڕوانە : هشام توفيق بحري ، صحافة الغـد ، القاهرة ، ١٩٦٨ ، ص ١٧ •

(٢٨) سەرەتای ساڵەکانی شەست تەنها لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پتر لە ١١ر٣٢٢ رۆژنامە لە نزیکەی ٨ر٤٥٠ شار چاپدەکرا ( بڕوانە :

"Печать зарубежных стран. Западная Европа, Америка, Австралия", Под редакцией Н.Г.Пальгунова и М.А.Харламова, Москва, 1962, стр. 322-323.

«چاپەمەنی وڵاتانی دەرەوە ــ ئەوروپای رۆژئاوا ، ئەمەریکا ، ئوستوراليا»، لەژێر چاودێری ن. گ. پالگونۆڤا و م. ا. خارلامۆڤا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢، ل ٣٢٢ ــ ٣٢٣ ) . ( لەمەودوا : «چاپەمەنی وڵاتانی دەرەوە » ) .

ئەمەش ، وەك یەکێك لە شارەزاکان باسی دەکا ، لە فرۆشـتنی جگەرە یـا گوێزانی تەراش یا پاکەتە بنێشت زیاترە • بەپێی قسەی هەمـان شـارەزا حەفتەی ١٨ ملیۆن دۆلار (واتە سـالی ٩٠٠ ملیۆن[٢٩] ) بـۆ کڕینی ئـەو رۆژنامانە خەرج‌دەکرێ[٣٠] • هەر لە ولاتـە یەکگرتووەکانی ئەمـەریکا دەوروبەری ٥٠٠ر١٢ گۆڤاری هەمەچەشنە بلاو دەبێتەوە کە نزیکەی ٣٠٠یان گۆڤاری گشتین و ٥٠٠ر١یان بۆ کاروباری ئایینی و ٠٠٠ر٢یان بۆ بازرگانی و ٥٠٠ر٨یـان بۆ پیشەسـازیی تەرخـان کراون[٣١] • تەنهـا لە گۆڤـاری (( The Reader's Digest ))[٣٢] ٢٠ ملیۆن دانە لە هەر ژمارەیەکی چـاپ دەکرێ و بەلای کەمەوە ٨٠ ملیۆن کەس دەیخوێندنەوە[٣٣] • دیسان لـە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نزیکەی هەزار گۆڤار و رۆژنامە بە زمـانی بێگانە چاپ دەکرێ ، لەمانە دەوروبەری صەدیان رۆژنامەی رۆژانەن[٣٤] •

ئینگلیزەکان لە ئەمەریکاییەکان زیاتر عەودالی گۆڤار و رۆژنامەن • هەر ئینگلیزێك نزیکەی دوو ئەوەندەی ئەمەریکاییـەك و سـێ ئەوەنـدەی فەرەنسەیەك رۆژنامە دەکڕێ • هەر ٢٤ سەعات جارێك ٣٠ ملیۆن رۆژنامە دەکەوێتە بـازاڕەکانی ئینگیلتەرەوە • سـەرەڕای ئەوە ٤٠٨٨ گۆڤـاری جۆربەجۆر و نزیکەی ١٠٥٠ رابەر و سالنامە و بەرهەمی رۆژنامەنووسیتری

---

(٢٩) دوور نییە ئیستە ئەو ژمارەیە لە ملیار تێپەڕبێ •

(٣٠) بڕوانە :

F. W. Rucker and A. L. Williams, Newspaper — Organization and Management, Third Reprinting, Iowa, U.S.A., 1961, P. 3.

(٣١) بڕوانە :

(( Journalism Tomorrow )), P. 53.

(٣٢) بە عەرەبی بە ناوی «المختار»ەوە دەردەچێ •

(٣٣) بڕوانە :

(( Journalism Tomorrow )), P. 53.

(٣٤) بڕوانە : الدکتور ابراهیم عبده ، الصحافة في الولایات المتحدة . نشاتهـا وتطورها ، القاهرة ، ١٩٦١ ، ص ٣٠٤ .

لەو بابەتە لە ئینگیلتەرە چـاپ دەکرێ [٣٥] •

لە سۆڤیەت هەمۆ سەر لە بەیانییەك تەنها لە رۆژنامەی «ئیزڤێستیا» پتر لە ٨ ملیۆن و لە «پراڤدا» ٩ ملیۆن دانە و هەمۆ سەری مانگێك ١٠ ملیۆن لە گۆڤاری «زدەرۆڤیا» (تەندروستێ) [٣٦] دەفرۆشرێ • لە هەمۆ کۆمارەکانی سۆڤیەت بە روسی و زمانی نەتەوەیێ خۆیان رۆژێ هەزارەهـا رۆژنـامەی جیاواز چاپ دەکرێ • تەنها لە کۆماری ئوکراینا سالی ١٩٧٠ هەمۆ رۆژێك ١٣٤١ رۆژنامە چاپ دەکرا کە ٩٣٦یان بە زمانی ئۆکراینی و ئەوانیتری بـە رۆسی و زمانیتر بۆن • سالی ١٩١٣ هەر صـەدکەسی رۆسـیا ١ر٢ دانـە رۆژنامەیان بەردەکەوت ، ئەم ژمارەیە سالی ١٩٤٠ بووە ٨ر١٩و سالی ١٩٧٠ گەیشتە ٥٨ دانـە •

ئەم خشتـەیەی خوارەوە پوختـەی بـاری رۆژنامـەنوسێ ولاتـە پێشکەوتووەکانمان دەخاتە بەرچاو :

| ولات | سـال | هەر هەزارکەس لە رۆژێکدا چەند رۆژنامەیان بۆ چاپ دەکرێ |
|---|---|---|
| یۆغۆسلاڤیا | ١٩٦٩ | ٧٩ |
| ئیتالیـا | ١٩٦٧ | ٩٥ |
| رۆمانیـا | ١٩٦٩ | ١٧١ |
| بەلغاریـا | ١٩٦٨ | ٢١٤ |
| هەنغاریـا | ١٩٦٩ | ٢٢٧ |
| فەرەنسـا | ١٩٦٧ | ٢٥٣ |
| چیکۆسلۆڤاکیا | ١٩٦٨ | ٢٧٠ |
| ولاتە یەکگرتووەکانی | | |

(٣٥) بڕوانە : «چاپەمەنێ ولاتانی دەرەوە» ، ل ١٨ .
(٣٦) ئەوی زۆ دانەیەك لەم گۆڤارە بۆ خۆی تۆمار نەکا ئیتر دەستی ناکەوێ .

| | | |
|---|---|---|
| ئەمەریکا | ١٩٦٩ | ٣٠٥ |
| ئەڵەمانیای فیدراڵی | ١٩٦٩ | ٤٠٠ |
| ئەڵەمانیای دیموکرات | ١٩٦٩ | ٤٠٣ |
| بەریتانیــا | ١٩٦٦ | ٤٨٨ |
| سویسرە | ١٩٦٨ | ٥١٨ |
| یەکیەتی سۆڤیەت | ١٩٧٠ | ٥٨٠ |

بایەخی بێئەندازەی رۆژنامەنوسی لە ژیانی خەڵــکدا و دەوری لــە هاندان و بزواندنیاندا هەمیشە کارێکیوای کردووە دیکتاتۆر و داگیرکەر و چەوسێنەر بە چاوی ترسەوە سەیری رۆژنامەی خاوێن و نیشتمانپەروەر و رۆژنامەنوسی خۆنەفرۆش بکەن • هەمو کاربەدەستێك ناچارە کەم و زۆر حیساب بۆ رەخنەی رۆژنامە بکات • هەیانە دەرس لەو رەخنەیە وەردەگرن و بۆ هەڵبژاردنی رێگەی راست کەڵکی لێ دەبینن ، هەشیانە پەنا دەبەنە بــەر زەبر و زۆر بۆ دەمکوتکردنی ئەوانەی دەیــانەوێ پــەردە لە روی کاری چەوت هەڵماڵن و ئافەرینی کاری راست بکەن • مێژوی ئادەمیزاد لە کۆنەوە تا ئیستە پڕە لە نمونەی سەیری ئەم راستیەیە • هەرچەنــدە ئەو «روداوی رۆژانــە»یەی بــاسمان کرد بە فەرمــانی یولیــۆس قەیســەر و لەژێــر سەرپەرشتی خۆیدا لەدایك‌بو کەچی لەگەڵ ئەوەشدا چ خۆی و چ ئەوانەی دوای ئەو هاتنە سەر تەخت بە وردی سەرپەرشتیــان دەکرد و رێــگەی بڵاوبونەوەی هیچ باسێکیان نەدەدا کە دەقــاودەق لەگەڵ بــیر و رێبــازی خۆیاندا نەگونجێ • داگیرکەرە ئینگلیزەکان نەیاندەهێشت ئەمەریکاییەکان بە ئارەزوی خۆیان کاغەز دروست‌بکەن و گەلێك کوسپیان دەخستە بەردەم هێنــانی کاغەز و مەرەکەب و دامودەزگای چاپ لە دەرەوەی وڵاتەوە • لە حاکمی ڤێرجینیا دەگێڕنەوە گوایە گەرم لە خوا پاڕاوەتەوە لە نیعمەتی ( ! )

بێ‌چاپخانەیێ خۆی و خەڵکی ناوچەکەی (!) بێ‌بەش نەکا [٣٧] • ئینگلیزەکان ئەو کارەیان بۆ خۆیان لە عەقڵەوە بو • بۆنمونە یەکێك لە کێشـە هـەرە گەورەکانی رۆژنامەنوسێ لە رۆژانی شـۆرشی گەلی ئەمەریکیـدا کەمی کاغەز بو [٣٨] • هەر ئەو کۆسپانەش بونە هۆی ئەوەی دامەزراندنی یەکەم رۆژنامە لە ئەمەریکای دەوڵەمەندا زۆر دوای ئەوروپا بـکەوێ • یـەکەم رۆژنامەی ئەمەریکایێ رۆژی ٢٥ی ئەیلولی ساڵی ١٦٩٠ لە چاپخانە دەرچو ، بەڵام ئەم ژمارەیە تاقانە مایەوە و بنیامین هاریسی خاوەنی پاش چەند رۆژێك لە دەرچونی بووە «میوان»ی کاربەدەستە ئینگلیزەکان لە بەندیخانەی شاری بۆسـتن [٣٩] •

لەگەڵ زیاتر وریابونەوەی خەڵك و پەرەسەندنی بایەخی رۆژنامەنوسێ ترسی دەسەڵات پەرستان لە چاپەمەنێ ئەوەنـدەی تر بەهێـز بو • چەنـد نمونەیەکی کەمی رابوردوی نزیك بەسە بۆ ساغ‌کردنەوەی ئەم راستی‌یە : دوای کوژاندنەوەی شۆرشی ئیسپانیا فرانـکۆ ژمـارەیەکی بێ‌شـومار رۆژنامەنوسی لە بەندیخانەکان توند کرد و فەرمـانی دەرکرد بۆ خنکاندنی تەنها ٠٠٠ چل کەسیان [٤٠]• دوای کۆدێتای راستڕەوی پورتوگال (٢٨ی مایـسی ١٩٢٦) یەکێك لـەو بڕیارانە رژێمی نوێ یەکـسەر دەری‌کردن یاسەیەکی زۆر دواکەوتوی چاپەمەنێ بو (٢٩ی گەلاوێژی هەمان‌ساڵ ) کە فشارێکی زۆری خستە سەر رۆژنامـەنوسێ و تـا ئەم چەنـدانەی دوایێ بێ‌دەستکارێ وەك خۆی لە کاردا بو [٤١] •

---

(٣٧) بڕوانە : د. ابراهیم عبدە ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٠ .

(٣٨) بڕوانە : Th. E. Berry, Op. Cit., PP. 1 — 2, 10 — 12 .

(٣٩) Ibid , P. 2.

(٤٠) بڕوانە :
(( The Press in Authoritarian Countries )), Published by The International Press Institnte , Zurich, 1959, P. 139.

(٤١) Ibid, PP. 155 — 156.

له زۆر ولاتی ئەمەریکای لاتینی شتێك نەماوە بۆنی ئازادیی رۆژنامەنوسیی لێ بێت • ساڵی ١٩٥٨ لە هەموو پەرەگوای تەنها چوار رۆژنامە هەبو کە بە هەر چواریان ٤٥ هەزار دانەیان بۆ ملیۆن و نیوێك بەشەر چاپ دەکرد [٤٢] • لەو ولاتە تەنانەت رۆژنامەنوسە بێگانەکانیش مافی ئەوەیان نی یە هیچ هەواڵێك بە دەرەوە بگەیێنن بەر لە وەرگرتنی رەزامەندیی دەزگای تایبەتیی راگەیاندن • لە پەرەگوای تاقە رۆژنامەیەکی سەربەخۆ هەیە [٤٣] ، واتە هی میریی خۆی نی یە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش کە ناحەزی کاربەدەستان نی یە ئینجا بۆ ماوەی پازدە ساڵی رەبەق رێگەی پێ نەدرا لە هیچ ژمارەیەکیدا سەروتار بڵاو بکاتەوە• نموونەی لەوەش خراپتر هەیە: رۆژنامەی( El Orden ) کە ژمارەیەك رۆژنامەنوسی سەر بە میریی بڵاویان دەکردەوە پاش ٢٦ رۆژ لە دەرچونی قەدەغە کرا چونکە تۆزێك لە رۆژنامەکانیتر کەمتر کۆنەپەرست بو [٤٤] •

له دۆمینیکان لە ماوەی فەرمانڕەوایی ترۆجیلۆدا خۆی دوو رۆژنامەی دەردەکرد ، یەکەمیان (( La Gazette )) کە ساڵی ١٩٤٠ دایمەزراند و ئەویتریان (( El Caribe )) کە دوای ٨ ساڵ دایمەزراند • ئەم دوو رۆژنامەیە ٦١ هەزار دانەیان چاپ دەکرد و بە هەموو رۆژنامەکانیتریش کە هیچیان تلیی تەزی دیموکراسییان تێدا نەبو کەمتر لە ١٤ هەزاریان چاپ دەکرد [٤٥] •

له ولاتانی ئەوروپای رۆژئاوا سەربەستی چاپەمەنیی پارێزراوە و مرۆڤ توانای تەواوی رەخنەگرتنی هەیە • بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆژنامە ناپارەکانی

---

(٤٢) واتە رۆژی ٣٠ دانە بۆ هەزار کەس . بۆئەوەی رادەی نزمیی ئەو ژمارەیە تێبگەین دەبێ لەگەڵ ئەو ژمارانەدا بەراوردی بکەین کە لە خشتەی پێشودا نیشانمان داون و دەشبێ ئەوە لە یاد نەکەین کە خوێندەواریی لە ولاتانی ئەمەریکای لاتینی لە زۆر شوێنیتر زیاتر بلاوە .

(٤٣) ناوی (( La Tribunna ))

(٤٤) بڕوانە : (( The Press in Authoritarian Countries )), P. 169.

(٤٥) Ibid, P. 171.

میرێ لە عەزیەت‌دان و بیانو پێ‌گرتن بەتەواوەتی رزگاریان نەبووە • هەر بۆ نموونە رۆژنامەی «یومانیتێ»ی پاریسێ لە ماوەی ٨ سالدا (١٩٥٠ ــ ١٩٥٨) تەنها ٢١٤ جار دراوە بە دادگا [٤٦] •

لێرەدا جێی خۆیەتی چەند روویەکی تایبەتێ رۆژنامەنوسێ جیهانی سەرمایەدار بخەینە بەرچاو • لە رۆژانی شۆرش و راپەرین و ئـاڵوگۆرە بۆرجوازی‌یە گرنگەکاندا زوربەی هەرە زۆری چاپەمەنێ ئەو ولاتانە دەوری پێشکەوتویان دەبینی بەوەی بوبونە هێزێکی بزوێنەری گەورەی رەوڕەوەی مێژو • بـەڵام دوای وەرگرتنی دەسـەڵات و پەرەسـەندنی پەیوەنـدێ سەرمایەدارێ و دەست پێ‌کردنی چەوساندنەوەی کۆلۆنیالی زوربەی ئەو رۆژنامانەش وەك زۆر روی‌تری ژیانی روناکبیرێ و کۆمەلایەتێ ولات کەوتنە سەر بارێکی نوێ • بەپێی یاسـای نەگۆڕاوی سـەرمایەدارێ «مـاسی‌یە گەورەکان دەستیان کردە خواردنی مـاسی‌یە پچـوکەکان » • لە ولاتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کار گەیشت بەوەی سەرتاپای هۆکانی راگەیاندن کەوتنە دەست ژمارەیەك ترێستی دەسەلاتدارەوە کە خاوەنەکانیان لە ریزی پێشەوەی سەرمایەدارە گەورەکانی ئەو ولاتەن • بە وێنـە ئەو پارەیـەی یەکێك لەو دەزگایانە بۆ کاری رۆژنامەنوسێ هەمو سالێك دەیخاتە گەڕ ٢٥٠ ملیۆن دۆلارە [٤٧] • لە ولاتێکی بچوکی وەك بەلچیکا دەوروبەری کۆتایێ سەدەی نۆزدە ٩٢ رۆژنامەی رۆژانە دەردەچو ، سالی ١٩٢٧ ئەو ژمارەیە هاتە سـەر ٧٦ و سـالی ١٩٣٩ بووە ٦٥ و سالی ١٩٦١ هاتە سەر ٥٤ رۆژنامە کە بەسەر یەکەوە رۆژی ٣ر٢ ملیۆن دانە چاپ دەکەن [٤٨] • هـەر بەوجۆرەش دامەزراندنی رۆژنامەیەکی نوێ لە ولاتە سەمایەدارەکانـدا بۆتـە کارێکی

---

(٤٦) « چاپەمەنێ ولاتانی دەرەوە » ، ل ١٧٢ .

(٤٧) بڕوانە : «رابەری رۆژنامەنوس» ، ل ٧٥٢ .

(٤٨) بڕوانە : « چاپەمەنێ ولاتانی دەرەوە » ، ل ٩ .

ئەوتۆ بە خەڵك و دەزگای پارەداریّ زۆر نەبیّ هەڵنەسورێ • بەپێی قسەی شارەزایان لە چلەکاندا ، نەك ئیستا ، دامەزراندنی رۆژنامەیەکی نویّ لە ئینگیلتەرە بە لای کەمەوە پێویستیّ بە ۲ ملیۆن پاوەن هەبوّ ، ئەویش تەنها بۆ دەست پیّ کردنی کار [٤٩] • ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا دەبو خێرا بکەوێتە گەڕ و پەرە بسێنیّ بەرلەوەی قوت بدریّ •

لە روی ناوەرۆکیشەوە رۆژنامە و گۆڤارە بۆرجوازی‌یەکان زۆر گۆڕاون • ئیستە گەلێك لە جاران کەمتر بایەخ بە سیاسەت دەدەن • جاران بەرهەمی بیری شکسپیر و ڤۆلتێر و رۆسۆ و کەسانیتری وەك ئەوان شوێنی دیاریان لەسەر لاپەڕەکانی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانە هەبوّ ، ئیستەش باسی دیوەخان و جل و بەرگ و مێزی قومار و ژمارەی دۆست و تاولەی ولاّخی خوا پێداوەکان جێگەی ئەوانیان گرتوّتەوە • بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی ٦٠٪ی ئەو هەواڵانەی یەکێك لە رۆژنامەکانی شاری دیترویتی ئەمەریکایی لەسەر لاپەڕە یەکی بلاّوی کردوّنەوە بریتی بوە لەباسی جەردەیی و خراپەکاریّ [٥٠] • چ لە ئەوروپای رۆژئاوا و چ لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەو جۆرە رۆژنامانەی هەر لەویّ کاتی خۆیّ ناوی « رۆژنامەی زەرد »یان بۆ هەڵبژێرراوە [٥١] گەلێك زیاتر لەو رۆژنامانەی ئەو رێگەیەیان

---

(٤٩) K. Martin, The Press the Public wants, London, 1947, P. 32.
لەم سەرچاوەیەدا گەلێك زانیاری و بەڵگەی پڕمانا دەربارەی ئیحتیکاری کاری رۆژنامەنوسیّ هەیە ( Ibid, PP. 33 — 55 ) •

(٥٠) بڕوانە : الدکتور حسين عبدالقادر ، الصحافة کمصدر للتأریخ ، الطبعة الثانية ، القاهرة ، ١٩٦٠ ، ص ١٢٩ •

(٥١) ئەو رۆژنامانەی رێبازێکی تایبەتی‌یان نی‌یە و هەر بەدوای قازانجدا دەگەڕێن ئەگەرچی لەسەر حیسابی ناو و شەرەفی خەڵکیش بیّ پێیان دەڵێن « رۆژنامەی زەرد » . ئەم ناوە بۆ یەکەم جار لە ئەمەریکا لە کۆتایی سەدەی رابوردودا بۆ ئەم مانایە بەکار هێنرا . ساڵی ١٨٩٥ لە یەك کاتدا دوّ رۆژنامەی نیۆیۆرك World لەگەڵ New York Journal لەسەر لاپەڕەی یەکەمیان وێنەی منداڵێکی کراس‌زەردیان بلاّوکردبۆوە =

نەگرتۆتەبەر لەبرەودان • هەر بۆنمونە رۆژنامەیەکی کۆنی بەناوبانگی وەك «تایمس»ی ئینگلیزیێ رۆژی ٣٠٠ هەزار و «نیۆیۆرك تایمس»ی ئەمەریکی ٧٠٠ هەزار و «مۆنـد»ی فەرەنسی ٤٠٠ هەزار دانەیان لیێ چاپدەکریێ ، کەچی «رۆژنامەی زەرد»یِ وا هەیە رۆژی ٥ ملیۆنی لیێ دەکەوێتە بازارەوە •

بەشی زۆری داهاتی رۆژنامە رۆژئاواییەکان لە پارەی ئیعلانەوە دێت • دەزگا سەرمایەدارەکانی ئەمەریکا سالی نەك چەند ملیۆنێك یا چەند ملیارێك بەلکو چەند بلیۆنێك دۆلار تەنها بۆ پرۆپاگەندە و ئیعلان خەرج دەکەن[٥٢] • لە ولاتێکی کەم گەشە کردوی وەك یۆنان پارەی ئیعلان ٥٠٪ تا ٦٠٪ی گشت داهاتی چەند رۆژنامەیەکی ناودار پێکدەهێنێت • ٦٠٪ی پوختەی داهاتی بێشوماری رۆژنامەی «فرانس سوار»ی پاریسی لە پارەی ئیعلانەوەیە[٥٣] • هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە رۆژنامە رۆژئاواییەکان بە بارست زۆر گەورەن • زۆریان ٤٠٪ و هەندێکیان ٧٠٪ی لاپەڕەکانیان بۆ ئیعلان تەرخان دەکەن • رۆژانی یەك شەموان لاپەڕەی ژمارەیەك لە رۆژنامە ئەمەریکاییەکان دەگاتە ٢٠٠ لاپەڕە و هەندە جارێکیش خۆی دەدا لە ٤٠٠ ــ ٤٥٠ لاپەڕە کە نزیکەی ٧٥ ــ ٨٠٪یان بۆ ئیعلان تەرخان

---

= کە بە توانجەوە باسی خەلکی ناوداری دەکرد بەنیازی لەکەدار کردنیان . لەسەر یەکەمیێ ئەو «شەرەفە» بەرزە هەردو رۆژنامە کەوتنە دۆبەرەکییەکی زۆر توند و تیژ . لەمکاتەدا سەرنوسەری رۆژنامەی (( New York Press ))ناوی «زەرد»ی بەسەر ئەو دوێ رۆژنامەیەدا ، کە لەسەر کراس زەرد شەڕیان بو ، داسەپاند . لەوکاتەوە «رۆژنامە یا چاپەمەنیێ زەرد» بۆنە دوێ زاراوەی بلاو کە وەك ناتۆرە بۆ ئەو چاپەمەنییانە بەکاردەهێنرێن کە لە نوسیندا پەیڕەویێ رەوشت ناکەن .

(٥٢) بڕوانە : F. W. Rucker and H. L. Williams, Op. Cit., P. 6 .
بەپێی هەندێك سەرچاوە ئەو پارەیە سالی ١٩٤١ خۆی لە ٢ بلیۆن دۆلار و سالی ١٩٦١ خۆی لە ٥ بلیۆن داوە ( بڕوانە : د. ابراهیم عبده ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٠٦ ) .

(٥٣) «چاپەمەنیێ ولاتانی دەرەوە» ، ل ٤٩ ، ١٧٠ .

دەکرێ [٥٤] .

کار و هونەری دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤار بێوچان لە پێشکەوتن و بەرزبونەوەدایە . هەرچەندە مەکینەی ئۆتۆماتیك و کەمپیوتەر بەخێرایی جێگەی کاری ئینسان دەگرنەوە ، بەڵام دەرکردنی رۆژنامەیەکی بەناوبانگ هێشتا پێویستی بە صەدان و هەزاران نوسەر و بەڕێوەبەر و کارگەر هەیە . یەکێك لە رۆژنامە ناودارەکانی ژاپۆن نیازێتی هەمو رۆژ بە تەلەڤیزیۆنی تایبەتی لاپەڕەکانی بگەیێنێتە ماڵان تەنها بۆئەوەی لە گێرمە و کێشەی دابەش کردن و قەڵەبالغی تۆکیۆ خۆی قوتار بکات .

ئەو راستییانەی بەکورتی باسمان کردن بایەخ و باری رۆژنامەنوسی دەخەنە پێش چاو . گەلی کوردیش لەم دەریا پان و بەرینە بێبنەی رۆژنامەنوسیدا قەترە ئاوێکی هەیە ، بەڵام مێژوی ئەو قەترەیە بۆ خۆی دەریایەکە . لە لاپەڕەکانی بەشی داهاتوی ئەم کتێبەدا هەوڵدەدەین بەپێی توانا چەند روێەکی ئەم باسە بخەینە بەرچاو تاوەکو باشتر لە زروفی دەرچونی « تێگەیشتنی راستی » بگەیین .



(٥٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٢٧ .

# بەشی دووەم

## چمکێك لە مێژوی رۆژنامەنوسی کوردی

سەرەتای پەیدابونی رۆژنامەنوسی هەمو گەلێك مێژوی تایبەتی خۆی هەیە ٠ ئەو مێژووە بەستراوە بە گەلێك هۆی جیاوازەوە ، بۆیەکا رونکردنەوەی پێویستی بە رونکردنەوەی زۆر لایەنی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی‌یە ٠ بەنیسبەت پەیدابونی رۆژنامەنوسی کوردی‌یەوە جگە لە مەرجەکانی ناوەوەی کۆمەل چەند هۆیەکی دەرەوە دەوری زۆریان تیا بینیوە٠ یەکێك لەو هۆیانە بریتی‌یە لە پەیدابونی رۆژنامەنوسی و پەرەسەندنی دەوری لە ژیانی روناکبیری و سیاسی گەلانی دراوسێی کوردا ٠

وەك لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان‌کرد زۆر بەسەر دۆزینەوەی مەکینەی چاپدا تێنەپەڕی کە ئەوروپایێکان پیتی عەرەبیشیان داڕشت ٠ بەلام ماوەیەکی زۆری دەویست بەرلەوەی چاپخانەی نوێ و پیتی عەرەبی بگەنە ولاتە موسلمانەکان ٠ راستە لە کۆتایی سەدەی پازدەوە چاپ و چاپەمەنی نوێ گەیشتە ولاتی عوسمانی ، بەلام نە ئەمیان و نە ئەویان بە تورکی و عەرەبی نەبون ٠ یەکەم دەزگای چاپ ئەو جولەکانە هێنایانە تورکیاوە کە لەدەست زۆرداری فەرمانڕەوایانی ئیسپانیا پەنایان هێنایە بەر ولاتی عوسمانی٠ ئەمانە سالی ١٤٩٤ یەکەم چاپخانەیان لە هەمو ئیمپراتۆری عوسمانیدا لە

ئەستەمۆڵ دامەزراند ، بەڵام تەنها دەوروبەری بیست ساڵێك ژیا [1] • دوا بەدوای ژمارەیە چاپخانەی‌تری وەك ئەو دامەزرێنرا كە هەنـدێكیان بـەر شاری‌تریش كەوتن •

ئەرمەنەكانیش زۆ هاتنە مەیدانی چاپ و چاپەمەنی‌یەوە • ساڵی ١٥٦٥ یەكەم چاپخانەی ئەرمەنی لە ئەستەمۆڵ كەوتە كار [2] • سـاڵی ١٧٧٣ لـە ئیچمادزینی نزیك یەریڤان ، واتە لەنـاو ئەرمینیا خۆیدا ، چاپخانـەیەكی سەربەخۆ بە پیتی تایبەتی ئەرمەنی دامەزرێنرا • زۆری نەخـایاند چەنـد كتێبێكی ئەرمەنی ئایینی و زانستی بە چاپكراوی كەوتنە بازاڕەوە • دوای ئەرمەن یۆنانی‌یەكان سەرەتای سەدەی حەڤدە چاپخانەی سەربەخۆی خۆیانیان لە ئەستەمۆڵ دامەزراند •

چاپ بە زمانی گەلە موسڵمانەكانی ناو دەوڵەتی عوسمانی زۆر لـەوە دواكەوت • سیاسەتی كوێرانەی سوڵتانەكان و دواكەوتویی خەڵك لەمـەدا دەوری گەورەیان بینی • وەك دەگێڕنەوە ساڵی ١٤٨٣ سوڵتان بایەزیـدی دووەم فەرمانێكی بۆ قەدەغە كردنی چاپ دەركرد و خنكاندنی كردە سزای ئەوانەی لەو فەرمانەی دەردەچن و گوایە سوڵتان سەلیم یاوزیش ساڵی ١٥١٥ ئەم فەرمانەی دوبارە كردۆتەوە • هەرچەندە ئەم باسە جێی گومانە و هێشتا

---

(1) بڕوانە :

Желтяков А.Д., Начальный этап книгопечатания в Турции,-" Ближний и Средний Восток. История, Культура. Источниковедение", Москва, 1968.

ا. د. ژیۆلتیاكۆف ، سەرەتای چاپكردنی كتێب لە توركیا ، ـ كتێبی «ڕۆژهەڵاتی نزیـك و نـاوەڕاست . مێـژو ، ڕونـاكبیری ، كـاری بیبلیۆگرافی » ، مۆسكۆ ، ١٩٦٨ ، ل ٤٧.

(2) ساڵی ١٥١٢ لە شاری ڤینیسیای ئیتالیا یەكەم كتێب بە زمانی ئەرمەنی چـاپكرا .

بە تەواوەتی ساغ نەبۆتەوە [٣] بەڵام ئەوەندە هەیە بەپێی یاسا رێگەی چاپخانەی کەمینە ئایینی‌یەکان نەدەدرا هیچ بە زمانی تورکی یا عەرەبی چاپ بکەن [٤] . ئەو چاپخانانە خۆیشیان لەگەڵ بەرزبونەوەی هەستی نەتەوەیی لەناو ئەرمەن و یۆنانی‌یەکاندا یەك لەدوای یەك داخران .

کار لەوەش تێپەڕی . سوڵتانەکان چاپکردنی کتێبیان بە کفر دادەنا ، بەتایبەتی کتێبی ئایینی . هەندێك سەرچاوەی تورکی باسی ئەوە دەکەن چۆن سوڵتان محەمەدی چوارەم (١٦٤٨ ــ ١٦٨٧) فەرمانی داوە هەموو ئەو قورئانانەی کابرایەکی ئەوروپایی بە چاپ کراوی لەگەڵ خۆی هێنابونی‌یە ئەستەمۆڵ تورڕ بدرێنە ناو دەریاوە . هەر بە فەرمانی ئەویش ئەو پیتە عەرەبی‌یانەی بە دیاری لە ڤینیسیاوە بۆیان نارد فڕێ دراونەتە دەریاوە [٥] .

لەگەڵ ئەوەش روناکبیرانی وڵاتی عوسمانی زۆ لە بایەخی چاپ گەیشتن . سەرەتای سەدەی حەڤدە ژمارەیەکیان ویستیان چاپخانە لە دەرەوەی وڵاتەوە بهێنن . جێبەجێ کردنی ئەم ویستە لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کردن[٦] کارێکی ئاسان نەبو . دەبو فەرمانڕەوایان چەند جارێك تاڵی ژێرکەوتن لە

---

(٣) تاوەکو ئێستا ئەو دو فەرمانە نەدۆزراونەتەوە ، هەرچەندە فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانی هەر لە سەرەتاوە بایەخی تەواویان دەدا بە پاراستنی هەمو بڕیار و فەرمانێکی میری .

(٤) بڕوانە : ا. د. ژێۆلتیاکۆڤ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٠ .

(٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٥١ .

(٦) فەرمانڕەوا دواکەوتووەکانی دەوڵەتی عوسمانی تەنها لە کتێبی چاپکراو سڵیان نەدەکردەوە . ئەوان لە هەمو کتێبێکی جیهانبینی دەترسان ، جا با دەستنوسیش بوایە . بەڵگەی ئەمە زۆرە . هەروەك نمونە ئەمە دەگێڕینەوە : عەلی پاشای سەدری ئەعزەم کتێبخانەیەکی یەکجار گەورەی هەبو کە تەنها ناوی کتێبەکانی لە چوار بەرگدا نوسرابونەوە . بەر لە مردنی (١٧١٦) کتێبخانەکەی وەقفکرد . بەڵام ( شێخ الاسلام ) رەتی‌کردەوە چونکە دەستنوسی فەلسەفی و زانستی تێدا بو کە بەلای ئەوەوە بریتی بون لە درۆ و دەلەسە .

بەردەمی ئەوروپاییەکاندا بچێژن تا تێ‌بگەن هۆی سەرکەوتنی ئەوان ئەنجامی پێشکەوتنیانە. ئەمــە کارێکی وای کرد وردە وردە دەرگا بۆ دەســکەوتی زانستی «کافرانی رۆژئاوا» بکرێتەوە. بەمجۆرە رێگە بۆ دامەزراندنی چاپی نوێش بە زمانی گەلە موسلمانەکان خۆش بو . رۆژی ٥ی تەموزی ســالی ١٧٢٧ سولتان ئەحمەدی سێیەم بەپێی فەرمانێکی تایبەتی رێگەی دامەزراندنی چاپخانەی دا بە کابرایەك کە ناوی مستەفا موتەفەرریق بو ، بەلام مەرجی بۆ دانا کە هیچ جۆرە بەرهەمێکی ئایینی وەك قورئان و تەفسیر و حەدیس و ئەو بابەتانە قەت چاپ نەکات . سەیر ئەوەیە لەم قۆناغەدا خۆشنوســەکان دژی چاپ وەستان و وەك نیشانەی ناڕەزایی بەرامبەر رێــگەدانی دامــەزراندنی چاپخانە قەلەم و دوێتەکانیان خستە دارە مەیتێکەوە و بە شاردا گێڕایان [٧].
لەگەل هەمو ئەمانەش لە کۆتایی نیوەی یەکەمی ســەدەی هــەژدەوە کاری چاپەمەنی نوێ هەنگاوی بــاشی لە ولاتی عوســمانی بەرەو پێشەوە نــاو ئەوەش سەرەتایەکی پێویست بو بۆ پەیدابونی رۆژنامە و رۆژنامەنوســی لەو ولاتەدا .

رۆژنامەش وەك کتێب سەرەتا لەناو کەمینە ئایینی‌یەکانی ئیمپراتۆری عوسمانیدا پەیدا بو . ئەرمەنەکان زۆر زو رۆژنامەی نەتەوەیی خۆیانیــان دامەزراند [٨] . بەلام یەکەم رۆژنامە لە خاکی عوسمانی خۆیدا سالی ١٨٢٥ لە شاری ئەزمیر بە فەرەنسەیی دەرچو . دوای ئەوە بە دەوروبەری حەوت سال (١٨٣٢) یەکەم رۆژنامە بە ناوی «تەقویمی وەقایع»ەوە بە زمانی تورکی

---

(٧) ا. د. ژیۆلتیاکۆف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٦ ــ ٥٧ .

(٨) نوسەری ئەرمەنی دوکتۆر ئەستارجیان بە شانازی‌یەوە بــاسی ئەوە دەکا کە ئەرمەن دەهەم گەلی جیهــانن رۆژنــامە و گۆڤــاری خۆیــان دامەزراندوە و لەوەدا پێش تورك و ئەمەریکاییەکان کەوتون ( بڕوانە : الدکتور ك. استارجیان ، تاریخ الثقافه والادب الارمنی ، الموصــل ، ١٩٥٤ ، ص ١٣١) . یەکەم گۆڤار بە زمانی ئەرمەنی لە مەدراس بە ناوی «ئازدارار»ەوە سالی ١٧٩٤ ــ ١٧٩٦ چاپ‌کرا .

چاپ کرا • ئەمە بووە سەرەتایەکی گرنگ بۆ مێژوی ڕۆژنامەنوسی گەلانی ناو دەوڵەتی عوسمانی • چل سالی نەخایاند کە ژمارەی ڕۆژنامە و گۆڤاری ئەم گەلانە گەیشتە ٤٧ ، لەمانە ١٣یان بە تورکی و ئەوانیتریان بە یۆنانی و ئەرمەنی و عەرەبی و بەلغاری و فەرەنسی و چەند زمانێکیتر بون [٩] • ڕۆژنامەی تورکی وەك «ترجمان احوال» و «تصور افكار» و هیتر بەناو خوێندەواری کوردیشدا بلاوەبونەوە • لە ئێرانیش ساڵی ١٨٥١ یەکەم ڕۆژنامەی فارسی کەوتە دەست خوێندەواران و تا سەرەتای سەدەی بیست ڕۆژنامەنوسی ئەم ولاتە گەیشتە پلەیەك شوێنی دیاری لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەلدا هەبێ [١٠] •

جێگەی ڕۆژنامەنوسی لە ژیانی ڕوناکبیری و تایبەت سیاسی ئەم گەلانەدا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەبو • ناحەزانی عوسمانی و قاجاری چاپەمەنیيان کردە چەکی کاریگەری خەباتی سیاسی ڕۆژانەیان • وەك دواییش بە درێژی

---

(٩) بڕوانە :

Новичев А.Д., Турция. Краткая история, Москва, 1965.

ا. د. نۆڤیچێڤ ، تورکیا . کورتەی مێژوی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١٣٣ .

(١٠) بڕوانە :

J. M. Upton, The history of Modern Iran. An itroduction, Fourth Printing, Massachusetts, 1968, P. 11.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ساڵی ١٨٥١ ناصرەددین شا یەکەم ڕۆژنامەی بە زمانی فارسی بلاوکردەوە ، بەلام هەندێ سەرچاوە ساڵی ١٨٣٨یان بە سەرەتای دەستپێکردنی ڕۆژنامەنوسی فارسی داناوە ( بڕوانە : احمد عبدالكريم ، الصحافه الايرانيه ، بغداد ، ١٩٧٢ ، ص ٧ ) .

باسی دەکەین « عوسمانیـــانی نویێ » [١١] و دوا بەدوای ئـــەوان تورکانی لاو [١٢] ژمارەیەکی زۆر رۆژنـــامە و گۆڤاریان لەنـــاوەوە و دەرەوەی ولاّت دامەزراند • شۆڕشگێرانی ئێران سەرەتای شۆڕشی دەستوری (١٩٠٥ ــ ١٩١١) نزیکەی ١٥٠ رۆژنامە و گۆڤاری هـــەمەجۆریان دامـــەزراند کە هێ وایان تێدا بو لەوکاتە زووەدا ٥ تا ١٠ هەزار دانەی چاپ دەکرد [١٣] • تـــا دەهات سەنگی رۆژنامە و رۆژنامەنوسێ لەناو عەرەب و ئەرمەندا قورستر دەبـــو •

بێ گومان ئەمانە هەمو لە ژیانی رونـــاکبیری و سیـــاسێ گەلی کوردا رەنگیان دایەوە و بۆنە هۆیەکی هاندەری گرنگ بۆ خوێندەوارە دوربینەکانی کە ئەوانیش بیر لە دامەزراندنی رۆژنامەی تایبـــەتی خۆیـــان بکەنـــەوە • عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری کە یەکێـــکە لە پێشـــڕەوانی رۆژنـــامەنوسێ کوردێ کاتی خۆی لەمبارەیەوە نوسیویە دەڵێ : ئێمە دەبینین چۆن «خەباتاوان (مەبەستی ئەرمەنە ــ ک• م•) بەشەو و رۆژ مرۆڤ لێ حـــەیران دەبێ ــ

---

(١١) «عوسمانی‌یە نوێکان» یا «عوسمانیانی نوێ» (العثمانیون الجدد) ناوی رێکخراوێکی نیشتمانی‌یە کە ساڵی ١٨٦٥ دەستەیە پیـــاوی سیـــاسێ تورکیا بەنهێنی دایانمەزراند بۆ خەباتکردن لەپێنـــاوی دامـــەزراندنی رژێمێکی دەستوریدا .

(١٢) رەنگبێ «تورکانی لاو» لە «تورکە لاوەکان» بۆ مانای (الاتراك الفتیـــان) زیـــاتر دەست بـــدا .

(١٣) بڕوانە :

Иванов М.С., Очерк истории Ирана, Москва, 1952.

م. س. ئیڤانۆف ، کورتەی مێژوی ئێران ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ ، ل ٢١٢ ــ ٢١٣ .

هەر رۆژێ غەزەتەکی ، هەر رۆژێ مجمـوعەکی ، هـەر رۆژە کتێبـەکی دەریدەخەن » [١٤] .

لەگەڵ ئەوەش کاری رۆژنامەنوسێ لەناو کوردا زۆر درەنـگتر لـە گەلانی دراوسێی پەیدابو . دواکەوتویێ و بەتایبـەتی لاوازێ دەسـتەی ئینتیلیجێنسیا [١٥] یەکەم هۆی ئەمە بو . هەر بۆنمونـە رۆژانی شـۆڕشی دەستورێ ئێران پیاوە سیاسی‌یەکانی کوردیش دەیانتوانی وەك ئازەری‌یەکان بێ‌کۆسپ رۆژنامەی خۆیان دەرکەن . کەچی وادیارە کەسێکیان بیریـان لە کارێکی‌وا پێویست نەکردۆتەوە هەرچەندە هەزاران رۆڵەی کورد لـەو شۆڕشە گەورەیەدا بەشدار بون [١٦] .

بۆ پەیدابونی رۆژنامەنوسێ کوردێ دەبو خوێنـدەوارێ وەك رۆی هەرە گرنگی ژیانی روناکبیرێ و دروستبون و پەرە سـەندنی دەسـتەی ئینتیلیجێنسیا وەك دیاردەیـەکی زۆر گرنگی ژیـانی کۆمەڵایـەتێ بـگەنە رادەیەکی ئەوتۆ نەبونی چاپەمەنێ نەتـەوەیێ لەگەڵی نەگونجێ . ئـەم دۆ

---

(١٤) بڕوانە گۆڤاری «ژین» ، ئەستەمولّ ، ساڵی یەك ، ژمارە ٨ ، ٩ی کانونی دووەمی ١٣٣٥ ، ل ١٦ ــ ١٧ .
ئەم گۆڤارە دوای شەڕی یەکەمی جیهان لە ئەستەمولّ لە چاپخانەی «نجم استقبال» بە کوردی و تورکی چاپ دەکرا . خـاوەن ئیمتیـاز و لێپرسراوی ئەشرەف حەمـزە و دوای ئـەو مەمـدوح سـەلیم بو . عەبدولرەحیم رەحمێ هەکاریێ ئەندامی دەستەی نوسەرانی بو . لەژێر ناوی گۆڤارەکە نـوسراوە : «دین ، ئەدەبیـات ، اجتمـاعیات و اقتصادیاتدن بحث ایدر تورکجـە ــ کوردجـە مجموعـەدر » . ئـەو سەرچاوانەی «ژین»یان بە رۆژنامە داناوە هەڵەن .

(١٥) ئینتیلیجێنسیا (یا ئینتیلیگینسیا) لە وشەی ( Intellegence ) ی لاتینی کۆنەوە وەرگیراوە کە مانای زیرەك و دانا و تێگەیشتو دەگەیێنێ . لـە کۆتایێ سەدەی نۆزدەوە بۆتە زاراوێکی کۆمەڵایەتی کە مانای دەستەی خوێندەوار دەگەیێنێ . روناکبیـرانی رۆس یـەکەم کەس بـون ئـەم زاراوەیان بۆ مانای نوێی بەکارهێنا .

(١٦) بڕوانە : م. س. لازەرێف ، کوردستان و کێشەی کورد ، ل ١١٨ .

ئاڵوگۆڕە پێکەوە بەستراوە لەناو کوردا هێواشتر ڕۆیان دەدا وەك لەنـاو زوربەی گەلانی دراوسێی ئەودا • بـەڵام لەگەڵ ئەوەش هـەردوکیان لـە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە بونە روداوێکی هەست پێکراو ، بەرادەیەك بایەخدان بە خوێنـدەواریی بووە یەکێـك لە دروشـمەکانی بزوتنـەوەی ئازادیخوازی کورد • لێرەدا پێویستە سـەرنج بۆ ئـەوەش راکێشـین کە فێرگەی ئایینی لە کوردستان لە دێرزەمانەوە جێگەی شیاو و دیاری بووە و زانا و خوێندەواری باشی پێگەیاندووە • زوربەی ئەو زانایانە لە هەست و خزمەتی نەتەوەیی راست بێبەش نەبون و دەستی باڵایـان لە پێشخسـتنی ژیانی روناکبیریی گەلدا هەبو • حاجی قادر و مەلای گەورە و دەیانیتری وەك ئەوان بەرهەمی پڕشانازیی ئەو فێرگانە بون کە جگە لە باسی ئایینی بایـەخی زۆریان بە ئەدەبی نەتەوەییش دەدا [١٧] •

سەرەڕای ئەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە خوێندن لەسـەر شێوازی نوێ گەیشتە کوردستانیش • بۆنمونە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لە عەقرە ٣٠ قوتابی و لە زاخۆ ٤٠ و لە عەمـادییە ٤٥ و لە رەوانـدزیش ئەوەندە و لە دهۆك ٥٠ و لە کۆیە ١٢٥ و لە سلێمانی بە شارباژێڕەوە ١٤٠ و لە سـەلاحییە ١٥٠ و لـە هـەولێر ١٥٥ قوتـابی لە فێـرگەکانی مـیریی دەیانخوێند [١٨] • دیسان بەر لە کۆتایی سەدەی رابوردو چەند فێرگەیەکی روشدییە (ناوەندیی) لە نـاوچە کوردییەکاندا کرایەوە کە ژمـارەیەکیان فێرگەی ناوەندیی سـەربازیی بون • بە وێنـە سـالی ١٨٩٣ فێرگەیـەکی روشدییەی سەربازیی لە شاری سلێمانی کرایەوە و پاش چەند ساڵێکی کەم

(١٧) دەربارەی مێژوو و بلاویی ئەو جۆرە فێرگانە و شوێنی زانا و بایەخیان بڕوانە : محمد القزلجی ، التعریف بمساجد السلیمانیه ومدارسهـا ، بغداد ، ١٣٥٦ هـ (١٩٣٨ م) •

(١٨) بڕوانە : عبدالرزاق الهلالی ، تاریخ التعلیم في العراق في العهد العثمانی (١٦٣٨ ـ ١٩١٧) ، بغداد ، ١٩٥٩ ، ص ١٧٩ ـ ١٨٠ •

بەشێك لە دەرچوانی تێرانە بەغدا و ئەستەمۆل[19] . بەر لە كەوتنی عوسمانیەكان ژمارەی قوتابیانی ئەم فێرگەیە گەیشتە ١١٠ كەس جگە لە ٧٠ كەسی تر كە لە فێرگەی ناوەندیی مولكی دەیانخوێند[20] .

خوێندن و خوێندەواریی لە شاری گەورەی وەك دیاربەكر زۆر لەوە زیاتر و خێراتر پەرەی سەند . ئاڵوگۆڕە روناكبیریی‌یە گەورەكانی پایتەخت و لە رێگەی ئەوەوە پێشكەوتنی گەلانی رۆژئاوای ئەوروپا زیاتر كاریان كردە سەر دەستەی خوێندەواری نوێی ئەو جۆرە شارانە . لەوەش گرنگتر ئەوە بو كە ژمارەیەكی زۆر لە خوێندەوارانی كورد وەك فەرمانبەر یا قوتابیی دەزگای زانستیی و سەربازیی لە ئەستەمۆل كۆبوبونەوە . هێشتا سەدەی نۆزدە كۆتایی نەهاتبو كە لەناو ئەمانەدا هیی وا هی هەڵكەوت بۆ خوێندن یا كاری دیپلۆماسی رویانكردە ئەوروپاش . دیارە ئەم روداوانە چاوی خوێندەواری كوردیان كردەوە و خستیانە سەر رێبازێكی نوێ . هیچ لە خۆوە نیە یەكێكی وەك مستەفا پاشا یامولكی كە لە ریزەكانی سوپای عوسمانیدا گەیشتە بەرزترین پایە و ماوەیەكی زۆری ژیانی لە ئەستەمۆل بردە سەر ، دوای گەڕانەوەی لە كاتێكی ناسكی مێژوی گەلەكەیدا ئەو هەمو بایەخەی بە كاری رۆژنامەنوسیدا . یا چۆن نەوەی بەدرخان پاشا و كوڕانی جەمیل پاشا[21] چاپەمەنیان خستبوە سەرو ئەركەكانی خەباتی بێوچانی رۆژانەیان .

---

(١٩) محمد امين زكي ، تاريخ السليمانيه ، نقله الى اللغة العربية الملا جميل الملا احمد الروزبياني ، بغداد ، ١٩٥١ ، ص ٢٠٥ ــ ٢١٠ .

(٢٠) هەمان سەرچاوە ، ل ٢١٠ .

(٢١) تایبەت مەدحەت و عەبدولڕەحمان و جەلادەت بەدرخان و قەدری و ئەكرەمی جەمیل پاشا كە هەمویان جێگەی دیاریان لە ژیانی روناكبیریی كوردا هەبو . ناوبراوان ماوەی زۆریان لە ئەستەمۆل و شارە پێشكەوتوەكانی ئەوروپا بردە سەر و زمانێك یا زیاتریان لە زمانە ئەوروپاییەكان دەزانی .

ئەمانە لەگەڵ پەرەسەندنی خەباتی نەتەوەیی و زۆربونی فشاری زوڵم و زۆری عوسمانی و قاجاری و چەسپ بونی رۆژنامەنوسی وەك كارێكی كاریگەر لەناو هەمو دراوسێكانی كوردا رێگەیان بۆ پەیدا بونی رۆژنامەنوسی كوردی خۆش كرد . بەڵام بەهۆی رژێمی خوێناوی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە دوامەرجی لەدایكبونی كۆرپەی نوێ لەناو وڵات خۆیدا نەبو . ئەمە و چەند هۆیەكی تر كە لەخوارەوە باسیان دەكەین ، شاری قاهیرەیان كردە شوێنی لەبار بۆ چاپكردنی یەكەم رۆژنامە لە مێژوی كوردا .

سوڵتان عەبدولحەمید كە سەرەتا خۆی بە دەستورپەروەر دادەنا و لەراستیدا پیاوێكی غەداری ترسنۆك و فێڵباز بو لەو رۆژەوەی هاتە سەر تەخت (ساڵی ١٨٧٦) كەوتە گیانی هەر شتێك بۆنی ئازادی و دیموكراسی و پێشكەوتنی لێ دەهات [٢٢] . «فەلسەفەی» حوكمی سوڵتان عەبدولحەمید دانانی وەزیر و كاربەدەستی گەورەی نیمچە خوێندەوار بو . خۆی دەیگوت: «دەزانم دەورو بەرم بە دز تەنراوە ... بەڵام من وای بە باش دەزانم ئەم پیرە دزانە لەسەر كار بهێڵمەوە ... ئەمانە بۆ من دڵسۆزن »[٢٣] .

---

(٢٢) ساڵ وەرنەچەرخا سوڵتان عەبدولحەمید دەستوری بەناوبانگی ١٨٧٦ی وەستاند و مەدحەت پاشا و هاوەڵەكانی دورخستەوە و گەلێكیانی لە بەندیخانە توند و زۆریانی ئاوارەی شار و وڵاتان كرد . لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەوا زیاتر لە ٢٠ هەزار كەس بەرەسمی جاسوس بوون (بڕوانە : ادموند تیلور ، سقوط الاسر الحاكمة ، ترجمة علی عزت الانصاری ، القاهرە ، ١٩٦٥ ، ص ١٩٣ ) .

(٢٣) بڕوانە :

Алиев Г.З., Турция в период правления младотурок ( 1908-1918 ), Москва, 1972.

گ. ز. ئەلیێف ، توركیا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی توركانی لاودا (١٩٠٨ ـ ١٩١٨) ، مۆسكۆ ، ١٩٧٢ ، ل ٤٦ .

عەبدولحەمید هەمو قوژبنێکی ئەستەمۆل و شارە گەورەکانی بە پیاوی خۆی ئاخنیبو • بەپێی سەرگوزشتەی مێژوتوسان لە سەردەمی سولتان عەبدولحەمیدا دەبو هەمو فەرمانبەرێکی تورك لە هەمان کاتدا پیاوی گوێ قولاغی کۆشکی یەلدز بن • «زۆر جار برا خەبەری لە برا دەدا و بەوجۆرە پاداشتێکی چەوری وەردەگرت» • یەکێك لە تورکانی لاو هەر لەمبارەیەوە وتویە : « لە تورکیا (ی سەردەمی عەبدولحەمیدا ــ ك• م•) تاقە رێگەیەك، تاقە ئامانجێك مابۆوە : کۆکردنەوەی پارە و خەرجکردنی بە سەفاهەت • بەلام بۆ گەیشتن بەوە دەبو بیبیە پیاوی کۆشك و دلسۆزێ خۆت بەگوێ نەدانە باوك و دایك و برا و هاوڕێ و بیر و ویژدان و هەمو هەستێکی نیشتمانی و مرۆڤایەتی ساغ بکەیتەوە » [٢٤] •

دیارە دەبێ رۆژنامەنوسی لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی ٣٣ سالەی سولتان عەبدولحەمیدا بکەوێتە زەلالەتەوە • لێرەدا چەند نمونەیەکی کەمی مانادار دەخەینە بەرچاو • هەرچەندە یەکەم «یاسای چاپەمەنی» کە سالی ١٨٥٧ دانرابو پڕ لە مەرج و بڕیاری قەبە و گران بو بەلام سولتان پێی قایل نەبو بۆیە پێنج جار (لە سالی ١٨٥٧وە تا سالی ١٩٠٠) ئالوگۆڕی تێدا کرد [٢٥] تا وای لێهات تەنها بۆ پێکەنین بشێ • رۆژنامەنوسان مافی ئەوەیان نەما بە هیچ کلۆجێك ناوی مەدحەت پاشا و دەستور و دینامێت و بۆمبا و

---

(٢٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٤٩ ــ ٥٠ .

(٢٥) بڕوانە :

Котлов Л.Н., Становление национально-освободитнльного движения на Арабском Востоке ( середина XIX в.-1908 г. ), Москва, 1975.

ل. ن. کاتلۆف ، پەیدابونی بزوتنەوەی نەتەوەیی ــ رزگاریخواز لە رۆژهەلاتی عەرەب (ناوەندی سەدەی نۆزدە ــ سالی ١٩٠٨ ) ، مۆسکۆ، ١٩٧٥ ، ل ١٢٩ ــ ١٣٠ .

شۆڕش و سۆشیالیزم و ماف و مانگرتن و ئازادی و سەربەستی و یەکسانی و خەبات یا باسی کوشتن و لابردنی هیچ فەرمانڕەوایەك بنوسن • تەنانەت ماوەی «فیل» و «فەرەج» و «قاچاغ»یش بۆ رۆژنامەنوسان نەمابو چونکە سولتان خۆی رەقیبی چاپەمەنییەکانی ئەستەمۆل و پیاوە دلسۆزەکانی هی شارە گەورەکان بون • لەسەر یەك دو هەلەی چاپ کە مانای رستەیەکی گۆڕیبو بەجۆرێك بۆنی توانجی لێ بێت رۆژنامەی «صەباح» چەند سالێك قەدەغە کرا[٢٦]• لەبەرئەوە هیچ سەیر نییە کۆتایی حوزەیرانی سالی ١٨٩٤ رۆژنامەنوسانی ئەستەمۆل سەری دنیایان لێهاتەوە یەك چۆن هەوالی کوشتنی سەرەك کۆماری فەرەنسە س•کارنۆ بلاو بکەنەوە ، لەلایەکەوە نەدەبو توخنی باسی کوشتنی سەرۆکی دەولەتێك بکەون ، لە لایەکیتریشەوە زاتیان نەدەکرد بنوسن بە دەردی خوا و لەبەر پیری مردووە چونکە سولتان لەگەلیدا هاوتەمەن بو • بەوجۆرە هیچ رۆژنامەیەك بە خۆیدا رانەپەرمو لە دێرێکی پچوك زیاتر بنوسێ کە ئەویش بریتی بو لە راگەیاندنی هەوالی مردنی • بەکورتی رقی ناپیرۆزی عەبدولحەمید بەرامبەر رۆژنامەنوسی سەربەست گەیشتبووە رادەیەك تەنانەت دوای هێنانە خوارەوەشی لەسەر تەختی خەلافەت (سالی ١٩٠٩) خۆزگەی بەوە دەخواست رۆژێ لە رۆژان بگەڕێتەوە کۆشکی یەلدز تاوەکو « سەرتاپای رۆژنامەنوسان تورداتە تەندورەوە » [٢٧] •

بێگومان لەژێر سایەی رژێمێکی لەو بابەتە قەت چاوەڕوان نەدەکرا رێگەی بلاوکردنەوەی رۆژنامەی کوردی بدرێ ، جا یا کەس زاتی داواکردنی مافی دەرکردنی رۆژنامەیەکی بە زمانی کوردی نەدەکرد یا ئەوی بیوێرایە و

---

(٢٦) هەر بەو بیانووە یەکەم رۆژنامەی تورکی «تەقویمی وەقایع»یش داخرا.

(٢٧) بڕوانە : الدکتور خلیل صابات ، الصحافة استعداد ، فن ، علم ، القاهرە ، ١٩٥٩ ، ص ١٣ .

لەژێر هەر پەردەیەکدا داوایەکی وای بکردایە بە دەستی بەتاڵ دەگەڕایە دواوە.

جگە لەوانەی باسمان کرد بۆ ئەمە هۆیەکی گرنگیتر لەئارادا بــو . ڕژێمی سولتان عەبدولحەمید بە توندی دژی وریابونەوەی نەتەوەکانی نــاو دەولەتی عوسمانی بو . لە سەردەمی فەرمــانڕەوایی ئەودا لە زۆر شــوێن بێبەزەییانە لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و گەلانی دراوسێی کورد درا . هەروەها سولتان دەیویست هۆزە چەکدارەکانی کورد بکاتە یەکێك لە داردەستەکانی بۆ لێدانی ناحەزانی خۆی و دەستە و دایەرەی ، لەبەرئەوەش بو کە «سوارەی حەمیدی» لە چەکدارانی ئەو هۆزانە دروستکرد [٢٨] . دیارە سولتانی کوربتێن شتێکی نەدەویست پێچەوانــەی ئەو ئــارەزووە ناهەموارەی بێ [٢٩] .

بەمجۆرە دەبو خوێندەواری کورد وەك خوێندەواری زوربەی گەلانی ناو دەولەتی عوسمانی [٣٠] بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەی خۆی بێر لە شوێنیتر بکاتەوە . قاهیرە لەبارترین جێگە بو بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە . بەر لە هەمو شت میسر لە زوربەی وڵاتانیتری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زیاتر پێــوەندی لەگەڵ شارستانەتی ئەوروپا هەبو . سەرەتای پەیدابونی ڕۆژنامەنوسی ئەم

---

(٢٨) لەوبارەیەوە بڕوانە : الدكتور كمال مظهر احمد ، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى ، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ، بغداد ، ١٩٧٧ ، ص ٨٤ ـ ٩٤ .

(٢٩) وەك دوایی باسی دەکەین «کوردستان»ی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی دژی سەرتاپای سیاسەتی سولتان عەبدولحەمید وەستا ، بەتــایبەتی دژی «سوارەی حەمیدی» و کوشتاری ئەرمەن .

(٣٠) زۆر لە گەلانی ژێردەستەی عوسمانی ناچار بون ڕۆژنامەی خۆیان لــە دەرەوەی وڵات دەرکەن . ســالی ١٧٩٤ ئەرمەن لە مــەدراس یــەکەم گۆڤاریان بە ناوی «ئازدارار»ەوە دەرکرد . سالی ١٨٥٤یش لە مۆسکۆ دەستیان کردە بلاوکردنەوەی گۆڤارێکیتر بە زمان و پیتی ئەرمــەنی . تەشرینی دووەمی سالی ١٨٨٧ حیزبی «هەنچاك» لە جنێف هەر بەناوی خۆیەوە کە مانای (زەنگی کلێســە)یە ڕۆژنامەیەکی دەرکرد .

ولاته دەگەڕێتەوە سەردەمی هاتنی ناپلیۆن و لەشکری فەرەنسی بۆ ئەوێ ؛ واتە کۆتایی سەدەی هەژدە . دوای داگیرکردنی میسر لەلایەن لەشکری ئینگلیزەوە (سالی ١٨٨٢) دەسەلاتی سولتانی عوسمانی دەنگی ماو رەنگی نەما . لەگەل ئەوەش فەرمانڕەوایانی ئەستەمۆل دەیانویست کەلك لە باری سیاسی نێوان دەولەتان و ئالوگۆڕی ناو میسر وەربگرن بۆ گێڕانەوەی دەسەلاتی لەکیس چویان . ئەمە بوە هەوێنی دوبەرەکیەکی شاراوە لەنێوان ئینگلیز و تورکدا کە تا دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی خایاند . ڕۆژنامەنوسی لەم دوبەرەکییەدا دەورێکی گەورە و سەیری بینی. سولتان عەبدولحەمید بە هەر چوار لادا هەولی دەدا هەستی ڕۆژنامەکانی میسر بەلای خۆیدا ڕابکێشێ . بۆ ئەم مەبەستەی پارەی زۆری دەدا [٣١] و هەستی ئایینی دەبزواند و عوسمانی پەروەرانی هان دەدا ڕۆژنامەی نوێ لە قاهیرە دامەزرێنن . تەقەلای سولتان لەم مەیدانەدا بێسود و ئەنجام نەبو . مێژونوسێکی عەرەب لەمبارەیەوە نوسیویە دەلێ :

« تورکیا هەرچەند لاواز بو ، بەلام هەولی دەدا هەستی خەلك دژی داگیرکەران (ی ئینگلیز ــ ك. م.) ببزوێنێ چونکە نەیدەویست بە یەکجاری میسری لە کیس بچێ . هەمان کات زۆر میسری ئەلقە لە گوێی تورکیا بون و ئەوەش بۆ خۆی ئەنجامی هەستی ئایینی بو ... لەبەرئەوە ڕۆژنامەی وا پەیدا بو کە بەلای دەولەتی عوسمانیدا مەیلی هەبو ، هێواش هەبو بە هاندانی ئەو دامەزرا » [٣٢] . «البرهان» و «القاهرة» و «الأهرام»ی

---

(٣١) ڕۆژنامەیوا هەبو هەزار جونەیهی بۆ بڕیبۆوە کە ئەمەش بۆ ئەو سەردەمە پارەیەکی زۆر بو .

(٣٢) الدكتور سامي عزيز ، الصحافة المصرية وموقفها من الاحتلال الانجليزي، القاهره ، ١٩٦٨ ، ص ١٦١ ــ ١٦٢ .

ئەوسا [٣٣] و چەند رۆژنامەیەکیتر لەوانە بون کە بە لایەنگری ئەستەمۆل دادەنـران •

دیارە کاربەدەستانی ئینگلیز لە میسر بەرامبـەر بەمە دەستەوەسـان نەوەستان ، بەتایبەتی چونکە سوربون لەسەر مانەوەی خۆیان و دەرپەڕاندنی یەکجاری عوسمانی‌یەکان لە میسر و بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستەش ئامادە بون بێ سێ و دو پەنا بەرنە بەر هەر رێگەیەك دەست بدا • کۆششی ئینگلیز لەم مەیدانەدا لە کۆششی عوسمانی‌یەکان گەلێك بەرهەمدارتر بو • ئەمەش بەر لە هەموشت ئەنجامی ئەوە بو کە توانا و دەسەلاتیان زۆر لەوان زیاتر بـو • رۆژنامەی وەك «الوطن» و «الزمان» و «مرآة الشرق» و «النیل» و «المقطم»و هیتر کەوتنە هێرش بردنە سەر دەسەلاتی عوسمانی و نیشاندانی عەیب و عاری • دوبەرەکی‌یەکی توند و تـیژ لەنێوان رۆژنـامە ئینگلیز خواکان و ئەوانی سەر بە ئەستەمۆل دروست بو [٣٤] •

سەرەڕای ئەوە کاربەدەستانی ئینگلیز لە میسر دەرگایـان بۆ هەمـو نـاحەزانی سولتان عەبدولحەمید و رژێمی عوسمانی خستە سـەر پشت • شاری قاهیرە بووە یەکێك لە مەلبەندە گرنگەکانی کۆبونـەوە و خەبـاتی تورکانی لاو کە دوژمنی هەرە گەورە و بەتواناى سولتان بون • یەکێك لەو کارانەی تورکانی لاوی دەرەوەی ولات بایەخی زۆریان پێ دەدا دەرکردن و بلاوکردنەوەی رۆژنامە بو بە چەند زمانێك • لەبەرئـەوە قاهـیرەش بووە ناوەندێکی گرنگی خەباتیـان لەم مەیـدانەدا و ئەو رۆژنامـانەی لـەوێ دەریان‌دەکردن بوبونە رویەکی دیاری چالاکی‌یان [٣٥] • شایانی باسە یەکێك

(٣٣) لەگەل ئەوەش بلاوکردنـەوەی «الاهرام» لەو شوێنـانەی دەسـەلاتی ئەستەمۆل بەهێز بو لە سـالی ١٨٨٤وە قەدەغە بو .

(٣٤) بڕوانە : د. سامی عزیز ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٥٩ ــ ١٧٨ .

(٣٥) تورکانی لاو چەند رۆژنامەیەکیان لە قاهیرە دەردەکرد ، لە هەمویـان ناودارتر ئەوەیان بو کە موراد داغـستانی بە ناوی «میزان»ەوە بـلاوی دەکردەوە .

لەو رۆژنامانە کە ناوی «اجتهاد» بو دوکتۆر عەبدوڵلا جەودەتی کورد بڵاوی دەکردەوە کە بۆ خۆی یەکێك بو لە یەکەم دەستەی دامەزرێنەری کۆمـەڵی « تورکانی لاو » (٣٦) .

بەهەمان دەستور کاربەدەستانی ئینگلیز ماوەیان دەدا بە ناحەزانی‌تری سوڵتان میسر بکەنە مەڵبەندی کار و خەباتیان . نیشتمانپەروەرانی ئەرمەن وەك نیشتمانپەروەرانی تورك لێرەش بەگەرمی کەوتبونە جموجۆڵ . ئەوانیش لە قاهیرە رۆژنامەی خۆیان هەبو .

بەمجۆرە و هــەر لــەبەر ئەو هۆیـــانەی باســـان کردن ، میسر بووە باشترین و نزیکترین شوێن بۆ لەدایـكبونی یەکەم رۆژنـامە لە مێــژۆی کوردا (٣٧) . رۆژی پێنج شەممــەی ٣٠ی «ذو القعدە»ی ســالی ١٣١٥ی کۆچی – ٩ی نیسانی ساڵی ١٣١٤ی رۆمی کە دەکاتە ٢٢ی نیســانی ساڵی ١٨٩٨ی عیســایی (٣٨) لە شــاری قاهــیرەی میسر یەکەم ژمــارەی یەکەم

---

(٣٦) عەبدوڵلا جەودەت خەڵکی عەرەبکیرە . مانگی مـایـسی ١٨٨٩ لـەگەڵ ئیسحاق سکوتی خەڵکی دیاربەکر و چەند هاوڕێیەکی‌تری یەکەم شانەی رێکخراوی تورکانی لاویان دامەزراند ، توشـــی گەلێك دەرد و ئازار هات و دوای گرتن و دوورخستنەوەی بۆ لیبیــا هەڵهـات و لە دەرەوە چالاکانە تێکەڵ بە خەباتی ناحەزانی سوڵتان عەبدولحەمید بو . لەگەڵ عەبدوڵلا سکوتی رۆژنامەی «عوسمانلی»شی دەرکرد . تا سەر خەباتی بۆ نەکرا و سوڵتان توانی بەلای خۆیدا رایکێشێ .

(٣٧) ئەو سەردەمە چاپەمەنی و رۆژنامەنوسی میسر قۆناغێکی باشی بەرەو پێشەوە بڕیبو . دەمێك بو ژمارەیە چاپخانەی گەورە بە پێوانەی ئەوسا لە میسر کاریان دەکرد و رۆژنامەیان لەچاپ دەدا . تەنهــا لە مــاوەی دوازدە ساڵدا (١٨٦٥ – ١٨٧٧) پتر لە ١٥ رۆژنامەی هەمەچەشنە هاتنە دەرچون (بڕوانە : عبدالله حسين ، الصحافة والصحف ، القاهرە ، بلا ، ص ١٣٧ ) .

(٣٨) لێرەدا پێویستە سەرنج راکێشین بـۆ ئەوە کە رۆژی دەرچونی یەکەم ژمارەی «کوردستان» لەسەر رۆژنامەکە خۆی تەنها بە ساڵی «هیجری»و «رۆمی» نوسراوە . هیجری‌یەکەی ، وەك وتمــان ، ٣٠ ذوالقعـدەی ١٣١٥یە . بەڵام بـەپێی ئەو جـەدوەلە بـاوەڕ پێ‌کراوانـەی لەبـەر

دەستماندان ، بەتایبەتی جەدوەلی ئەکادیمی ئۆرەبیللی کە ساڵی ١٩٦١ لە سۆڤیەت چاپکراوە ، ڕۆژی (٣٠ی ذو القعدەی ١٣١٥) دەکاتە هەینی ، کەچی لە سەر «کوردستان» لە دوو شوێن نوسراوە ڕۆژی پێنجشەممە چاپکراوە . بەپێی جەدوەلەکەی ئۆرەبیللی (٣٠ی ذوالقعدەی ١٣١٥) دەکاتە ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ . لەبەرئەوەش کە لە ڕاستیی گۆڕینەکەی ئۆرەبیللی دڵنیاین (بڕوانە ل ٢٦٩ی جەدوەلی ناوبراو) بەتایبەتی چونکە لەو هەڵە کەمانەی زانای سۆڤیەتی پرۆفیسۆر تسیبۆلسکی لەناو جەدوەلی ناوبراودا دۆزیونیەوە ساڵی ١٣١٥ و ١٣١٦یان تێدا نی‌یە (بڕوانە : گۆڤاری «گەلانی ئاسیا و ئەفریقا» ، بە زمانی ڕوسیی ، مۆسکۆ ، ژمارە ٣ ، ١٩٦٢ ، ل ٢٤٥) ناچار کەوتینە سۆراخی ئەوەی ئایا (٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨) بەر پێنجشەممە یا هەینی دەکەوێ . دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد ساغبۆوە کە ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨ دەقاودەق ڕۆژی پێنجشەممە دەگرێتەوە. کەواتە دەبێ هەڵە لە دیارکردنی سەرەتا و کۆتایی مانگە هیجرێکانی ئەو ساڵە خۆیدا ڕووی دابێ ، ئەمەش بۆ ساڵنامەی هیجریی ئاسایی‌یە چونکە ، وەك ئاشکرایە ، دیارکردنی سەرەتا و کۆتایی مانگەکانی لەسەر بینینی مانگ وەستاوە و زۆرجار هەڵەی تێدا دەکرێ . کەواتە ئەو ڕۆژی (٢٢ی نیسانی ١٨٩٨)ەی لە میسر بە ٣٠ی «ذوالقعدە» دانراوە ٢٩ی «ذوالقعدە» بووە. هەمان هەڵە بەنیسبەت ژمارەی‌تری «کوردستان»ەوە دوبارە بۆتەوە .

ئەم ڕاستی‌یەم یەکەمجار بێ ناوی خۆم لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردا بڵاوکردەوە (بڕوانە : «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩٥ ـ ٣٩٦) .

(٣٩) لە کۆتایی دوا لاپەڕەی ژمارە یەك و دوو سێی «کوردستان» نوسراوە لە چاپخانەی «الهلال» چاپکراوە ، کەچی لەسەر هەمان لاپەڕەی ژمارە چوار و پێنج نوسراوە گوایە لە چاپخانەی ڕۆژنامەی کوردستان چاپ کراوە . دوور نی‌یە میقداد مەدحەت بەگ بۆ نیشاندانی توانا یا سەرلێشێواندن وای‌کردبێ . بارستی ئەو ژمارانەی من دیومن ٢٣٫٨ x ٢٦ سانتیمە . دوکتۆر کەمال فوئاد کە زوربەی ژمارەکانی «کوردستان»ی دیوە ٢٥٫٥٠ x ٣٢٫٥٠ی داناوە ( بڕوانە : « کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیی» ، پێشەکی ) .

(٤٠) میقداد مەدحەت ناوی لێکدراوی خۆیەتی وەك مستەفا کەمال ، عەلی‌کەمال ، ئیسماعیل حەقی و گەلێکی‌تر . سەردەمی عوسمانی‌یەکان ناوی لێکدراو باو بو .

بەگی نەوەی بەدرخان پاشاوە چاپکرا •

بەم مەینەت و دەردێ سەرییە بناغەی رۆژنامەنوسێ کوردێ دانرا کە وەك دیمان تەنها دارشتنی گەلێ سالی پێ ویست چونکە ژانی گەلی کورد بۆ لەدایكبونی یەکەم رۆژنامەی زۆر زیاتری لە ژانی گەلانیتر خایاند • جێگەی خۆیەتی لێرەدا باسی ئەو نامەیە بکەین کە روناکبیرێکی کورد ناردویە بۆ خاوەنی «کوردستان» و تێیدا بەداخەوە پێی دەلێ تۆ درەنگ دەستتپێکرد و دەبو بەر لە ٢٠ سال ، واتە حەفتاکانی سەدەی نۆزدە ، رۆژنامەکەت دەرکردایە [٤١] •

وەك دواییش باسی دەکەین میقداد مەدحەت و بەتایبەتی عەبدورڕەحمان بەگی برای لە نزیکەوە پەیوەندییان لەگەل تورکانی لاودا هەبو • ئەمەش بۆ خۆی تا رادەیە کاری دەرکردنی «کوردستان»ی ئاسان کرد • ئەو پەیوەندییە نزیکەی بەدرخانییەکان وای لە ژمارەیە مێژونوس کردووە رۆژنامەی «کوردستان»یش بە یەکێك لە ئۆرگانەکانی تورکانی لاو لە قەلەم بدەن [٤٢] • بەلام راستییەکەی «کوردستان» رۆژنامەی سەربەخۆی نیشتمانپەروەرانی کورد بو کە زۆر شت لەو سەردەمەدا لەگەل ناحەزانی رژێمی سولتان عەبدولحەمید لە یەك سەنگەردا کۆی دەکردنەوە •

دەمێکە ژمارەیەکی زۆر لە کورد و رۆژهەلاتناسان بایەخ دەدەن بە مێژوی یەکەم رۆژنامەی کوردی و شوێنی لە ژیانی روناکبیری و سیاسێ کوردستاندا [٤٣] • مینورسکی پتر لە ٦٠ سال لەمەوبەر باسی دەرچونی

---

(٤١) بڕوانە : «کردستان» ، عدد ١٤ ، جنێف ، ٩ی ذي‌الحجة ١٣١٦ .

(٤٢) وەك رۆژهەلاتناسی ئازەریێ دوکتۆر حەمید عەلیێف ( بڕوانە : لاپەڕە ٥٨ی کتێبەکەی «تورکیا سەردەمی فەرمانڕەوایێ تورکانی لاو» ) .

(٤٣) ژمارەیەکیان لە لێکدانەوە و دیارکردنی رۆژی دەرچونی « کوردستان » بە هەلە چوبون . مامۆستایان ئەمین زەکی و عەلائەددین سەجادی ١٨٩٧یان بە سالی دەرچونی داناوە (محمد امین زکی ، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان ، ترجمة محمد علي عوني ، القاهرە ، ١٩٣٦ ، ص ٣٧٠؛

«کوردستان»ی لە قاهیرە کردووە [٤٤] • دوای ئەو بە دوو ساڵ ( ساڵی ١٩١٧) گەردلێفسکی بەمجۆرە هەمان باسی هێناوەتە کایەوە : « ساڵی ١٨٩٨ لـە قاهیرە رۆژنامەی «کوردستان» دەرچو ، دوایی لە جنێڤ دەستکرایەوە بـە بڵاوکردنەوەی • ئەم رۆژنامەیە کوردێك کە مەدحەتی کوڕی بەدرخانی ناودار

---

علاءالدین سجادی ، مێژوی ئەدەبی کورد ، بغداد ، ١٩٥٣ ، ل ٥٥١ .
لە چاپی دووەمی کتێبەکەیدا (بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٦٠٩ ــ ٦١٠) مامۆستا سەجادی لەبەر رۆشنایی ئەو زانیاری‌یانەی دوکتۆر کەمال فوئاد کاتی خۆی بڵاوی کردوتەوە ساڵی دەرچونی « کوردستـان »ی راسـت کردوتەوە ) . ئەدمۆندس و دوکتۆر شاکیر خەصبـاك و هی‌تر سـاڵی ١٨٩٢یان داناوە (الدکتور شاکر خصباك ، الکرد والمسألـة الکردیـة ، بغداد ، ١٩٥٩ ، ص ٢٩ ؛

C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, P. 58; C. J. Edmonds, The Kurds of Iraq , — (( The Middle East Journal )), 1957, No. 1, P. 55 ).

باسیل نیکیتین و دوکتۆر بلەچ شیرکۆ و دوکتۆر عەبدورڕەحمان قاسملو ساڵی کۆچی دەرچونی «کوردستان»یان وەك خۆی نوسیوە ( بڕوانـە :
B. Nikitine, Les Kurdes. Etude Sociologique et historique, Paris, 1956, ; A. R. Ghassemlou, Kurdistan and the Kurds, Prague, 1965, P. 44 ;

الدکتور بلەچ شیرکوە ، القضیة الکردیة . مـاضي الکرد وحـاضرهم ، القاهرە ، ١٩٣٠ ، ص ٥٠ ) . کاتی خۆی ئەم راستی‌یانەم لە وتارێکی تایبەتیدا بڵاو کردەوە (بڕوانە : پێشەکی ، پەراوێزی ژمارە ٦) .

(٤٤) بڕوانە :

Минорский В.Ф., Курды. Заметки и впечатления, Петроград, 1915.

ف. ف. مینۆرسکی ، کورد . تێبینی و سەرنج ، پێترۆگراد ، ١٩١٥ ، ل ١٨ (هەروەها بڕوانە : ف. ف. مینۆرسکی ، الاکراد . ملاحظـات وانطباعات ، ترجمة الدکتور معروف خزنەدار ، بغداد ، ١٩٦٨ ، ص ٤٤ ــ ٤٥ ) .

بو دەری‌کرد • دیارە لە تورکیا بلاوبونەوەی قەدەغە بو »[٤٥] • دوابەدوای ئەمان زۆر کوردناسی‌تر باسی سالی دەرچونی «کوردستان»یان بە دروستی کردووە و بەرز نرخاندویانە[٤٦] •

دوکتۆر بلەچ شێرکۆ[٤٧] دەربارەی «کوردستان» ئوسیویـە دەلێ : نیشتمانپەروەرانی کورد لەناو خۆیاندا بڕیاری دەرکردنی ئەم رۆژنامەیەیان داو بەوجۆرە بووە ئۆرگانی ئـەوان[٤٨] • دوکتۆر شـاکیر خەسـباکیش دەرچونی «کوردستان» بە سەرەتای گۆڕین یا قۆنـاغێکی نوێ لـە ژیانی کوردا دادەنێ[٤٩] •

---

(٤٥) Горддевский В.А., Избранные сочинения, том III ( история и культура ), Москва, 1962.

ئەکادێمی ف. ا. گەردلێڤسکی ، کاری هـەلبژاردەی ، بەرگی سـێ (مێژو و روناکبیری) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ١١٩ .

(٤٦) بەوێنە بڕوانە : م. س. لازەرێف ، مەسەلەی کورد ، ل ٤٨ .

(٤٧) جێگەی خۆیەتی لێرەدا راستی‌یەکی نەزانراو بخەمە بەرچـاو . زۆرن ئەوانەی ناوی دوکتۆر بلەچ شێرکۆیان بیستووە یا کتێبەکەیان بینیوە . دەمێکە «القضیة الکردیة» کە بە ناوی کۆمەلی «خۆیبۆن»ەوە دەرکراوە و سەد لاپەڕە زیاترە بۆتە سەرچاوەیەکی باش بۆ مێژونوسـان . زۆری خۆمان و رۆژهەلاتناسـان بۆ نوسینەکانیان کەلکیان لە زانیاریی نـاو ئەم کتێبە بینیوە . بەلام کەمن ئەوانەی دەزانن دوکتۆر بلەچ شێرکۆ کێیە . هەن وادەزانن مامۆستا جەلادەت بەدرخانە . راستەکەی دوکتۆر بلەچ شێرکۆ مامۆستا محەمەد عەلی عەونی‌یە کە یەکێك بو لە خوێندەوارە هەرە دلسۆزەکانی کورد. مامۆستای ناوبراو زمانزان و مێژونوس بو، زوربەی بەرهەمەکانی مامۆستا ئەمین زەکی ئەو وەری‌گێڕانە سەر زمانی عەرەبی . خزمەتی زۆری «خۆیبۆن»ی کرد . شایانی باسە مامۆسـتـا عەونی بۆ نوسینی «الکرد والقضیه الکردیه»کەی کەلـکی زۆری لـەو زانیاری و چاپەمەنی‌یانە وەردەگرت کە جەلادەت بەدرخانی هـاوەل و هاوبیری بۆی دەنارد .

(٤٨) د. بلەچ شێرکۆ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٠ ــ ٥١ .

(٤٩) د. شاکر خصباك ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٩ .

چاوگێڕانێکی خێرا بە ناوەرۆکی ژمارەکانی «کوردستان»دا ئەم ڕاستییە ساغ دەکاتەوە و دەری دەخا چۆن ڕۆژنامەنوسی کورد لە سەرەتای لەدایکبونییەوە لەژێر زەبری زولم و زۆری عوسمانییان و ئاڵوگۆڕی فیکری ناو دەستەی روناکبیری کوردا ڕێگەی خەباتی ڕاستی بۆ خۆی هەڵبژارد . لە یەکەم ژمارەیەوە «کوردستان» «وریا کردنەوە و هاندانی فێربونی صەنعەت»ی کردە دروشمی خۆی [٥٠] . وەك جگەرسۆز و دوربینێ زۆر جار باسی نرخ و بایەخی خوێندن و خوێندەواری دەکا و لە ڕۆڵەی کورد دەپاڕێتەوە ئەویش وەك ڕۆڵەی گەلانیتر ڕوکاتە خوێندن . بەنیازی زیاتر بزواندنی هەستی کۆمەڵانی خەڵك لەمبارەوە «کوردستان» زۆ زۆ پەنا دەباتە بەر فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (د. خ.) دەرحەق پێویستی و قازانجی فێربون [٥١] . «کوردستان» دەیویست بە هەموان ڕاگەیێنێ چۆن خوێندەواری بۆتە هەوێنی پێشکەوتنی گەلان . ئەوەتە بە یاریدەی خوێندن و زانست ژاپۆن بەسەر چین و میسر بەسەر سودانیدا زاڵ بۆن . لە عەقڵەوە دەیویست مەسەلەی ئاینێ و خۆشەویستی نیشتمان تێکەڵ یەك کا و بەوجۆرە

---

(٥٠) لە ژێرەوەی ناوی ژمارە یەکی «کوردستان» نوسراوە : «کردلری ایقاظ وتحصیل صنایعە تشویق ایچون شمدیلك» . لە ژمارە سێوە ئەم دروشمە وای لێ هات : «کردلری تحصیل علوم و فنونە تشویق ایدر نصائح و ادبیات کردیەیی حاوی» .

(٥١) لە زۆر ژمارەی «کوردستان»دا ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەر دەکەونە بەرچاو : «العلماء ورثة الانبیاء» ، «العلم علمان ـ علم الابدان وعلم الادیان» ، «الکاسب حبیب اللە» ، «اطلبوا العلم من المهد الی اللحد» ، « طلب العلم فریضة علی کل مسلم ومسلمة » ، «شهد اللە انە لا الە الا هو والملائکة و اولوا العلم» . هەندە جاری «کوردستان» وتاری بە ناونیشانی وا بڵاو دەکردەوە : «فضیلة التعلم» (ژمارە پێنج) ، « هل یستوي الذین یعلمون والذین لایعلمون» (ژمارە هەشت) ، «رتبة العلم اعلی الرتب» (ژمارە نۆ) و هیتر .

لاوی کورد بجولێنێ (٥٢) • دەیویست لە ڕێگەی قسەی پڕ بایەخی شاعیری گەورەی وەك خانی‌یەوە کورد بۆ «اتفاق» هاندا (٥٣) •

هەرکات ناوی «کوردستان» هاتە پێشەوە دەبێ دوو ڕووی پڕ شانازیی ئەم ڕۆژنامەیە بخرێتە بەر چاو • یەکەمیان هەڵوەستی‌یە بەرامبەر گەلی ئەرمەن و ئەوی‌تریان بەرامبەر بەو دەزگا سەربازی‌یە دواکەوتووەی سوڵتان دەوروبەری کۆتایی سەدەی نۆزدە بە ناوی «سوارەی حەمیدی»یەوە لە پیاوی چەکداری هۆزانی کورد دایمەزراند •

وەك ئاشکرایە لە نەوەدەکانی سەدەی رابوردووەوە فەرمانڕەوا شۆڤێنی‌یەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە ناحەق کەوتنە گیانی نەتەوەی ئەرمەن و ویستیان هۆزە چەکدارەکانی کورد بکەنە یەکێك لە داردەستە هەرە کاریگەرەکانی جێبەجێ کردنی ئەو کارە گڵاوەیان (٥٤) • پەردە لە ڕوو لادانی ئەو کارە و بەرهەڵستی کردنی بۆ قۆناغی خۆی ئەرکێکی ئاسان نەبو • لەو کاتەدا کە زۆرکەس کوێرانە دەستی خۆیان بە خوێنی ئەرمەن ڕەش دەکرد و لەوانیش زیاتر دەستیان بە کڵاوی خۆیانەوە دەگرت با نەیبا «کوردستان» دڵسۆزانە بانگی نەوەی کوردی دەکرد لە مەبەستی ڕاستەقینەی سوڵتان عەبدولحەمید بگەن و نەبنە هۆی لەناوبردنی ئەرمەنی دراوسێی دێرینیان • بەپێچەوانەوە ، «کوردستان» بەگەرمی داوای لێ دەکردن پارێزگاریی برا ئەرمەنەکانیان بکەن هیچ نەبێ لەبەرئەوەی هەردوو لایان وەك یەك گیرۆدەی زوڵم و زۆری سوڵتان عەبدولحەمید و دەستە و دایەرەی

---

(٥٢) بۆ ئەمەش زۆر جار «کوردستان» پەنای دەبردە بەر فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ، وەك «حب الوطن من الایمان» ، «علو الهمة من الایمان» .

(٥٣) بۆنمونە بڕوانە : «کردستان» ، ژمارە ٤ ، ١٢ ذوالحجة ١٣١٦ . بۆ هەمان مەبەست وتاری لەژێر ناونیشانی وادا بڵاو دەکردەوە : «واعتصموا بحبل الله جمیعاً ولاتفرقوا» (ژمارە یازدە) .

(٥٤) بۆ زانیاریی زیاتر لەمبارەوە بڕوانە : د. کەمال مەزهەر ، کوردستان.. ، چاپی کوردیی ل ٨٩ ــ ١٥٦ ، چاپی عەرەبی ل ٢٣٥ ــ ٣٠٢ .

ئەون [٥٥] ، داوای لێ دەکردن شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بکەنە نمونـە و دەرسی لێ وەرگرن چۆن کاربەدەستانی ئەسـتەمۆل لە حەفتـاکانی سەدەی نۆزدەدا نەیانتوانی دژی گاوران هانی دەن • جاری‌وا هەبۆ «کوردستان» لە دلسۆزی‌یـەوە بە رەقی روی دەمـی دەکردە گەلی کورد تـاوەکو زیـاتر بیبزوێنێ و لەو کارە ناهەموارەی دۆرخاتەوە [٥٦] •

عەبدوڕڕەحمان بەدرخانی سەرنوسـەری «کوردسـتان» راسترین هەلوەستی بەرامبەر کوشتارەکانی ئەرمەن هەبۆ • کار گەیشـت بـەوەی ئەم پیاوە دۆرێتە بەئاشکرا حاشای لە عوسـمانی کوژی کرد چونـکە لە کوشتاری ئەرمەندا بەشدار بو [٥٧] •

بە هەمان چەشن «کوردستان» بە ئەوپەڕی تێگەیشتنەوە «سـوارەی حەمیدی» و مەبەستی شارراوەی دامەزرانی هەڵسەنگاند • کاتێك ژمارەیەکی زۆر لە سەرەك هۆزانی کورد رەشبەلەکیان بەبۆنـەی دامـەزراندنی ئـەو دەزگایەوە دەگێڕا و هێ‌وایان هەبو وای دەزانی خێر و بەرەکەت بۆ هەمـۆ کورد دێنێ ( ! ) ، «کوردستان» بە هەمـوانی رادەگەیـاند کە مەبەستی سەرەکی «سوارەی حەمیدی» خەریك‌کردنی کورد و خۆش‌کردنی ئاگری دۆبەرەکی نێوان ئەوان و ئەرمەنە تاوەکو دژی سیاسەتی چەوسـاندنەوەی سولتان یەك نەگرن • دیارە دەزگایە بۆ کاری وا نالەبار دامەزرابێ دەبۆ لـە

---

(٥٥) «کردستان» ، ژمارە ٢٦ ، ٢٢ی رەمەزانی ١٣١٨ ، ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٠١ .

(٥٦) بۆنمۆنە بڕوانە : «کردستان» ، ژمارە ٢٧ ، ٢٢ی ذوالقعدەی ١٣١٨ ، ١٤ی مارتی ١٩٠١ .

(٥٧) بڕوانە :

E. E. Ramsaur, The Young Turks. Prelude of the Revolution of 1908, Princeton — New Jersey, 1957, P. 63.

زیان بەولاوە هیچی لێ چاوەڕوان نەکرێ [٥٨] • جێگەی تەقدیر و نیشانەی دوربینی‌یە کە «کوردستان» بە هەمان دەستور ڕوی کردۆتە نیشتمانپەروەرانی عەرەب و داوای لێکردون بە قسەی سولتان هەڵنەخەڵەتێن و ڕێگە نەدەن بە دامەزرانی «سوارەی حەمیدێ» لەناو هۆزی چەکداری عەرەبدا •

زۆر ڕوی‌تری «کوردستان» وەك یەکەم ڕۆژنامەی کوردێ سەرنج ڕادەکێشن • «کوردستان» لە هەر ڕێگەیەکەوە بۆی لوابێ هەوڵی داوە هەستی‌کورد بە شێوەیەکی دیموکراسی‌یانە بجوڵێنێ • لەبەر خاتری ئەم مەبەستە زۆر لاپەڕەی «کوردستان» بۆ باسی ئەدەب و مێژوی کورد تەرخانکراون و بە بەیتی پڕمانای «مەم و زین»ی خانی ڕازێنراونەوە[٥٩] •

لەبەر ئەمانە و زۆر هۆی‌تری وەك ئەوان دەبێ «کوردستان» ئاوارەی وڵاتان و میوانی شاران بێ • ڕاستە زۆر ئۆرگانی نیشتمانپەروەرانی تری ناو ئیمپراتۆرێ عوسمانێ وەك «کوردستان» دەربەدەر بون ، بەڵام هیچ کامیان بەرادەی ئەو ناچار نەبون شارەو شار کەن : ژمارە یەك تا پێنجی لە قاهیرە و شەش تا نۆزدەی لە جنێڤ و بیست تا بیستو سێی دیسان لە قاهیرە و تەنها بیستو چواری لە لەندەن و بیستو پێنج تا بیستو نۆی لە فۆلکستۆنی باشوری ئینگیلتەرە و سێ و سیویەکی جارێکی‌تر لە جنێڤ چاپکراون • ئەم «گەشتە»ی « کوردستان » تەنها ٤٧ مانگ و ٢٢ ڕۆژی خایاند • هەر لەبەرئەوەشە کە لەوماوەیەدا لە بریتی (٩٦) تەنها (٣١) دانەی لێ دەرچو ، واتە لە بریتی پازدە ڕۆژ کە بڕیار بو ، هەر ژمارەیەی پتر لە ٤٥ ڕۆژی بەردەکەوێ • گەلێجار خاوەنی «کوردستان» داوای خوش‌بونی لە خوێنەر کردوە چونکە نەیتوانیوە کاتی خۆی ڕۆژنامەکەی دەرکا [٦٠] •

---

(٥٨) بڕوانە : «کردستان» ، ژمارە ٢٨ ، ١ جمادی الاخرەی ١٣١٩ ، ١٥ی ئەیلولی ١٩٠١ .

(٥٩) لە بەشی پێنجەم جارێکی‌تر دێینەوە سەر ئەم باسە .

(٦٠) بڕوانە : ژمارە ١٦ و ٢٤ و ٢٨ .

دەرچونی «کوردستان» بووە گرێیەکیتر لە ناخی دڵی سوڵتان عەبدولحەمید و دەستەو دایەرەکەیدا • ناوەرۆکی ئەو ژمارانەی «کوردستان» کە بۆ یەکەمجار لە قاهیرە چاپکران رۆن نیشانی دەدەن چۆن پیاوانی سوڵتان کەوتونە شەڕ فرۆشتن و بیانوگرتن بە میقداد مەدحەت بەدرخان • کار گەیشتووە بەوەی داوایان لە کاربەدەستانی میسر کردووە وەك «تاوانبارێك» میقداد مەدحەت بدەنەوە دەست ئەستەمۆڵ [٦١] • وادیارە ئەمە پاڵی نا بە بەدرخانیەکانەوە ناچار «کوردستان» بگوێزنەوە ئەوروپا •

پەیوەندیی نزیکی عەبدوڕڕەحمان بەدرخان لەگەڵ نیشتمانپەروەرانی تورك زیاتر رقی سوڵتان عەبدولحەمیدی هەڵدەستاند • زۆر لە بیروباوەڕی کۆمەڵی «تورکانی لاو» لە ناوەرۆکی وتارەکانی «کوردستان»دا ئاشکرا رەنگیان داوەتەوە • عەبدوڕڕەحمان بەدرخان یەکێك بو لە بەشدارانی یەکەم کۆنگرەی ئەم کۆمەڵە کە شوباتی ساڵی ١٩٠٢ لە پاریس بەسترا • جگە لەوە جاروباریش لە رۆژنامەی «عوسمانلی» ئۆرگانی ئەو کۆمەڵەدا وتاری بڵاودەکردەوە [٦٢] • سەرەڕای هەمو ئەمانە ژمارەکانی ئەوروپای «کوردستان» ئاشکرا لە چاپخانەکانی کۆمەڵی «تورکانی لاو» چاپدەکران• لە دوا لاپەڕەی زوربەی ئەو ژمارانەی لە ئەوروپا چاپکراون ناوی ئەو چاپخانانە بەئاشکرا تۆمار کراوە •

---

(٦١) تایبەت بڕوانە سەروتاری ژمارە پێنجی «کوردستان» کە بریتییە لە نامەی میقداد مەدحەت بەدرخان بۆ سوڵتان عەبدولحەمید . شایانی باسە ئەو سەردەمە گەلێ جار کاربەدەستانی ئەستەمۆڵ داوای داخستنی رۆژنامە ناحەزەکانی سوڵتانیان لە خدێوی میسر دەکرد (بڕوانە : د. سامی عزیز ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٦٧ ــ ١٦٨ ) .

(٦٢) بڕوانە : E. E. Ramsaur, OP. Cit., P. 63. بەشی زۆری ژمارە ٣١ی «کوردستان» (١٤ی نیسانی ١٩٠٢) بۆ باسی هەواڵی ئەو کۆنگرەیە تەرخانکراوە .

دیاره ئەمەندە بەس بێ بۆئەوەی خاکی کوردستان لە «کوردستــان» قەدەغە کرێ • خاوەن و خوێنەرانی چەند جــارێ باسی ئەمەیــان لەســەر لاپەڕەکانی «کوردســـتان» خــۆی کردووە • بــەڵام کپ کردنی دەنــگی خەباتکەری رەسەن کارێکی مەحاڵە • بەپێی ئەو یاسا چەسپاوە «کوردستان» توانی وەك یەکەم رۆژنامەی کوردێ تا رادەیەکی زۆر دەوری مێژوویێ خۆی ببینێ • وەك لای راستی ناوی رۆژنامەکە خۆیەوە نوسراوە خاوەنی هەرجارە دوو هەزار دانەی لێ ناردۆتە کوردستان بەونیازەی بێ پارە بەسەر خەڵکــدا دابەش بکرێن [٦٣] • دوور نییــە بۆ جێبــەجێ کردنی ئــەم کارە گرنــگە بەدرخانییەکان پەنایان بردبێتە بەر یاریدەی نیشتمــانپەروەرانی تــورك و ئەرمەن • هەر چۆن بێ ئەو سەردەمە ناردنی رۆژنامەی نەیــاری سوڵتــان عەبدولحەمید بۆ خەڵکی ناو وڵات کارێکی بــاو بو • بەڕێوەبــەرانی ئــەو رۆژنامانە هەزار و یەك فڕوفێڵیان دەکرد بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستەیان : جاریوا هەبو رۆژنامەکانی خۆیان دەخستە ناو چاپەمەنێ ئەوتۆوە کە وێنەی سوڵتان یا باسی باشی ئەویان تێدا بو • رۆژنامەنوسانی عەرەبیش بۆ سەر لێ شێواندنی عوسمانی و ئینگلیز یا پیاوانی خدێو پەنایان دەبردە بەر ئەو جۆرە فێڵە • یەکێکیان دە جار ناوی رۆژنامەکەی خۆی گۆڕی [٦٤] دیارە بۆئەوەی نەناسرێتەوە و بەوجۆرە بگاتە ناو وڵات •

گومان لــەوەدا نییە لــە هەر رێگەیەکەوە بوبێ بــەدرخانییەکان

---

(٦٣) ئەم راستییە بە کوردی و بە تورکی لای راست و چــەپی ســـەرەوەی زیاتر لە نیوەی ژمارەکانی «کوردستان» نیشان دراوە . لای راستەوە نوسراوە : « هر جار دو هزار جریدیا بی پَرَه ازی ریکم کردستانی دەبدەن خەلکی» یا « . . . دە بلاش بدنخەلکی» . لە هەندێ ژمارەدا دوو هەزارەکە بۆتە «دو صد» و لە هەندێکیتریشدا وایلێهاتووە «کردستان داخلندە خصوصی استەیئلرە مجاناً کوندریلور » .

(٦٤) بڕوانە : د. سامی عزیز ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٤٢ ــ ٤٣ ، ٧٢ .

«کوردستان»یان دەگەیاندە دەست سەرەك هۆز و روناکبیرانی کورد • لە زۆر نوسینی ناو «کوردستان»ەوە دەردەکەوێ ژمارەکانی زوبەزو دەگەیشتنە زۆر ناوچەی کوردەوارێ و شوێنیتری ناو دەولەتی عوسمانی • هەر زو پەیوەندێ لەنێوان خاوەنی «کوردستان» و روناکبیری کوردا دروست بو • لە لاپەڕە چواری ژمارە دوّی «کوردستان»دا میقداد مەدحەت بەدرخان باسی نامەی «هەندێك میر و ئاغای کورد» دەکا و دەڵێ داوایان لێ کردووە باسی « حاڵی نهۆ و ئەدەبیاتا کوردێ» بڵاو بکاتەوە • لە ژمارە سێیدا نامەی کوردێکی شام بڵاو کراوەتەوە کە باسی ئەوە دەکا چۆن «کوردستان»یان پێ گەیشتووە و خەڵك لە خۆشیانا ماچیان کردووە و کۆتاییش گەلێك رەحمەتی بۆ میقداد مەدحەت و باو و باپیری ناردووە • دوای ئەوە بە دوّ ژمارە نامەی « اطنەیی سید طاهر بوظی »ی بڵاوکردوّتەوە کە خاوەنی بەرز ناوەرۆکی «کوردستان»ی نرخاندووە و باس دەکا چۆن لە «خوێندنەوەی تێر نەبووە» و داوا دەکا هەرجارەی «چل پەنجا» دانەی بۆ بنێرن چونکە ئەدەنە «وەك باژێری کوردی لیهاتووە» و « هەر ساڵەی دە پازدە هەزار» کوردی تێدەرژێ و گەلێکیان ، وەك دەڵێ ، لەوێ دەمێننەوە [٦٥] • لە ژمارەیتری «کوردستان»دا نامەی خەڵکی ماردین و دیاربەکر و موسڵ و شوێنیتر بڵاوکراوەتەوە [٦٦] • لەوەش گرنگتر : لەسەر لاپەڕە چواری ژمارە سیازدە لیستەی ئەو پارەیە بڵاوکراوەتەوە کە بەشدارانی «کوردستان» لە دیاربەکر و سلێمانی و ئەدەنەوە ناردویانە •

وادیارە «کوردستان» لە دەرەوەش ، تایبەت لەناو رۆژهەڵاتناسانا ، دەنگی داوەتەوە• عەبدوڕڕەحمان بەدرخان لە ژمارە سیازدەی «کوردستان»دا

---

(٦٥) زۆر کەم دەستکارێ قسەی ناو کەوانەکان کراوە ئەویش بەنیازی گونجاندنی ئەو شوێنانە لەگەڵ ناوەرۆکی رستەکان .

(٦٦) بڕوانە : ژمارە ٨ و ١٣ و ١٤ و ١٥ و هیتر .

باسی ئەوە دەکا چۆن لەوەتەی دەستی کردووە بە دەرکردنی رۆژنـامەکەی «گەلێك مرۆڤی ئەجنەبیی ئەڵەمان و نمچە (نەمسایی ــ ك٠ م٠) و ئینگلیـز» ئیشتراکیان تێدا کردووە «علی الخصوص یەك ئەڵەمان هەیە ناوی ڤی مسیۆ ( مارتن هارتمـان )ە » کە زوربەی زمـانی گەلانی رۆژهـەڵات دەزانێ و تەنانەت لەگەڵ ئەو خەریکی فێربونی کوردیشە ٠ هیـچ دوور نییە ئەو ٢٦ ژمارە دەگمەنەی «کوردستان» کە لە کتێبخـانەی دەولـەتی مـاربورگی ئەڵەمانیای رۆژئـاوا پارێزراون هەر ئەوانــە بن کە کاتی خۆی بۆ زانـای بەناوبانگ هارتمان [٦٧] چوون ٠

شایانی باسە ژمارەکانی یەکەم رۆژنامەی کوردی ئیستە زۆر بەدەگمەن دەستدەکەون ٠ جگە لەو ٢٦ ژمارەیەی کتێبخانەی دەولەتی مـاربورگ کە کاتی خۆی دوکتۆر کەمال فوئاد بە ئۆفسێت بلاوی کردنەوە ١٨ ژمـارەش لەوانەی ساڵی ١٨٩٩ و بەدواوە چاپ کراون لە کتێبخانەی نیشتمانی ئەنقەرە پارێزراون [٦٨] ٠ ژمارە یەکیشی لە کتێبخانەی لقی دەزگای رۆژهەڵاتناسی سۆڤیەت لە لێنینگراد هەیە ٠ لە کتێبخانەی «کۆڕی زانیاری کورد» ژمارە پێنج و لاپەڕە سێ و چواری ژمارە سێی هـەن [٦٩] ٠ یەکەمیـان لەســەر کاغەزێکی تەنکی رەنگ سەوز و دووەمیـان لەســەر کاغەزێکی زەردبـاو

---

(٦٧) پرۆفیســۆر مارتن هارتمـان ( M. Hartmann ) (١٨٥١ ــ ١٩١٨) عەرەبناسێکی ناوداری ئەڵەمانە ، زۆر شارەزای مێژۆی ئیسلام بوە .

(٦٨) بڕوانە
(( Eski harfli Türçe süreli yayinlar toply Katalogu )) , Ankara, 1963.
زۆر سوپاس بۆ دوکتۆر سەنان سەعید کە سەرنجی بۆ ئەم راستییـە راکێشـام .

(٦٩) دیاری ئەندامی یاریدەری کۆڕ بەڕێز رەوشەن بەدرخانن .

چاپکراون (٧٠) • دوور نىيه جگه لهمانه ژمارهىترى «كوردستان» لهملا و لهولا دهستبكهون (٧١) •

پياوانى سولتان ههولێكى زۆريـان لهگهڵ نهوهى بهدرخان پاشـا دا بۆئهوهى دهسـت لـه بلاوكردنـهوهى «كوردسـتان» هـهلگرن • وهك لهپێشيشهوه باسمانكرد سولتان عهبدولحهميد ئاماده بۆ ههموشتێك بكا تهنها بۆئهوهى ناحهزانى دهرهوهى به لاى خۆيدا راكێشێ • بهوجۆره توانى زۆر سهردار و رۆژنامهى نايارى خۆى بكرێ كه يهكێكيان رۆژنامهى ناودارى «مشورت» بۆ (٧٢) كه توركانى لاو له دهرهوهى ولات دهريانده‌كرد •

تائێسته بۆمان ساغ نهبۆتهوه «كوردستان» چـۆن و بۆ له دهرچـون وهستا • وهك رامزور باس دهكا گوايه «نوێنهرانى سولتان سـالى ١٩٠٤ توانيويانه (عهبدورِرهحمان بهدرخـان ــ ك• م•) قـايل كهن دهسـت لـه بلاوكردنهوهى رۆژنامهكهى ههلگرێ» (٧٣) • ههرچهنده دوور نىيه وهستانى « كوردستان » ئهنجامى كارێكىوا بوبێ ، بهلام لهگهڵ ئهوهش پێويسته چهند راستىيهك بۆ مێژو تۆمار بكهين • بهر له ههموشـت دوا ژمـارهى زانراوى «كوردستان» نيسانى سالى ١٩٠٢ دهرچووه نهك ١٩٠٤، لهوكاتهشدا عهبدورِرهحمان بهدرخان له ريزى پێشهوهى ناحهزانى سولتان عهبدولحهميد بو ، ههموى مانگێك بۆ له يهكهم كۆنگرهى توركانى لاو گهرِابۆوه جنێڤ • جگه لهوه تا دوا ژمارهى زانراوى «كوردستان» (٧٤) به تۆسقاڵ بۆنى ئهوه

---

(٧٠) بڕوانه : «گۆڤارى كۆرِى زانيارى كورد» ، بـهرگى يـهكهم ، بهشـى يهكهم ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩٧ ، ٤٠٢ •

(٧١) له قاهيره بهدواى ژمارهكانى «كوردستان»دا گهرِام ، بهداخهوه گهرِانهكهم بێئهنجـام بو •

(٧٢) بڕوانه : E. E. Ramsaur, Op. Cit., P. 53.

(٧٣) Ibid, P. 63.

(٧٤) به قسـهى مامۆستايان محهمهد ئهمين زهكى و محهمـهد عهلى عـهونى

ناکرێ خاوەنی لە ڕێبازی کوردایەتی ڕاست و خاوێن لای دابێ • دوور نی یە لەبەر کەمدەستی یا لەژێر فشاری چەتەولەکانی سولتانا یا لەبەر مەبەستێکی سیاسیتر «کوردستان» لە دەرچوون وەستابێ •

ئەمەبوو بەکورتی داستانی لەدایکبوون و ژیانی پڕ ئێش و ئازاری یەکەم ڕۆژنامەی کوردی • بڕوا ناکەم مێژووتوسێکی خاوەن ویژدان هەبێ ئەم

---

«کوردستان» دوای شۆڕشی ساڵی ۱۹۰۸ ماوەیەکیش لە ئەستەمووڵ چاپ کراوە (بڕوانە : محمد امین زکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۱۷۰). چاپەمەنی‌یەکانی «خۆیبوون»یش وادەڵێن (بڕوانە : د. بلەچ شیرکوە ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥١ ؛

(( La Question Kurde. Ses origines et ses causes )), Par Le Docteur Bletch Chirguh, Le Caire, 1930, P. 19 )

تاوەکو ئێستە ئەم ڕاستی‌یە بەتەواوەتی ساغ نەبۆتەوە . گەر وابوایە هیچ نەبێ دەبوو ئەو ژمارانەش لە کتێبخانەی نیشتمانی ئەنقەرە ناویان وەك ئەوانەی دەرەوە هەبوایە (بڕوانە : پەراوێزی ژمارە ٦٨) . لەگەڵ تەواوبونی شەڕی یەکەمی جیهان گۆڤارێك لە ئەستەمووڵ بە ناوی «کوردستان»ەوە کەوتە دەرچون . مامۆستا عەلائەددین سەجادی و ئەو نوسەرانەی دوای ئەو باسی گۆڤاری ناوبراویان کردووە بە هەڵە ۱۹۱۷یان بە ساڵی دەرچوونی داناوە و بە ڕۆژنامە ناویان‌بردووە . لەوە دەکا مامۆستا سەجادی ساڵی ڕۆمی ئەو ڕۆژنامەیەی وەك ساڵی کۆچی (هیجری) گۆڕیبێتە سەر ساڵی عیسایی . جگە لەوەی خۆم ۱۹ ژمارەی ئەو « کوردستان »ەم دیوە ، بەڵگەیەکی باوەڕ پێ‌کراوی‌تریش بەدەستەوەیە گومان لەوەدا ناهێڵێ ئەم «کوردستان»ە دوای شەڕی یەکەم چاپ‌کراوە نەك لە جەنگەی شەڕدا:لە بەرگی پشتەوەی ژمارە ۱۱ی گۆڤاری «ژین» کە دوای تەواوبونی شەڕی یەکەم دەستی بە دەرچون کرد (بڕوانە : پەراوێزی ژمارە ١٤) بەنیازی ڕاگەیاندن باسی دەرچونی ژمارە دوی «کوردستان» بڵاوکراوەتەوە.لە هەمان شوێنی ژمارەکانی‌تری گۆڤاری « ژین »دا باسی دەرچوونی یەك لەدوای یەکی «کوردستان» بڵاو کراوەتەوە . سەرەڕای هەموو ئەمانە لە ساڵەکانی شەڕدا ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی لەبەر بێ‌دەرامەتی دامو دەزگای خۆیان دەپێچایەوە یا زۆر لەجاران کەمتر دەردەچون . بڕوا ناکەم روناکبیری کورد ئەوساڵانە توانای دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤاری هەبوبێ.

داستانه به سەرەتایەکی پرشنگداری پڕ ماناو بەڵگە دانەنێ • هەر لەو سەرەتایەشەوە رۆن دیار بۆ پەرەسەندن و گەشەکردنی رۆژنامەنوسی کوردی بەستەیە بە رادەی رەسەنی سروشتی دیموکراسی ئەو رژێمانەی وا هات کورد لەژێر سایەیاندا بژی • ئەوەبو تا شۆڕشی سالی ۱۹۰۸ی تورکیا سەرنەکەوت رۆژنامەیەکیتری کوردی چاوی هەڵنەهێنا •

هەروەك دوکتۆر لازەریێف دەڵێ لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ۱۹۰۸ «بەهارێکی کورت» لە ژیانی کوردا دەستی پێکرد [۷۵] • بۆ یەکەمجار مێژوی کورد چەند کۆمەڵ و دەزگایەکی روناکبیری و سیاسی بەخۆیەوە بینی • پایزی سالی ۱۹۰۸ ، واتە یەکسەر دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ناوبراو [۷٦] ، ئەمین عالی بەدرخان و شەریف پاشا و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و ژمارەیە سەرداری ناسراویتر کۆمەڵی «تەعالی و تەرەقی کوردستان»یان دامەزراند و بەناوییەوە «کورد تەعاون وە تەرەقی غەزەتەسی »یان بلاوکردەوە • زۆری نەخایاند قوتابیانی کوردی ئەستەمۆل کۆمەلی «هیڤی»یان دامەزران و سالی ۱۹۱۳ش دەستیانکردە بلاوکردنەوەی گۆڤاری «رۆژ کورد» [۷۷] • هەر لەو دەوروبەرەشدا گۆڤارێکیتر کە ناوی

---

(۷٥) م. س. لازەریێف ، مەسەلەی کورد ، ل ١٤٥ .

(۷٦) شۆڕشی تورکانی‌لاو کە بە مەشروتە و شۆڕشی ئیتیحادی ناسراوە تەموزی سالی ۱۹۰۸ بەرپابو .

(۷۷) ژمارە ۳ی «رۆژ کورد» (رۆژی کورد) یەکی ئابی سالی ۱۳۲۹ (۱۹۱۳) دەرچووە . ژمارە ٤ی رۆژی ۳۰ی ئابی هەمان سال چاپکراوە . بەمەدا وا دەردەکەوێ «رۆژی کورد» مانگانە بوبێ و ژمارە یەکی سەرەتای حوزەیرانی سالی ۱۹۱۳ یا ئەو دەوروبەرە دەرچوبێ . لێرەدا پێویست و گرنگە سەرنج بۆ ئەو قسەیەی مینۆرسکی راکێشین کە دەڵێ ئەم گۆڤارە کە بەر لە دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهان ناوی بووە «هەتاوی کورد» لەناو خەڵکدا زۆر بلاو بۆ بەرادەیە ، وەك دەڵێ ، خۆم «لە ناوچەی دۆری سلێمانی» هەوالیم بیست (بڕوانە : ف. ف. مینۆرسکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۱۸ ) .

«یەکبون» بۆ کەوتە دەرچون [٧٨] .

ڕۆژنامەنوسی کوردی لە سەرەتاوە بە پێی سروشـــتی مەرجی مێژویی ئەو قۆناغە و لە قەوارەی تێگەیشتنی نیشتمانپەروەرانی ئەو سەردەمە جێگەی دیاری بۆ مەسەلەی خوێندن و خوێندەواری و ژیانی روناکبیری تەرخانکردە چەند روێەکی ئەم لایەنەمان لەگەڵ باسی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی خســتە بەرچاو . بەنیازی زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم باسە گرنگە پەنا دەبەینە بـەر چەند نمونەیەکیتری ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە .

ئەوانەی ژمارەی «کورد تەعاون وە تەرەقی غەزەتەسی»یان دیوە دەڵێن ناوەرۆکی بۆ مەسەلەی نەتەوەیی و زمان و ژیانی روناکبیری و فۆلکلۆری کوردی و ئەو جۆرە باسانە تەرخان کرابو و لەناو کۆمەلانی خەلکدا بـاش دەنگی دابۆوە [٧٩] . «ڕۆژی کورد» و «یەکبون»یش بەشی هەرە زۆری لاپەڕەکانیان بۆ ئەو جۆرە باسانە تەرخان کردبو . سەروتاری ژمارە سێی «ڕۆژی کورد» «قەڵەم بەر لە شێر»ە . خـاوەنی وتار هـەمو دواکەوتن و گیرۆدەیی کورد لەوەدا دەبینی کە «بایەخیـان داوە بە شـێر نەک قەڵەم» . نرخدان بە زانیاری و زانست لای «ڕۆژی کورد» وەک جێبەجێکردنی ئەرکی ئاینی وایە و بێ ئەو «حەقی خۆمـانە لەم ژیانە ناخۆشـەدا بژین» [٨٠] . «یەکبون»یش لە ژمارە دوێدا بەداخەوە باسـی ئەوە دەکا چـۆن «لەگەڵ

---

(٧٨) وابزانم تائیستە کەس باسی ئەم گۆڤارەی نەکردووە . کاتی خۆی بەڕێز ڕەوشەن بەدرخانی خێزانی جەلادەت بەدرخان ژمارەیە لەو وتارانەی دامێ کە بە زمـانی تورکی لە «یك بـون» (یەکبـون) و «ڕۆژی کورد»ا بلاوکراونەتەوە و زوربەیان لە نوسینی صالح بەدرخانی باوکێن . بـۆ نوسینی ئەم بەشە کەلکی زۆرم لەو وتارانە بینی .

(٧٩) بڕوانە : A. Safrastian, Op. Cit., PP. 70 — 71 . لە ئارشیفی باسیل نیکیتینیشدا باسی لەوجۆرە هـەیە (بڕوانــە : م. س. لازەرێـف ، مەسەلەی کورد ، ل ١٤٥ ، ٤٠٥ ) .

(٨٠) «ڕۆژ کرد» ، ژمارە ٣ ، ١ ی ئابی ١٣٢٩ .

ئەوەش هیچمان لە گەلانی‌تر کەمتر نی‌یــە» کەچی هێشــتا «نەمــاتتوانیوە دەسەڵات و توانای خۆمان لە ژیانــدا نیشــان‌دەین » چونکە « بەجــارێ نەخوێندەوار و نەزانین »[81] . لەبەرئەوە سەیر نی‌یە گەر هەمان گۆڤــار بەگەرمی داوا بکا کارێکی‌وا بکرێ زۆبەزۆ «بە لای کەمەوە ٤٠٪ یا ٥٠٪ی کورد فێری نوسین و خوێندنەوە بکرێن» . بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم مەبەستە «یەك‌بون» رۆی دەمی دەکاتە لاوان و داوایان لێ دەکا «دەست لە خۆشی ژیان هەڵگرن » و «رو کەنە شاخە بەرزە ساردەکانی کوردستــان و ببنــە مامۆستا و رێ‌نیشاندەری رۆڵەی ساکاری میللەت » [82] . «ژین» داوای دەکرد «میللەت هەمو بخوێنن» [83] ، «بە رۆژ و بە شەو بخوێنن ، مەکتەب ڤەکەن ، تەحصیل بکەن» [84] .

ئەم هاوارەی ئەستەموڵ هەر لەو رۆژانەدا لە بەغداش دەنگی دایەوە . جەمالەددین بابان رۆژی ١٢ی «ربیع الاول»ی سالی ١٣٣٢ ك ، واتــە ٨ی شوباتی ١٩١٤ ژمارە یەکی گۆڤاری «بانگ کرد» (بانگی کورد)ی بە تورکی و کوردی بلاوکردەوە [85] . گۆڤاری بەغدامان کوردی هاندەدا دەرس لــە «قەومێکی پچوکی وەك ژاپۆنیا» وەرگرێ چونکە ئەو بە « سایەی سەعی و تەقدیری قیمەتی وەختیان دەولەتێکی عظیمی وەکو روسیەیان شکان و تارومار

---

(٨١) «یك‌بون» ، ژمارە ٢ ، ١٩ی ئەیلولی ١٣٢٩ .

(٨٢) بڕوانە : «یك‌بون» ، ژمارە ٣ ، ٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٩ .

(٨٣) «ژین» ، ژمارە ٦ ، ٢٥ی کانونی یەکەمی ١٣٣٤ ، ل ١٦ .

(٨٤) «ژین» ، ژمارە ١٢ ، ٢٥ی شوباتی ١٣٣٥ ، ل ١٦ .

(٨٥) لە چاپخانەی «الاداب»ی بەغدا چاپ‌دەکرا . لە ژمارە یەکی‌یــەوە تــا ژمارە سێی بەسەریەکەوە ٧٢ لاپەڕەن ، واتە هەر ژمارەیەی ٢٤ لاپەڕە بو . بەپێی زانیاری‌یەکانی مامۆستا عەبدوڕڕەزاق حەســەنی «بــانگی کورد» پێنج ژمارەی لێ دەرچووە (بڕوانــە : عبــدالرزاق الحســنی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٥) . ئێمە تەنها سێ ژمارەی ئەم گۆڤارەمــان دیــوە .

کرد » [٨٦] . «بانگی کورد» «هاوار و داد و بێـــدادی» بۆ بۆ دامـــەزرانی کۆمەڵێك تاوەکو «بە تەشویق و کۆششی» ئەو «لە هەمۆ جێگەیە مەکتەبێ گوشاد بکرێ و قەومی کوردان لەم جەهالەتە تخلیص بکا» [٨٧] . « بانگی کورد»یش بە چەشنی رۆژنامە و گۆڤارە کوردی‌یـەکانی‌تر هەوڵی‌دەدا لـــە رێگەی بزواندنی هەستی ئایینی‌یەوە خەڵك بۆ خوێندن هان دا . وەك نمۆنە ئەم چەند بەیتەی خوارەوەی دەخەینە پێش چاو :

بۆ تەرەققی مولـــك و میللـــەت ئیتتیحادمـــان لازمـــە
سەرفی غیرەت چـــاکە با غەیبی نەکەین ئـــەم فرسەتـــە
محەفەظەی دین و شەریعەتمـــانە خۆ خـــاکی وەتـــەن
ئـــاوەدانی ئەو بە زۆری عیلـــم و فـــەن و سەنعەتـــە
ئیـــش ئەگەر وابێ وەتـــەن نـــورانی‌یو مەعمـــور دەبێ
رستگاریمان دەبێ ئێمەش لە دەســـت ئـــەم ظولمەتە
دوژمنی عیـــلم و مەعـــاریف خانەمـــان ویـــران دەکا
زۆر خراپە و موهلیکە ، دەرمانی کەین ئەم عیللەتە [٨٨]

دوای ئەوەی رۆی شۆڤێنی سیاسەتی نەتەوەیی رژێمی نوێی تورکانی لاو دەرکەوت چاپەمەنی کوردی دیسان گلولەی کەوتە لێژی . تا شەڕی یەکەمی جیهان دەستی پێ‌کرد سەرتاپای رۆژنامە و گۆڤـــارە کوردی‌یەکان داخران . لەگەڵ تەواوبونی شەڕ و کەوتنی رژێمی دواکەوتـــوی تورکانی لاو بزوتنەوەی نەتەوەیی گەلانی ناو ئیمپراتۆری عوسمانی بەجارێ خرۆشا و ئەنجـــام قۆناغێکی نوێ لە ژیانی رۆژنامەنوسی ئەو گەلانەدا دەســـتی پێ کرد . رۆژنامەنوسی کوردیش ئەو سەردەمـــە بەجـــۆرێکی هەست پێ‌کراو

---

(٨٦) «بانگ کرد» ، ژمارە ٣ ، ١٣٣٢ ، ل ٦٨ . زۆر کەم دەستکاری شێوەی نوسینەکەی کراوە .

(٨٧) هەمان ژمارە ، ل ٦٩ .

(٨٨) هەمان ژمارە ، ل ٦٩ ــ ٧٠ .

بوژایەوە • بەڵام بەداخەوە تەمەنی ئەم قۆناغە بۆ کورد هەناسەیە بۆ • قۆناغی داهاتوی رۆژنامەنوسیی کوردیی ــ وەك دوایی باسی دەکەین ــ پڕ لە روداو و بەسەرهاتی بێوێنـــەیە •

پەیدابونی رۆژنـــامەنوسیی کوردیی لە ئێران تـــارادەیەك دواکەوت • لێرەش دیسان یەکەم روناکبیری دوربین کە ویستی رۆژنـــامەیەکی کوردیی دامەزرێنێ لە بنەماڵەی بەدرخـــان بو • ســـەرداری نـــاودار عەبدوڕڕەزاق بەدرخـــان [٨٩] زۆ بـــە دروســـتی دەوری خوێنـــدن و خوێنـــدەواریی و رۆژنامەنوسیی بۆ ژیانی گەل زخاند • ئەوەبو ساڵی ١٩١٣ لە شاری خۆی لەسەر ئەرکی خۆی و پارەی کۆکراوەی خەڵك یەکەم قوتابخانەی کوردیی دامەزراند [٩٠] • هەر لەوێش کۆمەڵێکی روناکبیریی دروست کرد و نیـــازی بو چاپخانەیەکی لە دەرەوە بۆ بهێنێ و رۆژنامەیەکی بەناوەوە دەرکا • بەڵام چەند ئاڵوگۆڕێکی سیاسیی نالەبار بونە کۆسپ لەبەردەم جێبەجێکردنی ئەم نیازەی کە تا مردن لە مێشکی دەرنەچو [٩١] • عەبدوڕڕەزاق بەدرخان لـــە

---

(٨٩) عەبدوڕڕەزاق بەدرخان دەرەبەگێکی لیبرالی کوردپەروەری دوربێـــن و چالاك بو . لە کاری رۆژانەیدا بایەخی زۆری بە بلاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواریی دەدا . یەکەم کەس بو بیری لە دانانی ئەلفبـــای کـــوردیی بەپیتی لاتینی یا سلاڤی کردەوە (لەبارەیەوە بڕوانە : م. س. لازەرێف ، کوردستـــان و کێشـــەی کورد، ل ٦٩، ٧٠، ١٥٥ ــ ١٦٠ ، ٢٣٧ ــ ٢٤٠ و گەلێکیتر . هەروەها بڕوانە د. کمال مەزهەر ، سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی کوردیی : ل ٢٢ ، ٢٤ ، ٣٧ــ٣٨ ، ٣٩ ، ١٧٥ ، چـــاپی عەرەبی : ل ٥٠ ، ٦٤ ، ١٠٢ ، ١٠٣ ، ١٠٤ ، ٣٥٩ ) .

(٩٠) بڕوانە : ك. ، اول مدرسة كردية في ايـــران ، ــ «التـــآخي» ( صفحـــة «الثقافة الكردية» ــ ٨ ــ ) ، ٢٠ تشرين الثاني ١٩٧٣ .

(٩١) ژمارەیە نوسەری کورد باســـی ئەوەیـــان کردووە گوایە عەبدوڕڕەزاق بەدرخان ساڵی ١٩١٣ لە ورمێ رۆژنامەیەکی بە ناوی «کوردستان»ەوە دەرکردووە و گوایە دوای گرتنی لەلایەن روســـەکانەوە سمکۆ لەســـەر دەرکردنی بەردەوام بووە (بڕوانە : علاءالدين سجادی ، سەرچـــاوەی

دەرەوەی وڵاتیش (چ لە رووسیا و چ لە فەرەنسە) هەوڵیدا رۆژنامە یا گۆڤارێکی کوردیی بەپیتی لاتینی بڵاوکاتەوە .

میسیاتێرەکان یەکەم هەنگاویان لە مەیدانی رۆژنامەنووسی کوردیی ئێراندا نا . وەك مینۆرسکی باس دەکا میسیاتێرە پروتستانتەکان لە سابڵاغ (مەهاباد) بە یاریدەی دەزگا ئەڵەمانییەکان گۆڤارێکی پچوکیان بە ناوی «کوردستان»ەوە دەرکرد کە وتار و فۆلکلۆری کوردیی بڵاو دەکردەوە . مینۆرسکی دەربارەی هەمان باس ئەوەشی تۆمار کردووە کە خۆی ژمارە یەکی گۆڤاری ناوبراوی هەیە و نیسانی ساڵی ١٩١٤ دەرچووە (٩٢) .

دەستپێکردنی رۆژنامەنووسی نەتەوەیی کوردیی لە ئێران هاوکاتی رۆژانی خەبات و دەسەڵاتی ئیسماعیل ئاغای شوکاك (سمکۆ)یە . دوای شەڕی یەکەمی جیهان و دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ لە بزوتنەوەی سمکۆدا و دوای ئەوەی دەسەڵاتی گەیشتە ورمێ کە چاپخانەی خۆی هەبوو

---

ناوبراو ، چاپی یەکەم . لە چاپی دووەمیدا باسی نەکردووە ؛ محەمەدی مەلا کەریم ، سەرچاوەی ناوبراو ؛ جمال‌خزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٩) . سەرەڕای نەبونی هیچ بەڵگەیە لەم‌بارەوە سمکۆ بەر لە عەبدوڕڕەزاق بەدرخان لەلایەن رووسەوە گیرا و بە دەست‌بەسەریی نێررایە تبلیسی گورجستان (یەکەمیان سەرەتای ساڵی ١٩١٥ و دووەمیان ناوەندی هەمان ساڵ گیرا ) .

(٩٢) ف. ف. مینۆرسکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٩ . مامۆستا ئەمین زەکی باسی گۆڤاری «کوردستان» دەکا و دەڵێ «میسیاتێرەکان لە ورمێ دەریان دەکرد» (محمد امین زکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٧٠ ـ ٣٧١) . مامۆستا عەلائەدین سەجادی و دوابەدوای ئەو نووسەریتر باسی ئەم گۆڤارەیان دووبارە کردۆتەوە و دەڵێن «مانگی جارێ لە ورمێ موبەشیرەکان لە ساڵی ١٩١٢ دەریان‌ئەکرد ، بەڵام زۆر نەژیا » (علاءالدین سجادی ، سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی دووەم ، ل ٦١٠ ) . دیارە ئەمانە لەگەڵ قسەکانی مینۆرسکی تەواو یەك‌ناگرنەوە ، هەرچەندە دوور نییە ئەم گۆڤارە لە ورمێ چاپکرابێ چونکە لەوانەیە ئەوکاتە چاپخانە لە سابڵاغ نەبوبێ .

دەستی کردە دەرکردنی ڕۆژنامەیە کە سـەرەتا نـاوی «رۆژ کرد ـ شـەو عەجەم» [٩٣] (ڕۆژی کورد ـ شەوی عەجەم)ی لێ نا ، دوایێ ئەم نـاوەی گۆڕێ بە «رۆژ کرد» (ڕۆژی کورد) و ئینجا بە «کرد» (کورد) ، لە سـەرێ ناوی «کورد»ەوە نوسراوە : «واعتصموا بحبل الله جمیعاً ولا تفرقوا» ، لـە ژێریشیەوە وێنەی دوو دەست لە یەکدا وەك نیشانەی یەکیەتی دروست کراوە، لای راستەوە نوسراوە : «جیگی ادارە ورمی ، چاپخانە غیرت ، مدیر محمد ترجانی [٩٤] ، مقالاتیك منفعت کردان تیدا بی وردگیری ، جاری لە هـەر هەفتەدا یکیك چاپ دکری » [٩٥] ، لای چەپەوە نوسراوە : « حق ڕۆژنامە پیشەکی وردگیری ، داخلە سالیك ٥٠ خارجە ٦٠ قران ، ششمانك ٢٧ و ٣٥ قران ، قیمت یك نسخە دە شاهی ، قیمت اعلانـات هر دیری دو قران » ، لەژێر ناوی ڕۆژنامەکە نوسراوە : « ڕۆژنامیکە سـیاسی ادبی اخبـاری ، سرمقالی ترجمە دکری بفارسی ، دینوسی کوردیك بو هەمو کردان » [٩٦] ،

---

(٩٣) دەستکارێ جۆری نوسینی نەکراوە . دیارە مەبەست «ڕۆژی کورد ـ شەوی عەجەم »ە . (دەربارەی ڕۆژنامەکانی سمکۆ بڕوانە : محمد تمدن، اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیە ، تهران ، ص ٣٧١ـ٣٧٢).

(٩٤) مەبەست لە شێخ محەمەدی تورجـانێ شێخ محەمـەدی کوڕی مەلا محەمەد حسەینی کوڕی مەلا عەلێ قزلجی‌یە . بنەماڵەی ئەم زانـایە دانیشتوی گوندی قزلجەی نزیك پێنجوین بوّن . کاتێ خـۆی باپـیری چۆتە تورجان کە کەوتۆتە نێوان سـەقز و بـۆکان . خـۆی لە بۆکان لەدایكبووە . باوکی مامۆستای مزگەوت بو لە مەهـاباد ، بۆ خوێندن چووە میسـر و زۆ لەناو هاوەڵەکانیدا وەك پیاوێکی زیرەك ناوی‌دەرکرد و دوایێ وەك زانایەکی دەسەڵاتداری خامە رەنگین زیاتر ناسرا . لە بەغدا لە کلیەی شەریعە دەرسی دەوتەوە ، لە مزگەوتی حسـەین پاشـا و شـبلێ و هێ‌تر پێـش‌نوێژێ دەکرد . مامۆسـتا حەسـەن قزلجێ چیرۆکنوس یەکێکە لە خزمانی .

(٩٥) «جێگەی ئیدارە : ورمێ ، چاپخانەی (غیرەت) . مدیر محمد تورجانێ . مەقالاتێك مەنفعەتی کوردانی تێدابێ وەردەگیرێ ...» .

(٩٦) «... دەینوسێ کوردێ بۆ هەمێ کوردان» .

دوای ئەوەی بزوتنەوەی سمکۆ سەرەتای بیستەکان نوشوستی هێنا و ورمێی لەدەستچۆ ناچار وازی لە بلاّوکردنەوەی رۆژنامەکەشی هێنا • تـا سەردەمی مەهاباد رۆژنـامەنوسێ کوردێ ئەم ولاّتە جارێکیتر خـۆشێ بەخۆیەوە نەبینێ • لە ماوەی تاقە سالی مەهابادا نزیکەی ١٠ رۆژنامە و گۆڤار کەوتنە گەڕ و خزمەت :ـ

١ ـ گۆڤاری «نیشتمان» ـ ناوەندی سـالی ١٩٤٣ دەرچـو [(٩٧)] • ئۆرگانی کۆمەڵەی «ژ• ک•» (ژیانەوەی کورد) بو • ژمارە ٧ و ٨ و ٩ی بەسەر یەکەوە بە یەك بەرگ دەرچون • لە سـەری سـەرەوەی بەرگەکەی نوسراوە « الله » ئینجا «ژ• ک•» • هەروەها «نیشتمـان • بلاّوکەرەوەی کۆمەڵەی ژ• ک• گۆوارێکی ئەدەبێ ، خوێندەوارێ ، کۆمەلاّیەتێ ، سیاسیو

---

(٩٧) کاتی خۆی دوکتۆر رەحیمی قازێ و دوکتۆر قادری مەحمودزادە گەلێ ژمارەی رۆژنامە و گۆڤاری مەهابادیان دامێ . زوربەی زانیارێ ئـەم بەشە لەوان دەرهێنراون . لە گۆڤاری «نیشتمـان» کە بە سـەرەتـای رۆژنامەنوسێ مەهاباد دادەنرێ تەنها ژمارە ٧ و ٨ و ٩م لەبەردەستدایە. مامۆستا سەجادی دەلێ «یەکەم ژمارەی لە حوزەیرانی ١٩٤٣دا دەرچو» (علاءالدین سجادی ، سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی دووەم ، ل ٦١٥ ) . بەلاّم دوکتۆر رەحیمی قـازێ دەلێ یـەکەم ژمـارەی مـایسی ١٩٤٣ چـاپکرا (بڕوانە :

Гази Р.Г., Курдистанская демократическая партия - организатор и руководитель национально-освободительного движения в Иранском Курдистане ( 1945-1946 гг. ), Автореферат дисс. на соискание уч. ст. канд. ист. наук, Баку, 1954.

ر. ح. قازێ ، پارتی دیموکراتی کوردسـتان ـ رێکخەر و رەهبەری بزوتنەوەی نەتـەوەیێ ـ رزگاریخواز لە کوردسـتانی ئێران (١٩٤٥ ـ ١٩٤٦) ، کورتەی نامەی دوکتۆرێ ، باکو ، ١٩٥٤ ، ل ١٧ ) .

مانگێ کوردی»یە • لەژێر ئەم قسانەوە وێنەی صەلاحەدین چاپ‌کراوە • ئەم سێ ژمارەیەی کە «سالی یەکەم»یان لاوە نوسراوە بەز مانگی خاکەلێوە و بانەمەڕ و جۆزەردانی ۱۳۲۳ کەوتۆن کە دەکەنە مارت و نیسان و مایسی سالی ۱۹٤٤ • ژمارە یەکی لە تەورێز لە چاپخانەی کابرایەکی ئەرمەن بەنهێنی چاپ‌کراوە • زوربەی ژمارەکانی‌تری دیسان لە تەورێز چاپ‌کراون • مامۆستا رەحمانی زەبیحی سەرپەرشتی بلاوکردنەوەی دەکرد • دوای مەهاباد لە عیراق سالی ۱۹٤۸ژمارەیەکی بە چاپ‌کراوی لێ بلاوکراوەتەوە • دلشادی رەسولێ کە بە ناوی نادری‌یەوە بەرهەمی بلاوکردۆتەوە یەکێ لە نوسەرە چالاکەکانی بووە ، کاتی خۆی لە بەغدا خویندۆیە و مامۆستا بووە • هێمنی شاعیر دەلێ ئەو ئێمەی فێری رێنوسی کوردی کرد • نوسینی لە «گەلاوێژ»یشدا هەیە •

۲ ــ گۆڤاری «کوردوستان» • ژمارە یەکی رۆژی ۱٥ی سەرماوەزی ۱۳۲٤ ، واتە ٦ی کانۆنی یەکەمی ۱۹٤٥ دەرچووە • لەسەر بەرگەکەی نوسراوە «بلاوکەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان • گۆوارێکی ئەدەبێ کۆمەلایەتێ سیاسی‌یە • هەر پازدە رۆژ جارێك بلاو دەکرێتەوە » • لە مەهاباد لە چاپخانەی کوردستان چاپ دەکرا • ژمارە چواری مانگی بانەمەڕ ؛ مایسی ۱۹٤٦ چاپ‌کراوە • تا کۆتایێ سالی ۱۹٤٦ چەند ژمارەیەکی‌تری لێ چاپ‌کرا (۹۸) •

۳ ــ رۆژنامەی «کوردستان» • ژمارە یەکی رۆژی پێنج‌شەمۆی

---

(۹۸) بەپێی ئەو زانیاری‌یانەی کاك جەمال خەزنەدار لە رابەرەکەیدا باسی‌کردون وادەردەکەوێ ئەم گۆڤارە گوایە لە دۆ مانگ کەمتر ژیاوە (لە ٦ی کانونی یەکەمی ۱۹٤٥وە تاوەکو کۆتایێ کانونی دووەمی ۱۹٤٦ ) (بڕوانە : جمال خەزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٠ ) دیارە ئەمە راست نی‌یە . سەرچاوەکانی‌تریش لە باسی گۆڤاری «کوردستان»دا کەوتۆنە هەلەوە (بڕوانە : علاءالدین سجادی ، سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی دووەم ، ل ٦١٥ ــ ٦١٦ ) .

٢١/١٠/١٣٢٤ كه دەكاته ١١ی كانونی دووەمی ١٩٤٦ چاپ بووه • لـه سەرق ناوی ئەم رۆژنامەیەوه نوسراوه : «به ئێوی خودای بەرز و بێهاوتا»•
له ژێرییەوه نوسراوه : «بڵاوكەرەوەی بیری حیزبی دیموكراتی كوردستان»•
هەر دوو رۆژ جارێ ژمارەیەكی دەردەچو كه بارستی ( ٤٠ × ٢٧سم ) بـۆ • تا داخستنی پتر له ١١٠ ژمارەی لێ بڵاوبۆوه •

٤ ــ گۆڤاری «هەڵاڵه» • ژمارە یەكی بەر مانگی رەشـەمێی سـاڵی ١٣٢٤ دەكەوێ ، واته سەرەتای مارتی ١٩٤٦ ، له بۆكان چاپدەكرا • ژماره ٢ی مانگی خاكەلێوه و ژماره ٣ی مانگی بانەمەڕی ساڵی ١٣٢٥ ( نیسان و مایسی ١٩٤٦) چاپكراون • مودیری ئیدارەی ح• قزلجی بۆ [٩٩] •

٥ ــ گۆڤاری «هاواری نیشتمان» • ژماره یەكی رۆژی ١ی خاكەلێوەی ١٣٢٥ كه دەكاته ٢١ی مارتی ١٩٤٦ له مەهـاباد چاپكرا • له سـەرەوەی نوسراوه : «بڵاوكەرەوەی بیری یێكەتی جەوانـانی دیموكرات »ه ، واتـه ئۆرگانی رێكخراوی لاوان بووه •

٦ ــ گۆڤـاری «گڕوگاڵی منـداڵانی كورد» • ژمـاره ٢ی یـەكی جۆزەردان و ژماره ٣ی یەكی پوشپەڕی ساڵی ١٣٢٥ ( واته ٢١ی مـایس و ٢١ی حوزەیرانی ١٩٤٦) له مەهاباد چاپكراون [١٠٠] • بەوجۆره دەبێ ژماره یەكی یەكەم رۆژی مانگی بانەمەڕی هەمان ساڵ چاپكرابێ كه دەكاته ٢١ی نیسانی ١٩٤٦ • لەژێر نـاویدا نوسراوه : «بێـری كارگەرانی چاپخـانەی كوردستان»ه • له ژمـاره ٢ و ٣ی «گڕوگاڵی منـداڵانی كورد»ا چـەند دەرسێكی زمان و جوگرافیا بڵاوكراوەتەوه • «گڕوگاڵ» قەت پێی نەگرت و بەوجۆره وەك گۆڤاری منداڵان بووه تاقانەی مێژووی رۆژنامەنوسی كوردی•

٧ ــ گۆڤاری «هاوار» ، ژماره یەكی مانگی رەزبەری سـاڵی ١٣٢٤

---

(٩٩) دیاره مەبەست مامۆستا حەسەن قزلجییه .
(١٠٠) تەنها ژماره ٢ و ٣ی «گڕوگاڵی منداڵانی كورد»م دیوه .

چاپ‌کرا • لەسەر بەرگی یەکەمی تەنها «هاوار» و لەسەر دووەمی «هاواری کورد» نوسراوە [١٠١] •

٨ ــ گۆڤاری «هاواری نیشتمان» ، ژمارە یەکی رۆژی یەکی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٥ ، واتە ٢١ی مارتی ١٩٤٦ دەرچووە ، ئۆرگانی لاوانی دیموکرات بووە و لە مەهاباد چاپ‌کراوە • کارگێڕی ص• ئەنجیری (ئازەر) بووە • لەسەر لاپەڕە یەکی نوسراوە «گۆوارێکی : ئەدەبی • سیاسی • کۆمەڵایەتی »یە • ڕێبازی مارکسی لە ناوەرۆکیدا دیارە • لە سەرو ناوی گۆڤارەکەوە نوسراوە :

« باسەواد بیخوێنێتەوە بۆ بێسەوادان » •

لەبەر گەلێ هۆ رۆژنامەنوسی کوردی لە عیراق لە هەر شوێن زیاتر هەلی پێشکەوتن و گەشەکردنی بۆ هاتە پێشەوە [١٠٢] • سەرەتای مێژوی رۆژنامەنوسی کوردی عیراق دەگەڕێتەوە چەند مانگێ بەر لە هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی یەکەمی جیهان [١٠٣] • لە دواساڵی ئەو شەڕەوە و بەتایبەتی لەگەڵ تەواوبونی قۆناغێکی نوێی زۆر گرنگ لە ژیانی رۆژنامەنوسی کوردی عیراقدا دەستی پێ کردە رۆژنامەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحمود و «ژیانەوە» و «ژین» و «زاری کرمانجی» و «گەلاوێژ» و گەلێکی‌تر نمونەی پڕ بەڵگەی ئەم راستی‌یەن •

---

(١٠١) چەند نوسەرێکی کورد باسی گۆڤاری «ئاوات»یان کردووە کە گوایە ئەویش ساڵی ١٩٤٥ یا ١٩٤٦ لە مەهاباد چاپ‌کراوە (بڕوانە : عبدالجبار محمد جەباری ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٤٣ ؛ جمال خزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٤٨ ) .

(١٠٢) لە دەمێ ساڵەوە چاپەمەنی کوردی لە یەکیەتی سۆڤیەت بەشی خۆی لە برەودایە . یەکێ لە رووە دیارەکانی ئەو چاپەمەنی‌یە رۆژنامەی «رێیا تازە»یە کە دەیان ساڵە رێکوپێك بڵاو دەبێتەوە و لە زۆر لایەنەوە بە یەکێ لە رۆژنامە کوردی‌یە هەرە پێشکەوتووەکان دادەنرێ .

(١٠٣) ئەو سەرەتایە لەگەڵ دەرچوونی «بانگی کورد»ا دەست پێ دەکا (بڕوانە : پەراوێزی ژمارە ٨٥ ) .

لەگەڵ ئەوەش ڕێگەی گەشەکردنی ڕۆژنامەنوسی کوردی عیراق بێکەند و کەندەڵان نەبو ٠ چەند نمونەیەکی کەمی ساڵانی پێش شۆڕشی گەلاوێژ دەتوانێ وێنەیەکی بێهاوتا لەمبارەوە بۆ خوێنەر بکێشێ ٠ شێخ مەحمود بە هەمو توانا و دەسەلاتیەوە ناچار بو ساڵی ١٩٢٣ ڕۆژنامەی « بانگ حق » (بانگی حەق) لە ئەشکەوتی جاسەنەی ئەولای سورداشی نزیك سلێمانی چاپبکا [١٠٤] ٠ ژمارە یەکی ڕۆژی ٨ی مارت بلاوبۆوە ٠ تا نیسانی هەمان ساڵ تەنها سێ ژمارەی لێ دەرچو کە مەبەستی سەرەکی هاندانی کۆمەلانی خەڵك بو دژی ئینگلیز ٠ بەنیازی دەرکردنی «بانگی حەق» شێخ مەحمود بەر لە داگیرکردنی شاری سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە چاپخانەی شارەوانی «بلدیە»ی گواستەوە ئەشکەوتی جاسەنە[١٠٥] ٠ ئەمە بۆخۆی گەورەترین بەڵگەی بەرزبونەوەی بایەخی ڕۆژنامەنوسیە لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو قۆناغەی گەلی کوردا ٠ ناوی ڕۆژنامەکەش بەئاشکرا باسی

---

(١٠٤) ژمارە ٣ی «بانك حق» (بانگی حەق) لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری کورد هەیە . ئەم ژمارەیە ڕۆژی پێنجشەممەی ١٢ی نیسانی ١٣٣٩ ، ٢٦ی شەعبانی ١٣٤١ی لەسەر نوسراوە . هەرلەوێدا ڕۆژی دامەزرانی «بانگی حەق» بەمجۆرە تۆمار کراوە «تاریخ تاسیسی : ٨ مارت ١٣٣٩» . لە ژێرەوەی ناوی ڕۆژنامەکە نوسراوە «ناشکێ بە تۆپ و بۆمبا سەرفرازە بانگی حەق» . دوابەدوای ئەمە نوسراوە «سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، غزتەیکی رسمیە لە قرارگاهی عمومی ئۆردوی کوردستان طەبع دەکرێ . غایە و ئەمەلی استحصالی حقوقی کوردانە» . ژمارە سێی «بانگی حەق» دو لاپەڕەیە ، بارستی (١٣ x ٢ر٨سم)ە (بڕوانە : «بانك حق» ، ساڵ ١ ، ژمارە ٣ ، پینجشمبە ، ١٢ نیسان ١٣٣٩ ، ٢٦ شعبان ١٣٤١) .

(١٠٥) بڕوانە :
C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, PP. 319 — 320 .
ئەم زانیاریانەی ئەدمۆندس دەربارەی «بانگی حەق» جێگەی بڕوان چونکە خۆی لەگەڵ ئەو هێزانەی ئینگلیز بو کە ئەو سەردەمە بە دامرکاندنەوەی بزوتنەوەی شێخ مەحمودەوە خەریك بون و یەکێك بو لەوانەی دوای کشانەوەی شێخ و چەکدارانی چوە ناو ئەشکەوتی جاسەنە .

ئەو حەقە دەکا کە ئینگلیز کردیانە قۆچی قوربانی بەرژەوەندە تایبەتی‌یەکانی خۆیـان ٠

دیسان هەر شێخ مەحمود لە لەقەپۆپی دەسەلاتیا نەیتوانی پتر لـە ١٥ ژمارەی «رۆژ کردستـان» (رۆژی کوردستـان) و ١٤ ژمـارەی «بـانگ کردستان» (بانگی کوردستان) دەرکا [١٠٦] ٠ لە مـاوەی چوارده سـالەی فەرمانڕەوایی یەکسەرێ ئینگلیز (١٩١٨ـــ١٩٣٢) لە هەمو عیراق بەسەریەکەوە پتر لە ٢٠٠ گۆڤار و رۆژنامەی هەمەجۆر دەرچو کە تەنها ٦یان کوردی بون و هیچ‌کامیان لە چەند ژمارەیە زیاتریان لێ دەرنەچو ٠ روناکبیری نـاسراوی کورد حسەین حوزنی موکریانی بە هەزار ئەمسەر و ئەوسەر و بە کولەمەرگی «چاپخانەی کوردستان»ی پێکەوەنا کەچی لەگەڵ ئەوەش بە شەش سـالی رەبەق (لە ١٩٢٦وە تاوەکو ١٩٣٢) نەیتوانی زیاتر لە ٢٤ ژمـارەی « زاری کرمانجی» چاپ بکا [١٠٧] ٠ کەس وەك هامیلتن باسی ئەم گۆڤارە و خاوەنی

---

(١٠٦) یەکەم ژمارەی «بانگ کوردستان» (بانگی کوردستان) رۆژی ٢ی ئـابی سـالی ١٩٢٢ و دوا ژمارەی ٨ی حوزەیرانی ١٩٢٣ دەرچون . هەرچی «روژ کردستـان» (رۆژی کوردسـتـان)ە یەکەم ژمـارەی رۆژی ١٥ی تەشرینی دووەمـی سـالی ١٩٢٢ و دوا ژمـارەی ٣ی مـارتی ١٩٢٣ بلاوکراونەوە . ژمارەکانی ئەم دو رۆژنامەیە لە چەند کتێبخانەیەك و لای چەند کەسێ پارێزراون . هەندێ سـەرچاوە باسـی ٣ ژمارەی‌تری «بانگی کوردستان» دەکەن کە سالی ١٩٢٥ لە بەغدا چاپ‌کراون (بڕوانە: علاءالدین سجادی ، سەرچاوەی نـاوبراو ، چـاپی دووەم ، ل ٦١١ ؛ محەمەدی مەلاکەریم ، سەرچاوەی ناوبراو ) . چـەند سەرچـاوەیەك رۆژ و سالی دەرچونی «بانگی کوردستان»یان هـەلە چـاپ‌کردووە . بەپێی زانیاری‌یەکانی ناو رابەرەکەی کاك جەمـال خەزنـەدار «بـانگی کوردستان» مانگو نیوێك ژیاوە ( ٢ی ئەیلول ــ ٢٧ی تەشرینی یەکەم ) و گوایە بەو ماوە کەمە بۆ رۆژنامەنوسـێ کوردی ١٤ ژمارەی لێ چاپ‌کراوە (جمال خزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٧ ) .

(١٠٧) یەکەم ژمارەی گۆڤاری «زاری کرمانجی» حوزەیرانی سـالی ١٩٢٦ بلاو کرایـەوە .

ئەم گۆڤارەی نەکردووە • بەم چەند دێڕەی هامیلتن نیگاری پڕمانـای هەمو ژیانی رۆژنامەنوسێ کوردێ کێشاوە :

موکریانی « خۆی بەتەنها وتارەکانی گۆڤارەکەی دەنوسی ، خۆی بەتەنها وێنەکانی دەکێشان ، خۆی بەتەنها لە چاپی دەدان و ئینجا دەشی پێچانەوە • ئەمە بۆخۆی نمونەیەکی بێهاوتایە لەسـەر رۆی هەمو زەمێن » [108] •

بەلام هامیلتن تەنها ئەوەی لە یاد کردووە کە دەوروبەری ٥٠٠ سـال لەمەوبەر کاتێك تازە چاپ لە ئەوروپا داهاتبو زۆر خاوەن چاپخانەی ئەوسای ئەوان وەك موکریـانێ سـەدەی بیستی ئێمە بون [109] • وردکردنەوەی ئەمە دواکەوتویێ تەنها پێنج سەدەمان دەخاتە بەرچاو •

هـەرچەند سـالی ١٩٣٢ بەناو سەربەخۆیێ بـە ولات « بەخشرا » بـەلام هیچ ئـالوگۆڕێ بەسـەر رۆژنامەنوسـێ عیراقـدا نـەهات • رۆژنامەنوسێ کوردێ وەك جاری جاران زەحمەت دەیتوانی جاروبار سـەر لە قاوغە تەسکەکەی خۆی دەرهێنێ • رمخنەیەکی پچوك لە نەبونی پرۆژەی ئاوی خاوێن لە شاری هەولێر بەس بو بۆئەوەی سـالی ١٩٣٦ گۆڤـاری «روناکیێ» داخرێ • لە کۆتایێ چلەکانەوە و تایەت لە بەستنی پەیمانی بەغداوە سەخت و نالەبارترین قۆناغ لە ژیـانی رۆژنامەنوسـێ هەمـو عـیراقدا دەستیپێکرد • گەورەترین «قوربانێ» رۆژنامەنوسێ کوردێ ئەو سـالانە داخستنی گۆڤاری «گەلاوێژ» بو •

---

(١٠٨)
A. M. Hamilton, Road through Kurdistan, The Narrative of an Engineer in Iraq, London, 1937, PP. 122 — 123, 237.

(١٠٩) دەربارەی باری چاپ و چاپەمـەنێ ولاتانی ئەوروپـای ئەو سـەردەمە بڕوانە : جون ك. م. روذنشتین ، اختراع الطباعة ، ـ «تاريخ العالم» ، المجلد الخامس ، ص ٦٤٧ ـ ٦٤٩ •

لەگەڵ ئەوەش رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی سەردەمی پاشایەتی دەوری گەورەیان لە پێشخستنی ژیانی روناکبیری گەلدا بینی ، خزمەتی زۆری ئەدەب و زمانیان کرد و ژمارەیە نوسەری باشیان پێ گەیاند • باشترین بەڵگەی ئەم راستیە گۆڤاری تەمەنداری «گەلاوێژ»ە (١١٠) •

بیری ئازاد وەك لێشاوی لافاو وایە ، قەدەغەکردنی ئاسان نییە ، لە هەزار کون و کەلەبەرەوە دەرفەت بۆخۆی دەدۆزێتەوە • بەپێی ئەم یاسایە چاپەمەنی نهێنی نیشتمانپەروەرانی عەرەب و کوردی عیراق بەر لە شۆڕشی گەلاوێژ شۆڕە سواری مەیدانی ژیانی سیاسی و گوڵی سەردەستەی خەباتی کۆمەڵانی خەڵك بو • رۆژنامە و گۆڤارە نهێنییەکانی ئەو سەردەمە فراوان بەناو خەڵکدا بڵاودەبونەوە • بەپێی هەندێك سەرچاوە یەکێ لەو رۆژنامانە دوو هێندی گەورەترین رۆژنامەی ئاشکرای ئەو سەردەمەی لێ بڵاودەبۆوە (١١١) • یەکێ لە بەشدارانی دەرکردنی چاپەمەنی نهێنی کوردی سەردەمی پێش شۆڕشی گەلاوێژ نوسیویە دەڵێ تا دەهات خەڵکی کوردستان زیاتر لەدەوری رۆژنامەنوسی نهێنی کۆدەبونەوە ، هەرچەندە ــ وەك دەڵێ ــ دەشیانزانی لەوانەیە ئەو کارە زۆریان لەسەر بکەوێ (١١٢) •

دیارکردنی هەمو رووەکانی رۆژنامەنوسی نهێنی کوردی کارێکی

---

(١١٠) یەکەم ژمارەی کانونی یەکەمی ١٩٣٩ و دوا ژمارەی ئابی ١٩٤٩ چاپ کران • بەسەریەکەوە پتر لە ١٠٠ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە •

(١١١) بڕوانە :

I. Cox, The Struggle in Iraq, — (( World News )) , Vol. I, No. 19, May 8, 1954, P. 390.

(١١٢) صالح حيدري ، دور الصحافة الكردية السرية في العهود الرجعيه والدكتاتورية ، جريدة «العراق» ، ٢١ نيسان ١٩٧٧ •

ئاسان نی‌یه (١١٣) . بەر لە شـەڕی یەکەمی جیهان ژمـارەیە چـاپەمەنی و پەخشەی دەسنوسی کوردی بەنهێنی بڵاو دەکرانەوە . «بانگی حەق»ەکەی شێخ مەحموودیش ڕۆژنامەیەکی نیمچە نهێنی بوو . یەکەم ڕێکخراوی کوردی عیراق کە پەخشەی دەسنوسی نهێنی خۆی هەبوو حیزبی «هیوا» بوو (١٩٣٨ — ١٩٤٥) . یەکەم ئۆرگانی نهێنی ڕێکوپێکی کوردی گۆڤاری «نیشتمان»ی (ژ . ك .) بوو . وەك وتمان زوربەی ژمارەکانی ئەم گۆڤارە بەدزی‌یەوە لـە تەوریز چاپدەکران . «نیشتمان» بە نـاوەڕۆك دەوڵەمەنـد و بە ڕواڵەت ڕازاوە بو . بۆنموونـە ژمارە حەوت و هەشـت و نۆی کە بەسـەریەکەوە دەرچوون و ٣٢ لاپەڕەن بە زنجیرەیە وتاری سیاسی و بەڵگەی مێژوویی و شەش پارچە بەرهەمی شاعیری ناوداری وەك هەژار و هێمن ڕازێنراونەتەوە .

ڕۆژنامەنوسی نهێنی کوردی عیراق وەك ڕۆژنامەنوسی نهێنی عەرەب لە دەوروبەری کۆتایی شەڕی دووەمەوە بووە داردەستی کاریگەری هێزە نیشتمانی‌یەکان کە ڕۆژبەڕۆژ هونەرمەندانەتر هەڵیاندەسوڕاند . کار گەیشت بەوەی هەر ڕۆژەی لەلایەکەوە دەستەیە لاوی نیشتمانپەروەری خوێنگەرم دەکەوتنە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیە یا گۆڤارێکی نهێنی کە لەبەر بێدەرامەتی بەدەستخەت دەیاننوسینەوە . بۆنموونە ژمارە یەکی بـەرگی دووی گۆڤـاری «پشکۆ» ، کە وادیارە ئۆرگانی کۆمەڵێك بوو بەناوی «هاوار»ەوە ، سیازدە لاپەڕەیە ( ٢١ × ٥ر١٦سم ) و بە خەتی جوان و شێوازی ڕەوان و ناوەڕۆکی دەوڵەمەند ڕازێنراوەتەوە (١١٤) .

---

(١١٣) ئەو کارە بۆخۆی زەحمەتە ، هیچ نەبێ چونکە پاراستنی ئۆرگانی نهێنی هێزە نیشتمانی‌یەکان لە هەموو شوێن ئەرکێکی پڕ تەنگو چەڵەمەیە .

(١١٤) «پشکۆ» ، ژمارە ــ ١ ــ ، بـەرگی ــ ٢ ــ ، ١٩٤٥ . کاتی خـۆی لـە ڕۆژنامەی «التآخی»دا وتارێکم بەمناوەوە بڵاوکردەوە : « جمعية هاوار و مجلة پشكو » ( « التآخي » ، ١١ شـباط ١٩٧٤ ــ صفحة « الثقافة الكردية » ، العدد السابعشر ) . لەوێدا تکام کردبوو هەرکەس شـتی

«رزگاریی» ئۆرگانی حیزبی «رزگاریی کورد» یەکەم رۆژنامەی نهێنیی کوردیی عیراقە کە بە چاپکراوی و تارادەیەك ریکوپێك و فراوان دەوروبەری کۆتایی شەڕی دووەم هاتە مەیدانی خەبات [115] • «رزگاریی» دوایی بووە ئۆرگانی «پارتی دیموکراتی کوردستان» • ئەم مەیدانە جگە لە « رزگاریی » گەلێ رۆژنامە و گۆڤاریی نهێنیی کوردیی بەخۆیەوە بینیی وەك «یەکیەتی تێکوشین» و «شۆڕش» و «خەبات» و «خەباتی کوردستان» « ئازادیی » و «ئازادیی کوردستان» و «رێگا» و «دەنگی داس» و «شوعلە» [116] و هیتر •

سەرتاپای ئەم گۆڤار و رۆژنامانە بە ناوەرۆك شۆڕشگێڕ و دیموکراسیی بوون • بەڵگەی ئەم راستیيە کەم نییە • لای سەرەوەی ژمارە ٢ی ساڵی ٩ی رۆژنامەی «رزگاریی» (حوزەیرانی ١٩٥٥) بەم دروشمانە رازێنراوەتەوە کە دروشمی هەمو هێزە نیشتمانییەکان بون : لای راستی ناوی رۆژنامەکەوە نوسراوە «ئەی کۆمەڵانی خەڵك تێکۆشن بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانیی

---

دەربارەی کۆمەڵی «هاوار» و گۆڤاری «پشکۆ» دەزانیی ئاگادارم بکا . پاش ماوەیە کاك محەمەد مستەفای پارێزەر و کاك مستەفا عەبدوڵلا ئاگاداریان کردم کە «هاوار» دەستەیە لاوی سلێمانی دایانمەزراند و هەرئەوانیش «پشکۆ»یان دەردەکرد و بەنهێنیی بلاویان دەکردەوە . «هاوار» چەکی خەباتی دژی ئیمپریالیزم ، تایبەت ئیمپریالیزمی ئینگلیزی ، ئاراستە کردبۆ . ئەندامانی ئەم کۆمەڵە جاریێ پەردەی سینەمای پرۆپاگەندەی ئینگلیزەکانیان سوتاندووە ، بەوە ویستویانە نایاریی خۆیان بەرامبەر ئینگلیز دەرخەن .

(١١٥) بەپێی زانیاریی ناو «موسوعة» «رزگاریی» سەرەتا بە رۆنیۆ و دوایی بە مەکینە چاپدەکرا (بڕوانە : «موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي السري » ، الجزء الاول ، بغداد ١ ١٩٤٩ ، ص ٧٣ ) . هەروەها بڕوانە : صالح حیدری ، لە دەفتەری یادداشتەکانی . رزگاری چۆن چاپ دەکرا ، ــ « عیراق » ، ژمارە ١٤ ، نیسانی ١٩٧٨ ، ل ٣ ، ١٤ .

(١١٦) بەپێی زانیاریی ناو «موسوعة» (عبداللطيف السعدي) کە نازناوی «نذير» بۆ ئەم رۆژنامەیەی بە عەرەبیی و کوردیی لە هەولێر بلاودەکردەوە (بڕوانە : «موسوعة سرية خاصه بالحزب الشيوعي العراقي السري » ، الجزء الاول ، بغداد ، ١٩٤٩ ، ص ٧٣ ) .

یەکگرتو لە بەینی هـەمو پارتی و دامـەزراوە نیشتمانی‌یـەکان و هەمـو دوژمنەکانی ئیمپریالیزمدا ، بۆ لابردنی حکومەتی نوری سەعیدی خـاین و هێنانی حکومەتێکی نیشتمـانی » • لەلای چەپی‌یـەوە نوسراوە : «ئـەی کۆمەڵانی خەڵك خەبات بکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی مەجلسی داتاشراو(١١٧) ، لابردنی مەرسومو قـانونە فاشسـتی‌یەکان (١١٨) ، بەرەڵلاکردنی هـەمو سەربەستی‌یە دیموکراسیەکان ــ سـەربەستی نوسـین و بلاوکردنـەوەی بیروباوەڕ ، سەربەستی کۆبونەوە و خۆنواندن ، سەربەستی پارتی و کۆمەڵ و نەقابە دانان » • سەروتاری هەمان ژمـارە ئەمـە بو : «بەرەی نیشتمـانی یەکگرتو تەنها هێزە بتوانی ئیمپریالیزم بشکێنی و پڕۆژەکانی ژێر خا» (١١٩)• بەناوی « کورد و عەرەب »ەوە رۆژنامەی « خەباتی کوردستان » وتارێکی دور و درێژی بلاوکردۆتەوە تییدا باسی زەمینەی مێژویی برایەتی ئەو دو گەلە دەکا و پتەوکردنی بە مەرجێکی گرنـگ دادەنی بۆ بەهێـزکردنی خەبـاتی کۆمەڵانی خەڵك دژی ئیمپریالیزم (١٢٠) •

لەبەر رۆشنایی ئەو راستی‌یانەی بەکورتی باسمانکردن دەتوانین چەند رویەکی تایبەتی رۆژنامەنوسی کوردی بەمجۆرە دیارکەین :

● دەستپێ‌کردنی مێژوی رۆژنامەنوسی کوردی لەبەر گەلی هو ، کە زوربەیان لە دەست کورد خۆیدا نەبون ، تارادەیە دواکەوت • بەلام ئـەو دواکەوتنە بەپێوانەی سەردەمی خۆی و لە قوژبنی بەراوردکردنی‌یەوە لەگەڵ رۆژنامەنوسی ژمارەیە گەلی‌تری ناوچەکە یەکجار زۆر نی‌یە • بەوێنە یەکەم

---

(١١٧) مەبەستی ئەو ئەنجومەنی نوێنەرانەیە کە نوری سەعید سـالی ١٩٥٤ هەڵبژاردنی تایبەتی بۆ کرد تاوەکو جێگەی ئەو ئەنجومەنە بێتەمەنـە بگرێتەوە کە هێزە نیشتمانی‌یەکان چەند نوێنەرێکیان تیا هەبو .

(١١٨) مەبەستی ئەو یاسا و بڕیارانەیە کە نوری سەعید بەنیازی رێخۆشکردن بۆ بەستنی پەیمانی بەغدا دانان .

(١١٩) «رزگاری» ، ژمارە ٢ ، سالی ٩ ، حوزەیرانی ١٩٥٥ .

(١٢٠) «خەباتی کوردستان» ، مایسی ١٩٥٧ .

ڕۆژنامەی فارسی ــ وەك کاتی خۆی باسمان کرد ــ ساڵی ١٨٥١ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ناصرەددین شادا چاپ کرا ، بەڵام ئەو ڕۆژنامەیە هی میری بوو ، جگە لە یاسا و فەرمان و بڕیارەکانی شا و ئەو جۆرە باســانە شتێکی تری ئەوتۆی بڵاونەدەکردەوە • دیموکراسی خوازانی ئێران مــاوەی دەرکردنی ڕۆژنامەیان نەبوو ، بۆیەکا ئەوانیش ناچار لە هەندەران (لە لەندەن و قاهیرە و مەدراس) ڕۆژنامە و گۆڤاری خۆیان دەردەکرد و بە هەزار دەردی ســەری دەیانگەیاندنە ناو خاکی نیشتمان • یەکەم ڕۆژنامەی فارسی لەوبابەتە مەلکوم خان ساڵی ١٨٩١ لە لەندەن بە ناوی «قــانون»ەوە دەری کرد • بەوجــۆرە دەتوانین بڵێین ڕۆژنامەنوسی کوردی بە کەمدەرامەتی خۆیەوە لەڕاستیدا تەنها ٧ ساڵ لە ڕۆژنامەنوسی نەتەوەیی فارسی دواکەوت •

● ڕۆژنامەنوسی کوردی لەو ڕۆژەوەی لەدایكبووە بە وچان خەریکی بڕینی ڕێگەیەکی زۆر سەختە کە ڕوداو و بەسەرهاتەکانی ئاوێنەی بێ غەل و غەشی ژیانی ڕوناکبیری گەلی کوردن • لە عیراق و هەندەران لە هەمو شوێن زیاتر مــاوەی پێشــکەوتن و گەشــەکردن بۆ ڕۆژنــامەنوسی کوردی هاتۆتەپێشــەوە • ڕۆژنــامە و گۆڤــارە کوردی یــەکانی عــیراق [121] و «کوردستان»ی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی و گۆڤاری «هاوار» کە جەلادەت بەدرخان ساڵی ١٩٣٢ لە شام دەری کرد و گۆڤاری ( RONAHI ) «ڕوناهی» کە هەر ئەو ١ی نیسانی ساڵی ١٩٤٢ لە شام دەری کرد [122] بەڵگەی بێ پێچ و

(١٢١) زوربەی ئەو سەرچاوانەی باسی ڕۆژنــامەنوسی کوردی یــان کردووە لیستەیەکی دروستیان بۆ ئەو ڕۆژنــامە و گۆڤــارانە کردووە کە دوای شۆڕشی گەلاوێژ لە عیراق دەرچون ، بۆیــە دوبــارە کردنــەوەی ئەو باسەمان بەپێویست نەزانی (بڕوانە : علاءالدین سجادی ، سەرچــاوەی ناوبراو ، چــاپی دووەم ، ل ٦١٧ ــ ٦٢٦ ؛ محــەمەدی مــەلا کەریم ، سەرچاوەی ناوبراو ؛ جمال خزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٦٥ ــ ١٣٤ ) •

(١٢٢) ئەو سەرچاوانەی باسی «ڕوناهی»یان کردووە بەهەڵە تەشرینی یەکەمی

پەنای ئەم راستیيەن کە لە قوژبنی ئەم ژمارانەوە باشتر خۆ دەنوێنێ : لــە شەستەکاندا لە تورکیا رێگەی دەرچونی ٩٤٢ رۆژنامە و ٧١٦ گۆڤار درا • لەمانە ٧٢یان بە زمانی بێگانە و کەمینەکانی ناو وڵات بون ــ بە فەرنســێ ٣٦ ، بە ئینگلیزێ ١٠ ، بە ئەڵەمانی ٦ ، بە ئیتالێ ٢ ، بە ئەرمــەنێ ١٥ ، بــە یۆنانێ ٨ ، بە عیبرێ ٣ ، بە ئەلبانێ ١ و بە کوردیش ••• سفر (١٢٣) •

● زروف و باری ژیان کارێکیوای کردووە رۆژنامەنوسێ کوردێ لە سەرەتاوە بە سروشت دیموکراسی و بە ناوەرۆك نەتــەوەیێ بێ ، بۆیــەکا توانیویە دەوری گەورە لە ژیانی روناکبیرێ و پێشخستنی هەستی نەتەوەیێ کۆمەڵانی خەڵکدا ببینێ • لەزووەوە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان روی دەمیان کردۆتە هەمو چین و دەستە و دایەرەکانی کورد • بڕیاری خــاوەنی یەکەم رۆژنامەی کوردێ لەســەر بڵاوکردنەوەی دۆ هــەزار دانــە لە هەر ژمارەیەکی «کوردستان» بەخۆڕایێ بەردی بناغەی ئەم کارە گرنگەیە • دوای

---

ساڵی ١٩٤١یان بە مێژوی دەرچونی یەکەم ژمارەی داناوە ( بۆنمونــە بڕوانە : جمال خزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٤١ ؛ محەمەدی مەلا کەریم ، سەرچاوەی ناوبراو ) . بە کوردی و پیتی لاتینی لەسەر ژمارە یەکی نوسراوە : «ساڵ ١ ، هژمار ١ ، چارشەمب ، ١ نیسان ١٩٤٢» . هەر ئەمە بە فەرەنسیش دوبارە کراوەتەوە . دیسان ئەو سەرچاوانەی ئەم گۆڤارەیان بە حەفتانە داناوە بەهەڵەدا چون . تا شوباتی ســاڵی ١٩٤٤ (٢٣) ژمارەی لێدەرچووە ، واتە هەر مانگەی ژمارەیە . دوایئەوە لە نیسانی ١٩٤٤وە تا مارتی ١٩٤٥ تەنها (٥) ژمارەی لێ دەرچووە . ژمارە ٢٨ی کە بەر مارتی ساڵی ١٩٤٤ دەکەوێ دوا ژمارەیەتی کە مــن دیومە . هەندێ سەرچاوە دەڵێن گوایە «روناهی» تا ساڵی ١٩٤٦ ژیاوە (بڕوانە : محەمەدی مەلا کەریم ، سەرچاوەی ناوبراو) .

(١٢٣) بڕوانە :

"Современная Турция", ( Справочник ), Москва, 1965.

« تورکیای ئیمڕۆ » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ٢٦٨ ــ ٢٦٩ .

تێپەڕبونی زیاتر لە ٣٠ ساڵ بەسەر ئەو بڕیارەدا گۆڤاری «هاوار» ڕوی دەمی کردۆتە لاوانی کوردستان و پێیان دەڵێ :

« تائیستە منەوەرانی موحتەرەممان هەر هەوڵیانداوە کە متنفذان فێری مەفکورەی میللی بکەن ٠ ئێوە ئەبێ چاك بزانن هەر ئەوان کورد نین ٠ جوتیار ، فەلاح ، دارفرۆش ، ئاودێر ، سنعەتکار ، تجار هەمو کوردن ٠ فەرزە لەسەرتان لە حەیاتی عەمەلیتانا لەگەڵ جوتیارا ، فەلاحا ، شوانا ، گاوانا ، تجارا ، سنعەتکارا ، ئاودێرا بە سورەتێکی دیموقراتانە بجوڵێنەوە و تێیبگەیێنن مللیەت موقەدەسترە لە هەمو موعتەقەداتێك » ٠ دوابەدوای ئەوە «هاوار» دەڵێ : «بە کورد و کوردستان چی لاوێکی بزانێ هیمالایە چەند بەرزە ، مسیسیپی چەند درێژە ، بەرلین چیە و چیی تیایە ؟ [١٢٤] ٠ وەرن بگەڕێن بە دیهاتا بزانن لادێیی کورد لە چحاڵێکدایە و چۆنئەژێ ؟ ، چەند قووەتی بەسەرەوەیە ؟، چی ئەخوا ؟، بۆچ لاواز و هەژارە ؟٠٠٠»[١٢٥]٠

● باری سیاسی کارێکیوای کردووە مێژوی ڕۆژنامەنوسی کوردی پڕ بێ لە سەربازی نەناسراو و وەك دواییش باسی دەکەین « تێگەیشتنی ڕاستی» خۆی یەکێکە لە بەڵگە زۆرەکانی ئەم قسەیە ٠ لەگەڵ ئەوەش بەهۆی باری گشتی ژیانی کوردەوە رابوردو یەکێ هەڵتەکەوت پیشەی بەرودوای ڕۆژنامەنوسی بوبێ ٠ زوربەی هەرە زۆری نوسەر و شاعیر و پیاوی سیاسی ناوداری کورد لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەنوس بون : لە نەوەی بەدرخان پاشا میقداد مەدحەت و عەبدوڕڕەحمان و ئەمین عالی و صالح و جەلادەت بەدرخان ، مەمدوح سەلیم و مستەفا پاشا یامولکی و ڕەفیق حیلمی ، پیرەمێرد لە ئەستەمۆلەوە ، شێخ نوری شێخ صالح و علیکمال باپیر لە بیستەکانەوە ، عەلائەدین سەجادی و حسەین حوزنی و گیو موکریانی ، گۆران و هەژار و

---

(١٢٤) دیارە خاوەن وتار لێرەدا بەهەڵەچووە .

(١٢٥) «هاوار» ، شام ، ژمارە ٩ ، ٣٠ ئەیلولی ١٩٣٢ ، ل ٤ــ٦ .

هێمن و زەبیحێ و زۆری‌تر نمونەی ئەو راستی‌یەن • هەیـانبو بە خـەرجێ گیرفان و شـەونخونێ و بێ پادداشت مێژۆی رۆژنامەنوســێ کوردی‌یان دروست‌دەکرد [١٢٦] •

لەگەڵ‌ئەوەش رۆژنامـەنوسێ کوردێ توانی هەنگاوی بـاش بەرەو پێشەوە بنێ • «کوردستان»ی یەکەم رۆژنامەی کوردێ هیچی لە رۆژنامەکانی سەردەمی خۆی کەمتر نی‌یە ، بەڵکو لە هەندێ روەوە پێش ژمارەیەکیـان کەوتبو • رۆژئاواییەکان «گەلاوێژ»یان بە یەکێ لە گۆڤارە هەرە کامڵەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست داناوە [١٢٧] •

● رۆژنامەنوسێ کوردێ ، هەروەك مێژۆی کورد خـۆی ، پڕە لـە بەسەرهات و نمونەی سەیری بێ‌هاوتا • بڕواناکەم لە هەمو جیهاندا رۆژنامە یا گۆڤارێك هەبێ وتارەکانی بە پێنج زمانی جیاواز بڵاو کردبێتەوە • گۆڤاری «کوردستان» کە دوای تەواوبونی شەڕی یەکەمی جیهان لە ئەستەمۆڵ دەرچۆ وتارەکانی بە کوردی و تورکی و عـەرەبی و فـارسی و فەرەنسـەیێ بڵاو

---

(١٢٦) مامۆستا حامید فەرەج بۆی گێڕامەوە چۆن دەستەیـە لاوی خوێـن گەرمی تازە پێ‌گەیشتۆ لە خەرجی گیرفانیان یا لە موچەی کەمی کاریان پارەی دەرکردنی « دیارێ لاوان »یـان دەڕەخساند . مامۆسـتا قادر قەزازیش بەشانازی‌یەوە باس دەکا چۆن لە ساڵە سەختەکانی شەڕی دووەمی جیهاندا بە برسێتی تا نیوەشەو لە چـاپخانە دەمـانەوە هەر بۆئەوەی «گەلاوێژ» کەم هەڵە بێ .

(١٢٧) م. لورانس لە گۆڤاری (( Royal Central Asian Association )) مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٤ وتارێکی دەربارەی رۆژنامەنوسێ کوردێ بڵاو کردۆتەوە و دەربارەی «گەلاوێژ» نوسیویە دەڵێ : «ساڵی ١٩٣٩ چەند گەنجێکی کورد لە بەغدا بە ناوی «گەلاوێژ»ەوە گۆڤارێکیان دەرکرد کە ئیستە لە بەرزترین گۆڤارە ئەدەبیەکانی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەژمێررێ » . ئەم وتارە یوسف مەلەك کردۆیـە بە عـەرەبی و قـادر قەزازیش کردۆیە بە کوردی و لە «گەلاوێژ»دا بڵاوی کردۆتەوە (بڕوانە : «گەلاوێژ» ، ژمارە ٤ ، ساڵی ٦ ، نیسانی ١٩٤٥ ، ل ٢٤ ) .

دەکردەوە و بۆ خۆشی لەژێر ناوەکەیدا بە تورکی نوسیویە : « ئامادەیــن گشت باسێ بە هەر زمانێ بێ» بلاوی بکەینەوە • بۆنمونە ژمارە چواری ١١ وتاری تێدایە کە پێنجیان بە تورکی و دویان بە کوردی و دویتریــان بــە عەرەبی و ئەوانیتریان بە فارسی بلاوکراونەوە •

نمونەیەکیتر : وا پێدەچێ سەرتاپای وتارەکانی «پەیژە»ی تاقانە کە ٤٤ لاپەڕەیە مستەفا شەوقێ خاوەنی بەتەنها خۆی نوسیبێ •

لە دو بەرگەی ئەم کتیبەدا نمونەیتری لەمبابەتە زۆرە •

● رۆژنامە و گۆڤاری کوردێ سەرچاوەی رەسەنن بۆ لێکۆلینەوەی مێژۆ و ئەدەب و زمان و ژیانی کۆمەلایەتێ کورد • هەرچەندە لە بەشێکیتری ئەم کتیبەدا بەدرێژی دێینەوە سەر ئەم باسە بەلام والێرەدا تاقە نمونەیەکی مانادار ئەم لایەنەی رۆژنامەنوسێ کوردێ دەخەینە بەرچاو •

بڕوا ناکەم تائێستە هیچکام لە شارەزایــانمان ئــاگاداری ئەوە بێ کە سەرەتای شانۆگەرێ کوردێ دەگەڕێتەوە یەکەم سالی دوای تــەواوبونی شەڕی یەکەمی جیهان [١٢٨] • ئەو سالە «ژین»ی ئەستــەمۆل «دۆ پــەردە پیــەس»ی بە نــاوی «مــەمی ئــالان»ەوە بــلاوکردەوە کە ع• رەحمێ نوسیویە [١٢٩] • لەژێر ناوی «مەمی ئالان» نوسراوە «تیاترو کردان فضیلتا

---

(١٢٨) زوربەی ئەو سەرچاوانەی باسی شانۆی کوردییان کردووە ســالی ١٩٢٦ بە سەرەتای دادەنێن ، واتە ئەو ســالەی یەکێ لە فێــرگەکانی سلێمانێ شانۆگەرێ «نیرۆنی زۆردار»ی نیشان دا کە مامۆستا فوئــاد رەشید سەرپەرشتێ ئامادەکردن و دەرهێنانی کردبو (بڕوانە : ص. ك. ، المسرح الكردي والفرق المسرحيـة ، ـ «العراق» ، ٢٨ تشرين الثـاني ١٩٧٧ ) . وابزانم ئەو چیرۆکەی ع. رەحمێ و هەندێ بەرهەمیتر ئەوە دێنن مامۆستا حسـەین عارف سالی١٩١٨یان ١٩١٩ی بکردایە سەرەتای لێکولینەوەکەی ئەم دوایەی دەربارەی چیرۆکی کوردی (بڕوانە : حسین عارف ، چیرۆکی هونەرێ کوردی ١٩٢٥ ـ ١٩٦٠ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ) .

(١٢٩) عەبدولڕەحیم رەحمێ خەلکی هەکارێ یەکێکە لە نوســەر و شــاعیر و رۆژنامەنوسە چالاکەکانی ئەو سەردەمە .

کردان نوشی ددەت »[١٣٠] • مەم دەیەوێ «سەری کوردان بەرزکاتەوە» و بەدەم سوڵتان صەلاحەددینەوە بچێ کە «شیری خۆی کێشـایە و لەپێـش تەمـاعی دنیایێ وەستایە ( قودسـا شریف ) محافەزە دەکا » • مەم دەیەوێ چاوڕەشی دایکی «شیری سپێ خۆی پێ حەڵاڵ کا» و ڕێگەی بدا بچێ بـۆ غەزا • چاوڕەشیش دەیەوێ «ناوێ کوردێ کرمانجێ ئەعلا بکا» بۆیە شیری خۆی بە مەم حەڵاڵ دەکا • فرمێسکی خەزاڵی ژنی ، مەم پەشیمان ناکاتەوە •

زۆر ڕۆی گرنگی ڕۆژنامەنوسێ کوردێ چاوەڕوانی خاوەن قەڵەمی بە بەهرە و توانـان •

ناوەرۆکی ئەم بەشە بە رونی نیشانی دەدا چۆن گەلی کورد بەرلەوەی سەدەی نۆزدە تەواو بێ گەیشتبووە ئەو قۆناغەی پێویست بێ لە ڕێـگەی ڕۆژنامە و گۆڤارەوە قسەی لەگەڵ بکرێ • دیارە ئەمە ــ هەر وەك لە بەشی داهاتوشدا باسی دەکەین ــ لە سەرو گشت ئەو هۆیانەوە دێ کە پاڵیان بە ئینگلیزەوە نا ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستێ» دەرکەن •



(١٣٠) «ژین» ، ژمارە ١٥ ، ٣٠ مارت ١٣٣٥ ، ل ٢١ ــ ٢٤ •

# بەشی سێیەم

## کەی و چۆن «تێگەیشتنی راستی» دەرچو

رویەکی گرنگی شارستانەتی سەرمایەداری لەوەدا خۆ دەنوێنێ کە لەبەر زۆر هۆ نەیتوانی لە قاوغ و قەوارەیکی تەسکدا بمێنێتەوە ، تیشکی تیژی گەیشتە دواکەوتوترین و کەلاترین قوژبنی جیهان . چاپ و چاپەمەنی و رۆژنامە و رۆژنامەنوسیش هەر لەو رێگەوە گەیشتنە ناو گەلانی ئەو ولاتانەی ئەمڕۆ پێیان دەگوترێ «جیهانی سێیەم» .

کۆلۆنیالیستەکان لەبەر خاتری خۆیان زۆ دەستیان دەدایە دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤار لەو ولاتانەی دەکەوتنە ژێر دەستیان . ناپلیۆن بۆناپارت بەرلەوەی بکەوێتە رێ بەرەو میسر کەوتە ئامادەکردنی تفاقی تەواوی چاپ و چاپەمەنێ تا لەگەڵ خۆیدا بیانهێنێ . وەك دەگێڕنەوە ناپلیۆن بەوە زۆر قارس بو کە کاربەدەستان نەیانتوانی لە ماوەی دە رۆژدا ئەو فەرمانەی بەجێبهێنن کە تێیدا داوای ئامادەکردنی سێ چاپخانە و پیتیعەرەبی و لاتینی و یۆنانێ کردبو . بۆ هەمان مەبەست ناپلیۆن بەتایبەتی داوای کردبو لە ئیتالیا پیتی عەرەبێ بۆ دابڕێژن . جگە لەوە بڕیاریدا (مارسێل)ی رۆژهەلاتناس و ژمارەیە لەوانەی عەرەبیان لە رۆما و پاریس خوێندبو لەگەڵ خۆی بیانهێنێ بۆ میسر بۆ سەرپەرشتێ کاری راگەیاندن . جارێکیتر بایەخدانی بێ

ئەندازەی ناپلیۆن لەوەدا خۆی نواند کە چاپخانەکانی خستە ناو ئەو پاپۆڕەی خۆی پێی هاتە میسر [١] •

بەمجۆرە ٦٠ رۆژ زیاتر بەسەر گەیشتنی ناپلیۆندا تێنەپەڕی کە یەکەم رۆژنامەی بە زمانی فەرەنسەیی لـە قاهیرە بلاوکردەوە[٢] • دوای ئەوە بە ماوەیە رۆژنامەیەکی‌تری بە فەرەنسەیی بلاوکردەوە • فەرەنسەییکان نیازیان بو رۆژنامەی عەرەبیش بلاو کەنەوە ، بەلام فریا نەکەوتن • بەلای ژمـارەیە لە نوسەرانی میسرەوە ئەم کارەی ناپلیۆن بۆناپارت لە مەیدانی چاپەمەنی و رۆژنامەنوسیدا کردی «کۆتایی سەردەمێکی کۆن و سەرەتای سەردەمێکی نوێ» بۆ بۆ «ژیانی میسر» و بگرە « هەمو رۆژهەلات» [٣] •

داگیرکەرانی ئینگلیز لەمەشـدا زۆ بونـە یەکەمی مەیـدان و بۆڕی هاوەڵەکانیان دا ، دەیانزانی دەتوانن چاپەمەنی و تایبەت رۆژنامەنوسی بکەنە داردەستێکی کاریگەری راگەیاندنی سیاسەتیان و بلاوکردنـەوەی زمـان و نەریتیان و چەسپکردنی جێ پێیان لە ژیانی ئابوری ئەو ولاتانەی داگیریان دەکەن • دەزگای ناودارو چالاکی ئینگلیز «کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی» لە دەورو بەری کۆتایی سـەدەی هـەژدەوە گەورەترین دەوری بینـی بۆ دامەزراندن و بەڕێوەبردنی رۆژنامە و گۆڤاری ئینگلیزی لە هیندستان [٤]• ئەم کارە وەها زیرەکانە دەبرا بەڕێوە کە لە ماوەیەکی کەمدا توانی تـەنگ

---

(١) بڕوانە : «آفاق عربيه» ، بغـداد ، العدد ٣ ، تشريـن الثـانی ١٩٧٦ ، ص ١٥٨ ــ ١٥٩ .

(٢) بڕوانە : عبدالله حسين ، الصحافة والصحف ، القاهرة، بلا ، ص١٢٧ .

(٣) بڕوانە : ابراهيم عبده ، تاريخ الطباعة والصحافة في مصر خلال الحملة الفرنسية ، القاهره ، ١٩٤٩ ، ص ١٢ ، ٢٧ ــ ٢٨ ؛ الدكتور محمـود نجيب ابوالليل ، الصحافة الفرنسية في مصر ، ص ٢٤ .

(٤) بڕوانە :
S. Natarajan, A history of the Press in India, London, 1962, PP. 14 — 99.

به زمانه نەتەوەییە هندی‌یەکان هەڵچنیٖ • تاقە نموٗنەیە دەتوانێ ئەمە بـاش روٗن‌کاتەوە : سالی ۱۹۳۷ لە هندستان ۳۲ رۆژنامەی رۆژانە و نزیك ئەوەندەی حەفتانە بە زمانی ئینگلیزی بلاو دەبۆنەوە • سالی ۱۹٤۷ ، واتە پاش دە ساڵ ئەم ژمارەیە وای لیٖ هات : ٥۱ رۆژنامەی رۆژانە و ۲٥ی حەفتانە • پـاش پیٖنج ساڵ یەکەمیان گەیشتە ۷۰ و دووەمیان ۲٦۱ • بازاڕی ئەم رۆژنامانە زۆر لە بازاڕی رۆژنامەی هندیٖ گەرمترە • پەنجاکان لە یەکەمیان رۆژی ملیۆن و نیوێك و لە دووەمیان تەنها ۷٤٥ هەزار دانە دەفرۆشرا [٥] •

دەوری پرۆپاگەندە لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهاندا زۆر لە جاران زیاتربو • ئینگلیزەکان بایەخیٖکی زۆریان بەم مەسەلەیە دا • لوید جۆرجی سەرەك وەزیر لە یادداشتەکانیدا لەم‌بارەیەوە نوسیویە دەڵیٖ : «زانیمان دەتوانین توانـای دوژمن لە رێگەی کەڵك‌وەرگرتن لە نـاڕەزایی گەلانی ژێردەستی‌یەوە هەڵتەکیٖنین • هەر بۆنمونە سەدان سالی چەوساندنەوە ژیانی پیٖکەوەی عـەرەب و تورکی کردبووە مەحـاڵ » [٦] • لە شـوێنیٖکی‌تری یادداشتەکانی لوید جۆرج ئەم مەبەستەی روٗنتر داوە بەدەسـتەوە ، دەڵیٖ : «پرۆپاگەندەی هەردوٗلا لەم شەڕەدا [٧] دەوری گەورەتری لە جاران بینیٖ • بە لایەنی کەمەوە وەك نمونە دەتوانم باسی بەڵیٖنـە ئاشـکراکانی ولاتـە هاوپەیمانەکان بکەم دەربارەی نیازیان بۆ ئازادکردن و دانـان بە مـافی چارەنوٗسی گەلە ژێردەستەکانی تورکیا و ئەڵەمانیا و نەمسای دوژمنماندا •••

---

(٥) بڕوانە :
(( Journalism in Modern India )), Edited by R. E. Wolseley, Second revised edition, London, 1964,PP. 4 — 5.

(٦)
David Lloyd George, The truth about Peace Treatiets, Vol. II, London, 1938, P. 755.

(٧) دیارە مەبەست شەڕی یەکەمی جیهانە .

ئێمە دەمانزانی باسی ئازادیی وەك یەكێ لە مەبەستەكانمان یاریدەمان دەدا بۆ تێكدانی شیرازەی یەكیەتی ولاتــە ناحەزەكانمــان و لەوەشــدا بە هــەڵە نەچوین» [٨] • دیارە دەبێ لەم قوژبنەوە سەیری ئەو بایەخە زۆرە بكرێ كە ئینگلیز سالآنی شەڕی یەكەم دایان بە كاری رۆژنامەنوسیی بە زمانی ئــەو گەلانەی لە ژێردەستی دوژمنانیاندا بون •

بە هەمان دەستور زۆر بەسەر داگیركردنی شــاری بەسرەدا تێنەپەڕی كاتێ ئینگلیزەكان دەستیان كردە بلآوكردنەوەی رۆژنامەی تایبەتی خۆیان • هەر ئەو رۆژەی پێیان نایە ئەم شــارەوە ( ٢٢ی تەشرینی دووەمی ١٩١٤ ) دەستیان گرت بەسەر هەر چوار چاپخانەی شاردا هەرچەندە تەنها یەكێكیان هی میریی و ئەو سیانی تریان هی خەڵكی بون • سەرەتا ئینگلیزەكان كەوتنە بلآوكردنەوەی پەخشــە «نشرە»یەكی تایبــەتی بە عــەرەبیی و ئینگلیزیی و تەرخانیان كرد بۆ راگەیاندنی هەواڵەكانی شەڕ • دیارە سەركەوتنی ئینگلیز لە مەیدانی شەڕدا جێگەی یەكەمی لاپەڕەكانی ئەو پەخشەیەی گرتبۆوە • زۆری نەخایاند كە فەرماندەی لەشكر بڕیاری دەركردنی «تایمسی بەسرە» (( Basra Times ))ی‌دا كە بە عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی و توركی بلآو دەكرایەوە • هەمانكات كەوتنە دەركردنی دوو گۆڤــاریش ، یەكێكیان بــۆ دەنگوباسی شەڕ و ئەوی‌تریان بۆ باسی سەرەك هۆزەكانی سەر بە خۆیان و وێنەی شار و شوێنەواری كۆنی عیراق تەرخان كرابو • دیارە ئەركی یەكەمی ئەم پەخشە و رۆژنامە و گۆڤارانە لە یەكەم رۆژی دەركردنیــانەوە هەڵدانی ئینگلیز و بەدناو كردنی دوژمنیان بو [٩] •

---

(٨) Lloyd George, Op. Cit., P. 1118.

(٩) بڕوانە : عبدالرزاق الحسنی ، سەرچــاوەی نــاوبراو ، ل ٧٤ ــ ٧٥ ؛ حمید احمد حمدان التمیمی ، البصرە في ظل الاحتلال البریطانی ١٩١٤ ــ ١٩٢١ ، رسالة ماجستیر ، بغداد ، ١٩٧٥ ، ص ٤٢٦ ــ ٤٣٣ •

بۆ ماوەی دوو ساڵ ڕۆژنامەنوسی ئینگلیز لە عیراق لەم سنورە دەرنەچو .
بەڵام وەك زۆر شتی‌تر لەگەڵ گرتنی بەغدا (١١ مارتی ١٩١٧) قۆناغێکی نوێ
لە مێژوی ئەم ڕۆژنامەنوسی‌یەدا دەستی پێ‌کرد. ئینگلیزەکان لە ڕۆژی ١١ی
تەشرینی یەکەمی هەمان ساڵەوە دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی پەخشەیەکی‌تر
لە بەغدا بە ناوی « صدى الحقيقة» (دەنگدانەوەی ڕاستی)یەوە کە بۆ باس و
وێنەی سەرکەوتنەکانی ئینگلیز و هاوپەیمانانیان تەرخان‌کرا . هەنگاوی
گەورەی ئینگلیز لەم مەیدانەدا دەرکردنی ڕۆژنامەی «العرب» بو کە یەکەم
ژمارەی ڕۆژی ٤ی تەموزی ساڵی ١٩١٧ دەرچو . لەژێر ناوی « العرب »دا
نوسرابو « ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی هەواڵگوزاری مێژوویی ئاوەدان
کەرموەیە . بە بیر و ئامانج عەرەبی‌یە . لە بەغدا عەرەب بۆ عەرەبی
بڵاودەکاتەوە » [١٠] . شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە زانا و نوسەری
ناوداری ئەو سەردەمەی عیراق بە دەرکردنی «العرب»ەوە خەریك بون ،
لەمانە : ئەنستاس ماری کەرمەلی و زەهاوی و مەهدی بەسیر و کازم
دوجەیلی و عەبدوڕڕەحمان بەننا و زۆری‌تر .

هەنگاوی گەورەی داهاتوی ئینگلیز بریتی بو لە دەرکردنی سێ
ڕۆژنامەی نوێ کە هەرسێکیان لەگەڵ دەست پێ‌کردنی ساڵی ١٩١٨ کەوتنە
دەرچون ، یەکێکیان ئینگلیزی ڕۆژانە بو ، بە چوار لاپەڕە و بە ناوی
(( Baghdad Times )) ( تایمسی بەغدا )وە دەردەچو . یەکێکی‌تریان ناوی
«ئێران» بو کە بە زمانی فارسی و بە دوو لاپەڕە هەفتەی جارێ دەردەچو[١١].

(١٠) عەرەبی‌یەکەی بەم‌جۆرە بو : « جريدة سياسية اخبارية ادبيه عمرانيه . عربية المبدأ والغرض . ينشئها في بغداد عرب للعرب » .

(١١) ئێران لە شەڕی یەکەمی جیهاندا بەشدار نەبو ، بەڵام خاکی بوبووە مەیدانێکی گەورەی ئەو شەڕە و لەشکر و کرێ‌گرتەی چوار دەوڵەت ( تورکیا و ئەڵمانیا و بەریتانیا و روسیا ) خاکیان بە تورەکە دەبێژا . ئینگلیزەکان عیراقیان لە یەکەم ڕۆژی داگیرکردنی‌یەوە کردە مەڵبەندی

سێیەمیان «تێگەیشتنی ڕاستی» بۆ • ڕۆژنامەی «العرب» بەبۆنەی دەرچونی ئەم سێ ڕۆژنامەیەوە نوسیویە دەڵێ :

«هەر ئەوەندە پێی تورك لەم خاکە پیرۆزە بڕزا سروەی بەیان گیان و بیری خەڵکی فێنك کردەوە ، لە کۆت و زنجیر قوتار بون و لەم وڵاتەدا بزوتنەوەیەکی روناکبیری ••• ئەوتۆ دەستی پێکرد کە قەت لە وێنەیمان نەدیوە مەگەر ئەوە نەبێ لە ڕێگەی مێژووە دەرحەق سەردەمی ئاوەدانی عەباسیەیان بیستومانە •

تورکان ڕۆشتن و لە پیسی بەولاوە هیچیان بەجێ نەهێشت بونیان بیرخاتەوە ••• ئەوان دو ڕۆژنامەیان هەبو «زوراء» کە تورکی و هی میری بوو «الزهور» [12] کە ئۆرگانی کۆمەڵی زۆردار و تاوانبار بو [13] ، هەردوکیان چ لە ڕوی ڕێبازەوە چ لە ڕوی زمان و شێوازەوە نزمترین ڕۆژنامەی جیهان بون •

بەڵام ئیمڕۆ کار بە جۆرێکیتر بەڕێوە دەبرێ • هەر ئەوەندە تورکان ڕۆشتن ئەم ڕۆژنامەیە (واتە «العرب» ــ ك• م•) دەرچو • لەگەڵ هەڵهاتنی ڕوی ساڵی نوێی ١٩١٨یش لە بەغدا سێ ڕۆژنامەیتر کەوتنە دەرچون: یەکێکیان ناوی تایمسی بەغدایە ، ڕۆژانە و ئینگلیزی زوبانە ، دووەمیان «تێگەیشتنی ڕاستی» و سێیەمیان «ئێران»ە ••• ئەم سێ ڕۆژنامەیە هی ئەو نەتەوانەن کە لەم شارە دەژین ــ عەرەب و ئینگلیز ، کورد و فورس • دەوڵەتی بەریتانیا هەمو نەتەوەیە هاندەدا بۆ دامەزراندنی هەر شتێ بیر و

---

پرۆپاگەندەی خۆیان لە ئێران چونکە لە ناو ئەو وڵاتە خۆیدا مەودای تەواوی ئەو کارەیان نەبو .

(١٢) «الزهور» ڕۆژنامەیەکی سیاسی بو ، لە ڕۆژی ٤ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٩وە بە عەرەبی و تورکی لە بەغدا کەوتە دەرچون .

(١٣) مەبەستی کۆمەڵی ئیتیحادی دەستەی تورکانی لاوە کە تەموزی ١٩٠٨ هاتە سەر حوکم .

ئاواتی دەربڕێ • سوپـاس بۆ یەزدان کە دەوڵەتێکی پێ بەخشـین چـۆن پێویستە کار وا دەزخێنێ و رێگەی هەموان دەدا بە هەوای خۆیان تا خوا دەڵێ بەس بنوسـن »[١٤] •

هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی رون بە دەستەوە نییە لە رێگەیەوە بتوانرێ ناوی ئەوانە دیار کرێ کە سەرپەرشتی دەرکردنی «تێگەیشتنی راستی»یان دەکرد • زوربەی نوسـەرانی رۆژنـامەی «العرب» و هەمـو نوسـەرانی «تێگەیشتنی راستی» نـاوی خۆیـان لەسـەر بەرهـەم و وتارەکانیـان نەدەنوسی[١٥] • بەڵام وردبونەوە لە چەند راستییەك و بەراوردیان گومان لە بەشداری دوکەس نـاهێڵێ : یەکەمیـان میجـەر سـۆن و دووەمیـان شوکریلفەضلی ( شکری الفضلی )یە • لەوانەیە هەر ئەم دوانەش بە جوتـە دەستەی نوسەر و کارگێڕی «تێگەیشتنی راستی» بوبن •

---

(١٤) «العرب» ، بغداد ، ٧ کانون الثانی ١٩١٨ .

(١٥) بەنیسـبەت «العرب»ەوە مێژونوسی ئاگادار مامۆسـتـا عەبـدوڕڕەزاق حەسەنی دەڵێ ئەو نوسەرانە لەوە سڵیان دەکردەوە نومەی لایەنگیری داگیرکەریان بدرێتە پاڵ (عبدالرزاق الحسنی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٧٥ ) . راستە زۆر نوسـەری ئەم رۆژنامەیە ناوی خۆیان نەدەنوسی ، هی واشیان هەبو نازناوی بۆ خۆی دادەنا . بۆنمونە عەبدوڕڕەحمـان بەنا بە ناوی (ابن‌الیراع)ەوە نوسینی بڵاو دەکردەوە . کەرمەلی زانـا گەلێ نازناوی جیاجیای بەکاردەهێنا . بەڵام ئەمـە بۆ خـۆی کارێکی ئاساییە . بەوێنە کەرمەلی ناوبراو ٤٠ نازناوی هەبو کە زۆربانی بـەر لە ساڵی ١٩١٤ بەکارهێناوە ( بڕوانە : کورکیس عواد ، الاب انستـاس ماری الکرملی . حیاته ومؤلفاته (١٨٦٦ ــ ١٩٤٧) ، بغداد ، ١٩٦٦ ، ص ١٩ ــ ٢٢) . هەمان‌کات ژمارەیە نوسەر و شاعیری بەناوبانگی ئـەو سەردەمەی وەك زەهاوی بە ناوی ئاشکرای خۆیـانەوە لە «العرب»دا بەرهەمیـان بـڵاو دەکردەوە و بە شـانازییەوە باسـی دەسکەوتە شارستانییەکانی ئینگلیزیان دەکرد . مەبەسـتم لەم رونکردنەوەیـە ئەوەیە نیشانی دەم بۆ ئەو سـەردەمە هێشتا زو بو بەوجـۆرە بێر لـە ئینگلیز بکرێتەوە ، بەتایبەت چونکە هێشتا دڵی خەڵك پڕ لە رق و کینە بو بەرامبەر عوسمانییان و تەواو ئینگلیزیان لەنزیکەوە نەناسیبو .

هەرچی مێجەر سۆنە [١٦] لە هەمو ئینگلیزی ئەو سەردەمە و بگرە پێش ئەو سەردەمەش زیاتر شارەزای کورد و وڵاتی کورد و زمانی کوردی بو • بەر لە شەڕی یەکەم بە چەند ساڵێ هاتبووە ناو کورد و لە نزیکەوە دەرسی نیشتمان و نەریتی کردبون و پەیوەندی لەگەڵ زۆری ناوداریان بەستبو ، بەرهەمی گەورە و بایەخداری دەربارەیان بڵاو کردبۆوە [١٧] • سۆن زمانی کوردی ئەوەندە دەزانی مامۆستا ئەمین زەکی بڵێ : «بەقەدەر کوردێک کوردی ئەزانی و لە عالمێکی کورد زیاتر شارەزای زمانەکەمان بو » [١٨] • کوردی زانینی سۆن گەیشتبووە رادەیە قورئانی پیرۆزی بە باشی لە عەرەبییەوە وەردەگێڕایە سەر زمانی کوردی • جارێکیان بە بەردەمی چاپخانەیەکی سلێمانیدا تێدەپەڕێ و دەبینێ زۆر کەس بە قومارەوە خەریکن• یەکسەر وتارێ بە ناوی خۆیەوە لە «پێشکەوتن»دا بڵاو دەکاتەوە و تێیدا دەڵێ :

---

(١٦) ئێلی بانستەر سۆن ( Ely Bannister Soane ) ( ١٦ی ئابی ١٨٨١ — ٢٤ی شوباتی ١٩٢٣) یەکێکە لە ئەفسەرە سیاسییە هەرە ناودارەکانی ئینگلیز . وەك رۆژهەڵات و کوردناسیش شوێنی دیاری خۆی هەیە . بەر لە شەڕی یەکەم بە ناوی میرزا حەسەین غولامی شیرازییەوە هاتە گەلێ ناوچەی کوردستان . ساڵانی شەڕ زۆر فەرمانی گرنگی لە عیراق پێسپێررا . دوای شەڕ بۆ ماوەیە حاکمی سیاسی سلێمانی بو . لە رۆژانی سەختی کاریدا توشی سیل هات و ئەنجام بەو دەردە رۆی .

(١٧) گەشتەکەی کوردستانی بە کتێبێکی گەورە دو جار چاپکرا ( E. B. Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in disguise, London, 1912 and 1926 ).

گەلێ بەرهەمی بایەخداری دەربارەی زمانی کوردی و هۆزەکانی کوردستان هەیە .

(١٨) محمد امين زكی ، خلاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان ، جلدی اول (جزمی دووەم) ، بەغدا ، ١٩٣١ ، ل ٢٩١ . لە زۆر شوێنیتردا چاپی عەرەبی ئەم کتێبەمان وەك سەرچاوە بەکارهێناوە ئەویش زیاتر لەبەر لێدوانەکانی محەمەد عەلی عەونییە .

«دەڵێم ئەم یاری‌یانە لەسەر پارە یا چای بێ یاخود لەسەر هەچ شتێکی‌تر بێ قومارە و فەرقێکیان لە ێودا نی‌یە • لە قورئانی مەجیدا بێژراوە : «یسألونك عن الخمر والمیسر قل فیهما اثم کبیر ومنافع للناس ، واثمهما أکبر من نفعهما » یەعنی : «لە تۆ دەپرسن لە مەی و قومار بڵێ لەو دوانەدا زیانی گەورە و قازانج هەیە ، بەڵام زیانیان زۆرترە لە قازانجیان » • دیسان فەرموراوە : « انما یرید الشیطان ان یوقع بینکم العداوة والبغضاء في الخمر والمیسر ویصدکم عن ذکر الله وعن الصلوات » یەعنی « جگە لەمە نی‌یە کە شەیتان دەیەوێ لە ناوتان دوژمنی و رق بخاتن بە مەی و قومار و ئێوە بهێڵێتەوە لە زکرێ خوا و لە نوێژ »[19] • دیارە کێشانی ئەم کوردی‌یەی سۆن دەبێ بە تەرازوی سەردەمی خۆی بێ کە لەگەڵ قسەی گەلێ شاعیر و نوسەری ئەو قۆناغە پارسەنگی پێ ناوێ • بەڵام گوێ بۆ ئەم راگەیاندنە رایەڵ کەن کە دیسان هەر خۆی نوسیویە :

« بۆ زانینی هەمو :

مەجید کوڕی عەلێ هەمەوەندێ ٢٧ ساڵەیە ، دەستە پیاوە ، سمێڵی پڕ و درێژە ، ریشی تۆپە ، مۆی سورە ، پیاوی کوشتووە و هەڵاتووە ، هەچ کەسێ هەواڵی ئەو مەجیدە بدا کە بۆ کوێ چووە یا بیگرێ و بیگەیێنێتە حوکمەت سێ‌صەد روپیەی ئەدرێتێ •

**حاکمی سیاسی مێجەر سۆن » (٢٠) •**

سۆن حەزی دەکرد زمانی کوردێ پێشکەوێ و بێتە زمانی نوسێن • بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم نیازەی پەنای بردە بەر گەلێ کاری بە ئەنجام • هەر کە بووە حاکمی سیاسێ سلێمانی کوردێ کردە زمانی خوێندن و نوسێن و

---

(١٩) «پێشکەوتن» ، سلێمانی ، ١٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٠ •
(٢٠) «پێشکەوتن» ، ٣ی مارتی ١٩٢١ •

پەیوەندیی نێوان دەزگایانی میریی[21] • بەخێرایی کتێبی ئـەلفبای کوردیی چاپکرد و خۆی بەسەر فێرگەکاندا دەگەڕا و زۆر گەرم مامۆستا و شاگردانی ئەو قوتابخانانەی بۆ بەکار هێنانی زمانی کوردی هاندەدا • جگە لەوە سۆن کەوتە هاندانی نوسەر و شاعیرانی کورد بۆئەوەی زیاترپەتیی بنوسن • بـۆ ئەم مەبەستەی پێشکەوتنێکی رێکخست و نوسینێکی زەکیی صائیبی کردە دووەم لەگەڵ ئەوەش کە لە تارتـێـك‌بینیی و ورە بـەردان و «گەڕان بەدوای عیزرائیل» بەولاوە هیچیتری تێدا نی‌یە ، بەڵام هەمۆی لە بەرگێکی ساکاری پەتیدا پێشکەش کراوە و مێجەر سۆنیش عەوداڵ و کوژراوی ئەوە بـۆ • هەر لەو پێشکەوتنەدا شیعرێکی شێخ نوریی شێخ صالحی کردۆتە یەکەم کە قەت ناچێتە ناو دەفتەری بەرهەمە بەهێزەکانی ئەو شاعیرەوە ، بەڵام بۆ سۆن ئەوە زۆر بـۆ کە شێخ نوریی بە کوردیی‌یەکی پـەتیی خەڵکی هاندەدا بۆ بایەخدان بە کشتوکاڵ[22] • هەر بەوجۆرەش سۆن شـێـخ نوریی و جەمال عیرفانی هان دەدا لەسەر لۆکە و توتن و ئەو بابەتانە بنوسن • راستە مێجەر سۆن دەیەویست داهاتی بۆجەی کارگێڕیی شار زۆر کا کە هەمۆ کاروباری ناوچەکەی پێ هەڵدەسوڕێنرا ، بەڵام خۆ هیچکام لە حاکمە سیاسی‌یەکانیتر،

(21) بڕوانـە :
W. R. Hay, Two Years in Kurdistan. Experiences of a Political Officcer 1918 — 1920, London, 1921, PP. 36 — 37.

(22) مێجەر سـۆن هەواڵی ئـەو پێشکەوتنـەی لە ژمـارە (27) و (28)ی رۆژنامەی «پێشکەوتن»دا بلاوکردەوە . یازدە کەس لەو پێشکەوتنەدا بەشدار بون کە سیانیان یەکەم و دووەم و سێیەم دەرچون. یەکەمیـان شیعری شێخ نوریی شێخ صالح بۆ «جوتو گا شـتێکی چـاکە» ( 50 روپیەی لە سەر وەرگرت) ، دووەمیان پارچەیە پەخشانی زەکیی صائیب بۆ ، بێ ناونیشـان بلاوی کردەوە و 35 روپیـەی لەسـەر وەرگرت ، سێیەمیان «رۆژەوە بۆنێك»ی محەمەد جەمیل (جەمیل صائب) بۆ کە ئەویش پارچەیە پەخشانە لە شێوەی چیرۆکدا نوسراوە و 25 روپیەی لەسەر وەرگرت (بڕوانە : «پێشکەوتن» ، 28ی ئۆکتۆبەر و 4 و 18ی نۆڤەمبەریی 1920 ) .

تەنانەت تۆئێلیش کە وا ناسرابو کوردی خـۆش دەوێ ، وەك ئەو بیریـان نەکردەوە و رەفتاریان نەکرد •

لە لایەکی‌ترەوە مێجەر سۆن وەك فەرمانبەرێك دریغی لە جێ‌بەجێ‌کردنی هیچ ئەرکێکی سەرشـانی نەدەکرد ، چیی پێ دەکرا وەك نوێنـەری رژێمی وڵاتەکەی بە ئەوپەڕی دڵسۆزی‌یەوە دەیکرد • لەمیشیاندا سۆن عـارەقی دەڕشت و توشی دەرد و ئازار دەهات و زادی مێشکی دەسوتاند و زۆریشی لەسەر دەکەوت • گەلێ جار سۆن لەگەڵ مەرگ دەستە و یەخە دەوەستا[٢٣] •

بەم‌جۆرە پێویستە لە هەمو قوژبن و لایەتێکەوە سەیری سۆن بکرێ : وەك مرۆڤێك کە ئەویش مەبەستی بۆ بێتـە « لۆرانسی کورد »[٢٤] ، وەك فەرمانبەرێك و وەك پیاوێکی ئازا و زانـا و شـارەزا • سەربـاری هەمو ئەمانەش سۆن دەستی باڵای لە مەیدانی رۆژنامەنوسیدا هەبو • یەکێ بو لە بەڕێوەبەرانی (( Basra Times )) کە یەکەم رۆژنامەیە ئینگلیزەکان لە بەسرە دوای گرتنی دەریان کرد[٢٥] • هەر کە بوشنە حاکمی سیاسی سلێمانی یەکسەر دەستی دایە دەرکردنی رۆژنامەی «پێشکەوتن» کە بە بـارست و ناوەرۆك لەگەڵ «تێگەیشتنی راستی» هیچ جیـاوازی‌یەکی نی‌یە • ئەم راستی‌یـانە

---

(٢٣) تایبەت بەر لە شەڕی یەکەمی جیهـان ، واتە ئـەو کاتـەی بە نـاوی بازرگانێکی عەجەمەوە ماوەیەکی درێژی لە کوردستان بردەسەر . مێجەر سۆن خۆی بە وردی باسی ئەو رۆژانەی کردووە (بڕوانە کتێبەکەی : .( (( To Kurdistan and Mesopotamia in disguse ))

(٢٤) ئێرنست مێین دەڵێ کارەکانی سۆن «بەرادەی کارەکانی لۆرانس گرنگ بۆن‌هەرچەندە کەمتر زانراون » .
( E. Main, Iraq from Mandate to Independence, London, 1935, P. 51 ).

(٢٥) بڕوانە :
A. T. Wilson, Loyalities Mesopotamia 1914 — 1917. A Personal and Historical Record, London, 1930, P. 73.

بەسەر یەکەوە دەبێ گومان لەوەدا نەهێڵن کە مێجەر سۆن دەست و دەوری گەورەی لە دەرکردنی رۆژنامەی «تێگەیشتنی راستی»دا هەبێ •

کە ژمارەکانی «تێگەیشتنی راستی» دەخوێنییەوە هەست بە نوسینی دوو کەسی جیاواز دەکەیت ، هەست دەکەیت یەکێکیان بۆ کورد سوتاوە و بە زمان و هەستی رۆژهەڵاتیرەك دەدوێ • ئەوی تریان وەك ئینگلیزێکی دڵسۆز و روناکبیرێکی ئەوروپایی دەنوسێ • ئەمیان وەك وتمان مێجەر سۆنە • هەرچی ئەوی تریانە زۆر لەوە دەکا شوکریلفەضلی بوبێ[26] • بۆ ئەمەش ، وەك لە خوارەوە باسی دەکەین ، چەند بەڵگەیەکمان بەدەستەوەیە •

شوکریلفەضلی[27] ( ١٨٨٢ ـ ١٩٢٦ ) یەکێکە لە توسەرە ناودارەکانی

---

(٢٦) روفائیل بەطی لە بەرگی یەکەمی ساڵی ١٩٢٦ی « لغة العرب »دا ئیشارەتێکی کردووە بۆ ئەوە کە شوکریلفەضلی لە «تێگەیشتنی راستی»دا کاری کردووە .

(٢٧) نیسبەت بە گەڕەکی «فضل» لە بەغدا کە تیا لەدایکبووە . کوڕی مەحمودی کوڕی ئەحمەد ئاغای خەڵکی سلێمانییە . عایشەی دایکی لە هۆزی «کرویە»ی عەرەبە . گەلێ سەرچاوەی باوەڕپێکراو دانی بەم راستییەدا ناوە (بڕوانە : رفائیل بطی ، شکری الفضلی (١٨٨٢ ـ ١٩٢٦) ، ـ «لغة العرب» ، بغداد ، الجزء الاول من السنة الرابعة ، تموز ١٩٢٦ ، ص ٢٢ ؛ خیرالدین الزرکلی ، الاعلام ، الجزء الثالث ، الطبعة الثالثة ، بیروت ، بلا ، ص ٢٥٠ ؛ حمە بۆر ، شکری الفضلی الشاعر الذي کتب للعرب والاکراد ، ـ «العراق» ، بغداد ، ١٨ آب ١٩٧٧ ) . لەگەڵ ئەوەش هەن ئەم پیاوە لە دایك و باوکەوە بە عەرەب دادەنێن (بڕوانە : عبدالله الجبوری ، شکری الفضلی ، ـ «البلد» ، بغداد ، ٥ مایس ١٩٦٦ ) . گەر ئەمە راست بێ ئەوەندەیتر لە مەقامی شوکریلفەضلی بەرز دەکاتەوە ، زۆر خۆشە مرۆڤ هێند دیموکراسی بێ و گەلانیتری بەورادەیە خۆش بوێ و ئاوا دڵسۆزانە خزمەتی زمان و کەلەپوریان بکا و بۆ دوارۆژیان بە پەرۆش بێ . با لێرەدا ئەوەش بڵێین بەڵگەیەکی گرنگی عەرەبایەتی شوکریلفەضلی لای عەبدوڵلا ئەلجبوری ئەوەتە کە لە کتێبی «مشاهیر الکرد و کردستان»ەکەی مامۆستا ئەمین زەکیدا ناوی نەهاتووە ! .

عيراقی پێش شەڕی یەکەم و دوای ئەو شەڕە . بە دایك عەرەب و بە بـاوك کورد شوکریلفەضلی ، وەك نوسەرێکی کورد دەڵێ ، تاکە کەسـە کە بۆ هەردو رەگەزی وەفادار بۆ[28] . هەرچەندە بەغدا مەڵبەندی خێزانی ئەم پیاوە بو بەڵام بەلای کەمەوە ۲۰ ساڵی تەمەنی لە کوردەواریێ بردە سـەر ، تایبەت لە سلێمانی و دەوروبەری [29] . بـەمجۆرە کوردییەکی باشـی دەزانی و تەواو شارەزای ژیـانی کۆمەلایـەتی کورد بو . کوردیێ زانینی شوکریلفەضلی گەیشتبووە رادەیە شیعری پێدەنوسێ و شەڕە شیعری لەگەڵ شاعیرێکی بە دەسەلاتی وەك شێخ رەزا دەکرد[30] . بەر لەوەش شـەڕی یەکەم دەست پێ بکا ئەم پیاوە لە سەر کوردی دەنوسێ. لەو زنجیرە وتارەی کە لە «لغة العرب»دا بە نـاوی «کوردی ئیمڕۆ»وە بلاوی کردۆتـەوە وەك شارەزایە باسی ئافرەت و پیاو و خێزان و جل و بەرگ و ئایین و نەریتی کوردی کردووە [31] . زۆر پێ دەکا یەکەم کەسی خۆمانە بێ کە هەوڵی داوە وشەی کوردیێ بە پیتی لاتینی بنوسـێ . هەر لەو وتارەیدا گەلێ وشـەی کوردیێ پەتێ بـە لاتینی نوسـیوە [32] .

---

(۲۸) بڕوانە : حەمە بۆر ، سەرچاوەی ناوبراو .

(۲۹) لەمبارەوە گۆڤاری باوەڕپێکراوی «لغة العرب» بەر لە شـەڕی یەکەمی جیهان نوسیویە دەڵێ : «۲۰ سـاڵی لەنـاو کوردا بردەسـەر و . . . گەڕانێکی تەواو بەو ناوچەیەدا گەڕا » (بڕوانە : «لغة العرب» ، الجزء الخامس من السنة الثالثة ، تشرين الثانی ۱۹۱۳ ، ص ۲۳٤ ) .

(۳۰) وەك باس دەکەن دیوانی شوکریلفەضلێ لای مامۆستا مەلا نەجمەددیـن بووە . بە شیعرێکی شێخ رەزادا رون دیارە کە شەڕە شیعری قورسیان لە نێواندا بووە (دەربارەی ئەو شیعرەی شێخ رەزا بڕوانە : « دیـوانی شێخ رضای طالەبانی » ، کۆکەر و چاپکەری علی الطالبانی ، بەغـا ، ۱۹٤٦ ، ل ٤۰ ) .

(۳۱) شکری الفضلی ، الکرد الحالیون ، ــ «لغة العرب» ، الجزء الخامس من السنة الثالثة ، تشرين الثانی ۱۹۱۳ ، ص ۲۳٤ ــ ۲٤۲ ؛ الجزء السادس من السنة الثالثة ، تشرين الثانی ۱۹۱۳ ، ص ۳۰۷ ــ ۳۱۳ .

(۳۲) بۆنمونە : کورتـەك = Koûrtak ؛ دۆم = Dôm ؛ سـێ بـراکە Sé — Brakéh و گەلێکی تر .

جگـــه لەمانـــه شوکریلفەضلیش وەك مێجـــەر ســـۆن دەســـتی لـــه ڕۆژنامەنوسیێدا بالاّ بۆ • بەرلەوەی شـــەڕی یەکەم دەستپێبکا وتـــاری سیاسی و کۆمەلاّیەتی و شیعری له ڕۆژنامەی « التعاون » و « الزهور »دا بلاّودەکردەوە[۳۳] • وەك وتمان له گۆڤاری « لغة العرب »یشـــدا وتاری دەنوسێ • که ئینگلیز له سالاّنی شەڕدا « العرب »ی عەرەبێ و « ایران » و « ظفر عراق »ی فارســـییان دامەزراند شوکریفلەضلی بووە نوســـەرێکی چالاکیـــان [۳٤] •

ئەمانـــه گومان لـــەوەدا ناهێڵن که شوکریلفەضلی یەکێك بووە لـــه سەرپەرشتیکەرانی «تێگەیشتنی ڕاستێ» • ڕاسته هیچ بەلگەیە لەو ڕۆژنامەیه خۆیدا بۆ ساغکردنەوەی ئەم ڕاستییە به دەستەوە نییە ، بەلاّم هەمانکات هیچ بەلگەیەکی بەشداریشـــی له چاپەمەنییەکانی تـــری ئینگلیزدا بەرچاو ناکەوێ • جگـــه لەوە کوردێکیتر شك نابەین ئەو ســـالەی « تێگەیشتنی ڕاستێ » تیا دەرچوۆ له بەغدا بوبێ و نوسین و دەرکردنی ڕۆژنامەی له دەست هاتبێ • جەمال بابان تاکە کوردی عیراقە بەر له شـــەڕی یەکـــەم ڕێگـــەی ڕۆژنامەنوسێ گرته بـــەر ، بەلاّم ئەویش لەگەل هەلگیرسانی ئاگری شـــەڕ ناچار دامو دەزگای گۆڤارە تاقانەکەی پێچایەوە •

جگە له سۆن و شوکریلفەضلی بیری پشکنەر لەمباسەدا تارادەیە بـــۆ نۆئێلیش دەچێ هیچ نەبێ چونـــکه بەرادەی ســـۆن بایەخی بـــه کورد و کوردستان دەدا و وەك ئەو یەکێ بـــۆ له ئەفسەرانی لەشکری ئینگلیز لـــه عیراق • بەلاّم نوئێل زیاتر بیری له هۆز و سەرەك هۆزانی کورد دەکردەوە • ئەم بەر له سۆن بووە حاکمی سیاسێی ناوچەی سلێمانی ، کەچی وەك ئـــەو

---

(۳۳) «التعاون» و «الزهور» له بەغدا دەردەچون .

(۳٤) عبدالرزاق الحسنی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۷٥ ؛ روفائیل بطی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۲۳ ـــ ۲٤ .

بـیری لە دەرکردنی رۆژنامەیەکی کوردیی نەکردەوە هەرچەندە لەو زیاتـر پەرۆشی بۆ کورد نیشان دەدا •

بۆ ساغ‌کردنەوەی ئەم راستی‌یانە پەنام بردە بەر زۆر کەسی شارەزا و خوێندەواری کوردی ئەو سەردەمە • هەر لەم‌بارەوە نامەیەکی تایبەتیم بـۆ مامۆستا تۆفیق وەهبی نارد بەڵکو ئەوو ئەدمۆندس بتوانن یاریدەیەکم بدەن• وا لـە خوارەوە دەقی وەڵامی مامۆستا وەهبی بڵاو دەکەمەوە کە بۆ خۆی بەڵگەیەکی‌ترە بۆ ئەم باسە :

« ••• جوابی ئەو کاغەزەی نـاردبوم بۆ میستەر ئەدمۆنـدس هاتـەوە • میسـتەر ئەدمۆندس دەڵێ کـە ئـەو سـەردەمەی « تێگەیشتنی راسـتیی » دەردەچو ، خـۆی لەگەڵ کاروباری کوردستاندا پەیوەندیی نەبو • « تێگەیشتنی راستیی » ئۆرگانی پرۆپاگەندەی سیاسیی بەریتانیی بو ، میستەر سۆن سەرپەرشتیی دەکرد • بەڵام باوەڕ ناکا کە مێجەر نۆئێل دەستی بوبێ تێیدا • وە دەڵـێ کە دەشـێ شوکریلفەزلیی یەکێ بوبێ لـە سـەرەك نوسـەرەکانی ••• » [٣٥] •

یەکەم ژمـارەی « تێگەیشتنی راسـتیی » رۆژی سێ‌شەممەی ١٨ی ( ربیع الاول )ی ١٣٣٦ی کۆچی ــ یەکی کانونی دووەمی سـالی ١٩١٨ لە بەغدا دەرچو ، بەڵام لەو ژمارەیەدا بە هەڵە سالی ١٩١٧ لەبریتی سالی ١٩١٨ چاپ‌کراوە [٣٦] • یـەکەم ژمارەی بەم‌جۆرە « مسلك »ی رۆژنامەی تازە

---

(٣٥) لەو نامەیەیدا مامۆستا تۆفیق وەهبی دەڵێ : «پێشنیار دەکەم لەباتـی (د.) نیشانەی (در.) دانێین بەرامبەر وشەی دوکتۆر » .

(٣٦) بەهۆی ئەو هەڵەی چاپەوە دانەری «کشاف الجرائد والمجلات العراقیە» (بغداد ، ١٩٧٦) زاهیدە ئیبراهیم کەوتۆتە هەڵەوە و سالی ١٩١٧ی بە سەرەتای دەرچونی «تێگەیشتنی راستیی» داناوە . سەرچاوەی‌تریـش

لەدایك‌بوی دیار کردووە: «تێگەیشتنی راستی خزمەتی یەك‌بون و سەربەستی و سەرکەوتنی کوردان ئەکا • ئەمڕۆ هەمو ئەقوامی عالەم خەریکی بەجێ‌هێنانی ئەم ئومێدە موبارەکەن و گەلێکیان لەپاش کۆششێکی پیاوانە پێی گەیشتن• هەر فیکرێ کە بە تەرازوی عیلم و عەقڵ نەپێورابێ عەرزی ناکەین ، هەر ئیشێ کە بە تاقی کردنەوە چاك‌دەرنەچوبێ کردنی رەوا نابینین » [٣٧] •

وەك لەکۆتایی بەشی دووەمدا وتمان کورد بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان گەیشتبووە ئەو پلەیەی لە رێگەی رۆژنامەوە قسەی لەگەڵ بکرێ • ئینگلیزیش ئەو سەردەمە لە گشت لایەتێکەوە مەبەستی بۆ کورد بەلای خۆیدا راکێشێ • لەمەدا ، بەر لە هەمو شت ، هۆی دەرکردنی «تێگەیشتنی راستی » دەبینرێ •

بەشی زۆری سەرتاپای ژمارەکانی «تێگەیشتنی راستی» بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراوە و لەمەدا هیچ لادانێك لە سروشت و کاری ئاسایی بەدی ناکرێ • هەر لە ژمارە یەکدا و دوابەدوای باسی رێبازی رۆژنامەکە «تێگەیشتنی راستی» وتارێکی بەم ناوەوە بلاوکردۆتەوە : «چاکەی حکومەتی بەریتانیای معظم بۆ عیراق» • لێرەدا بەشی زۆری ئەو وتارەی وەك خۆی دەخەینە بەرچاو بەنیازی رونکردنەوەی رێباز و شێوازی نوسینی «تێگەیشتنی راستی» لە سەرەتای هاتنە مەیدانی‌یەوە :

«عیراق لەم شەڕە عالەمگیرەدا لە هەمو لا نەوجەوانانێکی زۆری بەکوشتن‌درا کە بەراستی قوەتی ئەژنۆ و هێزی دەستی بەختیاری ئایندە بون • لەبەرئەمە ئەم وڵاتە خەندەبارە ، هەمو لایەکی لە زۆری هەتیوانی هەناسە سارد و بێوەژنانی بێ‌کەس و دەر هەمیشە دەگریا • هەزاران مال

---

کەوتونە هەمان هەڵەوە (بڕوانە : محەمەدی مەلا کەریم ، سەرچاوەی ناوبراو ) •

(٣٧) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە یەك ، ١ی کانونی دووەمی ١٩١٨ •

وێران بۆ ، سوتا ، وەك جگەری خانەخوێ بۆ بەکۆی زوخاڵ • هـەزاران بـاغ و جۆگە و زەوێ بێخاوەن ما • رزق ، شـتومەك رۆژبـەرۆژ کەم ، فەقیر و هەژار تا ئەهات زۆر دەبۆ • گەلێ کەس ئێوارە بێچرا دەما ، شەو بێشێو سەریان ئەنایەوە • هەمۆ لایە پڕ لە شیوەن و هـاوار و گریـان و باوکەڕۆ بۆ • بێسەرێ و بێدەرێ هەمۆ ولاتانی خەمبـار کرد • بێئیشێ ، بێبازاڕێ خەلقی لە گیانی خۆی بێزار کرد [٣٨] • عیراقیەیە بێچارەکان لەژێر باری گرانی خوێنینی ئەم هەمۆ شەڕ و شۆڕە ، ئەم هەمـۆ خەم و خەفەتـە دەیانناڵاند ••• ئاخرێ خوا حکومەتی معظمەی بەریتانیای بۆ عیراقیەیەکان رەخساند ، حکومەتە زاڵمە عاجزەکەیان دەرکرد و هەموانی لە کۆت و زنجیری بێرەحمێ ئەوان نەجاتدا • لە حاڵی نەزعی گیژانەوە ، دۆبارە ژیانەوە••••» • ئینگلیز بە «زەڕەبینی قانون و عەدالەت تەماشای حەق و حەقیقەت دەکەن••• ئەو زەوییانەی کە جاران سێیەکێکی لەبەر زولم نەدەچێنرا ئەمڕۆ هەمـۆ سەوز ئەکاتەوە ، حکومەتی معظمەی بەریتانیا گەنمو جۆیـەکی زۆری بـە فەلاحەکان داو ئیشی تەواو بۆ ئاسان کردن » • بەم جـۆرە و لە سـایەی ئینگلیزدا هەموان «عومرێکی ئالتونین و زیوینین رادەبوێرن » [٣٩] •

---

(٣٨) رستەی لەم بابەتە : «بێسەرێ و بێدەرێ هەمۆ ولاتانی خەمبار کرد ، بێئیشێ و بێبازاڕێ خەلقی لە گیانی خـۆی بێزار کرد» لە نوسـینی یەکێك دەکا دەستی لە شیعردا هەبێ . ژمارەکانی «تێگەیشتنی راستێ» پڕن لە نمونەیوا کە ئەمەش بۆ خۆی بەلگەیەکیتری بەشداری کردنی شوکریلفەضلییە لە بلاوکردنەوەی ئەو رۆژنامەیەدا .

(٣٩) «تێگەیشتنی راستێ» ، ژمـارە یـەك ، ١ی کانونی دووەمی ١٩١٨ . لەمەدا «تێگەیشتنی راستێ» و «العرب» تەواو یەکیـان دەگرتـەوە . ژمارەکانی ئەمیشیان وەك ئەو پڕن لە هەڵدان بە شانوباهوی ئینگلیزدا . هەر بۆنمونە ئەم چەند دێڕەی «العرب» دەخەینە بەرچاو کە هەمان رۆژ بلاوی کردۆتەوە . «العرب» لەو ژمارەیـەیدا دەڵێ : «لە سـەردەمی لەناوچۆی تورکدا ناوی بەندیخانە لەشی دەهێنایە لەرزیـن ، خەڵـك مردنیان بەلاوە خۆشتر بۆ وەك لەم ناوە بێزراوە . تـورکان ، خوا تـا

راکێشانی هەستی گەلانی ناو ئیمپراتۆریی عوسمانیی بۆلای ئینگلیز پێویستی بە بەدناوکردنی یەکجاریی عوسمانیییان بو . «تێگەیشتنی راستی» و «العرب» لەمەدا درێغیییان نەکرد . بەشی زۆری سەروتـار و نوسینیتری هەردوکیان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراوە . ناونیشانی سەروتاری ژمـارە دوی «تێگەیشتنی راستی» ناوەرۆکیئەم رێبازە رون دەخـاتە بەرچـاو : «کوردستان چ خێرێکی لـە رۆمیان یەعنی لە تورکان دی ؟ » [40] . زۆر سەروتارییتری «تێگەیشتنی راستی» دەستە خوشکی ئەم بابەتەن ، وەك : « تورك بە عەمەلی کورد و ئەقوامیتر نایە» [41] .

کار بەمەشەوە نەوەستا . دەبو هەستی ئایینی خەلـك بجزوێنـرێ و وایانلێبکرێ تورك بە دوژمن و ئینگلیز بە دۆستی ئیسلام دابنێن . لە وتاری «ئینگیلتەرە و ئیسلام»دا «تێگەیشتنی راستی» نوسیویە دەڵێ : « ئەوی تەماشای تاریخ بکا دەبینێ کە حوکمەتی معظمەی ئینگیلتەرە گەلێ جار بە فریای ئیسلام گەیشتووە . حوکمەتی تورکی چەند دەفعـەیە لەبەرخـاتری موسڵمانان لە مردن خەلاص کردووە » . دوای باسی خۆشی و بەختەوەری موسڵمانان لەژێر سایەی ئینگلیزدا «تێگەیشتنی راستی» دەڵێ : «حوکمەتی ئینگلتەرە و فەرەنسە و روسیا لەبەر خاتری موسڵمانان بە حوکمەتی تورکیان گوت تۆ شەرمەکە و بێتەرەف بوێستە ئێمە هەرچی چاکە دەرحەق بە تـۆ رەوای دەبینین . ئەما ئیتیحادییە تورکەکان چونکە ئارەزویان ئەمە بـو کە

---

رۆژی مەحشـەر خەجالەتیان کا ، ئەم شوێنەیان کردبووە «رازەو بـۆ دۆزەخ » . . . یەکەم کاری حکومەتی بەریتـانی (لە عـیراق ـ ك. م.) لابردنی ئەو بەندیخانەیەی رۆژانی تورك بو » . دیارە ئینگلیز لە جێی ئەو بەندیخانەیەکی هێند ریکوپێکیان دانا هەمو کەس حەز بکا تیا بژی (!!) .

(40) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمـارە دو ، 5ی کانونی دووەمی 1918 .

(41) سەروتاری ژمارە 28ی «تێگەیشتنی راستی» ، 13ی مایسی 1918 .

عەرەب و کورد لەنـاو بەرن و هەر خۆیان بمێنن گوێیان لـەم قسـانە نـەگرت ...» [٤٢] .

لە وتارێکی‌تریدا بە ناونیشانی «تورکە ئیتیحـادی‌یەکان موضـیرێ ئیسلامەتین» «تێگەیشتنی راستی» دوای هێرشێکی قورس بۆ سەر تورکانی لاو دەڵێ : « ئەم جەمعیەتە تورکە کە چاوی‌پێ‌کەوت عەرەب لە تورکیا لـە خۆیان زۆرترن و استنادگاهیان دیانەتی ئیسلامە بۆ ئەمە کە ئەوان زەعیـف بکەن دەستیان‌کرد بە ئیمحا و گۆڕینی کلیلی ئادابی دیانەتی ئیسلام . چی‌یان کرد ؟ . جەمعیەتێکی گەورەی تورکیان هێنـایە ناو و ناویـان نا « تـورك ئۆجـاغی » . راو رەسمی ئەم جەمعیەتە مەحوی ئیسلامیەتە و (ئەیەوێ ـــ ك . م .) ئەوی غەیرە تورکە بیکا بە تورك ...» [٤٣] . لە سەروتارێکی تریدا دەڵێ : « حوکمەتی تورك موغایری شەرعە » [٤٤] بۆیەکا سـەردارانی گەر «ناوی محەمەد ( ص . م .)یان لا بێنی هەمۆ رۆ گرژ ئەکەن و ئەگەر نـاوی ئەنوەر و طەلعەت و جەمال [٤٥] بێ ( صلی‌الله علیه وسـلم ) ئـەڵێن ... حوکمەتێك ئەمە حالی بێ ، رجالی دەولەتێك رەوشت و دین و ئاینیان ئەمـە بێ هەڵبەت شایانی تاعەت نین » [٤٦] . سەیرکەن « تورکە ئیتیحادی‌یەکان چی‌یان بە ئیسلام نەکرد » [٤٧] و چۆن « لەگەڵ ئەڵەمانیا و هاوڕێکانی کە هەمۆ دوژمنی ئیسلامن و موسڵمانێك تا ئیمرۆ لە سایەی ئەواندا نەژیـاوە ئیتیفاقیان کرد و خۆیان و موسڵمانە بێ‌گوناهەکانیان بەمەدەردە برد ...» .

---

(٤٢) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە سیازدە ، ١٢ی شوباتی ١٩١٨ .
(٤٣) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیستو یەك ، ٢٥ی مارتی ١٩١٨ .
(٤٤) ئەمە ناونیشانی وتارەکەیە .
(٤٥) ئەو سەردەمە گشـت کاروبـاری دەوڵەتی عوسمانی بەدەسـت ئەم سیانەوە بو .
(٤٦) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیستو نۆ ، ٢٠ی مایسی ١٩١٨ .
(٤٧) ئەمە ناونیشانی سەروتاری ژمارە سیو یەکی «تێگەیشتنی راستی»یە ، ٣ی حوزەیرانی ١٩١٨ .

ئینگلیز به نیازی بزواندنی هەستی ئایینیِ خەڵکی ساکاریِ ناوچەکە پەنایان دەبردە بەر هەمۆ ڕێگەیە • ئەوەتە هەر ئینگلیزە و دەست لە ئایینی خۆیان هەڵدەگرن و دەبنە ئیسلام و «دڵسۆز»ی‌یان بۆ ئایینی نوێیان دەگاتە ڕادەی «بێز» کردنەوە لە ناوی ڕابوردوۆیان • فەرمۆ ئەوا میستەر ل• ج• ستیوارد نەك هەر موسلمان بۆ بەڵکو ناوی خۆشی‌کردە جەماڵەددین• هەرچی میستەر جاکسنی تازە موسڵمانە ناوی سەعدی ئەحمەدی لە هەمۆ ناوێکی ئینگلیزیِ بەلاوە خۆشتر بۆ [٤٨] • لای خۆشمان میستەر سۆن سەری بچوایە نوێژ و ڕۆژۆی نەدەچۆ •

تا ئەوکاتەی «تێگەیشتنی ڕاستیِ» دەستی‌کرد بە دەرچون گەلیِ ئاڵوگۆڕی گرنگ لە مەیدانی شەڕ و باری سیاسیِ نێوان دەوڵەتاندا ڕۆی‌دا• لەشکری ئینگلیز و ئەو هێزانەی سەر بەو بۆن جێ‌پێی خۆیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست باش قایم کردبۆ • بەرلەوەی لەشکری ئینگلیز بگاتە بەغدا وەزعی ڕۆسیا شلۆقا و گلوڵەی دەستە و دایەرەی چار کەوتە لێژی و زۆری نەخایاند شۆڕشی ئۆکتۆبەر تەختو تاراجی ڕژێمی کۆنی تێکدا و لەشکری ڕۆس لە شەڕ کشایەوە • ئەم ئاڵوگۆڕانە بارێکی ئەوتۆیان خولقاند کە بۆ ئینگلیز بە هیچ‌جۆر لەگەڵ بڕیارەکانی پەیمانی نهێنیِ «سایکس ــ پیکۆ»ی ساڵی ١٩١٥ نەدەگونجا • بەپێی بەندەکانی ئەو پەیمانە هەمۆ کوردستانی ناو ئیمپراتۆریِ عوسمانیِ بەر ڕوسیا و فەرەنسە کەوتبۆ • بەڵام وا یەکەمیان لە مەیدان دەرچو ، دووەمیشیان دەوری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەگەڵ دەوری ئینگلیز بەراورد نەدەکرا • بەم‌جۆرە ئینگلیز کەوتنە سەر بیری ئەوەی تا دەتوانن بەرەو باکوریِ بەغدا بڕۆن • دیارە یەکیِ لە ئەنجامەکانی ئەم ئاڵوگۆڕە زۆر بۆنی بایەخ و شوێنی کورد و کوردستان بۆ لە پلانەکانی

(٤٨) بڕوانە : «تێگەیشتنی ڕاستیِ» ، ژمارە چوار ، ١٢ی کانونی دووەمی ١٩١٨ •

ئینگلیزدا ، بەتایبەتی لەبەرئەوەش کە لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕەوە دوژمنەکانیان چالاکانە هەوڵیان دەدا هۆزە کوردەکان ڕاکێشن و بیانکەنە داردەستێکی کاریگەری خۆیان لە مەیدانەکانی شەڕدا •

لەبەر ئەم هۆیانە دەبو ئینگلیز زیاتر بایەخ بدەن بە هاندانی کورد و ڕاکێشانیان بەلای خۆیاندا • وەك ئاشکراشە کەس وەك ئەوان وەستای ئەم کارە نەبو • زوربەی لەشکری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان هندۆك و سیك بۆ تا ئەوان بەدەستەوە بونایە بەدەگمەن پیاوی خۆیان بەکوشت دەدا • لەولاشەوە هەر ئەوان زانیریان چۆن کەڵك لە خەباتی ڕەوای هۆزە عەرەبەکانی حیجاز ببینن • دیارە دەیانویست هەمان یاری بە کوردیش بکەن • لەمەشدا «تێگەیشتنی ڕاستی» دەوری خۆی بینی •

بۆ ئەم مەبەستە «تێگەیشتنی ڕاستی» بە هەمو زمانێك لەگەڵ کورد دەدوا • لە سەروتاری ژمارە دوێدا دەڵێ : «چارەی کوردان ئەمڕۆ وەك عەرەب بە حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا پشتبەستنە چونکە چاوی لە ماڵ و مولکی کەس نییە ، ئارەزوی ئازادکردنی ئەقوامە ، حکومەتی ئەمەریکا دەستێژی ئەوە ، کەنەدە و ئیرلەندە و میسر و هندستان لە سایەی ئەوا زۆر چاك سەربەست ئەژین • لە تورکیا بەتەمای دڵخۆش‌بون شێتییە ئەی کوردی برایان » [٤٩] •

لە سەروتاری ژمارە چواریدا «تێگەیشتنی ڕاستی» ئایین و سیاسەت لە یەك جوێ دەکاتەوە و[٥٠] دەڵێ : «حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا شەرقی بۆ شەرقێکان دەوێ ، ئەم حەربە گەورەیە بۆ سەربەست بونی ئەقوامی موختەلیفەی عەرەب و کورد و ئەرمەن دەکا • بۆ خۆ بە خۆ ژیانی هەمو

---

(٤٩) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژمارە دوێ ، ٥ی کانونی دووەمی ١٩١٨ .

(٥٠) ناونیشانی سەروتاری ئەو ژمارەیە بەمجۆرەیە : « دیانەت جوێیە و سیاسەت جوێیە » .

ئەقوام سەعیەکی تەواوی ئیختیار کردووە »[٥١] .

لەبەر خاتری هەمان مەبەست زۆر جار «تێگەیشتنی راستی» دەکەوتە باسی «خۆشەویستی» و «دلسۆزی» بێهاوتای ئینگلیز بۆ کورد . بەگەرمی دەیگوت : « حکومەتی ئینگلیز کوردانی زۆر خۆشدەوێ ... چونکە دەزانێ لە تاریخی عالەمدا کوردان ناوێکی گەورەیان هەیە و بە مەردی و ئازایی هەتا ئێستاکە خۆیان راگرتووە . حەزناکا وا بلاو بمێننەوە و خزمەتی ئەم و ئەو بکەن ... هەلبەتە حکومەتی موعەزەمەی ئینگلیتەرە کە کوردانی لە هەموکەس زیاتر خۆشدەوێ وەکو ئیشی ئەقوامیتری ئاسانکرد ئیش بۆ ئەوانیش ئاسان دەکا ... » . لە هەمان ژمارەیدا «تێگەیشتنی راستی» دیسان دەلێ : «کورد عاقلن ، دەبێ نەختێ تێبفکرن ، تا زووە یاریەی حکومەتی موعەزەمەی ئینگلیتەرە طەلەب و خۆیان هەم لە تورك و هەم ئەلەمان و کەسانیتر رزگار بکەن و بۆخۆیان جوێ بژین ، خودا پەکیانناخا ... »[٥٢].

لە ژمارەیەکیتریدا دەلێ :

« ئینگلیز لە هەمو قەومێك زیاتر دۆستی کوردانن ، عاشقی شوجاعەتی ئەوانن ، دلێری کوردانیان چاك بیستووە لەبەرئەمە زۆریان خۆش ئەوێن . ئێمە ئەگەرچی لە بەغدا کەمین [٥٣] بەلام لە خەلکی بەغدا خۆشەویسترین . مەئموری یەتی گەورە ئەمڕۆ زۆری لە دەسکوردانە ، کوردێ کە موراجەعەتیان بکا بێبەشی ناکەن ... لە تورکان مەترسن ، بەمزیکانە لەشکری جیهانگیری ئینگلیز بە ئیمدادتان دەگا ... » [٥٤] .

---

(٥١) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە چوار ، ١٢ی کانونی دووەمی ١٩١٨ .
(٥٢) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە هەژدە ، ٢ی مارتی ١٩١٨ .
(٥٣) دیارە ئەمە نوسینی مێجەرسۆن نییە ، لە نوسینی شوکریلفەضلی دەکا ، گەر وابێ خۆی بە کورد داناوە .
(٥٤) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە حەفدە ، ٢٣ی شوباتی ١٩١٨ .

«دلسۆزی» ئینگلیز بۆ کورد گەیشتبووە رادەیە ناونیشانی ژمارە ٣٣ی «تێگەیشتنی راستی» بەمجۆرە بێ : « حکومەتی بەریتانیای عوزما سەعی بۆ کورد دەکا » • ئەو حکومەتە ، وەك دەڵێ ، «قۆڵێکی موحتەشەمەی بۆ کوردان درێژ کردووە بۆ ئەمەی کە لە دەست حکومەتی تورك خۆی نەجات بدا • دەبێ (کورد — ك• م•) بە کەمالی دیقەت حەرەکەت بکا چونکە ئەمڕۆ لە حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا زیاتر هیچ حکومەتێك نی‌یە خزمەتی حوڕیەتی بەشەر و سەعادەتی ئەقوام بکا » • «تێگەیشتنی راستی» لێرەدا ناوەڕاست و باشوری عیراق دەکاتە نمونە کە وەك دەڵێ ئەمڕۆ « لەسایەی عەدالەتی» بەریتانیادا «لە هەمو ئەقطاری عالەم» باشترن • کۆتایی «تێگەیشتنی راستی» بە ئەوپەڕی بڕواوە دەڵێ : «شوبهە نی‌یە کوردستانیش لەم نزیکانە نائیلی ئەم رەفاهو خێرە دەبێ » [٥٥] • ژمارەکانی‌تری ئەم رۆژنامەیە پڕن لەم بابەتە قسە و گفت و پەیمان و هاندانە [٥٦] •

«تێگەیشتنی راستی» زۆر جار عەرەبی حیجاز و عیراق و بە رادەیەکی کەمتر ئەرمەنی دەکردە نمونە بۆ کورد و دەیویست بە ناوی ئەوانەوە زیاتر هانیان بداء دیارە لەمەدا عاقڵی دەکرد ، چونکە ئەوانیش وەك کورد ساڵەهای ساڵ بۆ گیرۆدەی دەستی عوسمانی‌یان بون • جگە لەوە مەسەلەی حیجاز ئەو رۆژانە دەیتوانی لە قوژبنی ئایینەوە کار بکاتە سەر گشت موسڵمانانی جیهان • لەمەشدا «تێگەیشتنی راستی» وەستایانە هاتە مەیدان • بەکوردی دەوت ئەوەتە « حیجازی موبارەك لەژێر عەلەمی حەزرەتی رسول‌الله ، رۆحم بە صەدەقەی بێ ، ئیعلانی ئیستیقلالی کرد » [٥٧] ، چونکە تورکە

(٥٥) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە سێو دو ، ١٠ی حوزەیرانی ١٩١٨ .

(٥٦) شایانی باسە لەگەڵ نزیك‌بونەوەی کۆتایی شەڕ و مسۆگەربونی سەرکەوتنی ئینگلیز « تێگەیشتنی راستی » کەوتە پاشەکشە لە گفت و پەیمانە زۆرەکانی .

(٥٧) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە شازدە ، ٢٣ی شوباتی ١٩١٨ .

ئیتیحادی‌یه‌کان « ئاره‌زویان ئه‌مه بۆ عه‌ره‌ب و کورد له‌ناوبه‌رن و ... گه‌لێ له گه‌وره‌ی عه‌ره‌ب و کورد به کوشتن دران و نه‌فی کران و چل په‌نجا هه‌زار که‌س له‌وان به زولمی ئه‌لمانیا و حه‌ماقه‌تی تورك له‌ناوچۆن ... شه‌ریفی مه‌ککه‌ی موشه‌ڕه‌فه جه‌نابی سولتان حسه‌ین [٥٨] که موسلمانێکی سه‌ید و به‌شه‌ره‌ف و غیره‌ت بۆ که ئه‌م حاله بێ‌مه‌عنایه‌ی دی له‌گه‌ڵ حکومه‌تی زالمی تورك به شه‌ڕ هات » [٥٩] . له ژماره‌یه‌کی‌تردا به هه‌مان ده‌ستور ده‌ڵێ : «قه‌ومی عه‌ره‌ب ئه‌وا جوێ حکومه‌تیان هێنایه ناو . ئه‌مڕۆ سولتان حسه‌ین له مه‌ککه‌ی موشه‌ڕه‌فدا شه‌ره‌فی عه‌ره‌بی زیندو کرده‌وه . له کوردستان پیاوی گه‌وره ده‌س ده‌که‌وێ ، بۆچی بێ‌ده‌نگ بۆن ، تورك ئه‌و قووه‌ته‌ی نه‌ماوه که که‌س لێیان بترسێ ... » [٦٠] . ده‌رباره‌ی هه‌مان باس دیسان « تێگه‌یشتنی راستی » ده‌ڵێ :

عوسمانی «ده‌یانویست عه‌ره‌ب و کورد فیدای تورك که‌ن ، ئه‌ما عه‌داله‌تی خودا ئه‌مه‌ی قبوڵ نه‌کرد . قه‌ومی عه‌ره‌ب له حیجاز حکومه‌تیان هێنایه ناو و خۆیان له ده‌س تورك نه‌جات‌دا و به (اترکوا الترك کما ترکوکم) عه‌مه‌لیان کرد ، ئه‌گه‌ر به‌مه عه‌مه‌لیان نه‌کردایه مه‌حو ده‌بون ...» به‌ڵام «کورد چونکه به‌دینن به‌زه‌ییان به‌واندا (واته به عوسمانی‌یانا ــ ك. م.) هاته‌وه و معاوه‌نه‌تیان ده‌کردن ، ئه‌ما چونکه مه‌قصود ئه‌مه بو کورد مه‌حو بێته‌وه هه‌ر چاکه‌یه‌ك له‌گه‌لیان ده‌کردن بێ‌فائیده ده‌ما و بالعکس زیاتر شێتگیر ده‌بون ...» . دوای ئه‌وه «تێگه‌یشتنی راستی» دێته سه‌ر باسی ته‌مه‌نی یه‌ك ساڵه‌ی به‌غدا له‌ژێر سایه‌ی ئینگلیزدا و ده‌ڵێ : « ئه‌و ئاسار و عیمران و مه‌ده‌نیه‌ت و زیراعه‌ت و خه‌یراته که ئه‌وان پێکیان‌هێنا تورکان به

---

(٥٨) مه‌به‌ستی شه‌ریفی مه‌ککه حسه‌ینی کوڕی عه‌لی‌یه که ئه‌وکاته راپه‌ڕینێکی گه‌وره‌ی دژی ده‌سه‌ڵاتی عوسمانی له حیجاز به‌رپا کردبو .

(٥٩) «تێگه‌یشتنی راستی» ، ژماره سیازده ، ١٢ی شوباتی ١٩١٨ .

(٦٠) «تێگه‌یشتنی راستی» ، ژماره حه‌فده ، ٢٣ی شوباتی ١٩١٨ .

٥٠٠ ساڵ نەیانتوانی بیکەن ... ئەمەمان هەیە کە قەومی کورد بە قسەی درۆی تورك تەفرە ناخۆن و دەست ئەدەنە دەستی ئینگلیز و خۆیان لە زوڵمی تورکان رزگار دەکەن و خەریکی ئیعماری مەملەکەتی خۆیان دەبن » (٦١) .

لە سەروتاری ژمارە ٣١یدا «تێگەیشتنی راستی» بێپێچوپەنا دێتە سەر مەبەست و دەڵێ : «حکومەتی تورك ئەمڕۆ هیچ قیمەتێکی دەولیەی نیە ، بەدەست ئەڵەمانیاوە وەك داشی دامە حەرەکەت دەکا ... هەڵبەتە عەرەب و کورد ئیتر مەیلی حکومەتێکیوا جاهیل و بێدەسەلات ناکەن ، زاتەن لەبەرئەمە کە عولەمای مەککە خەلافەتیان لێ نەزع کرد قیمەتێکی دینیشی نەما . عەرەب لە مەککەی موشەڕەفە ئیعلانی ئیستیقلالیان کرد . جەلالەتمەئاب مەلیك حسەین ئەمڕۆ لەگەڵ تورکەکاندا لە حەربدایە ، کوردەکانیش چارەیەکی سەری خۆیان بکەن چاکە چونکە حکومەتی بەریتانیای عوزما موحیبی کوردە » (٦٢) .

دیارە مەبەستی سەرەکی ئەم هەمو پیاهەڵدان و هاندانە ئەوەبو هۆزە چەکدارەکانی کوردستان بینە داردەستی ئینگلیز و بکەونە گیانی لەشکری عوسمانی و راوێژکەرە ئەڵەمانەکانی و بەوجۆرە رێگەی پێشکەوتنی بێزیان بۆ ئەوان تەخت و خۆش کەن . هەر لە سەرەتاوە «تێگەیشتنی راستی» ئەمەی بە رونی خستە بەر چاو و گەلێ وتاری بۆ تەرخان کرد . سەروتاری ژمارە نۆزدەی بەم ناوەوە بو : «رۆئەسای کورد دەبێ چی بکەن ؟ ». دوای مەتحێکی زۆری سەردەمی فەرمانڕەوایی سەردارانی بابان «تێگەیشتنی راستی» لەم وتارەیدا دەڵێ :

سەردارانی بابان «دایم موستەقیل دەژیان و ئەگەر لە تەرەف عەجەم و تورکەوە تەجاوزێکیان بدیایە بۆ موحافەزەی ئەمارەتی خۆیان بەگژ ئەم دو

---

(٦١) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیستو هەشت ، ١٣ی مایسی ١٩١٨ .

(٦٢) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە سیتو یەك ، ٣ی حوزەیرانی ١٩١٨ .

حکومەتە کە چەند دەفعە لە خۆیان گەورەتر بون دەچون و دەیانشکاندن •
هەم تورك ، هەم عەجەم ئیفتیخاریان بە ئیتیفاقی ئومەرای بابان دەکرد •••
ئەگەر تەماشای حەقیقەت بکرێ کورد تا ئەم نزیکانە قەومێکی حاکم بـون
کەواتا بۆچی حاکمێتی بە مەحکومیەت بگۆڕنـەوە • لەم شـەڕەدا هەر
قەومێك کە بەغیرەت بو سەری بەرز کردەوە و ئەوا نایلی حاکمیەت دەبێ •
قەومی کورد هەڵبەتە لە گەلێ ئەقوامیتر بەغیرەتترن ، بۆچی هەتا ئێستـاکە
وێستاون » • دوای ئەوە «تێگەیشتنی راستی» دەکەوێتە ژماردنی ناودارانی
کورد و لە شێخانەوە دەستپێدەکا و بەسەر جاف و پشدەر و مەنـگوڕ و
هەمەوەند و زەنگەنە و تاڵەبانی و باجەلانی و گەلێکیتردا تێدەپەڕێو [٦٣]
داوایان لێدەکا تا زووە بجولێن و «هەرایەکی گەورە» بەرپاکەن و «سلێمانی و
ئەترافی لە زولمی تورك خەلاص» کەن و هەل لە دەست نەدەن بەتایبەتی کە
«تورك ئەمڕۆ ئیشی خراپە ، ئەگەر هەر یەك لە کوردستاندا هەڵسێ ناتوانێ
نەفەرێك بۆ ئەو ناوە بنێرێ چونکە لەشکری ئینگلیز بەرابەری وێستاوە•••» •
دوای ئەوە بەنیازی زیاتر جولاندنی کورد «تێگەیشتنی راسـتی» هەر لـەو
ژمارەیەیدا دەڵێ :

«ئەمڕۆ حکومەتی ئینگیلتەرە و فەرەنسە و ئەمریکا و هاوڕێکانیـان
هەمو تەرەفداری حاکمیەتی ئەقوامن • ئەم شەڕە هەر دەبێ ئـاخری بێ ،

---

(٦٣) زۆریش بە شانو باهویاندا هەڵدەدا : شێخان « لە هەمو کوردستاندا شۆرەتی ئازاییان هەیە و هیچ وەختێ لە حکومەتی تورك نەترساون » ؛ « عەشیرەتی گەورەی جاف وجودی حکومەتی تورکیان لە لا نیـیە و هەمو بە ئەسلەحەی چاك موسەلەحن » ؛ « ئاغایانی پشـدەر و مەنگوڕ کـە حکومەتی تورك بـە تـۆپ و عەسـکەرێکی زۆرەوە دەرەقـەتیان نەدەهات » ؛ « هەمەوەند کە بە دەست و بازو تا ئەم چەندانە لە بازیان لەبەر چاوی حکومەت خەرج و باجیان لە ئەهالی وەردەگرت و حکومەتی تورك هەرچەند پەلەپەلی کرد فایەی نەبو » ؛ « زەنـگەنە و تاڵەبانی و شوان و شێخبزنی ••• زۆر شـەجیعن » ؛ « بەگزادەی باجەلان لـە تاریخدا ناویان گەورەیە » •

ئەوسا ناوی عەرەب و ئەرمەن و جولەکە لەناو موعاهەدەی صـولح زیـکر دەکرێ چونکە ئەمانە لەم شـەڕەدا هەمو سەریـان بـەرز کرد و داوای حکومەتیان کرد • ئەما کوردان تائیستا هیچیان نەکرد ، لە حکومەتان وایـە کە ئەم قەومە هیچ نیە چونکە خۆیان نەنوانـد » ، وادیـارە «خۆیـان حاکمی‌یەتیان ناوێ » چونکە « ئەگەر بیانویستایە هەرایەکیان دەکرد » و بە «قسەی درۆی تورکەکان تەفرەیان نەدەخوارد ••• کورد دەبێ لەئێستـاوە پەلەپەل بکەن تا لەناو موعاهەدەی صولح نـاویان بێ ••• وەکو دەبینـین حکومەتی ئینگیلتەرە زۆر (زۆر ــ ك• م•) کوردانی خۆش دەوێ چونـکە لە هەمو دەولەتەکانی‌تر زیاتر دەیانناسێ ، موحتەمەلە زۆر یاری‌یەیان بـدا ، ئەما کە ئەوان وسکت بن تەبیعی دەخلی بە سەریانەوە نـامێنێ و لەپاشـانا زەرەرێکی زۆر دەکەن ••• » [٦٤] •

رون دیارە ئینگلیز ئەو رۆژانە دەیـانویست هـەرایەکی گەورە دژی دەسەلاتی عوسمانێ لە کوردستان بەرپا بێ • تا نزیـك تەواوبونی شـەڕ «تێگەیشتنی راستێ» لە هەمو شت زیاتر بایەخی بەم مەسەلەیە دەدا و ئاشکرا بە ناوی ئینگلیزەوە پەیمانی یاریدەی بە سەرەك هۆزانی کورد دەدا بۆئەوەی چالاکانە دژی رژێمی عوسمانێ بێنە مەیدانەوە • یەکێك لە ژمارە زووەکانی «تێگەیشتنی راستێ» رودەکاتە «زەنگەنە و هەمەوەند و پشدەر» و پێیـان دەلێ «ئەگەر (عوسمانێ ــ ك• م•) عەسـکەری خۆیـان بنێرنە سـەرتان لەشکری ئینگلیز دەستبەجێ رودەکاتە هەمو کوردستان» خۆ « ئـەمڕۆ ئەگەر حکومەتی ئینگیلتەرە بزانێ کە هەرایە لە کوردستاندا قەوماوە تۆپ و لەشکر سەوق دەکا و بە بێ ئەمـە کە خوێـن لە لوتی کوردێ بێ ئیشـی کوردستان جێبەجێ دەبێ » [٦٥] • هـەر بەوجۆرە « تێگەیشتنی راستێ »

---

(٦٤) «تێگەیشتنی راستێ» ، ژمارە نۆزدە ، ٥ی مارتی ١٩١٨ •

(٦٥) «تێگەیشتنی راستێ» ، ژمارە پازدە ، ١٩ی شوباتی ١٩١٨ •

ئەفسەر و سەربازی کوردی ناو لەشکری عوسمانیی هاندەدا بدەنە شاخ و داوای دەکرد بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە پەیوەندی‌یان پێوە بکرێ ٠

شایانی باسە « تێگەیشتنی راستیی » لەم‌بارەوە رووی دەمی نەدەکردە تەنها سەرەك هۆزانی کوردستان ٠ جاروبار بەم‌جۆرەش دەدوا : « ئێمە لێرەدا روئەکەینە رەنجبەر و فەقیران چونکە دەزانین دەولەمەندان بە نانی خۆیان گەیشتون و رۆحی خۆیان زۆر خۆش دەوێ و خۆیان نە بە قەومی کورد نە بە دونیا ناگۆڕنەوە ٠ ئەما رەنجبەر و فەقیر لە هەمو قەومێکدا مل لە چەقۆ دەسوون ، هەر ئەمەندە چەند جوانێکی زیرەك رێگەیان پێ نیشان‌بدەن دەتوانن هەرایە بنێنەوە هەم خۆیان و هەم قەومی کورد لە فەلاکەت و کوێرەوەریی رزگار بکەن ٠ ئەی کورد ، برایانی فەقیر و رەنجبەر خۆتان زۆر چاك دەزانن کە ئەرزی کوردستان هەمو شاخ و داخە ، عەسکەری غەرب رێی تێدا چاك دەرناکا ، ئەگەر کورد[٦٦] سیلاحی خۆیان بێنن و لەگەڵ ئێوە یەك بن دەتوانن هەرایەکی گەورە بەرپا بکەن » [٦٧] ٠

لە ژمارەیەکی‌تریدا بە هەمان دەستور دەڵێ : « لێرە دوبارە قسە تەوجیهی پیاوی گەورەی کوردستان دەکەین و دەڵێین گوناهی فەقیر و هەژاری کورد هەموی بەئەستۆی ئێوەیە ئەگەر مەنفعەتی شەخسیی خۆتان بە فائیدەی عومومی کورد و کوردستان بگۆڕنەوە و ئەو قەومە کە بە هجومی بابل و ئاشور و میدیی[٦٨] و فورس و حوکمەتانی‌تر بەفەنا نەچو لەناوی

(٦٦) مەبەستی سەرباز و ئەفسەری کوردی ناو لەشکری عوسمانی‌یە ٠

(٦٧) «تێگەیشتنی راستیی» ، ژمارە پازدە ، ١٩ی شوباتی ١٩١٨ ٠

(٦٨) هێنانەوەی ناوی میدیی لێرەدا راست نی‌یە ، بەلام دەشبێ ئەوە لەیادنەکەین کە ئەوکاتە هێشتا را زانستی‌یەکەی کورد و رۆژهەلاتناسی بەناوبانگ پرۆفیسۆر مینۆرسکی لەبارەی پەیوەندیی رەگەزی کورد بە میدی‌یەوە بلاو نەبوبۆوە ( لەو بارەیەوە بڕوانە : البروفیسور ڤلادیمیر مینورسکی ، الاکراد احفاد المیدیین ، ترجمة وتعلیق الدکتور کمال مظهر احمد ، ـ « مجلة المجمع العلمي الکردي » ، المجلد الأول ، العدد الأول ، ١٩٧٣ ، ص ٥٥٢ ـ ٥٦٣ ) ٠

بیـەن »[٦٩] •

وەك وتمان دوو کەس یا دوو دەسـتەی ( ؟ ) [٧٠] جیا « تێگەیشـتنی راستی »یان دەبرد بەڕێوە ، یەکێکیان فەرمانبەرێکی بەدەسەڵات و زیرەك و دڵسۆزی ئینگلیز بو ، ئەویتریان روناکبیرێکی کورد یا رۆژهەڵاتیەکە بە دڵ بۆ کوردستان و گەلی کورد سوتاوە • لەبەر ئەوە گەلێ جار لـە یەك مەبەستدا هەست بە دوو شێوازی جیاواز دەکەی چونکە ئەویان بـۆ یاری خۆی و ئەمیان بـۆ یاری خۆی شـینی کردووە • لە هاندانی کوردا دژی دەسەڵاتی عوسمانی ئەم لایەنە روون و ئاشکرا دەرکەوتووە • شانبەشانی ئەو شێوازەی لە سەرەوە باسمانکرد یەکێکیتر بە ئاوازێکیتر کورد بـۆ راپەڕین هاندەدا ، ئەوەش بۆ خۆی نرخ و بایەخی « تێگەیشتنی راستی » زۆر بەرز دەکاتەوە ، تـایبەت گەر کات و شـوێنیش بگرینە بەرچـاو • وا لەخوارەوە چەند نمونەیەکی شێوازی دووەم دەخەینە بەرچاو :

لە وتارێکی ژمارە بیستو پێنجیدا « تێگەیشتنی راستی » دەڵێ :

«کورد دەبێ چاك تێبفکرن ••• دەبێ چاك موتەزیری فرسەت (بن ـــ ك• م• ) و بۆ حەیاتی کوردستان هەرچی لازمە بیکەن • رۆژێکە و ئەمڕۆ ، دەبێ دەستو بازۆی هیمەتی کوردی تێدا دەرکەوێ و ناوی باوك و باپیری خۆیان کە هەمو بە شانو باهۆی خۆیان بەڕێوە چون و بەندەگێ کەسـیان قبوڵ نەکردووە زیندوی بکەنەوە و خۆیان لە مزگێنی و زوڵمی ئەم و ئەو نەجات بدەن • تەماشا کەن خوا بـەم عەزەمەت و گەورەییەی جورئەت و ئیختیاری بـە بەندە داوە چاك و خراپ چی ئارەزو دەکا بیکا ، ئەما ئەوی ئەکەوێتە ژێر باری حوکمی خەڵق جورئەتی ئیختیاریشی لەدەست وەردەگرن و وەك داشی دامە چۆن ئارەزو بـکەن وای دەگێڕن » • دواى باسـی ئەو

(٦٩) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیستو پێنج ، ٢٢ی نیسانی ١٩١٨ •
(٧٠) دوو دڵین لەوەی دوو کەس زیاتر بوبن •

دواکەوتنەی عوسمانی‌یەکان لەگەڵ خۆیان هێنایانە کوردستان «تێگەیشتنی ڕاستی» لە کوتایی هەمان وتاردا دەڵێ : زەمانی زۆ « قەوم قەومی مەحو نەدەکرد ، ئەما سیاسەتی ئەم زەمانە وا ئیجاب دەکا ئەمڕۆ ئەگەر قەومێ خۆی موحافەزە نەکا هەمو کەس دانی لێ تیژ ئەکا و کە بۆی ڕێکەوت چنگی تێ دەهاوێ و پارچە پارچەی دەکا • ئەوی عەقلی ( بێ ــ ک• م• ) ئەوەندەی بەســە » (71) •

لە وتارێکی‌تریدا « تێگەیشتنی ڕاستی » لەوەش جگەرسۆزانەتر دێتە دەست و بە دڵێکی پڕ لە داخەوە دەڵێ : « لە بەینی ئەو ئەقوامەی تابیعی تورکن(72) لە کورد مەغدورتر نی‌یە ، تورك هەر خوێنیان دەمژن و مەحصولی سەعیان دەخۆن ••• » (73) • لە وتارێکی‌تردا دەڵێ : « ئەمڕۆ قەومێ کە لەوان ( لە کورد ــ ک• م• ) بە عەدەد کەمتر و بە شەجاعەت لەوان خوارترە بۆ کۆبوونەوە سەعی دەکا و بۆ ئەمە کە ئیشی خۆی بە دەستی خۆی ڕێکخا خەو و خۆراکی لە خۆی حەرام کردووە(74) • ئەمڕۆ کێ حەز ناکا گەورە گەورانی کورد دەســت بدەنــە یــەك و بــۆ ڕزگار بونی ئەم قەومــە تێ‌بکۆشــن ••• » (75) •

شوێنی دیار لەسەر لاپەڕەکانی « تێگەیشتنی ڕاستی » بۆ سەرکەوتنی ئینگلیز و هاوپەیمانەکانیان لــە مەیدانی شــەڕدا تەرخان کراوە • جۆر و

---

(71) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژمارە بیستو پێنج ، 22ی نیسانی 1918 • شایانی باسە هەندێ جار هەردوو ڕێباز لە وتارێکدا یەکیان گرتۆتەوە ، جا ئەوە یا ڕێکەوتە یا ئەنجامی هاوسەرنجی‌یە بۆ دیاردەی تایبەتی یا لەوەوە هاتووە کە ڕەنگبێ سۆن و شوکریلفەضلی سەیرو دەستکاری وتاری یەکیان کردبێ •

(72) ذیارە مەبەستی «تێگەیشتنی ڕاستی» عوسمانی و تورکانی لاوە •

(73) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژمارە سێو یەك ، 10ی حوزەیرانی 1918 •

(74) لەوە دەکا مەبەستی ئەرمەن بێ •

(75) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژمارە هەژدە ، 2ی مارتی 1918 •

شێوازی بڵاوکردنەوەیان شێوەی پرۆپاگەندەی وەرگرتبۆ و زیاتر بۆ ئەوە بو خەڵکی کوردستان وا تێبگەن دوارۆژ لە هەمو لا زیاتر بۆ ئینگلیزە بۆیە دەبێ پشت بەوان ببەستن • بۆنمونە بەشی زۆری ژمارە بیستو یەك بۆ باسی رودواوە گەورەکانی شەڕ لە ماوەی ساڵێکدا تەرخان کراوە و کۆتایی بەمجۆرە هاتووە : « ••• ئەڵەمانیا تەمایەتی عالەم بە شیر بگرێ و ببێ بە ئاغای هەمو خەڵق ؛ خودا مووەفەقی نەکا • زاڵم عومری کەم ئەبێ • ئینگیلتەرە وانییە ، تەرەفداری حاکمیەتی ئەقوامە ، نایەوێ کەس بکا بە عەبدی خۆی بەڵکو دەیەوێ هەمو خەڵق مەسعود بن بۆیە تائیستە موەفەقە و لەمەولاش موەفەق دەبێ ، عادل دایمە بەرخوردارە »[٧٦] • « ئەڵەمانیا ئەمە چوار ساڵە خەریکە هەر پیاو بەکوشتن ئەدا و قووەت و ماڵ سەرف دەکا و موتەفیقەکانی بەگژ ئەم و ئەودا دەکا و تائیستا هیچی بە هیچ نەکرد ، بالعکس ئۆردووەکەی روی لە پەرێشانییە و حکومەتەکەی بەپێر موفلیسیەوە دەچێ • ئەوا ساڵی پێنجەمی حەرب دەستی پێکرد ، شك نییە ناتوانێ ئەم ساڵە بە سەلامەتی بەرێتە سەر چونکە ئیشی تەواوە ••• ئەڵەمانیا هەر خۆی نا ، ئەوستریا و تورك و بەلغاریشی بەقوڕدا برد • ئەما ئەوستریا و تورك هەردو موستەحەقن چونکە ساڵەهایە زوڵم لە عەناصری ژێردەستیان دەکەن ، ئەم حەربە تائیستە بەعزێکی نەجات دا و ئەوی ماوە ئەوانیش رزگار دەبن »[٧٧] •

دوژمنانی ئینگلیز ، تایبەت ئەڵەمان، هەر لە شەڕدا ژێرنەکەوتن ، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش « عەسکەریان چووە هەر جێ وێرانی کرد و ئەهالی لە رۆحی خۆی بێزار کرد • ئەما ئینگیلتەرە عەسکەری چووە هەر جێ مەعموری

(٧٦) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیستو یەك ، ١٨ی مارتی ١٩١٨ •
(٧٧) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە چل ، ٥ی ئابی ١٩١٨ •

کرد و ئەهالی‌یەکەی مەمنون هێشت [78] ... لەبەر ئـەمە ئەڵمانیا تا بێ دۆستی کەم و دوژمنی زۆر دەبێ و ئینگیلتەرە تا بێ دۆسـتی زۆر دەبێ » بۆیە « ئینگلیز موەفەق و ئەڵەمانیا مەغلوبە و زەمان لە ئیسپاتی ئەمە عاجز نی‌یـە » [79] .

بۆ هەمان مەبەست شوێنی تایبەت لە « تێگەیشتنی راسـتی »دا بۆ سـەرکەوتن و پێشکەوتنی لەشـکری ئەمیر فەیسەڵ لە حیجاز و شـام و فەلەستین تەرخان‌کراوە . ژمارەی وای هەیە زیاتر لە نیوەی بریتی‌یە لە باسی شەڕی فەلەستین[80] . سەرەوتاری ژمارە چلو هەشت کە بەم ناونیشـانەیە « ظەفەری عەظیمی فەلەسـتین » [81] بەجۆرێکی سـەرنج راکێشەر باسی بەدیل‌گرتنی ٥٠ هەزار سەرباز و ٣٢٥ تۆپ و نیوەی ئەفسـەری « ئۆردوی هەشتەمی » لەشکری عوسمانی دەکا و بە شانازی‌یەوە دەڵێ «لەشکرگێڕ[82]

---

(٧٨) بە داڕشتنەکەیدا لە قسـەی سۆن دەکا .

(٧٩) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە ٤٥ ، ٩ی ئەیلولی ١٩١٨ . هەر بەوجۆرە « تێگەیشتنی راسـتی » گەلێ نمونەی لەسـەر کوشـتن و بڕیـن و خراپەکاری لەشکری عوسمانی لە ئێران و ئازەربایجان و شـوێنی‌تر هێناوەتەوە ( بڕوانە هەمان ژمارە و ژمـارە چلو حەوتی رۆژی ٢٣ی ئەیلولی ١٩١٨ ) .

(٨٠) بۆ نمونە بڕوانە ژمارە چلو هەشت ، ٣٠ی ئەیلولی ١٩١٨ .

(٨١) رۆژنامەی «العرب»یش وتارێکی گەورەی لەژێر هەمـان ناونیشـاندا بڵاوکردۆتەوە . ناونیشان و ناوەرۆکی زۆر وتاری گرنگی « تێگەیشتنی راستی » و « العرب » لە یەکیان دەکرد . ئەم چەند نمونەیەی «العرب» بەڵگەن : « محاربة الاتراك لدين الاسلام » ( ٢١ آذار ١٩١٨ ) ؛ «انتهاك الاتحاديين لقدسيات الاسلام» (٢٥ آذار ١٩١٨) یا «الترك في نظر الالمان» (٨ نيسان ١٩١٨) ؛ «حول رزء الترك» (٢٦ تشرين الاول ١٩١٨ ) .

(٨٢) مەبەستی لە (لەشکرگێڕ) (قائد الجيش) یا (القائد العام)ە .

لیمان ڤۆن ساندەرس [٨٣] بە هەزار حاڵ خۆی لە یەخسیری رزگار کرد » [٨٤] .

« تێگەیشتنی راستی » بڵاوکردنەوەی هەمو هەواڵێکی سەرکەوتنی مەیدانی فەلەستین و شامی بە هەل دەزانی بۆ تازەکردنەوەی باسی خراپەی عوسمانی و ئەڵەمان و چاکەی ئینگلیز . « حکومەتی ئینگلتەرە کە تورکی لەوێش ( لە فەلەستین ـ ك . م . ) دەرکرد خەڵق حەیاتێکی تازەیان دەست کەوت چونکە لە زەمانی تورکدا هەمو لەبرسانا دەمردن . ئەو زوڵمانەی تورك لە سوریە کردیان گەلێ خراپتر بو » بۆیە دانیشتوانی فەلەستین و سوریە « ئەمڕۆ هەمو بە خوێنی سەری تورکیا تینون » . هەرچی ئەڵەمانیاشە « دەیەوێ خوێنی ئەقوام بمژێ ، ماڵ و حاڵیان پێ نەهێڵێ چونکە ئەو ئەڵێ : ئەقوامی شەرق حەقی بەقایان نیە ، یا دەبێ بمرن یا دەبێ عەبدایەتی قبوڵ ( بکەن ـ ك. م. ) » [٨٥] .

« تێگەیشتنی راستی » و « العرب » گەرماوگەرم قسە و وتەی لێپرسراوانی ئینگلیزیان بەجۆرێکی دیار و سەرنج راکێشەربڵاو دەکردەوە . نەك هەر سەروتاری ژمارە ٥ و ٦ و ٧ی « تێگەیشتنی راستی » بەڵکو سەرتاپای ئەو سێ ژمارەیە [٨٦] بۆ ناوەرۆك و باسی ئەو وتە گرنگەی لوید جۆرجی سەرەك وەزیر تەرخان کراون کە رۆژی ٥ی کانونی دووەمی ساڵی

(٨٣) جەنەراڵ لیمان ڤۆن ساندەرس شارەزایەکی عەسکەری ناوداری ئەڵەمانیە، ئەو سەردەمە وەك راوێژکەر سەرپەرشتی هێزی چەکداری عوسمانی دەکرد .

(٨٤) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە چلو هەشت ، ٣٠ی ئەیلولی ١٩١٨ .

(٨٥) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە چلو پێنج ، ٩ی ئەیلولی ١٩١٨ ؛ ژمارە پەنجا ، ١٤ی تەشرینی یەکەمی ١٩١٨ .

(٨٦) تەنها یەك دو هەواڵی زۆر بچوك لە ژمارە شەش و حەوتدا بڵاوکراونەوە.

١٩١٨ دای[٨٧]. «تێگەیشتنی راستی» و «العرب» قسەکانی لوید جۆرجیان بە گەورەترین روداوو گرنگترین قسەی رەسمی هەمو شەڕ دانا و بە لێدوانەوە بڵاویان کردەوە[٨٨] . لەگەڵ ئەوەش ئەو دو رۆژنامەیە ئەو قسانەی لوید جۆرجیان نەنوسی کە دەربارەی رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست ( تایبەت سوریە و عیراق ) وتبوی چونکە بەڵێنی سەربەخۆیی تەواویان تیا بو . بە هەمان دەستور چاوپۆشییان لەو بەشانەی چواردە بەندە ناودارەکەی سەرەك کۆماری ئەمەریکا ویلسن کرد کە بۆ باسی چارەنوسی گەلانی ژێردەستە تەرخان کرابون[٨٩] .

«تێگەیشتنی راستی» و بەتایبەتی «العرب» زۆ زۆ باسی ئەو دەسکەوتە شارستانەتییانەیان دەکرد کە بە هاتنی ئینگلیز لە عیراق بڵاوبونەوە . هەر لە ژمارە یەکیدا «تێگەیشتنی راستی» کەوتە باسی ئەوەی چۆن « جادەی مەملەکەت بە چرای ئەلەکتریك رۆشن کرایەوە و شەو لەگەڵ رۆژدا ئەوەندە

---

(٨٧) رۆژی ٥ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩١٨ لوید جۆرج لە هۆڵی وێستمنیستەر لە بەردەم نوێنەرانی کرێکاری ئینگلتەرە وتارێکی رەسمی گرنگی لەبارەی روداو و مەبەستەکانی شەڕەوە خوێندەوە . هەر لەو وتارەیدا لوید جۆرج گەلێ باسی ماف و داخوازی رەوای گەلانی کرد ( دەربارەی دەقی وتاری ناوبراو بڕوانە :
(( War memories of Lloyd George )), Vol. V, London, 1936, PP. 2515 — 2527 ).

(٨٨) بڕوانە : «العرب» ، ١٢ و ١٩ کانون الثانی ١٩١٨ ؛ « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە پێنج و شەش و حەوت ، ١٥ و ١٩ و ٢٢ ی کانونی دووەمی ١٩١٨ .

(٨٩) تایبەت بەندی دوازدەی کە باسی دوارۆژی گەلانی ناو ئیمپراتۆری عوسمانی دەکرد . سەیر ئەوەیە رۆژنامەی « العرب » دوای ئەوەش کە ژمارەیە لە خوێنەرانی داوایان لێ کرد دەقی ئەو بەندە وەك خۆی بڵاو بکاتەوە ئینجا هەر خۆی لێ گێل کرد ( بڕوانە : « العرب » ، ٧ شباط ١٩١٨ ) .

فەرقی نەما » و «خەڵق لەبەر ئەو ڕۆشنایی‌یە کە شەو لەگەڵ مانگ و ئەستێرە دەکا تا سەعات شەشی ( عەرەبی ــ ك۰ م۰ ) شەو [۹۰] بە هەوەسی خۆیان هاتوچۆ دەکەن ۰ چەند مانگێ لەمەوپێش بۆ چرایەکی تەنەکە هەمو ئاواتیان دەخواست ۰ ئەو تاریکی‌یە لەکوێ و ئەم ڕۆشنایی‌یە لەکوێ ؟ » [۹۱] ۰

سەیر ئەوەیە لە هەمو «تێگەیشتنی ڕاستی»دا ، بەپێچەوانەی «العرب»ەوە ، شیعرێکی پیاهەڵدانی بەسەر ئینگلیزدا تێدا نی‌یە هەرچەند شوکریلفەضلی دەستی باڵای لە شیعر وتندا هەبو ، جگە لەوەی شاعیری ناوداری وەك زەهاوی و عەبدوڕڕەحمان بەنا و هی‌تر گەلێ شیعری لەو بابەتەیان بە زمانی عەرەبی لە «العرب»دا بڵاو دەکردەوە ۰ دیارە هۆیەکی گەورەی ئەمە نەبونی شاعیری کورد بو لە بەغدا ۰ هەرچی شوکریلفەضلیش خۆیەتی لە قسەی یەکێ لە هاوڕێکانی‌یەوە وا دەردەکەوێ ڕۆژئاوا پەرست نەبوبێ [۹۲] ۰

جێی خۆیەتی لێرەدا رویەکی تری گرنگ بخەینە بەرچاو کە پەیوەندی بە شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیزمی ڕوسیاوە هەیە ۰ «تێگەیشتنی ڕاستی» یەکەم چاپکراوی کوردی‌یە باسی ئەم شۆڕشەی کردووە ، بەڵام لە زۆر ژمارەیدا هەوڵی‌داوە روی ڕاستی بشێوێنێ کە ئەمەش بۆ خۆی بە رونی مەترسی ئینگلیز دەخاتە رو ۰ وادیارە لەو کاتەوە حسابی دواڕۆژیان دەکرد ۰ هەمو سەروتاری ژمارە چلو چواری «تێگەیشتنی ڕاستی» بۆ «بەیانی

(۹۰) واتە تا نیوە شەو ۰

(۹۱) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژمارە یەك ، ١ی کانونی دووەمی ١٩١٨ ۰

(۹۲) روفائیل بەطی دەڵێ شوکریلفەضلی لەگەڵ ئەوەش لایەنگری ڕژێمی نوێی دوای سەردەمی عوسمانی بو بەڵام رقی لە مادی‌یەتی ڕۆژئاوا دەبووە و ئامانجی ئەوەبو لە ڕۆژهەڵات هێزێ بێ بتوانێ بەرەنگاری بووەستێ ( بڕوانە : « لغة العرب » ، الجزء الاول من السنة الرابعة ، تموز ١٩٢٦ ، ص ٧٦ ) ۰

حکومەتی ئینگلیز بۆ ئەقوامی روسیە» تەرخانکراوە کە سەرتاپای بریتی یە لە هاندانی گەلانی ناوچەی قەفقاس بۆئەوەی بدەنە پاڵ ئینگلیز کە ، وەك دەڵێ ، ئەوانیان «لە فکر نەچۆتەوە» بۆیە لەشکریان «بۆ یاریدەیان» و «بۆ شەڕی ئەلەمانیا» ناردۆتە خاکیان ٠ دوابەدوای ئەوە پێیان دەڵێ :

«ئەی ئەقوامی روسیە : ئەمڕۆ بینای ئیستیقلالی ئێوە خەتەرناکە و ئەو حوڕیەتەی کە لە اثنای شۆڕشدا پێیگەیشتن روی لە زەوالە ، سەبەبیش ئەلەمانیایە ٠ لە دەوری ئەو بەیداغی حوڕیەت و ئیستیقلالە کۆبنەوە کە ئێمە لەناو ئێوەدا هەڵیئەدەین ٠٠٠ ئەی ئەقوامی روسیە : ئێمە نەهاتوین کە تەنها مەملەکەتەکەتان لە دەست ئەلەمانەکان رزگار بکەین ، بەڵکو تەمامانە بە موساعەدەی ئیقتیصادی بە فریادی بگەین و لە مەشەققەت نەجاتی بدەین »[٩٣] ٠

شایانی باسە «تێگەیشتنی راستی» سەرەتا نە زۆر و نە کەم دەستکاری ئەم باسەی نەدەکرد ، کەچی لەدوا ژمارەکانیدا زۆ زۆ دەیجولاند و جاربەجار نایارانەتر دەربارەی دەنوسی ٠ هەر لە ژمارەی ئایندەیدا ناوی دەسەلاتی نوێی روسیا بەمجۆرە دەبا : « حکومەتە تازە نامەشروعەکەی روسیە»[٩٤] ٠ لەوەش خراپتر «تێگەیشتنی راستی» بەمجۆرە باسی راووداونانی لەشکری ئینگلیز و هارپەیمانەکانی لەلایەن گەلانی روسیاوە رادەگەیاند :

---

(٩٣) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە چلو چوار ، ٢ی ئەیلولی ١٩١٨ ٠ پرسیاری لیرەدا دێتە ناو کە ئایا مەبەست لە بلاوکردنەوەی بەیانێکی لەم بابەتە بە کوردی چی بوبێ کاتێك « تێگەیشتنی راستی » بەیانی زۆر لەوە گرنگتری بلاو نەدەکردەوە . تۆ بلێی ئینگلیز حسابیان بۆ کوردی ناوچەی قەفقاس کردبێ ، چونکە هەر ئەو دەورو بەرە بو کە نوێنلی کوردستانناسی شارەزایان بەرەو قەفقاس نارد و ئەوەبو لەلایەن جەنگەلی یەکانەوە بە دیل گیرا . دوریش نی یە مەبەستی ئینگلیز پرۆپاگەندە بوبێ بۆ سیاسەتی خۆیان .

(٩٤) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە چلو پێنج ، ٩ی ئەیلولی ١٩١٨ ٠

«ئەقوامی روسیە ئەمڕۆ عەساکری حوڵەفا بە کەمالی دڵخۆشی لە هەمو جێ ئیستیقبال دەکەن و بە حامی حوڕیەت و ئیستیقلالی خۆیانی دەزانن • لەو بەیاننامەیە کە حوڵەفاو حکومەتی ئینگیلتەرە دای نوری عەدالەت و مەرحەمەتی تیدا دەدرەوشێتەوە ••• حوڵەفا ئەمڕۆ لە مەسافەیەکی دورەوە عەسکەر بۆ خاکی روسیە دەنێرن و نفوس و ماڵێکی زۆر صەرف دەکەن لەگەڵ ئەمەش هیچ ئارەزوی ئەوە ناکەن یەکێك لەوان پارچەیەکی ئەرزی روسیە ببا » دیارە « عەدالەت هەر ئەمەندە دەبێ » [٩٥] •

لەگەڵ ئەوەش خوێنەر لە رێگەی هەواڵ و باسەکانی ناو «تێگەیشتنی راستی»یەوە دەتوانێ لە چەند روویەکی روسیای نوێ دروست تێبگا • ئەوەتا «زۆر زابتی روس ، هەتا لە روتبە گەورەکان لە لەشکری سوردا خزمەت دەکەن و لەم عارە ( ! )[٩٦] هیچ باکیان نیە » [٩٧] • یا « روسیەی (بۆلشەڤی ـ ك• م•) هەرچییەکی بو لەگەڵ عەوامی ئەلەمان بەشی دەکرد» و «گاڵتەی بە فیکری حوڵەفا کرد لە ئەمە کە لەشکری‌تر بۆ روسیە دەنێرن» و «ئیشکەرانی روس بۆ ئەمە حازرن کە لەگەڵ ئەڵەمانەکان شانەوشان لەسەر راین شەڕ لەگەڵ ماڵدارەکانی ئینگلیز بکەن » [٩٨] •

شایانی باسە دوای داخستنی «تێگەیشتنی راستی» «پێشکەوتن» لەم مەیدانەدا گەرمتر جێگەی گرتەوە • «پێشکەوتن» ژمارەی‌وای هەیە لە چوار شوێنی جیایدا باسی «هەرا و بگر» و «یاخی‌بون» و «برسێتی» روسیای کردووە[٩٩] بۆیە ، وەك دەڵێ ، « بۆلشەویك لە هەمو لایەکەوە

(٩٥) هەمان ژمارە .
(٩٦) لە « تێگەیشتنی راستی » دا نی‌یە .
(٩٧) « تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە شەستو سێ ، ١٣ی کانونی دووەمی ١٩١٩ .
(٩٨) هەمان ژمارە .
(٩٩) بەوێنە بڕوانە : «پێشکەوتن» ، ژمارە بیستو دوو ، ٢٣ی سێپتامبەری ١٩٢٠ . هەر ئەو ژمارانە پڕن لە هێرشی نارەوا بۆسەر شۆڕشگێڕانی

رادەکەن» و «راکردنیشیان بۆتە بەلا» چونکە بەهۆی ئەوانـەوە «ریـش تاشین لای دەلاك بە هەزار مەناتە[100] ( واتە هەزار روبل !! ــ ك. م. ) و شەکر بە ۳۰ هەزار مەناتە و هێلکەیەك بە دوو هەزار و پەنجا مەناتە [101] » .
هەر بە سایەی ئەوانیشەوە «شـارە گەورەکان بووە بە کەلاوە و خـەرابە ، فابریقەکان نەماوە ، نان نەماوە ، حکومەتی بۆلشەویك ناتوانێ بگاتە فریای رەعیەی خۆی ، ئیشو کار و فابریقە نەماوە ، ئەوی مـاوە و هـەیە زولم و زۆرە » [102] . زۆر شوێنی ژمارەی‌تری « پێشکەوتن » بە دەستووری دوا ژمارەکانی « تێگەیشتنی راستی » بۆ ئەم جۆرە باسە تەرخان کراون [103] .

بەم‌جۆرە «تێگەیشتنی راستی» ئەرکەکانی سەرشانی جێ‌بەجێ دەکردە لەگەڵ باسی هونەری رۆژنامەنوسی ئەم رۆژنامەیە چەند نمونە و باسێکی‌تری هەمان لایەن دەخەینە بەرچاو .



---

کورد و عەرەب لە باکور و باشوری عیراق و کەمالی لە تورکیا .

(۱۰۰) ئێستە بە نیو مەنـاتە !! .

(۱۰۱) ئێستە دەی بە مەنـاتێکە !! .

(۱۰۲) « پێشکەوتن » ، ژمارە بیستو شـەش ، ۲۱ی ئۆکتۆبەری ۱۹۲۰ . ئەوجۆرە نوسینانەی نـاو « پێشکەوتن » لە هێ مێجەرسـۆن دەکەن کە ئەوسا حاکمی سیاسیی سلێمانی بوو خۆی « پێشکەوتن »ی دامەزراند. هێرشی بێ ئەندازەی « پێشکەوتن » زیـاتر ئەو هۆیانەمان بـۆ روون دەکاتەوە کە هەر ئەو ساڵە پالیان بە سۆنەوە نا نامەیەکی رەسمی نهێنی بۆ حاکمی سیاسیی گشتیی ئینگلیز لە عیراق بنێرێ کە تێیدا بەداخەوە باسی ئەوەی کردووە « چۆن خەڵکی ئەو ناوچەیە وایان لێ هاتووە لە ناوو ناوەرۆکی بۆلشەفیزم تێ‌بگەن » ( بڕوانە :
A. T. Wilson, Mesopotamia 1917 — 1920. A clash of loyalities. A Personal and Historical Record, London, 1931, P. 145 ).

(۱۰۳) بۆنمونە بڕوانە : « پێشکەوتن » ، ژمارە چلو چوار و حەفتا و سێ و حەفتاو چوار و هەشتا و حەوت و نەوەت و پێنج و گەلێکی‌تر .

# بەشی چوارەم

## هونەری رۆژنامەنوسی
## لە (( تێگەیشتنی راستی ))دا

رۆژنامەنوسی و دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤار هونەرێکی هێند بەرزە کە لەدەست هەمو کەس نایەت • لەدەمێکەوە ئەم هونەرە بۆتە زانستێکی سەربەخۆی زانکۆکان • لە سالی ۱۸٦۹وە هونەری رۆژنامەنوسی وەك دەرس لە ئەمەریکا دەخوێنرێ[1] • ئەمرۆ بەرزی هونەری رۆژنامەنوسی یەکێکە لە مەرجە هەرە پێویستەکانی ژیان و سەرکەوتنی هەمو رۆژنامە و گۆڤارێك •

بە پێوانەی کات و شوێن پلەی هونەری رۆژنامەنوسی (( تێگەیشتنی راستی )) بەشی خۆی بەرز بو • ئەمەش لەراستیدا ئەنجامی چەند هۆیەکی تێکەل بو• بەر لە هەمو شت نوێنەرانی پێشکەوتوترین گەلی ئەو سەردەمەی جیهان[2] سەرپەرشتی دەرکردنی (( تێگەیشتنی راستی ))یان دەکرد کە دیارە

---

(۱) بڕوانە : د. خلیل صابات ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۳٦ — ۳۷ . نەك هەر ئەوە ، بەلکو لە قوتابخانەی ئێمرۆی هەمو ولاتە پێشکەوتووەکاندا بایەخێکی زۆر بە دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤاری تایبەتی دەدرێ و ئەرکێکی گەورەی پەروەردە و فێرکردنیان خراوەتە ئەستۆ ( بڕوانە :
Th. E. Berry, Op. Cit., PP. 267 — 296 ).

(۲) کەم گەلی جیهان بەرادەی ئینگلیز پەرۆشی خوێندنەوەی رۆژنامە و گۆڤارن (دەربارەی ئەمە بڕوانە ئەو خشتەیەی لە بەشی یەکەمدا بلاومان کردۆتەوە ) .

زۆر شارەزای هونەری رۆژنامەنوسی بون • جگە لەوە مێجەر سۆن بۆ خۆی ، وەك وتمان ، یەكێك بو لەو ئینگلیزانەی دەستی بالآیان لە دەرکردنی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەدا هەبو کە لە سەرەتای داگیرکردنی عیراقەوە فەرماندەی لەشکری بەریتانی دەستی دایە بلاوکردنەوەیان• شوکری‌فەضلیش دەمێ سالّ بو تێکەڵی کاری رۆژنامەنوسی بو بوو دەستی لە دەرکردنی هەمو ئەو رۆژنامانەدا هەبو کە ئینگلیز لە بەغدا بە عەرەبی و فارسی چاپیان دەکردن•

سەرەتا « تێگەیشتنی راستی » حەفتەی دو جار ـ شەموان و سێشەموان بە دو لاپەڕە دەردەچو • لای سەرەوە ناوی رۆژنامەکە بەم جۆرە نوسراوە : « تی‌گەیشتن راستی » • لە ژێر ناوەکەدا ژمارە و رۆژی دەرچونی بە مێژوی عیسایی و ئینجا رۆژی حەفتە و دوای ئەوەش رۆژی دەرچونی بە هیجری[٣] نوسراون • لای راستی ناوەکەوە نرخی «تێگەیشتنی راستی » چاپکراوە کە « بو ناو مەملەکەت » بو هەر ١٠٠ ژمارە ٦ روپی و « بو دەرەوە » ٨ روپی و بو ٥٠ ژمارە ٣ و ٤ روپی و بو هەر ژمارەیەی عانەیەك[٤] بو • لای چەپی ناوی رۆژنامەکەوە نوسراوە : « موخابەرە لەگەڵ ئیدارەخانەی رۆژنامە دەبێ بکرێ • ژمارە ١٧٨/٩ [٥] • نویشتەیێ کە موافیقی مەسلەکمان بێ دەینوسین ، ئەگەر نەبێ نایگەڕێنینەوە • هەر هەفتەی دو جار دەردەچێ : لە بەغداد » • لەژێر هەمو ئەمانەشەوە نوسراوە :

« رۆژنامەیەکی سیاسی و ئیجتماعی و خادیمی یەك‌بون و سەربەستی کوردانە » •

---

(٣) ژمارە یەکی «تێگەیشتنی راستی» بە هیجری ١٨ی (ربیع الاول)ی سالّی ( ١٣٣٦ )ە •

(٤) واتە ٤ فلس .

(٥) مەبەست ژمارەی ئەو خانووەیە کە شوێنی کارگێڕی «تێگەیشتنی راستی» بو . ئەو خانووە لە (شارع النهر) بو و هەمانکات شوێنی کارگێڕی رۆژنامەی « العرب »یش بو .

لە ژمارە بیستەوە ( ١١ی مارتی ١٩١٨ ) « تێگەیشتنی راستی » بۆتە چوار لاپەڕە بێ ئەوەی نرخی بگۆڕرێ • لە ژمارە بیستو یەکیشەوە ( ٢٥ی مارتی ١٩١٨ )[٦] بۆتە رۆژنامەیەکی حەفتانە و ئیتر دۆشەموان دەردەچوو لەژێر ناوەکەیدا لەبریتی « هەر هەفتــەی دوو جــار دەردەچێ : لە بەغــداد » دەنوسرا « هەر هەفتەی جارێ دەردەچێ : لە بەغدا » ، بێ ئەوەی هیچی تری لێ بگــۆڕرێ •

لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەموو ژمارەکانی « تێگەیشتنی راســتی » بە بارســت وەك یەکن : ٣٦×٢٤ ســم • رۆژنامەی « العرب » و رۆژنامەی « پێشکەوتن » کە سۆن دوایی لە سلێمانی دەری کرد هەر بەو بارســتە یا نزیکی چاپ دەکران[٧] •

وەك وتمان یەکەم ژمارەی « تێگەیشتنی راستی » رۆژی یەکی کانونی دووەمی سالی ١٩١٨ بلاوبۆوە • هەرچی دوا ژمارەیەتی رۆژی ٢٧ی کانونی دووەمی سالی ١٩١٩ دەرچو • واتە « تێگەیشتنی راستی » بەسەریەکەوە تەنها سالێك و ٢٦ رۆژ ژیا • دروشمی دوا ژمارەی وەك یەکەم ژمارەیەتی ، واتە بێ دەستکاری نوسراوە : « رۆژنامەیەکی سیاسی و ئیجتیماعی و خادمی یەکبوون و سەربەستی کوردانە » •

هەرچەندە ژمارەی (٦٥) لەسەر لاپەڕەی دوا ژمارەی « تێگەیشتنی راستی » چاپکراوە بەلام راستەکەی هەموی بەسەریەکەوە (٦٧) ژمارە لەم رۆژنامەیە چاپکرا • کاتی بلاوکردنەوەی ژمارەکانی دوو هەلە کراوە • دوو

(٦) ئەو جیاوازییە زۆرەی نێوان رۆژی دەرچوونی ژمــارە بیســت و ژمــارە بیستو یەك ، وەك باسی دەکەین ، ئەنجامی ئەوەیە کە بە هەلە دوو جــار ژمارە بیستو یەك چاپکراوە •

(٧) وادیارە ئەو راهاتنە بووە هۆی ئەوەی دوایی «ژیــانەوە» و «ژین» بــە هەمانبارست چــاپ بکرێن •

جار ژماره (٢٠) چاپکراوه و هەردوکیشیان رۆژی ١١ مارتی ١٩١٨یان بەسەرەوەیه • سەیرئەوەیه جیاوازی‌یەکی کەم لە ناوەرۆکی ئەم دوو ژمارەیەدا هەیە • سەروتاری هەردوکیان وەك یەك بریتی‌یه لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حەمدی بابان [٨] کە هەمو لاپەڕە یەك و چواریەکی لاپەڕە دوی گرتۆتەوە • ئەوی‌تری لاپەڕە دوی هەردو ژمارەکە وەك یەك بۆ « ئەدەبیاتی کورد » تەرخان کراوە • لە نیوەی یەکەمی لاپەڕە سێی هەردوکیاندا بێ‌جیاوازی باسی « حەوادیسی محلیه » ، « زەراعەت » ، «بیمارستان ــ خەستەخانە» و قسەی « تێگەیشتنی راستی » دەربارەی بایەخ پێدانی ئینگلیز بە ئاوەدانی بلاو کراونەتەوە • لێرە بەدواوە جیاوازی نێوان ئەم دوو ژمارەیە دەستپێدەکا • لە نیوەی دووەمی لاپەڕە سێی یەکێکیاندا ئەم باسانە بلاوکراونەتەوە : « ئەخباری کاظمیه » ، « هاتنی روئەسای دەغارە » ، شەڕ « لە مەیدانی عێراق » و «تەلگرافی رۆیتەر ، مارتی ١٩١٨ » کە باسی هەواڵەکانی دەرموەیە و هەمو لاپەڕە چواری گرتۆتەوە ، کەچی لە ژمارەکەی‌تردا لەبریتی هەمو ئەو باسانە وتارێکی گەورە بەم ناونیشانە بلاوکراوەتەوە : « موازەنەی قیوای دو تەرەف لەم شەڕەدا » کە نیوەی لاپەڕە سێ و سەرتاپای لاپەڕە چواری داپۆشیوە و بریتی‌یه لە باسی سەرکەوتنەکانی ئینگلیز و شکاندنی یەك لەدوای یەکی ئەلەمان و تورك •

---

(٨) حەمدی بابان یەکێك بو لە کوردە ناودارەکانی ئەوسای بەغدا . بە ناوەرۆکی «تێگەیشتنی راستی»دا وا دەردەکەوێ ئینگلیز بایەخی زۆریان پێ دابێ ، لەوە دەکا ، وەك کاتی خۆی باسی دەکەین ، حەمدی بەگی بابان لە دەسەڵات و رەفتاری ناهەمواری عوسمانی زۆر داخ لە دڵ بوبێ . شایانی باسە لە ژمارە بیستو یەکی «تێگەیشتنی راستی»دا ئەم هەواڵە بلاوکراوەتەوە : «جەنابی حەمدی بەگی بابان ٣٥ نوسخە کتێبی دەستخەتی دا بە کتێبخانەی مەعاریف. ئەم ئیحسانە مەعاریف پەروەری‌یە حەقیقەتەن لایقی ستایشە » (بڕوانە : «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیستویەك ، ٢٥ی مارتی ١٩١٨ ) .

هەڵەی دووەم بەر ژمارە (٢١) کەوتووە : لەسەر دوو ژمارەی جیاوازی یەك لەدوای یەك رۆژی ٢٥ی مارتی ١٩١٨ چاپکراوە ، هەرچەند هیچ باسێك نیە لەم دوو ژمارەیەدا لە یەك بکەن. وادیارە ئەم هەڵەیە بەسەر بەڕێوەبەرانی « تێگەیشتنی راستی »دا تێپەڕیوە بۆیە لە هیچ ژمارەیەکدا سەرنجیان بۆ رانەکێشاوە و باسیان نەکردووە .

ئینگلیز لە هەڵبژاردنی ناوی « تێگەیشتنی راستی » بۆ رۆژنامەکەیان مەبەستی خۆیان هەبوو . لە ژمارە چوارەوە لەژێر ناونیشانی « تێگەیشتنی راستی »دا جاروبار وتارێکی کورت یا هەواڵێکی گرنگ بڵاو دەکرایەوە کە هەموی بریتی بوو لە باسی چاکە و سەرکەوتنی ئینگلیز و خراپە و ژێرکەوتنی ناحەزانیان ، کە ئەوەش بەلای ئینگلیزەوە راستیە بوو دەبوو دانیشتوانی کوردستان تێی بگەن . وا لەخوارەوە یەکەم نموونەی ئەو « تێگەیشتنی راستی »یانە دەخەینە بەرچاو :

« تێگەیشتنی راستی : ئەوی لەم حسابە ورد بێتەوە دەبینێ کە حکومەتی موعەظەمەی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٧دا یەك و چوار زیاتر بەسەر دوژمندا زاڵە، لەبەرئەمە ئومێدێکی بەقوەتمان هەیە کە لەم حەربە عمومیەدا بە موەفەقیەتێکی تەواو دەرچێ و ئەقوامی شەرق هەموو ، خصوصەن عەرەب و کوردی عێراق و ئەترافی ، لە پەرێشانی رزگار بکا و بە سەربەستی و یەك بوون شاد بێ چونکە ئەم مەطلەبە موقەدەسانە هەر بە یارمەتی حکومەتێکی بە عەدالەت و ئینصافی وەك بەریتانیای گەورە پێك دێ»[٩].

شایانی باسە ئینگلیزەکان دەیانویست ناوێکی هەر لەو بابەتە یا (( Baghdad Times )) لە رۆژنامە عەرەبیەکەیان بنێن ، بەڵام وادیارە ئەنستاس کەرمەلی ئەو بیرەی پێ گۆڕیون و ناوەکەی پێ کردوونە

(٩) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە چوار ، ١٢ی کانونی دووەمی ١٩١٨ .

« العرب »[10] •

له هەمو ژمارەیەکی « تێگەیشتنی راستی »دا سەروتار یا هەواڵ و باسێکی گرنگ وەك سەروتار بڵاوکراوەتەوە • بەوجۆرە لە (٦٧) ژمارەکەی ئەم رۆژنامەیەدا (٦٦) سەروتار هەیە[11] • لە زۆر ژمارەیدا جگە لە سەروتار وتارێکیتر بڵاوکراوەتەوە • ناونیشانی زوربەی وتارەکانی ناو « تێگەیشتنی راستی » بە گشتی و بۆ کورد بەتایبەتی سەرنج راکێشەرن • ئەمانە چەند نمونەیەکی ئەو ناونیشانانەن :

« سوڵتان سەلاحەددین و تورکەکان » ( ژمارە هەشت ) ؛ « حکومەتی ئینگیلتەرە • فورس و تورك و رۆس و ئەڵەمان » (ژمارە نۆ) ؛ «ئینگیلتەرە و ئیسلام » ( ژمارە سیازدە ) ؛ « فیکری ئینگلیز و فەرەنسە و ئەمەریکا و ئیتالیا دەرحەق ئەقوامی شەرق و عەرەب چیە» (ژمارە هەژدە ) ؛ «روئەسای کورد دەبێ چی بکەن ؟ » ( ژمارە نۆزدە ) ؛ « ئینگیلتەرە و ئەڵەمانیا لەم شەڕەدا » ( ژمارە بیستو دو ) ؛ « تورك بە عەمەلی کورد و ئەقوامیتر نایە » (ژمارە بیستو هەشت) ؛ «حکومەتی تورك بۆچی شەڕ دەکا» ( ژمارە سیو هەشت ) ؛ « فەرقی حکومەتی ئینگلیز و تورك » ( ژمارە چلو چوار ) ؛ « حکومەتی تورك بێهێز بووە » ( ژمارە پەنجا ) ؛ « سەربەستی فیکری و قەومی » ( ژمارە پەنجا و حەوت ) ؛ « ئایندەی عالەم » (ژمارە شەستو دو) •

ناوی کەس لەسەر هیچکام لەم سەروتارانە نەنوسراوە تەنها سەروتاری ژمارە چلو چوار نەبێ کە بە ناونیشانی « عەدالەت شیرێکی تیژە » و لە نوسینی زەینەلعابدین کاشانی ناوە و هەمو لاپەڕە یەك و دوی گرتۆتەوە[12]• وا پێدەکا خاوەنی ئەم وتارە پیاوێکی ئایینی عەرەب بێ کە زۆر

---

(١٠) بڕوانە : عبدالرزاق الحسني ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٧٦ .

(١١) بۆیە (٦٦)ە چونکە سەروتاری ژمارە (٢٠)ی دوبارە کراو وەك یەکن ، بەپێچەوانەی ژمارە (٢١)ەوە .

(١٢) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە چلو یەك ، ١٢ی ئابی ١٩١٨ .

خۆشەویستانە باسی ئەوروپاییەکانی کردووە چونکە وەك دەڵێ بە « شیری تیژی عەدالەت » « ئەمڕۆ ریاسەتی هەمو بەشــەر دەکەن و لغـاوی حوکمی درموشاریان گرتۆتە دەست » و خەڵق « حەیرانی صــنعەتیان » دەبێ کە « مسافەیان پێ نزیك و موخابەرەیان پێ خێرا و نەقلی ئەشیایان پێ ئاسان کرد » ، سەرتاپای ئەوکارانەش بەهۆی « عەدالەتەوە جێبەجێ بون»[14] •

جگە لە سەروتار « تێگەیشتنی راستی » هەواڵی زۆری مەیدانەکانی شەڕی بەپێی راگەیاندنی « رۆیتەر » بڵاو دەکردەوە ، دیارە زۆرتر بایەخی بە سەرکەوتنەکانی ئینگلیز دەدا • جاروبار « تێگەیشتنی راســتی » دەهــاتە سەر باسی سیاسەتی نێوان دەوڵەتان وەك ئەوەی باســی رێبازی سیاسی تورکانی لاو و پەیوەندی نێــوان دەوڵەتی عوســمانی و ئەڵەمانیا و باری سیاسی روسیا و ناوچەکانی قەفقاس و باسی‌تری لەوجۆرەی دەکرد • لــە ژمارەی بیستەمی‌یەوە « تێگەیشتنی راســتی » کەوتە بایەخدانی زیــاتر بــە هەواڵ و روداو و ئالوگۆڕی ناو عیراق خۆی ، وەك باسی ژیانی ئابوری و روناکبیری و تەندروســتی و بەراوردکردنی لەگەڵ ئەوەی لــە سەردەمی عوسمانیدا هەبو • لە ژمارە بیستو یەکەوە « تێگەیشتنی راستی » دەستی کردە بڵاوکردنەوەی ئاگاداری‌یەکانی فەرمــاندەی لەشــکر و ئەو یاســا و بڕیارانەی دەری دەکردن • وا لە خوارەوە نمونەی یەکێ لەو ئاگاداری‌یانــە دەخەینە بەرچــاو :

« ئیعلان : من کە ولیەم رین مارشاڵ ــ کەی • سی • بی ــ و فەریق

---

(14) دیارە هەمان وتار بە عەرەبیش لە «العرب»دا بڵاوکراوەتەوە چونکە بڕی‌یە لە پیاهەڵدان بەسەر شانو باهوی ئینگلیزدا . کۆتایی بەمجۆرە هــاتووە : «ئەگەر مەنتیق زانێك بیەوێ کەمێکی چاکەی ئەم حکومەتەی (ئینگلیز لە عیراق ــ ك. م.) بەیان بکا زمانی ماندو دەبێ و تەواوی ناکا و قەڵەمی کول دەبێ ... خولاسە ئەم حکومەتە بۆ ئەهالی نیعمەتێکی خوایە» . لــەوە دەکا مێجەر سۆن وەری‌گێڕابێتە سەر زمانی کوردی .

ئەوەڵم بینا لەسەر ئەو سەلاحیەتەی بە سیفەتی لەشکر گێڕی عمومیِ قووەتی عیراق کە لە جەلالەتمەئابی بەریتانیاوە بە من دراوە فەقەراتی ئـاتیە ئیعـلان دەکەم : هەر کەسێ قسەیەکی درۆ یاخود شایەعەیەك یا تەقریرێك کە خەلەل بە ئەمنیەتی عومیِ بگەیێنێ و ... خەلق بێلزوم بترسێنێ و ئەفکاریان مشەوەش بکا کە ئەم جورمە لەسەری سابیت بێ بە ئیعدام و یا بە عقوبەتێکی سوکتر » بەپێی بێری دادگا حوکم دەدرێ [١٤] .

« تێگەیشتنی راستیِ » یەکەم رۆژنامەی کوردی‌یە کــە ئاگاداری و پرۆپاگەندەی بازرگانیِ بلاوکردۆتەوە . کاربەدەستانی ئینگلیز لە دەرەوەی بەغدا پیشانگەیەکی تایەتی‌یان کردەوە بۆ فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانەی لێیان زیاد بێ . لە یەکێ لە ژمارەکانیدا « تێگەیشتنی راستیِ » بەم شیوە بزوێنەرە باسی ئەو پیشانگەیە دەکا و دەڵێ : « ... ئەشیای وای تێدا هەیە کە بــۆ ئەهالیِ ئەم مەملەکەتە زۆر بەقیمەتە و بــە عەمەلیان دێ . تاجیرێکی زیرەك مومکینە قازانجێکی چاکی لێی دەستکەوێ ... ئەو شتومەکانە کە لەوێدان قیمەتیان لە چەند هەزار لیرەی ئینگلیزیِ زیاترە ، لەگەڵ ئەمە هیچ شتێکی تێدا نیە کە فیاتی ( نرخی ــ ك. م. ) زۆر بێ » [١٥] . لە ئاگاداری‌یەکی‌تری لەو بابەتــەدا دەڵێ : « کاروانی کۆلارە [١٦] لــە بەینی میسر و بــەغدا ... مودەتی سەفەر لە قاهیرەوە بۆ بەغداد لەبەینی دوٚ ســێ هەفتەدایە » بەلام « ئەو کۆلارەیە » ئەو کاروانەی تەنها بە « ١٢ ســەعات و ٣٥ دەقیقە طەی

---

(١٤) بڕوانە:«تێگەیشتنی راستیِ»، ژمارە بیستو حەوت ، ٦ی مایسی ١٩١٨. بە ناوەرۆکی ئەو ئاگاداری‌یەدا وا دەردەکەوێ تورکخوایانی عیراق ئـەو رۆژانە چالاکانە خەریکی بلاوکردنەوەی پرۆپاگەندە بون دژی ئینگلیز .

(١٥) بڕوانە : «تێگەیشتنی راستیِ» ، ژمارە پەنجا و هــەشت ، ٩ی کانونی یەکەمی ١٩١٨ .

(١٦) مەبەستی فڕۆکەیــە . لە بەشی داهاتودا دێینە سەر باسی ئەو زاراوانەی «تێگەیشتنی راستیِ» بۆ یەکەم جار بەکاری‌هێناون .

کرد »[١٧] .

هەمان‌کات « تێگەیشتنی راستی » یەکەم رۆژنامەی کوردی‌یە ریپۆرتاج‌و چاوپێکەوتنی رۆژنامەنوسی بلاوکردۆتەوە . نوێنەری « تێگەیشتنی راستی » دوو جار گفتوگۆی تایبەتی لەگەڵ حەمدی بەگی بابان کردووە . جاری یەکەم داوای لێ کردووە بیری خۆی دەربارەی رۆژنامەکە و باری سیاسی کوردستان دەربڕێ . لە وەڵامدا « ئەمیرزادەی ئەجەل و ئەکرەمی بابان جەنابی حەمدی بەگ » وتویە : « ... ئەمڕۆ ئێمە لە زەمانێکداین کە حەقی حاکمی‌یەتی ئەقوامی تێدا تەعیین دەکرێ . عەقڵ و نەجابەت و شەرەفی کوردان هەڵبەتە موساعیدی ئەمە نی‌یە کە فرسەتێکی‌وا گەورەی لە دەس دەربکەن . قەت زەن ناکەم کوردان بە قسەی کرێ گرتەی ئەڵەمان تەفرە بخۆن و دەرحەق تاریخ و حەیسی‌یەت و ئایندەی خۆیان خیانەت بکەن . کوردان ئەم زەمانەیان چاك پێ تەقدیر دەکرێ ، حەقی خۆیان هەڵبەتە داوا دەکەن و معاوەنەتی حکومەتی ئینگیلتەرە دەست خۆیان ئەخەن و لە ئەسیری خۆیان رزگار دەکەن » . وەك بەڵگە باسی ئەوە دەکا چۆن کاتێ لە « کوردستان و موسڵ » بەهۆی عوسمانی و ئەڵەمانەوە « خەڵکێکی زۆر لەبرسانا دەمرن » لە بەغدا لەژێر سایەی ئینگلیزدا «کیسەی هەموو پڕە و زگی هەموو تێرە » [١٨] .

پاش ماوەیە « موخبیری رۆژنامەی تێگەیشتنی راستی » دیسان چاوی بە « جەنابی سەعادەتمەئاب حەزرەتی حەمدی پاشای بابان » کەوتەوە . ئەمجارەش بە هەمان دەستور حەمدی بەگی بابان کورد بۆ هاریکاری ئینگلیز هاندەدا و دەڵێ :

---

(١٧) بڕوانە : «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە پەنجاو هەشت ، ٩ی کانونی یەکەمی ١٩١٨ .

(١٨) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیست ، ١١ی مارتی ١٩١٨ .

« خولاســه قەومی کورد لەلام موحەقەقە کە لەشــکری ئینگلیز و حکومەتی بەریتانیای عوزما بــە کەمالی دلخۆشی و ئیحترام ئیســتیقبال دەکەن و بە قسەی کەس تەفرە ناخۆن چونکە تورکەکانیان ئەمەندە تەجروبە کرد تا عاجز بۆن ... ئەمەلمان زۆرە کە حکومەتی حازرە کوردان بە نەزەری لوتف تەماشا بکا و ڕێی سەعادەتیان پێ نیشان بدا »[19] .

بەبۆنەی تەواوبونی شەڕەوە « تێگەیشتنی ڕاستی » لە ژمارە پەنجا و سێیدا ڕیپۆرتاجێکی ڕێکوپێکی دەربارەی ئەو ئاهەنــگە بلاوکردەوە کە فەرماندەی لەشکری ئینگلیز لــە بەغدا گێڕای[20] . لــەو ڕیپۆرتاجەیدا « تێگەیشتنی ڕاستی » باسی ڕازاندنەوەی بەغدا و « داگیرســانی چــرای ئەلەکتریك بە شەو » و شادمانی خەلك و ئــاگردانی ٢١ تۆپ بەوبۆنەیەوە دەکا . دوابەدوای ئەوە نوێنەری « تێگەیشتنی ڕاستی » دەلێ : « ڕۆژی شەممە لە بەغدا ڕۆژێ بو کە لە فکر ناچێتەوە ... کۆلانان لەبەر سەیرکەران عادەتا وەکو جۆگەی ذی حــەیات جەرەیانی دەکرد و جلی خۆل ڕەنــگی زابتان و عەسکەری ئینگلیز و هیندییەکان لەگەل جلی ڕەنگاوڕەنگی ئەهالی مەنزەرێکی غەریبی نیشانئەدا و هەموکەس لوبابی فەرەح و ڕوخۆش بو .. مۆسیقا لەو سێ مەیدانەدا کە لە پرۆغرامەکەدا تەخصــیص کرابو ئەویش بەردەمی دائیرەی لەشکرگێڕ و باتی و مەیدان بو دەستی بە تەرەنوم کرد ، چەند کۆلارەیەك لە هەوادا دەستیانکرد بە یاری ، بــەرز و نزم دەبون و تەقلەیان لێئەدا و لە خوارەوە چەپلەیان بۆ لێئەدان و تەحسینیان دەکردن .

(١٩) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژمارە بیستو هەشت ، ١٣ی مایسی ١٩١٨ .

(٢٠) هەمو ژمارە ٥٣ی «تێگەیشتنی ڕاســتی» بۆ بــاسی کۆتــایی شــەڕ تەرخــانکراوە و بە مانشێتێکی گەورە لە ناوەڕاســتی یەکەم لاپــەڕەی نوسراوە «موتارەکەی ئینگلیز و تورك» ( «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژمارە پەنجاوسێ ، ٤ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ ) . لەو سەردەمەوە «موتارەکە» بە مانای «هدنە» یا « صلح » تێکەلی نوسینی سیاسی کوردی بو .

که شەو هات نوری ئەلەکتریك رۆژی هێنا و خەڵك بــە کەماڵی فەرەح لە کوڵانەکاندا هاتوچۆیان دەکرد » • ئەم ریپۆرتاجە نزیکەی نیوەی لاپەڕە سێی ژمارەکەی داپۆشیوە •

هەمان ژمارە ریپۆرتاجێکی تری دەربارەی ئاهــەنگی نەجەف بــڵاو کردۆتەوە • وەك دەڵێ لەو ئاهەنگەدا «٧٢ سەید و ١٧٠ شێخ و لەگەڵ هەر شێخێ کۆڵێ ئەتباع حازر بون ••• ئەوی ئیشتراکی ئەم ئیجتماعەیــان کرد چاك تێگەیشتن کە عەصرێکی تازەیان بۆ ظاهر بو کە عیبارەتە لە سەلامەتی و ئیتیفاق و ئازادیٚ و تەرەقیٚ » [٢١] •

دیسان « تێگەیشتنی راستیٚ » یەکەم رۆژنامەی کوردی‌یە کە وێنــەی لەسەر لاپەڕەکانی بڵاوکردۆتەوە • ئەو وێنــانە لە ژێرەوەی دوا لاپــەڕەی ژمارەکەدا چاپ دەکران • یەکەم وێنە لە ژمــارە دۆیدا بڵاو کراوەتــەوە و لەژێرەوەی نوسراوە «پاپۆڕێکی ئینگلیزیٚ لە ساحیلی فەرەنسەدا عەسکەری ئینگلیز ئەکاتە دەریٚ [٢٢] بۆ روکاری حەربی فەرەنســە » [٢٣] • هــەمۆی بەسەر یەکەوە دوازدە وێنە لە « تێگەیشتنی راستیٚ»دا بڵاوکراوەتەوە [٢٤] کە زوربەیان وێنەی چەك و مەیدانەکانی شەڕن ، وەك «حەزرەتی حوکمداریٚ ئینگیلتەرە تەماشای کەشتیانی زرێدار دەکا » (ژمارە حەوت ) ؛ «عەسکەری ئینگلیز بە مەترەلیۆزێکەوە لەناو خەندەقدان » (ژمارە هەشت) ؛ « عەسکەری ئینگلیز حوشتری خۆیان دەشۆن» (ژمارە نۆ) ؛ « کۆلارەوایێکی ئینگلیــز

(٢١) «تێگەیشتنی راستیٚ» ، ژمارە پەنجا و سێ ، ٤ی تــەشرینی دووەمی ١٩١٨ •

(٢٢) دیارە مەبەستی ئەوەیە بڵێ سەربازی ئینگلیز دادەبەزێنیٚ •

(٢٣) «تێگەیشتنی راستیٚ» ، ژمارە دۆ ، ٥ی کانونی دووەمی ١٩١٨ •

(٢٤) لەو ژمارانەدا کە من دیومن هێندێ لەو وێنانە باش دەرنەچون ، ئەوانی‌تر زۆر باش دیارن • بە کەمیٚ ژمارەی ئەو وێنانەدا وا دەردەکەویٚ ئەوسا کاری دەرهێنانی زەنکۆگراف لە بەغدا ئاسان نەبوبیٚ •

کۆلارەکەی پیشانی خەلك ئەدا » (ژمارە یازدە) ؛ «ئالەتێکی دوژمن کوژی ئینگلیز» ( ژمارە چواردە) .

تا ئیستە بۆمان ساغ نەبۆتەوە چەند دانە لە «تێگەیشتنی راستی» چاپ دەکرا و چۆن دابەش دەکرا . بەلام گومان لەوەدا نی یە کە ژمارەی لێ دەگەیشتە ئەو ناوچانەی کوردستان کە هێشتا بەدەست لەشکری عوسمانی یەوە بون (٢٥) . دوور نی یە ژمارەی لێ گەیشتبێتە کوردستانی ئێرانیش چونکە ئینگلیز بایەخی زۆریان پێ دەدا و ئەو بایەخەش لەسەر لاپەڕەکانی «تێگەیشتنی راستی» رەنگی دابۆوە (٢٦) .

زوربەی هەرە زۆری وتارەکانی « تێگەیشتنی راستی » بە کوردی یەکی ساکار داڕێژراون . راستە نوسەرانی وشەی عەرەبی یان زۆر بەکار هێناوە . بەلام لەگەل ئەوەش نوسینەکانیان تام و چێژی کوردی یانەیان لەدەست نەداوە ، بەتایبەتی چونکە گەلێ جار لە شوێنی لەباردا بە پەندی پێشنیان و قسەی نەستەق رازێنراونەوە (٢٧) . لە هەمو ژمارەکانی «تێگەیشتنی راستی»دا تەنها جارێ وشەیەکی ناقۆلای وەك «سەرسەری» بەکارهێنراوە (٢٨) .

---

(٢٥) سالەکانی شەڕ هەمو جۆرە پەیوەندی یەکی ئاسایی لەنێوان ئەو ناوچانەی بە دەست ئینگلیز و ئەوانی بەدەست عوسمانی یەوە بون هەبو ، لەبەرئەوە دوور نی یە بەئاسانی ژمارەکانی «تێگەیشتنی راستی» گەیشتبنە کوردستان.

(٢٦) «تێگەیشتنی راستی» گەلێجار هاتوتە سەر باسی ئێران و کوردی ئێران و خراپەی عوسمانی و ئەلەمان لە کوردستان و ئازەربایجان و برسێتی ئەو ناوچانە و هۆی ناردنی لەشکری ئینگلیز بۆ ئەوێ ( بڕوانە : «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە دوازدە ، ٩ی شوباتی ١٩١٨ ؛ ژمارە چلو حەوت ، ٢٣ی ئەیلولی ١٩١٨ و هی تر ) .

(٢٧) لە بەشی داهاتودا بەدرێژی دێینەوە سەر ئەم باسە .

(٢٨) بەکارهێنانەکەی بەجۆرێکە کە تارادەیەکی زۆر لە زەقی مانای ئەو وشەیەی کەم کردۆتەوە . «تێگەیشتنی راستی» لە یەکێك لە وتارەکانیدا نوسیویە دەلێ : «ئەگەر تورکەکان پیاوی چاك دەبون بەمنەوعە ئیشی

وتارەکانی «تێگەیشتنی راستیِ» هەمۆ درێژو پڕ لە قسـەو و بـاس و هەواڵن • وتاریِ‌وای هەیە دۆ لاپەڕەی رۆژنامەکەی گرتۆتەوە ، هیِ‌واشی تیایە بە ژمارەیە کۆتایی نەهاتووە و لەژێرەوەی نوسراوە «تەواوی دیِ» یـا «دوایی دیِ» • بەلاّم هیچ وتارێك نییە لە یەك ژمارەدا کرابیِ بە دۆ بەشەوە، واتە سەرەتاکەی لە لاپەڕەیەك و کۆتاییەکەی یەکسەر لە لاپەڕەی داهاتودا نەبیِ • جێگەی تەقدیریشە کە بەدەگمەن خوێنەر توشی هەڵەی چاپ دیِ • ئەمە بۆ خۆی رۆیەکی هونەریِ گرنگیِ «تێگەیشتنی راستیِ»یە ، بەتایبەتی گەر بیِتو ئەوە لەیاد نەکەین کە کاری چاپ ئەوسا گەلیِ گرانتر بۆ وەك لـە ئیستە • بڕوا ناکریِ ئەوسا کرێکارێکی چـاپیِ کورد یا کوردیِ لە هەمـو بـەغدادا هەبوبیِ •

ئەم رووانەی باسمـان کردن لـەگەڵ شـیِ‌کردنەوەی بـایەخ‌پێدانی «تێگەیشتنی راستیِ» بە زمان و ئەدەب و مێژۆی کورد زیاتر خۆ دەنوێنن •



خۆیان تەسلیمی دۆ سیِ سەرسەریِ سـیاسەت نەدەکرد و خۆیـان وا ماڵوێران و پەرێشـان و داماو نەدەهێشـت » (بڕوانـە : «تێگەیشتنی راستیِ» ، ژمارە پەنجاو سیِ ، ٤ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ ) .

# بەشی پێنجەم

## زمان و ئەدەب و مێژوی کورد

## لــە

## (( تێگەیشتنی راستی ))دا

گرنگی و بایەخی زۆری «تێگەیشتنی راســتی» وەك رۆژنــامەیەکی کوردی لە قوژبنی ئەو شوێنە دیارەوە دەردەکەوێ کە بۆ زمــان و ئەدەب و مێژوی کوردی تەرخان کردبو • لەم بەشەی کتێبەکەمــانـدا هــەوڵدەدەین بەپێی توانا و دەسەڵات ئەم ســێ لایــەنە بایەخــدارە لە چوارچێــوەی هەڵسەنگاندنێکی راستدا بخەینە بەرچاو •

**« تێگەیشتنی راستی» و زمانی کوردی :**

بێ گومان سادەیی و رەوانی زمان مەرجی پێویستی سەرکەوتنی کاری رۆژنامەنوسین • وەك بەر لە ئێستــە باســمانکرد لە هــەمو ژمــارەکانی «تێگەیشتنی راستی»دا وشە و رستەی عەرەبی زۆر بەکارهێنراون ، بــەڵام بێ ئەوەی زمانی کوردی لەوێدا شیرینی رەسەنی خــۆی دۆڕاندبێ • هــەر خوێنەوارێکی کورد ئەمڕۆ ژمارەیەکی «تێگەیشتنی راستی» دەستکەوێ تا کۆتایی واز لە خوێندنەوەی ناهێنێ • ئەمە بۆخۆی شتێکی مانادارە •

زوربەی وتارەکانی «تێگەیشتنی راستی» بە شیعری شاعیران و پەندی

پێشنیان و نمونەی جوان رازێنراونەوە ، وەك : «بە تیرێ دوّ نیشانی دەشکاند » ، «لە سەرەوە دۆستە و لە ژێرەوە دوژمــن» ، «گورگە و لــە پێستی مەڕدایە» ، «شوێن کلاّوی بابردوّ کەوتوّن» [1] ، «پارو لە دەمی خۆی دەرئەهێنێ» ، «لەپاش باران کەپەنك» .

سەرپەرشتیکەرانی «تێگەیشتنی راستێ» هەولێکی باشیان داوە بــۆ هەلّبژاردن و دارشتنی وشەی کوردێ پەتێ بۆ مانای نوێ . وا لەخوارەوە چەند نمونەیە دەخەینە بەرچـاو :

| بە عەرەبێ | لە «تێگەیشتنی راستێ»دا | ئیستە |
| --- | --- | --- |
| الطیـارة | کولارە (ژمارە یازدە و بیست) | فرۆکە |
| الطیـار | کولارەوان (ژمارە یازدە) | فرۆکەوان |
| المطـار | ئارامگای کولارە (ژمارە پەنجا و هەشت) | فرۆکەخانە |
| الشرق | رۆژهەلاّت (ژمارە دوازدە) | رۆژهەلاّت |
| الجنوب | راست (ژمارە دوازدە) | خوارو ، باشوور |
| الشمـال | چـەپ ( ژمارە دوازدە ) | سەرو ، بـاکور |
| السـفینة | گومێ ( ژمارە دوازدە ) | |
| | پاپۆر (ژمارە چلو حەوت) | کەشتێ، گومێ، پاپۆر |
| لاجیء | پەناهێنەر (ژمارە پەنجاو یەك) | پەنابەر |
| العقبة | قورت (ژمارە پەنجاو یەك) | قورت ، تەگەرە |
| الجبهة | روکار (ژمارە پەنجاو چوار) | بەرە ، شەرگە |
| الحـارس | دەرگەوان (ژمارە بیسـتو یەك) | دەرگەوان |

(1) ئــەم پەندە جارێ وا بــەکارهێنراوە : « شــوێن کلاّوی لار کەوتن » ( « تێگەیشـــتنی راستێ » ، ژمارە چلو نــۆ ، ٧ی تەشرینی یــەکەمی ١٩١٨ ) ، لەوە دەکا مێجەر سۆن بەکاری‌هێنابێ و لێی تێك‌چوبێ .

| | | |
|---|---|---|
| لاسلكي | بێتەل (ژمارە پەنجا و هەشت) | بێتـەل |
| اللهجة | شێوە (ژمارە بیست) | شێوە |
| الراسمالي | ماڵدار (ژمارە شەستوسێ) | سەرمایەدار |
| الممثـل | نوێنەر (ژمارە شەستو سێ) | نوێنـەر |

جگە لەمجۆرە وشە و زاراوانە «تێگەیشتنی راستی» بۆ یەکەمجـار لە نوسیندا وشەی وەك ئوتومبیل و ئەلەکتریك و گالیسکە و وشـەی‌تری وای بەکارهێناوە • زۆر جاریش وشەی زۆر پەتی تێکهەڵکێشی نوسینەکانی کردووە وەك : بێژراوە و دەبێژن ، شوێنەون ، رەند ، خۆخۆیی ، خۆماڵی و گەلێکی‌تر • واش‌بووە نوسەرانی هەولیان‌داوە تەنانەت ئەو جۆرە ناوانـە بکەنە کوردی کە دەستکارییان راست نی‌یە وەك «قەرەداغ» کە کراوەتـە «شاخی رەش» [2] • «تێگەیشتنی راستی» ناوی زۆر مەڵبەند و شـوێنی بەوجۆرە بەکارهێناوە کە ئەوسا باو بون ، یا لەوانەیە ئەو بۆ یەکەمجار وای نوسیبێ ، وەك : لۆندرە (لەندەن) ، ئەمـەریقا ( ئەمەریـکا ) [3] ، قەنەدە (کەنەدە) ، ئەستەقهۆلم (ستەکهۆلم) ، قۆپنهاق (کۆپنهـاگن) ، دانیمـارقە (دانیمارك) ، لیپچیغ (لایپزگ) و هی‌تر •

نوسەرانی «تێگەیشتنی راستی» هەولیان‌دەدا پیتی نوێ بۆ ئەو دەنگە کوردی‌یانە بەکاربهێنن کە لە ئەلفبای عەرەبیدا نین • (پ) و (چ) و (ژ)ی وەك ئێستە نوسیوە : (پارچە ، پاپۆڕ ، هەرچی ، هەژار ، تێژو گەلێکی‌تر) • بەڵام جاری‌واش هەیە لە بریتی (پ) (ب) و (چ) (ج) و (ژ) (ز) یا (ش)ی بـەکار هێناوە • واهەیە هەردو شێوەی یەکێ لەم پیتانە تێکەڵی یەك ژمارە یا یـەك وتار و تەنانەت یەك دێڕیش بون و لەوانەیە لە یەك وشەدا بە هەردو جـۆر

(٢) بڕوانـە « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە شەسـتو دو ، ٦ی کانـونی دووەمی ١٩١٩ .

(٣) جاری‌وا هەیە ( ئەمەریکا )شی بەکارهێناوە .

نوسرابن • بۆنمونه یەکەم دێڕی ژمارە چلو شەشی «تێگەیشتنی راستی» وانوسراوە : «رۆژنامەی تایمس •••» ، کەچی لەژێر ناوی رۆژنامەکە خۆیدا و وەك هەمو ژمارەکانی تری نوسراوە « رۆژنامەیەکی سیاسی و ئیجتیماعی و خادمی یەك بۆن و سەربەستی کوردانە »[٤] • جاریواش هەیە (ش)ی لەبریتی (ژ) نوسیوە ، وەك (دوشمن) لە جێی (دوژمن) • جاروبار (ە)ی بەرامبەر «فتحە»ی عەرەبی بەکارهێناوە ، بەڵام توخنی (ڤ) و (گ) و سەر و بۆر و کەشیدە نەکەوتووە • زۆر جاریش پیتی عەرەبی ئەوتۆی بەکارهێناوە کە لە کوردیدا نین ، وەك (ذ) «مذکرة» و (ث) «تأثیر» و (ض) « ضرر » [٥] •

لەم‌بارەوە گرنگ ئەوەیە نوسەرانی «تێگەیشتنی راستی» لەگەڵ کاری رۆژانەیان هەستیان بە پێویستی دەسکاری کردنی رێنوسی کوردی کردووە و لەم مەیدانەدا بەپێی دەسەڵاتی خۆیان هەنگاوی باشیان ناوە • « تێگەیشتنی راستی» خۆی جارێکیان نوسیویە دەڵێ :

«ئەوروپاییەکان بۆ خوێندن و نوسینی زمانی شەرقیەکان زۆر موشکیلات دەکێشن • ئێمە لەبەر ئەمە کە ئەم موشکیلاتە بەقەدەر ئیمکان حەل‌بکەین ئەمە سالێکە لە نوسینی کوردیدا بە موافەقەتی فەنی ئێشناکان بەعزێ ئیستیلاحمان قبوڵ کرد • (سەر) و (بۆر) و (ژێر)ی حەرفەکان بە (ە) و (و) و (ی) دەنوسین [٦] : لە باتی کردستان (کوردستان) و لە باتی دکا (دەکا) و لەباتی موفقیت اوان (موفقیتی اوان) و همزەش بە (ی) دەنوسین [٧] • ئەمە بێ‌شوبهە بۆ چاك خوێندنەوەی نوسینی

---

(٤) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە چلو شەش ، ١٦ای ئەیلولی ١٩١٨ .
(٥) پیتی ( ض )ی زۆر بەکارهێناوە .
(٦) وەك وتمان هەمو کات پەیڕەوی ئەمەیان نەکردووە .
(٧) دەسکاری رێنوسی ئەم نمونانە نەکراوە .

کوردی فائیدەی زۆرە و گەلێ ئیستیلاحاتی‌تریشمان تەصەور کردووە ، ئەوانیش لە وەختی خۆیدا نەشر دەکەین[8] »[9] .

ئەم قسانە زۆر لەوە دەچن هی مێجەر سۆن بن . وا دیارە سۆن کە چەند بەرهەمێکی بایەخداری لەسەر زمان و رێزمانی کوردی هەیە[10] نیازی وابووە بەپێی پێویست ئالوگۆڕیش لە رێنوسی ئەو زمانەدا بکا . بەداخەوە کاری سیاسی زۆر و نەخۆشی قورس و مردنی زوو مۆڵەتیان نەدا .

شایانی باسە «تێگەیشتنی راستی» زۆر جار پیتی (د)ی سەرەتای وشەی وەك خۆی هێشتوتەوە ، وەك : دەکا ، دەخوا ، دەڵێ ، دەبێ ... هتد ، واتە بەوجۆرەی لە زوربەی ناوچە کوردنشینەکان بەکاردەهێنرێ و

(٨) بەداخەوە فریا نەکەوتن « ئەوانیش لە وەختی خۆیدا نەشر » بکەن ، چونکە زۆری نەبرد کە « تێگەیشتنی راستی » داخرا .

(٩) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە شەستو سێ ، ١٣ی کانونی دووەمی ١٩١٩ .

(١٠) بەشی زۆری ئەو بەرهەمانەی بەر لە دەستپێکردنی شەڕی یەکەم بلاوکردەوە ، وەك :
(( A Southern Kurdish Folksong in Kermanshahi Dialect )) , — (( Journal of the Royal Central Asian Society )) , London, 1909, PP. 35 — 51 ; (( Notes on a Kurdish Dialect, The Shadi Branch of Kermanji )) , — (( JRCAS )) , 1909, PP. 895 — 921 ; (( Notes on a Kurdish Dialect, Sulaimania ( Southern Turkish Kurdistan) )) , — (( JRCAS )) , 1912, PP. 891 — 940 ; (( Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language )), London, 1913 ( 13 + 289 PP. ) .

دوای تەواوبونی شەڕ سۆن لە بەغداش چەند بەرهەمێکی‌تری نوسی کە ژمارەیەکیان چاپکراون و یەکێکیان کوردی‌یە : « کیتابی ئەوەڵەمینی قیرائەتی کوردی »، بەغدا ، ١٩٢٠ . ئەم کتێبەی بەسەر فێرگەکانی سلێمانیدا بلاو کردەوە ، بەوجۆرە دەبێتە یەکەم کتێبی خوێندن بە زمانی کوردی .

مامۆستا تۆفیــق وەهبیــش نوســین و وتنی بە پێویســت دەزانێ [١١] ٠ جاروبارێش بەپێچەوانەوە ، ئەو وشانەی وەك وتنی خــەلکی ســلێمانی لێ کردووە ، واتە (د)کەی کردۆتە (ئە) : ئەکا ، ئەخوا ، ئەلێ ، ئەبێ [١٢] ٠ هەر بەو جۆرەش رەفتاری لەگەل (ت)ی کۆتــایێ وشــە کردووە ، زۆر جــار نوسیویە (دێت ، دەڕوات ، دەلێت ٠٠٠ هتد) ، جاروبــارێش ســوانــدویە (دێ ، دەڕوا ، دەلێ ٠٠٠ هتــد) ٠ (ی) درێژ و دۆ پیتــی (ی)ی بەســەر یەکەوە و بە یەك پیت نوسیوە ، بەلام بەدەگمەن لە یەکیشی جیا کردۆنەوە ٠ بەوێنە لە وتارێکی ژمارە پەنجا و سێیدا (پێریــان) بەمجــۆرە نــوسراوە : « لەورۆژەوە کە لەشکری ئینگلیز پێریان هاویشتە خەلیج ٠٠٠» [١٣] ٠

راستە رۆژنامە و گۆڤارە زووەکانی کورد بەپێی توانا و تێگەیشتنی سەردەمی خۆیان بایەخیان بە زمان و ڕێنوســێ کوردێ داوە ٠ « ژێن »ی ئەستەمۆل و تایبەت « هاوار »ی شام شوێنی دیاریان لەسەر لاپەڕەکانیان بۆ ئەم باسە تەرخان کردبو ٠ یەکەمیان لە دوا ژمارەکانیدا پێشنیاری چەند پیتێکی نیشــانەداری بۆ نوســینی کوردێ کرد و چــەند جارێ بلاوی کردنەوە [١٤] ٠ بەلام دەستپێشکەرێ ئەم مەیدانە گرنگە هێ رۆژنامەی « تێگەیشتنی راستێ »یە ٠

---

(١١) بڕوانە : تۆفیق وەهبێ ، ئەسلی پیتە قالبێ « ئە »ی شێوەی سلێمانی ، ـ «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشــی یەکەم ، ١٩٧٣ ، ل ٩ ــ ٣٤ ٠

(١٢) جاریوا هەیە لە یەك رستەی « تێگەیشتنی راستێ »دا هەردۆ شــێوە بەکارهێنراوە ، وەك ئەم رستەیە : « ئەلمانیا ئەمە چوار سالە خەریکە هەر پیاو بە کوشتن ئەدا و قووەت و مال سەرف دەکا و موتەفیقەکانی بەگژ ئەم و ئەودا دەکا » ( بڕوانە : « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە چل ، ٥ی ئابی ١٩١٨ ، سەروتار ) ٠

(١٣) « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە پەنجاو سێ ، ٤ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ ٠

(١٤) بۆنمونە بڕوانە : « ژێن » ، ٢٢ی مایسی ١٣٣٥ ٠

بایەخدانی « تێگەیشتنی راستی » بە زمانی کوردی جارێکی‌تر لەو بایەخە زۆرەدا خۆ دەنوێنێ کە داویە بە ئەدەبی کوردی •

**«تێگەیشتنی راستی» و ئەدەبی کوردی :**

لە رۆژی پەیدا بونی‌یەوە رۆژنامەنوسی کوردی شوێنی دیاری بۆ ئەدەبی کوردی تەرخان کردووە • « کوردستان »ی یەکەم رۆژنامەی کوردی لە ژمارە دوێیەوە [١٥] دەستی کردە بلاو کردنەوەی « مەم و زین »ی ئەحمەدی خانی و زۆری ژمارەکانی بە بەیتی ئەو داستانە گەوهەرەی ئەدەبی نەتەوەیی کورد دەڕازاندەوە‌جاری‌وا هەیە بەیتەکانی «مەم و زین» دەوروبەری نیوەی تەواوی ژمارەیەکی « کوردستان »ی گرتۆتەوە [١٦] • جاروباریش خاوەنی « کوردستان » لەو بەیتانە دەدوێ و بەرز دەیان‌نرخێنێ • جگە لە بەیتی « مەم و زین » پارچە شیعری‌تری کوردی لە « کوردستان »دا بەرچاو دەکەون •

زوربەی هەرە زۆری [١٧] رۆژنامە و گۆڤارە کوردی‌یەکانی دوای « کوردستان » وەك ئەو بایەخیان بە ئەدەبی کوردی دا و بەوجۆرە بونە یەکێ لە سەرچاوە رەسەنە دەگمەنەکانی توژینەوەی ئەدەبی کوردی • « کوردستان » نەبوایە لەوانەبو تائیستەش سالی وەفاتی شاعیری گەورەی

(١٥) خاوەنی « کوردستان » لە ژمارە دوێدا نوسیویە دەلێ ژمارەیە « میرو ئاغایانی کورد » بە نامەی تایبەتی داوایان لێ کردووە باسی «حالی نوێ و ئەدەبیاتی کوردی »یان بۆ بلاو بکاتەوە و ئەویش پەیمانی‌داوە باسی « حالی نوێ »ی کورد بکا و «هەر جار هەندێ بەیت و شیعری کرمانجی و حیکایەتی قنج » بنوسێ ( بڕوانە : « کوردستان » ، ژمارە دوێ ، ١٤ی ذو الحجه ١٣١٥ ) .

(١٦) بۆنمونە بڕوانە : « کوردستان » ، ژمارە ٦ ، ٢٥ی جمادی الاول ١٣١٦ .

(١٧) لەوانەشە هەمو .

کورد حاجی قادری کۆییان ئەزانیایە [18] . بەپێی قسەی شارەزایانی ئەدەبمان « کوردستان » یەکەم سەرچاوەیە دروست سالی دانانی

---

١٨) زوربەی نوسەرانی کورد سالی مردنی حاجی قادریان بە هەڵە داناوە . لە زووەکان مامۆستا عەبدورەحمان سەعید سالی (١٣١٢ ك) داناوە کە دەکاتە ( ١٨٩٤ ــ ١٨٩٥ی عیسایی ) ( بڕوانە : « کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی » ، چاپو بلاوکەر عبدالرحمن سعید ، بغداد ، ١٩٢٥ ، ل ٦ ) ؛ مامۆستایان سەجادی و گیو موکریانی و محەمەدی مەلا کەریم سالی ١٨٩٢یا داناوە ( بڕوانە : علاءالدین سجادی ، سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی یەکەم ، ل ٣٠٩ ، ٣١٢ ، چاپی دووەم ، ل ٣٤١ ، ٣٤٣ ؛ « دیوانی حاجی قادری کۆیی » ، هەولێر ، ١٩٦٩ ، ل ٥ ؛ محمدی مەلا کەریم ، حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بغداد ، بێ ، ل ٩ ) . دوکتۆر ئیحسان فوئاد و دوکتۆر مارف خەزنەدار وەك ئەدمۆندس سالی ١٨٩٤یان بۆ وەفاتی حاجی داناوە ، بەلام هەرچی ئەدمۆندسە بە وشەی (( circa )) ( واتە دەوروبەری ) گومانی نیشانداوە ( بڕوانە :

Ихсан Фуад, Творчество Хаджи Койи и его место в курдской литературе, Автореферат, Москва, 1966.

دوکتۆر ئیحسان فوئاد ، هونەرمەندی حاجی قادری کۆیی و شوێنی لە وێژەی کوردیدا ،کورتەی نامەی دوکتۆراکەی بە زمانی رۆسی ، مۆسکۆ، ١٩٦٦ ، ل ٩ ؛ دوکتۆر مارف خەزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٤٠ ؛

( C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, P. 58 ) .

مامۆستا رەفیق حیلمی لە « شیعر و ادبیاتی کوردی »کەیدا ( بەغدا ، ١٩٤١ ، ل ٩٩ ــ ١١٨ ) باسی تەنها سالی لەدایكبونی حاجی کردووە . هەرچی مامۆستا ئەمین زەکیبە سالی ١٣١٤ی کۆچی داناوە کە ١٨٩٦ و ١٨٩٧ دەگرێتەوە ( بڕوانە : محمد امین زکی ، مشاهیر الکرد و کردستان فی العهد الاسلامي ، الجزء الثانی ، بغداد ، ١٩٤٧ ، ص ١١٠ ) ؛ هەرەگول ئازیزان کە نازناوی جەلادەت بەدرخانە ، سالی ١٣١٢ی کۆچی داناوە کە ١٨٩٤ و ١٨٩٥ دەگرێتەوە ( بڕوانە :

( (( Hawar )), Sham, Sal 9, Hejmar 33, 1941, L. 13 )

( شایانی باسە لە بریتی ١٣١٢ك بە هەڵە ١٩١٢ چاپکراوە ) . بەلام رۆژنامەی « کوردستان » لە لاپەڕە سێی ژمارە سێیدا ( ٢٨ ذوالحجه

« مەم و زین »ی نوسیوە[19] . «ژین»ی ئەستەمۆڵ پڕە لە زانیاریی گرنگ دەربارەی ئەدەبی کورد . بەوێنە پیرەمێردی نەمر یەکەمجار « قوربانی تۆزی رێگەتم »ەکەی نالیی لەودا بڵاوکردەوە و دێڕ بە دێڕ کردویە بە تورکی[20] . وادیارە ئەوسا پیرەمێرد بە ناوی ( پیرە کورد )ەوە نوسینەکانی خۆی بڵاو دەکردەوە[21] .

لە رێگەی « ژین »ی ئەستەمۆڵەوە دەتوانرێ تۆماری ناوی شاعیرانی کورد دەوڵەمەند کرێ . ع . رەحمیی هەکاریی لە هەمو ژمارەیەکیدا شیعری پڕ هەستی نەتەوەییی بڵاو کردۆتەوە کە تارادەیە هەست بە نوێکاریی لە بەرهەمەکانیدا دەکرێ . دیسان « ژین » بەرهەمی ( سیاە پۆش ) ناوێکی بڵاو کردۆتەوە کە کەسمان تائێستە ناویمان نەبیستوە و لەوە دەکا شاعیرێکی وردکار و خوێندەوارێکی باش بوبێ[22] :

ئەی حەبیبی قەلب و رۆح و ئەی قەراری جانی من
دەی چە بێتن جارەکی گەر تۆ بیبە میهمانی من
بێ لەسەر چاڤێ مە رۆ نێ نەظرا قلبی من
ئەز غلامێ کەمترینم ، هەر تۆیی سوڵتانی من
قەلب و دڵ مەجروحی عەینی ئەسوەدی تەنە
نینە بێجامامێ قەت مەرهەم و دەرمانی من

---

١٣١٥ ) هەواڵێك و چەند بەیتێکی حاجیی بڵاوکردۆتەوە و لەوێدا نوسیویە « ساڵێ دی وەفایی کر » کە بەپێی کاتی دەرچونی ئەو ژمارەیەی « کوردستان » دەکاتە ساڵی ١٨٩٧ . بەمجۆرە شارەزایانی ئەدەبی کورد توانییان ساڵی وەفاتی حاجیی بزانن .
بێناو کاتی خۆی ئەم زانیارییانەم لە «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»دا بڵاوکردەوە ( بڕوانە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٣ ، ل ٤٠٣ ــ ٤٠٥ ) .

(١٩) بڕوانە : الدکتور عزالدین مصطفی رسول ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٢ .
(٢٠) « ژین » ، ژمارە شەش ، ٢٥ی کانونی یەکەمی ١٣١٤ ، ل ١٢ ــ ١٤ .
(٢١) بڕوانە : « ژین » ، ژمارە دوازدە ، ٢٥ی شوباتی ١٣٣٥ ، ل ٤ ــ ٨ .
(٢٢) دەربارەی لە زۆر کەسم پرسی ، یەکێکیان مامۆستا هێمنی شاعیر بو ، کەسیان هیچیان دەربارە نەبیستبو .

صەد وەکی عیساو و ئیفلاتون و جالینۆسی حەکیم
چاری دەردی من ناکەن بێ تۆ ئەی لوقمانی من

..........................................................

ئەز ئەسیری قەید و بەند و زولف و زنجیری تەمە
رەحمێ کە بە یەخسیران ئەی شاهو سولتانی من

..........................................................

..........................................................

زولف خالان «ماه و رولر چوق سیاه پوش ایدیلر
قورقرم بن قره اولسون» چادر و سەیوانی من (٢٣)

هیچ لە راستی دوور ناکەومەوە گەر بڵێم لە هەمو ئەم جیهانە پان و بەرینەدا تەنها کوردە شاعیری خاوەن بەهرەی وەهای خۆی نانـاسێ !! .

داوەر ئەردەلانێ کە دیسان کەسمان ناویمان نەبیستووە لەگەڵ تەواو بوونی شەڕی یەکەمی جیهاندا پڕ بە دەم هاواری کردووە :

کوردان وەرن هەمو پێکەوە دەست بە دەست بدەین
بۆ کۆمەڵە هەژارەکەمان ، با لەناو نەچین
خەڵقی لەژێر سێبەری عیرفاندا حەساونەتەوە
ئێمەش خەریکی من من و تۆ تۆی جەهالەتین (٢٤)

« هاوار »ی بەدرخانییانیش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئەدەبی کوردی‌یە . « ئەدەبی کوردی لە هاواردا » پێشنیاری سەروتارێکی زانستی بەکەڵکە دەیخەمە بەرچاوی شارەزایان . والێرەدا بە کورتی چەند نمونەیەکی ئەم باسە دێنینەوە .

« هاوار » یەکەم چاپەمەنی کوردی‌یە کە « وەفدی کوردستان »ەکەی پیرەمێردی بڵاوکردۆتەوە و لەژێرەوەی ئاشکرا مەبەستی شاعیر و هۆی

(٢٣) بڕوانە : « ژین » ، ژمارە دوازدە ، ٢٥ی شوباتی ١٣٣٥ ، ل ١٥–١٦ .
زۆر کەم دەسکاری نوسینەکەی کراوە .
(٢٤) بڕوانە : « ژین » ، ژمارە (٤) ، ل ١٦ .

دانانی رۆن کردۆتەوە[٢٥] . گەلێ شیعر و پەخشـــانی نەزانراوی گۆرانی زیندو لە « هاوار »دا چاپکراون . ئەویش « ئەی چاو »ەکەی یەکەمجار لە « هاوار »دا بلاوکردۆتەوە و نـــاوی « ئاواتـــی دوری » لێ نـــاوە . دوای تەواوبونی بەیتەکانی ، گۆران رونکردنەوەیەکی کورتی نوســـیوە کە تێیدا دەلێ : «ئەم شیعرانە لەسەر ئوصولی «فقرە» رێكخراون ، هەر فەقەرەیـــەك عیبارەتە لە چوار بەیت ، بەیتی یەکەم و چوارەم لەسەر وەزنی عەروز وتراون ، دووەم و سێیەمیش لەسەر وەزنی پەنجە » [٢٦] .

گۆران لە ژمارە دەی ئەم گۆڤارەدا «ئیلهامی هاوار»ی بۆ «مەفکورەی بەدرخانییەکان» بلاوکردۆتەوە کە بەمبەیتە نازدارانە دەستی پێکردووە :

**دەروێشێکم دێ لەسەر دوخمەی شا**
**شای صەلاحەدین ، بەکوڵ ئەگریـــا**
**هاواری ئەکرد ، ئەیلاوانەوە**
**دلی ئینسانی ئەتـــاوانەوە (٢٧)**

دیسان گۆران لە ژمـــارە دوازدەی «هـــاوار»دا شـــیعری « ئـــەی گەلاوێژ » [٢٨] و پەخشانی «چاو»ی [٢٩] بلاوکردۆتەوە . لەمیاندا دەلێ : «هەندێ [٣٠] وەك شەو رەشن ، هەندێکیش چەشنی پیرۆزە شێن ، هەندێ چاویتریش هەن ئەلێی چاوی هەلۆن ، چەشنی یاقوت ئاگریان لێ ئەبێتەوە!. لای من وایە چاوی رەش بە جلوەی حوزن و دلۆپی فرمێسکەوە قەرالیچەی هەمو چاوە جوانەکانە ... ئەوەندە شیرین ، ئەوەندە بێوێنەیە ... » .

---

(٢٥) « هاوار » ، ژمارە ٢٢ ، ١ی تەموزی ١٩٣٣ ، ل ٤ .
(٢٦) « هاوار » ، ژمارە ٩ ، ٣٠ی ئەیلولی ١٩٣٢ ، ل ٥ .
(٢٧) « هاوار » ، ژمارە ١٠ ، ٢٣ی تەشرینی یەکەمی ١٩٣٢ ، ل ٥ . هـــەر لەو ژمارەیەدا « هەی وەتـــەن »ی ( خدۆك ) بلاوکراوەتەوە کـــە پارچە شیعرێکی نیشتمانی نایابی پڕ لە زانیاری مێژوییە .
(٢٨) « هاوار » ، ژمارە ١٢ ، ٢٧ی تەشرینی دووەمی ١٩٣٢ ، ل ٣ .
(٢٩) هەمان ژمارە ، ل ٤ ــ ٥ .
(٣٠) هەمو ( هەندێ )کانی بە ( هەنگێ ) نوسیون .

شیعری «بۆ خانمێك» (٣١) و پەخشانی «فرمێسك» (٣٢) و بەرهەمی‌تری گۆران لە «هاوار»دا دەست دەکەون ۰ ئەویانی وا دەست پێ‌کردووە :

قاصید وتی پێم : بگرە سەبر ، خانم ئەوا دێت
سا فەرموو ، سەبر بێ بە فیدای خاکی بەری پێت (٣٣)

« ئەی وەتەن »ی بێکەسی بێکەسان (٣٤) و گەلێ شیعری نایاب و دانسقەی عەبدولخالق ئەسیری کەرکووکی (٣٥) بۆ یەکەم و هەندێکیان بۆ دواجار لە «هاوار»دا بڵاوکراونەوە ۰ لاپەڕەی زۆری «هاوار»یش لە ناوی سەربازی نەناسراو و گوڵی نەزانراوی باغی ئەدەبی کوردی بێ‌بەش نین ۰ وادیارە جگە لە هێمنی موکریانی هێمنێکی‌تری وەك ئەو هێمنمان هەبووە (٣٦) ۰ ئەم چەند دێڕە دەوڵەمەندەش نموونەی بەرهەمی یەکێ لەو سەربازە نەناسراوانەن :

سەروەری عالی مەقامی قەومی کورد غەمخواری کورد (٣٧)
باعیسی فەخری گرۆهی میللەتی غەمباری کورد
گەر دەپرسی تۆ لە حاڵی میللەتی مەقهوری خۆت
هەوری بەدبەختی و خەفەت گرتی دڵی هوشیاری کورد
ئەو کەسانەی ئەرزەلن ئەمڕۆ لە سایەی جەهلەوە
بوون بە حوککام و ئەمیر و ئاغەوو سەرداری کورد
فیکری دینی بو بە زەهری قاتیلی ئەمسالی من
بۆیە پاشکەوتین لە جەمعی سەرسەری و جلخواری ۰۰۰ (٣٨)
لەحزەیە چاوت هەڵهێنە سەیری ئەحواڵی بکە
دە بزانە بۆچ غەریبە لە زوبێر سەییاری کورد

لە زوبێر ــ کورد (٣٩)

---

(٣١) « هاوار »، ژمارە ١٥ ، ٢٣ی کانونی دووەمی ١٩٣٣ ، ل ٧ .

(٣٢) « هاوار » ، ژمارە ١٣ ، ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٣٢ ، ل ٥ .

(٣٣) وادیارە ئەو شیعرەی لە هەڕەتی لاوێدا بە ئیلهامی رابواردنی شەوی یەکێ لە کەباری‌یەکانی بەغدا بۆ هاتووە .

(٣٤) بێکەسی گەورە سەرەتا ئەم شیعرەی بە ناوی « یادی وەتەن »ەوە بڵاوکردۆتەوە ( بڕوانە : « هاوار » ، ژمارە ١٢ ، ٢٧ی تەشرینی دووەمی ١٩٣٢ ، ل ٢ ) .

سەربازێکی نەناسراوی‌تر وتویە :

**دیدە چۆن لێزمەی بارانی بەھار**
**ئەشکی خوێنینت پێدا دێتە خوار**
**گریان کردەوەی بێ‌دەسەڵاتە**
**دۆ بەرگەی کتێب بگرە و بخوێنە**
**بێ‌دەسەڵاتان ئەمرن لەژێر بار**
**ھاوڕێی داتا بە نەزان مەدوێنە**
**گەردن ئازاد کە لە کۆتەی دیلێ**
**یا ئازا بژی ، یاخود مەمێنە (٤٠)**

دەتوانێن گەلێ نمونـەی‌تری لەم بابەتـانە لە ڕۆژنـامە و گۆڤـارە کوردی‌یەکانی‌تر بهێنینەوە . هەرچی «تێگەیشتنی ڕاستی»یە لەم مەیدانەدا شوێنێکی زۆر دیاری هەیە . ئەم ڕۆژنـامەیە هەرچـەندە بۆ مەبەسـتێکی تایبەتی دەردەکرا بەڵام بایەخی زۆری بە ئەدەبی کوردی دەدا ، تایبەت بـە

---

(٣٥) گۆڤاری « هاوار » ژمارەیەکی زۆری لە شیعرە نایابەکانی ئەسیری بڵاو کردۆتەوە . وادیارە کاتی خۆی « سنۆر »ی ئەسیری بە بەرھەمی حاجی قادری کۆیی لە قەڵەم دراوە ، «هاوار» ئەمەی لە زمان شاعیر خۆی و مامۆستا تۆفیق وەهبی‌یەوە ڕاست‌کردۆتەوە ( بڕوانـە : « هاوار » ، ژمارە ١٠ ، ٢٣ی تەشـرینی یەکەمی ١٩٣٢ ، ل ٨ ؛ ژمارە ١١ ، ١٠ی تەشرینی دووەمی ١٩٣٢ ، ل ٤ ــ ٥ ) .

(٣٦) لە ژمارە چواردەیدا « هاوار » « سکاڵا لەتەك گردی سـەیواندا »ی هێمنی بڵاو کردۆتەوە کە لەوە ناکا هی مامۆستا هێمنی موکریانی بێ ( بڕوانە : « هاوار » ، ژمارە ١٤ ، ٣١ی کانونی یەکەمی ١٩٣٢ ، ل ٨ ) .

(٣٧) مەبەستی جەلادەت بەدرخانی خاوەنی «هاوار»ە . دەرکردنی « هاوار » هەستی گەلێ روناکبیری کوردی بزواند و شیعر و پەخشانی زۆریان پیا هەڵدا .

(٣٨) ئەو دێڕە وا چاپ کراوە . دەبێ وشـەی ( کورد ) لەوێدا لابرابێ . ئـەو سـەردەمە بە کوردی «تورکخوا»یان دەوت «جل‌خوار» .

(٣٩) « هـاوار » ، ژمارە ١٢ ، ٢٧ی تەشـرینی دووەمی ١٩٣٢ ، ل ١٢ . بەیتەکانی ئـەم شاعیرە نەناسـراوە لەژێر ناوی « هـەربژێ »دا بڵاو کراونەتەوە .

(٤٠) ئەم شیعرە بە ناوی (م)ەوە بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە : « هاوار » ، ژمارە ١٩ ، ١٧ی نیسـانی ١٩٣٣ ، ل ٦ ــ ٧ ) .

بەرهەمی شاعیرانی ناوداری کوردستان • دیارە شارەزایی و هەستی شاعیری شوکرتلفەضلی لەمەدا دەوری گەورەی بینیوە • ئەمە بۆخۆی ، وەك وتمان، بەڵگەیەکی تری بەشداری ئەو پیاوەیە لە دەرکردنی «تێگەیشتنی راستی»دا • هەر بەم بۆنەوە بەڵگەیەکی تر دێتە ناو • شوکرتلفەضلی ناوی زوربەی شاعیرە ناودارەکانی کوردستانی هێناوە و باسی ژیان و بەرهەم و سەنگیانی کردووە، بەڵام چونکە لەگەڵ شێخ رەزا ناکۆك بو [41] نە زۆر و نە کەم توخنی ناو و بەرهەمی نەکەوتووە • هیچ گومان لەوەدا نیە گەر ئەم دوو بەیتە هی شێخ رەزا نەبونایە جارەهای جار لە «تێگەیشتنی راستی»دا چاپدەکران چونکە وەك دەرمان بەدوای قسەی وادا دەگەڕا :

**لەبیرم دێ سلێمانی کە دارولولکی بابان بو**
**نە مەحکومی عەجەم ، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بو (42)**

لە ژمارە یەکیەوە «تێگەیشتنی راستی» شیعری کوردی تێکەڵ نوسینەکانی کردووە • لەو ژمارەیەیدا کە دێتە سەر باسی تورکانی لاو و خراپەکاریان لەگەڵ دانیشتوانی عیراق دەڵێ : «خوێنی بێ گوناهان گرتنی ••• هەناسەی مەزلومان ئاگری تێبەردان :

**ئەی جامیعی دونیا وو قیامەت بە خەیاڵات**
**ئەو رۆژەکە رۆیی (43) نە ئەوت بو نە ئەمەت بو »**

---

(41) بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٢٩ی بەشی سێیەم •

(42) بۆ تەواوی ئەم شیعرە بڕوانە : « دیوانی شێخ رضای طالەبانی » ، ل ٣٤ ــ ٣٥ •

(43) لە سەرچاوەیتردا :

**ئەو رۆژە کە مردی ، نە ئەوت بۆ نە ئەمەت بۆ**

( بڕوانە : «دیوانی نالی . مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی» ، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، پیاچوونەوەی محمدی مەلاکەریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٣٦٨ . لەمەودوا : « دیوانی نالی » ) .

دیاره خاوەن وتار مەبەستی ئەوەیە بە کاربەدەستانی دەولەتی عوسمانی بلێ هەمو شتتان لەکیس خۆتان دا و بۆنە جووەکەی لە هەردو دێن بۆ ٠

لە هەمان ژمارەیدا « تێگەیشتنی راستی» کاتێ باسی ئەلەکتریك دەکا بەیتێکی فارسی مەلا محەمەدی سەنەندەجی تێکهەلکیشی قسەکانی کردووە (٤٤) ٠

لە وتارێکی تریدا کە دێتە سەر باسی پەیوەندی نێوان ئەلمان و عوسمانی «تێگەیشتنی راستی» دەلێ : «٠٠٠ بەلێ ئەلەمانیا حکومەتێکی جەلادە ، ئەما کوشتنی تورکی لەپێش عەرەب و کورد ئارەزو دەکرد و لەژێریشەوە بۆ کوشتنی عەرەب و کورد دەستی بە تورکەکانەوە دەنا ٠ خولاسە لەم شەڕەدا ئەلەمان تورکی بەکوشت دەدا و تورکیش عەرەب و کوردیان لەناو دەبرد ٠ ئەلەمانیا بە تیرێك دو نیشانی دەشکاند ٠ شاعیرێکی کورد ئەلێ :

**بە تیری دو نیشانە ناشکی هەی رۆحەکەم شیرین**
**لە غەمزەی تاقە تیرێکی لە فەرهاد و لە خەسرەوی دا نالە»(٤٥)**

جاروبار نمونەی تری لەم بابەتە لە وتارەکانی «تێگەیشتنی راستی»دا دەکەونە بەرچاو ٠ زۆری نەخایاند ئەدەبی کوردی وەك باسێکی سەربەخۆ کەوتە سەر لاپەڕەکانی ئەم رۆژنامەیە ، دیارە نوسەرانی دەیانزانی لە رێگەی ئەدەب و مێژوی کوردەوە دەتوانن ئەوەندەی تر ناوی عوسمانی لای دانیشتوانی کوردستان رەش و لەکەدار کەن ٠ لە ژمارە یازدەوە سەرەتای بایەخ پێدانی «تێگەیشتنی راستی» بەم‌لایەنە لە قوژبنی ئەدەبەوە دەستی پێ‌کرد ٠ ئەم قسانەی خوارەوە لە سەروتاری ژمارە یازدەوە وەرگیراون :

«تەماشا کەن ئەحمەد حیلمی شەهبەندەر زادە کە یەکێکە لە

---

(٤٤) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە یەك ، ١ی کانونی دووەمی ١٩١٨ ٠
(٤٥) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە سیازدە ، ١٢ی شوباتی ١٩١٨ ٠

موحەرریزینی تورك لە کتێبی ئەقوامی جیهاندا ئەڵێ کوردەکان هیچ ئەدەبیاتیان نی‌یە • کە ئەحمەد حیلمێ وا بڵێ دەبێ غەربی‌یەکان چێ بڵێن ؟ • تورکێك کە ئەگەڵ کورد ئەوەندە حەیات رابوێرێ هێشتا کورد چی‌یە نایناسێ ، لەکوێ دەتوانێ زمان و عادەتی ئەو تێبگا و رێی تەرەقێ پێ نیشان بدا • کەسێ ئاگای لە خۆی نەبێ چۆن دەتوانێ یەکێکی‌تر ئاگاداری بکا [٤٦] • کورد ، وەکو وتمان ، دەبێ خۆیان بۆ خۆیان سەعی بکەن و ئیستیفادە لە قەومی ئینگلیز و حکومەتی بەریتانیا بکەن چونکە هیچ قەومێکی بێ‌تەداروکات و بێ ئەسباب بە بێ یاریەی حکومەتێکی بەقووەت بە مەقصودی خۆی نەگەیشتووە و ناگا • ئەوانە کە سەعێ بۆ قەومی کورد دەکەن نابێ تەماشای مەنفەعەتی خۆیان بکەن ، دەبێ بۆ ئەحفادیان سەعادەت حازر بکەن چونکە ئەوی چاوی لە قازانجی خۆی بێ ناتوانێ بۆ قەومی ئیش پێك‌بهێنێ ، بلخصوص موحافەزەی وەتەن و ئیحیا و ئیرشادی قەومێك ئیشێکی زۆر گەورەیە ، هەر بەپیاوی غەیور و فیدایێ سەردەگرێ ••• بزانن شاعیرێکی کورد کە ئەحمەد حیلمێ ناینا‌سێ چۆن باسی وەتەنی‌یەت دەکا :

دڵ سیاسەتگ نەبێ ، مائیلی خاکی وەتەنە
خاڵی لێوی حەبەشە ، ساکینی بوردی یەمەنە (٤٧)
دڵی (نالێ) کە ئەنیسی قەرەداغە ئیستاش (٤٨)
داغی سەرچاوەوو دیوانەیی دار و دەوەنە »(٤٩)

« تێگەیشتنی راستێ» کۆتایێ وتارێکی‌تری مێژوویێ بەم‌جۆرە هێناوە :

---

(٤٦) گەلێ‌جار قسەی وا ماندار کە لەگەڵ زانستی کۆمەڵایەتیدا یەك دەگرنەوە لە ژمارەکانی « تێگەیشتنی راستێ »دا دەکەونە بەرچاو .

(٤٧) لە سەرچاوەی‌تردا :

« خاڵی لەعلی حەبەشە ، ساکینی بوردی یەمەنە »

( بڕوانە : « دیوانی نالێ » ، ل ٥٢٤ ) .

(٤٨) لە سەرچاوەی‌تردا : « ئیستەیش » ( بڕوانە : «دیوانی نالێ» ، ل٥٢٧) .

(٤٩) « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە یازدە ، ٥ی شوباتی ١٩١٨ .

«ئیستا قەومێك كە ئەمەندە مالیكی ماضیەكی موحتەشەم بێ حەیف نیـە وا موهمەل بمێنێتەوە ... ئەگەر رۆئەسای (لوڕسـتانی گەورە و پچوك) و (ئەردەلان) و (هەمەدان) و (جەنوبێ ئازەربایجان) و (شارەزوور) و (بتلیس) و قیسمی موسلمانی ویلایاتی شەرقیە [50] سەعی بۆ خۆیان بکەن و ئیستیفادە لە حکومەتی موعەظەمەی بەریتانیا بکەن چێ نایەتە ناو . شـاعیرێکی کورد ئـەڵێ :

حاصلی گفتوگو هەمێ بـایە
عەمەلیاتە نانی تێدایە » (٥١)

لە ژمارە شازدەیەوە « تێگەیشتنی راستێ » گۆشـەیەکی تایبەتێ بۆ «ئەدەبیاتی کورد» تەرخـان کردووە . بایـەخی ئەم بەشـە چ لـە رۆی رۆژنامەنوسێ و چ لەرۆی لێکۆڵینەوە و بوژاندنەوەی ئەدەبی کوردیەوە . زۆرە . لەم گۆشەیەدا بۆ یەکەمجار بەرهەمی ژمـارەیە لە شـاعیرە هـەرە ناودارەکانی کوردستان چاپکراوە . دیسان بۆ یەکەمجار لە مێژوی ئەدەبی کوردیدا ئەو بەرهەمانە لەگەڵ تۆژینەوە و بەراوردا لەسـەر لاپـەڕەکانی «تێگەیشتنی راستێ»بڵاوکراونەوە . بایەخێکیتری ئەو گۆشەیە لەوەدا خۆ دەنوێنێ کە شیعری نەزانراو یا جۆری نەزانراوی زۆر بەیتی بڵاوکردۆتەوە. بێگومان ئەمانە بۆ ئەدەبناسی کورد گرنگ و بایەخدارن .

لە یەکەم گۆشەی «ئەدەبیاتی کورد»دا «تێگەیشتنی راسـتێ» ئـەم بەیتانەی «شاعیری گەورەی کورد نالێ»ی [52] بڵاوکردۆتەوە [53] :

---

(٥٠) مەبەستی ئەو ناوچانەیە کە کورد و ئەرمەن تێکەڵ تیا دەژین .
(٥١) لەوەدەکا شـیعری شوکرێلفەضلێ خـۆی بێ ( بڕوانە : « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە دوازدە ، ٩ی شوباتی ١٩١٨ ) .
(٥٢) « شاعیری گەورەی کورد » قسـەی رۆژنامەکە خۆیەتی .
(٥٣) هەمێ بەیتەکان نێـن ، کەمێك بەرودواش خراون . بۆ تـەواوی ئـەو بەیتانەی نالێ بڕوانە : « دیوانی نالێ » ، ل ٣٢٠ ــ ٣٢٦ .

**«لە دوگمەی سێنە دوێنێ بانگی شێوان (٥٤)**
**بەیانی دا سفیدەی بـاغی سێوان**

**لە خەوفی طەلعەتی رۆژ هەروەکو شێت**
**بە رۆژمردێ هەلات و کەوتە کێوان**

**مەکەن لۆمەی پەشێوێ دڵ کە ئەمشەو**
**پەشێواوە لەبەر پەرچەم پەشێوان**

**دوو چاوی من کە وا کەیلی سوروشکن**
**دەپێون ئاوی بەحری خوێن (٥٥) بە پێوان**

**شەرابی لەعلی روممانێ لە (نالێ)**
**حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان »(٥٦)**

لە ژمارەی داهاتوریدا و دیسـان لە گۆشـەی «ئەدەبیـاتی کورد»ا «تێگەیشتنی راستێ» شتێکی تازەمان بۆ دەردەخا کە وابزانم تا ئیمڕۆ کەس باسی نەکردووە . لەو ژمارەیەیدا بەمجۆرە موناسەبەتی وتنی شیعرێـکی نالیمان پێ دەڵێ : «نالێ پاش مردن خیطاب بە ئەمیرێکی بابان دەکا [٥٧] :

**هەرچەندە حەیاتی خضر و جامی جەمت بۆ (٥٨)**
**چونکە ئەمەلت زۆرە ، چ عومرێکی کەمت بۆ**

---

(٥٤) لە سەرچاوەیتردا :
« لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شـێوان »
( بڕوانە : « دیوانی نالێ » ، ل ٣٢٠ ؛ مەسعوود محەمەد ، چەپکێك لـە گوڵزاری نالێ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٠٩ ) .

(٥٥) لە سەرچاوەیتردا : « خوێ » ( بڕوانە : « دیوانی نالێ » ، ل ٣٢١ ) .

(٥٦) « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە شازدە ، ٢٣ی شوباتی ١٩١٨ .

(٥٧) دیارە «پاش مردن»ی ناو ئەم رستەیە بۆ «ئەمیرێکی بابان» دەگەڕێتەوە .

(٥٨) لە سەرچاوەیتردا :
**« هەرچەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بۆ »**
( بڕوانە : « دیوانی نالێ » ، ل ٣٦٧ ) . دەربارەی هەموو بەیتەکانی ئەم هەڵبەستەی نـالێ و لێکدانەوەیان بڕوانـە ل ٣٦٨ ـ ٣٧٠ی هـەمان سەرچاوە .

**ئیستا که له تۆ دوره هەماغۆشی عەدۆته**
**دونیا که زەمانی حەرەمی موحتەرەمت بۆ (٥٩)**
**ئەی جامیعی دونیاوو قیامەت بە خەیالات**
**ئەو رۆژە کە رۆییت نە ئەوت بۆ نە ئەمت بۆ**
**ئەوسا چ بو دەتدا بە زمان لافی کەرامات (٦٠)**
**ئەمڕۆ نە دەمت بۆ نەدەمت بۆ نەدەمت بۆ**
**(نالی) چی‌یە تۆ میثلی جوعەل غەرقی شیاکەی**
**خۆ تۆ بە حیسابی وەکو پەروانە شەمت بۆ (٦٢) »**

دەبێ نالی ئەم‌شیعرەی بەبۆنەی مردنی یەکێ لە ناحەزانی عەبدوڕڕەحمان پاشای بابانەوە وتبێ[٦٣] کە بە چاوی قەدر و رێزەوە سەیری دەکرد چونکە عەبدوڕڕەحمان پاشا یەکێ بۆ لەو سەردارە بەدەسەڵاتەکانی میرنشینێ بابان و بۆ ماوەی چارەکی سەدەیە شوێنێکی دیاری لە ژیانی سیاسێ هەمۆ عیراقـدا هەبۆ ، تەنانەت کە پاشای بەغدا سولەیمانی پچوك لە ئەستەمۆڵ یاخی بـۆ سوڵتان داوای لێ کرد بچێتە جێگەی ، بەڵام پاشای بابان قبولی نەکرد کوردستان و مەڵبەندی باو باپیرانی بەجێ‌بهێڵێ[٦٤] . عەبدوڕڕەحمان پاشا بەهۆی پیلان و دەسیسەی ناوەوەی وڵات و دەوری خراپی عوسمانی و

---

(٥٩) لە سەرچاوەی‌تردا :
**بێزارە لە تۆ ئیستە ، هەماغۆشی عەدۆتە**
**دونیا ، کە دوێنێ حەرەمی موحتەرەمت بۆ**
( بڕوانە : « دیوانی نالی » ، ل ٣٦٨ ) .

(٦٠) لە سەرچاوەی‌تردا :
**دوێنێ چ بو دەتدا بە زوبان لافی کەرامەت**
( بڕوانە : « دیوانی نالی » ، ل ٣٦٨ ) .

(٦١) لە سەرچاوەی‌تردا :
« ... چییە وا ... » ( بڕوانە : « دیوانی نالی » ، ل ٣٧٠ ) .

(٦٢) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە حەڤدە ، ٢٦ی شوباتی ١٩١٨ .

(٦٣) مامۆستا مەسعود محەمەد سەرنجی بۆ ئەم راستی‌یە راکێشام .

(٦٤) بڕوانە : کلۆدیوس جیمس ریچ ، رحلة في العراق عام ١٨٢٠ ، ترجمة بهاءالدین نوری ، بغداد ، ١٩٥١ ، ص ٦٧ ـ ٦٨ .

قاجاری ناحەزی زۆر بو [٦٥] بەرادەیە چەند جارێ ناچـار بو دەسـت لـە فەرمانڕەوایی میرنشینی بابان هەڵگرێ • لەگەڵ ئەوەش زوربـەی ناوچـەی سۆران لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پچڕ پچڕی ئەودا لە برەوو پێشکەوتنـدا بو • عەبدورڕەحمان پاشا یەکێکە لەو سەرداره کوردانەی سەرەتای هەستی نەتەوەییان تێدا بەدی دەکرێ ، تا دوازۆژی ژیانی (سالی ١٨١٣ وەفاتی کرد) بە چلوی رێز و خۆشەویستیەوە سەیری زانا و ئەدیبی کوردی دەکرد ، بۆیـە نالیش شوێنی دیاری لە دڵی فراوانیدا بۆ تەرخان کردبو •

لە گۆشەی «ئەدەبیاتی کورد»ی ژمارەی داهـاتویدا « تێگەیشـتنی راستی» جارێکی‌تر دێتەوە سەر باسی نالی و دەڵێ : «نالی مەتحی عەسکەری خـاصەی ئومەرای بابان دەکا :

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاصەیی شاهن
ئاشۆبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن (٦٦)
یەك صەف کە دەوێستن بە نەزمی خەتتی شوعاعن (٦٧)
حەلقە کە دەبەستن وەکو خەرمانەیی ماهن » (٦٨)

لە دواگۆشەی «ئەدەبیاتی کورد»ا «تێگەیشتنی راستی» جـارێکی‌تر دێتەوە سەر باسی نالی و دەڵێ : « ••• لەمەوپێش بـاسی نالیمـان کرد و وتمان ئەم زاتە شاعیرێکی عالم ، موجەدیدە ، شێوە و زمـانی کوردیـیە ، شیعرەکانی زۆر فەسیحـن ، کوردستان بە شیعرەکانی موتەرەنیم دەبـن و گۆرانی پێوە دەڵێن • ئەم غەزەلە لە چاکترین ئەشعارێتی :

---

(٦٥) یەکێ لەناحەزەکانی خالد پاشای برازای بو کە چەند جارێك هێزی هەردو لایان بە هاندانی بێگانە بەشەڕهاتن .

(٦٦) لەبارەی روونکردنەوەی ئەم دوو بەیتە و هەست بەرزی نالی‌یەوە بڕوانە : مەسعود محەممەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٠٨ ــ ١٠٩ .

(٦٧) لە سەرچاوەی‌تردا : « صەف صەف کە دەوەسـتن ... » ( بڕوانە : « دیوانی نالی » ، ل ٣٤١ ) .

(٦٨) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە هەژدە ، ٢ی مارتی ١٩١٨ .

**عاشقی بێدڵ دەناڵێ ، مەیلی گریانی هەیە**
**بێشکە هەور و تریشقە ئاوی بارانی هەیە**

**چاوی من دەمدەم دەڕێژێ ئاوی صاف و خوێنی گەش**
**دا بڵێن دیاری (٦٩) عومان دوڕڕ و مەرجانی هەیە**

**ئاسمانی حوسنی مەحبوبم لە ئەبرۆ و زوڵف و ڕوو**
**دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە**

**دڵ موشەببەك بوو لەبەر نیشانی ئێشانی (٧٠) موژەت**
**حەیفە قوربان ئاخر ئەم نیشانە ئێشانی هەیە (٧١)**

**لەحزەیەك و لەمحەیێ چاوم بە چاوی ناکەوێ**
**کێ دەڵێ وەحشیێ غەزالە مەیلی ئینسانی هەیە (٧٢)**

**تۆ ئەگەر هەستی و لە جێ ڕاوێستی دێو و کافریش (٧٣)**
**دێن دەڵێن : بەخودا قیامەت ڕاستە هەڵسانی (٧٤) هەیە**

**فارس و کورد و عەرەب هەر سێیم بە دەفتەر گرتووە**
**ناڵی ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە دێوانی هەیە »(٧٥)**

لە گۆشەیەکیتری «ئەدەبیاتی کورد»ا «تێگەیشتنی ڕاستی» هاتۆتە سەر باسی هونەری مستەفا بەگ و دەڵێ : « مستەفا بەگ شاعیرێکی بەلیغی کوردە ، مەتحی ئەمیرزادەیەك دەکا :

---

(٦٩) بە هەڵە ( دیاری ) چاپکراوە . بۆ ئەم بەیتانەی ناڵی بڕوانە ل ٥٧٢ ـ ٥٧٧ی « دێوانی ناڵی » .

(٧٠) لە هەمان دێواندا : « ... ئێشانی نیشانی هەیە » ( ل ٥٧٦ ) .

(٧١) لە هەمان دێواندا :

**« حەیفە قوربان ! ئاخر ئەم نیشانەیی شانی هەیە »**

( ل ٥٧٦ )

(٧٢) دەربارەی وردکاریی ناڵی لەم بەیتەیدا بڕوانە : مەسعود محەمەد . سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٧ .

(٧٣) لە دێوانی ناڵیدا :

**« تۆ ئەگەر هەستی ، لە جێ ڕاوەستی ، دێو و کافریش »**

( ل ٥٧٧ )

(٧٤) لە هەمان دێواندا : « هەستانی » ( ل ٥٧٧ ) .

(٧٥) « تێگەیشتنی ڕاستی » ، ژمارە سێو سێ ، ١٧ی حوزەیرانی ١٩١٨ .

**لەپێش بەیداغی شاهی یار ئەوا ئەسپی دەناخێوێ**
**بە تیپی غەم ئەڵێن نامەرد ئەسەر دڵ ئەمڕۆ یەلغارە**
**ئەڵێ ئەسپی فیراق سمکوڵ ئەکا وا لێلە بیناییم**
**ئەڵێ تەپڵی نیفاقیان ژەند کە گوێچکەم پڕ لە هاوارە»(٧٦)**

«تێگەیشتنی راستی» یەکەم سەرچاوەی کوردی‌یە کە وردە دەسکاری ئەدەبی بەراورد (مقارن)ی کردووە • زۆر جار بەرهەمی شاعیرانی کورد لەگەڵ هی شاعیرانی‌تری رۆژهەڵات بەراورد دەکا • هەر لەبارەی مستەفا بەگەوە «تێگەیشتنی راستی» لە ژمارەیەکی‌تریدا توسیویە دەڵێ : «مستەفا بەگ یەکێکە لە شاعیرانی کورد ، خەڵکی سلێمانی‌یە • لەقەبی (کوردی)یە و بەحزەن (هیجری) • لەقەبی ئەوەڵی دەلالەت لە قەومی‌یەت پەروەری دەکا • شیعرەکانی زۆر مەحزونانەیە • هەر بەیتێکی سەرچاوەیەکی عیشقە ، مەشرەبی وەکو (فضولی) وایە • ئەوی ئاساری ئەو بخوێنێتەوە دەبێ هەر

---

(٧٦) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە هەژدە ، ١٢ی مارتی ١٩١٨ . لە چاپی دووەمی ئەو دیوانەی کوردیدا کە موکریانی بلاوی کردۆتەوە ئەم چەند بەیتە وا هاتووە :

**سەدای کاروانی فیرقەت دێ دەڵێن سەرقافلەچی یارە**
**نزەی پێشەنگی میحنەت دێ دەڵێن کالایی غەمبارە**
**ترنگەی تەپڵی بازاتلانی چاوەش دەنگی جارچی دێ**
**بە تیپی غەم دەڵێن نامەرد ئەسەر دڵ ئەمڕۆ یەلغارە**
**دەڵێی ئەسپی فیراق سمکوڵ ئەکا وا لێلە بیناییم**
**دەڵێی تەپڵی فیراقیان ژەند کەوا گوێم پڕ لە هاوارە**
**لەپێش بەیداخی شادی یار ئەوا ئەسپی دەناخێوێ**
**لەسەر تیپی سوپاسالار و هەم پێشەنگ و دونغارە**

( بڕوانە : « دیوانی کوردی . مستەفا بەگی صاحیب قران » ، چاپی دووەمین ، هەولێر ، ٢٥٧٣ی کوردی ، ل ٤٦ ) . ئەوانەی دوای « تێگەیشتنی راستی » باسی ئەم شیعرەی مستەفا بەگیان کردووە دەڵێن بۆ قادر ناوێکی وتووە کە دڵی پیا چووە ، گەر وابێ بۆ « ئەمیرزادەیەکی » نەوتووە وەك « تێگەیشتنی راستی » دەڵێ ( بڕوانە : « دیوانی کوردی »، ل ٦ ــ ٧ ؛ علاءالدین سجادی ، سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی دووەم ، ل ٣٢٨ ) .

بگرێ ، پێکەنینی لە فکر دەچێتەوە ، تەماشـــای ئەم دوو بەیتـــەکەن چەنـــد موحزینـــن :

**شەهیدی عیشقم و مەمشوون و کفنم بوو مەکەن یاران**
**گەواهێ حەشرە بوو دەعوای شەهادەت بەرگی خوێنینم**
**لە پەردەی تاهیری گەر بێ صەدای یا عاشقی یارم (٧٧)**
**ئیتر حاجەت نی‌یە بێنن مەلا بوو وەعز و تەلقینم**

ئەوێ ئەم دوو بەیتە بخوێنێتەوە جۆشی گریانی هەڵـــدەسێ ، چونـــکە سەودای مەحەبەتی لێ هەڵدەقوڵێ ... سەیرکەن فـــیراق و غـــەریبێ چۆن تەصویر دەکا :

**وەها سووتاوم ئەسڵەن تابی فریادم نەما سا دەی**
**رەفیقان نیوە سوتون ، نامەرد عەرزی هاواری**
**لەژێر باری غەریبێ شانی سەبرم ریشە ئیستاکە**
**فیراقی یار لەبەر ئاخر شەڕێ لێم بوو بە سەرباری (٧٨)**

ئەم دوو بەیتە دەرەجەی تەئسیری لەلای ئەربـــابی زەوق و مـــەوەدەت ئاشکرایە ، ئەما لە نوقتەی نەزەری ئەدەبیاتی کوردەوە قیمەتێکی گەورەی هەیە ، جارێ ئەمەندە سەلیس و مونسەجیمە ئەڵێی ئاوە دێتە خوارێ ... ماناکەی ئەوەندە وازیح و خۆشە دەست‌بەجێ زیهن ئیشغال ئەکا ... مستەفا بەگ بەعزەن دەکەوێتە وادێ وەسفەوە ، ئەما لەم نەسەقە شیعری کەمە :

---

(٧٧) ئەم نیوە بەیتەیان لە دیوانە چاپکراوەکەیدا وەهایە :

**« بە پەردەی ظاهری گەر بێ صەدای ئەو عاشقی یارەم »**

( بڕوانە : «دیوانی کوردێ ... » ، ل ٢٧ ) .

(٧٨) ئەم بەیتانە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا وەهان :

**وەها سووتاوم ئەسڵەن تابی فریادم نەما سا دەی**
**رەفیقان نیوە سووتەن ئێوە نامەرد عەرضە هاواری**
**لەژێر باری خەما وا شانی سەبرم ریشە ئیستاکە**
**فیراقی یار لەبەر ئاخر شەڕێ لێم بوو بە سەرباری**

( بڕوانە : « دیوانی کوردێ ... » ، ل ٥٣ ) .

**کەوا داری زەر کورتەك کەمەرچین جببە گولناری**
**کلاو لار چاو خومار شیرین سوار خاڵ موشکی تاتاری**
**کەمانی هاتە سەر کێشانی ئەبرۆی تۆ لەپاش چاوت**
**لە مەستی دەستی وا لەغزی کە کەچ هات خەتتی پەرگاری (٧٩)**

ئەم دوو بەیتە زۆر نەشئە بەخشە ، زاهیرەن وەسفی ئەمـیرزادەیەکە • ئەماکەی چەند موحتەشەمە ، موحیبەت و علوییەتی تێدا تێکەڵاو بووە • لە بەیتی ئەوەڵدا هەشت وەسفی کۆکردۆتەوە ، لەگەڵ (ئەوەش) هیچ خەلەلی بە زموقی ئەدەبی نەداوە • شوبهە نی‌یە کە تەبیعەتێکی خـالیس و سـافی بی‌دەوێ • لە بەیتی دووەمدا مانایەکی (وردی) ئەدا کردووە کە هیچ زموق ئاشنایەکی ئەدەب نی‌یە بە خوێندنی جەزبە نەیگرێ • شاعیرێکی فورس دەڵێ:

**بعد چشم تو مصور چو بابرو پرداخت**
**شد چنان مست که بر روی تو شمشیر کشید**

واقیعەن ئەم بەیتە قیمەتێکی ئەدەبی فەوقەلعادەی هەیە ••• دەهشەت بە ئینسان ئەدا • (بەڵام) بەیتێکی مستەفا بەگ ، یانی کوردی یاخود هیجری، لەو نازکترە ، چونکە فەنی تەسویر کراوە •ئەم دوو بەیتـەی زۆر خـۆش و بی‌بـاکانە ئەدا دەکا •••:

**ئەم خوسرەو خوبانە کەوا دێتە نەزارەت**
**شیرینە لەلام دڵ دەفڕێنێ بە مەهارەت**
**باکم نی‌یە لەو خەنجەرە کردۆتە بە بەرتـا**
**شمشێری بڕۆت جەرگی بڕیوم بە ئیشـارەت (٨٠)**

بەیتی ئەوەڵی ئەمەندە نازکە کە لایقە خەسرەوی پەروێز بۆ شـیرینی بخوێنێتەوە و (نەکیسا) و (باربد) ــ دوو موغەنی مەشـهوری خـەسرەو و

(٧٩) بە هەڵە لەبریتی ( میسك ) ( مشك ) چاپکراوە . دوا دوو وشە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا وەهان : « ... خەطی پەرگاری » ( هەمان سەرچاوە ، ل ٥٦ ) .

(٨٠) ئەم دوو بەیتە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نین .

شیرینن ــ نەغمەپەروازێ پێ بکەن • بەشێوەیەکی کوردێ تەواو بێژراوە • بەیتی دووەم شوجاعەتێکی ئەدەبێ تێدا هەیە کە لەگەڵ مەیلێکی موحیبەت تێکەڵاو بووە • ئینسان کە مەصرەعی ئەوەل دەخوێنێ بلندی‌یەك ... لە خۆیدا دەبینێ ، ئەما کە مەصرەعی دووەم دەخوێنێتەوە خۆی لەناو بەحرێکی موحیبەتدا دەبینێ کە نە ساحیلی بێت و نە پەناە • (سروش) (٨١) کە شاعیرێکی فورسە ئەڵێ :

**چە حاجت خنجر فولاد اگر خواهی مرا کشتن**
**ازان ابروی عاشق کش بکش بکش ام ترك شمشیری ؟**

ئەما ئەگەر ئەم دوو بەیتە کە مانایان تەقریبەن مساوی‌یە بێنینە تەرازوی حەساسی ئەدەبیات هەڵبەتە بەیتەکەی (کوردێ) گرانتر دەردەچێ • بۆ شاعیرێکی کورد ئەمە کافی‌یە • ئەی ئەم دوو بەیتە سەیرکەن چەند کوردانەیە:

**جانا ومرە ئەم جەژنە بە قوربانی سەرت بم**
**بۆ تیری قەزای چاوی حەسودان سوپەرت بم**

**هێن قاڵ و زەعیفم لە هەنیتەی غەمی دوریت**
**شایستەم ئەمێستاکە کە حەڵقەی کەمەرت بم (٨٢)**

لە بەیتی ئەوەڵدا مەتانەتێکی (ئەدەبی) ، (فەساحەتێکی شیعری) هەیە، ئەما بەیتی دووەم لە شیعرە فەوقەلعادەکانە چونکە مانا هەر ئەمەندە دەقیق دەبێ • لەپاشا ئەڵێ :

---

(٨١) مەبەست شەمسولشوعەرا میرزا محەمەد عەلی سرۆشی ئەصفەهانی‌یە کە بە یەکێك لە شاعیرە ناودارەکانی ئێرانی سەدەی نۆزدە دادەنرێ ، ساڵی ١٨٦٨ عەمری خوای کردووە .

(٨٢) بەیتی دووەم لە دیوانە چاپکراوەکەیدا وەهایە :

**« وا قاڵ و زەعیفم لە هەتیتەی غەمی دوریت**
**شایستەیە ئیستاکە کە ئەڵقەی کەمەرت بم »**

( ل ٢٢ )

**شادن له تەماشایی روخت (٨٣) مەحرەم و ئەغیار**
**مروەت نی‌یە تەنها هەر ئەمن دەربەدەرت بم**

چەند پاژانەوەیەکی موحیبەتکارانەیە ، ئەوی دەیخوێنێتەوە بـەزەیی بەم شاعیرە بێچارەیەدا دێتەوە » (٨٤) .

«تێگەیشتنی راستی» لە هەمان وتاردا کە بەشێکی زۆری ژمارەکەی گرتۆتەوە ، جارێکی‌تر بەرز مستەفا بەگی ساحێبقڕان دەنرخێنێ و وەك بەڵگە ئەم شیعرانەی بڵاو کردۆتەوە :

**« دەروون زامدار و دڵ غەمگینە بۆ تۆ**
**سەرم گێژە و تەنم بێتینە بۆ تۆ**
**زمستان مەیل ئەکەی پایز براکەم**
**بەهاری وەسلی من هاوینە بێ تۆ**
**ئەوا ئەمن بوم بە شاهی جوملە عالەم**
**توخوا سا کاکە گیان ئەی ژینە بێ تۆ (٨٥)**

پێی ناوێ ئەوی زەوقی ئاشنای زمانی کوردی بێ و بتوانێ دەقـایقی ئەدەبیاتی تێ بگا دەزانێ کە ئەم سێ بەیتە بۆ ئەمە ... شاعیرێك بگەیێنێتە ئاسمانی «سەهلی مومتەنیع» کافی‌یە چونکی لەطافەتی زمـانی کوردی بـە

---

(٨٣) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
**« شادن لە تەماشای نظرت مەحرەم و ئەغیار »**
( ل ٢٢ ) .

(٨٤) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە بیستو یەك ، ١٨ی مارتی ١٩١٨ .

(٨٥) جیاوازی‌یەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەم بەیتانەی « تێگەیشتنی راستی » و ئەوانەی ناو دیوانە چاپکراوەکەی . لەمیاندا وەهان :
**« دەروون زامدار و دڵ غەمگینە بێ تۆ**
**سەرم گێژ و تەنم بێتینە بێ تۆ**
**زومستان مەیلەکەت پایز براکەم**
**بەهاری عومر و دێن هاوینە بێ تۆ**
**ئەوا من بوم بە شاو سولتان و والی**
**توخوا سا کاکە گیانە ژینە بێ تۆ »**
( ل ٣٩ ) .

خوێندنەوەی ئەمانە قسمێکی ئەمــەندە چــاکی دەردەکەوێ کە ئینســان سەرمەست و [٨٦] حەیران دەکا ، هەتا ئەتوانین بڵێین مەزی‌یەتی زمانی کوردیێ تەواو پێ دەردەکەوێ • کورد شــاعیری مــاهیریان زۆرە ، یــەکە یــەکە دەیان‌توسین و ئاساریان نیشان ئەدەین ، لەگەڵ ئەمە ئیعتراف دەکەین کە ئەم شاعیرە لە هەمویان زیاتر کوردانە و مەحزونانە شیعر ئەڵێ و حەقیقەتەن لــە شاعیرە گەورەکانی (کوردە) •

لە خاتیمەی کەلامدا ئەم شیعرە کوردی‌یە خالیسە (بخوێننەوە) چونکە زۆر موافیقی شێوەیە :

**بۆم هات سەگی دەرگای و زریقایەوە دەیوت**
**هەی لێی بگەڕێن بیگرێ ئازاری ئەوابە (٨٧) »**

لە دامێنی ئەم وتارە نوسراوە : «دوایی دێ» بە مەبەستی (ماویەتی)[٨٨] کە ئیستە بەکاردەهێنرێ •

ژمارەی داهاتوی «تێگەیشتنی راستی» بەشی دووەمی ئەم وتــارەی بڵاوکردۆتەوە • شایانی باسە «تێگەیشتنی راستی» لەم ژمارەیەوەی هەوڵی داوە لاپەڕەکانی ئەدەبی کورد بە باری سیاسی رۆژانەوە ببەستێ ، بەڵام ئەم کارەی هیچ لە بایەخ و سەنگی قورسی بەشی ئەدەبیاتی رۆژنــامەکەی کەم نەکردۆتــەوە •

لەم بەشەیدا دەربارەی مستەفا بەگی ساحێبقڕان «تێگەیشتنی راستی» نوسیویە دەڵێ : «لە نوسخەی پێشودا باسی (مستەفا بەگ) یانی (کوردی)

---

(٨٦) بە هەڵە « ســرمت » چاپ کراوە .
(٨٧) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
**« هات بۆم سەگی دەرگای و زریقایەوە دەیوت**
**هەر لێی گەڕێ با بیگەزێ ئازاری ئەوابە »**
( ل ٤٤ ) .
(٨٨) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە بیستو یەك ، ١٨ی مارتی ١٩١٨ .

کرا : بەعزێ لە موتەنەخەباتی شیعریشی نوسرابو • لەگەڵ ئەمەش تورکەکان (دەستیان) هاویشتبووە شاری سلێمانێ لێیان نەدەترسا ، لەڕقانا لە عەلەیهی تورك و قەومی کورد دەبو ، ئەما بە نەزاکەت ، تەماشای ئەم دۆ بەیتە بکەن :

**خەبەرێکم بەمنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر**
**ڕۆژی ئەمڕۆ کە لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر**
**نوری مەهدێ لە تەرەف مەککەوە زاهیر بووە یا**
**غەلەبەی ڕۆمە لەبۆ کوشتنی (من کان کفر) » (٨٩)**

ئەم چوار بەیتەی «تێگەیشتنی ڕاستێ» زۆر لەگەڵ بەیتەکانی ناو دیوانە چاپکراوەکەی جیان • لەمیانەدا وان :

**«خەبەرێکم بەمنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر**
**ڕۆژ کەوا ئەمڕۆ لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر**
**نوری مەهدێ لە تەرەف مەککەوە زاهیر بووە یا**
**غەلەبەی کوردە لەبۆ کوشتنی (من کان کفر)» (٩٠)**

ئەم جیاوازی‌یە کەمێ ڕوون کردنەوەی پێ‌دەوێ • لەوانەیە لە دیوانی دەستنوسی جیای شاعیرەوە هاتبێ ، لەوانەشە بۆ مەبەستێکی سیاسێ لە «تێگەیشتنی ڕاستێ»دا گۆڕرابێ ، چونکە یەکسەر دوای ئەم بەیتانە نوسیویە دەڵێ :

« هەمێ کوردێك دەزانێ کە کورد تورك بە ڕۆم ناو دەبەن ، هەتا ئەمڕۆش لە کوردستان بە تورك ئەڵێن (ڕۆمێ) • سەیری ئەم شاعیرە کەن چۆن بە کینایە (قەومێ) کورد دەهێنێتە هەیەجان • تورك چونکی لە غەربی سلێمانی‌یەوە هاتن ئیستیلای ئەوان بە ڕۆژی حەشر تەشبیە دەکا و مەغلوبی‌یەت لایق بە کوردان نابینێ • بە ڕەمز پێیان ئەڵێ خۆ ئێوە کافر نین• تورك جارێ بە ڕۆژ جارێ بە نوری مەهدێ ناو دەبا ، یەعنی بۆچێ وا لاتان

---

(٨٩) « تێگەیشتنی ڕاستێ » ، ژمارە بیستو یەك ( دۆبارە ) ، ٢٥ی مارتی ١٩١٨ .
(٩٠) « دیوانی کوردێ » ، ل ١٦ .

گەورە بون ••• (دوایێ) شوێنەوێکی عەجایەب دەکات • وەلحاصل ئەم دۆ بەیتە بەلاغەتێکی چاکی لێ دەدرەوشێتەوە و بۆ وەتەنپەروەرێ (کوردێ) دەلیلێکی گەورەیــە •

(کوردێ) شیعری تورکێ و عەرەبێ و فارسێشی هەیە ، ئەما تورکێ و عەرەبی‌یەکەی قیمەتێکی ئەدەبێ نی‌یە • تەرکیب‌بەندێکی فارسێ هەیە سۆفی مەشرەبـانەیە [٩١] » •

دوای ئەوە «تێگەیشتنی راســتێ» بە کورتی دێتــە ســەر بــاسی سەرگوزەشتەی ژیانی مستەفا بەگی ساحێبقڕان و هەندێ بیرێ نوێ و شتی نەزانراو دەخاتە بەرچاو کە تا رادەیە جیــاوازن لەگەڵ گێڕانــەوەی باسی ژیانی لەلایەن شــارەزای‌ترەوە ، تایبــەت لەگەڵ ئەوەی خوا لێخۆشبـو موکریانێ [٩٢] • «تێگەیشتنی راستێ» دەڵێ :

«کوردێ ، مستەفا بەگ ، لە بــەگزادەکانی ســلێمانی‌یە • تــاریخی ویلادەت و وەفاتی نەنوسراوە ، ئەما وەکو ئاساری دەفامرێتەوە لە ئەسنای ئیستیلای تورك ژیاوە ، حەفتا هەشتا ساڵ لەمەوپێــش حەیــاتی شــیعرێ دەستی پێ‌کردووە • ئەم شاعیرە وەکو نەقڵ دەکرێ عاشــقێکی پاك بووە و مەحبوبەیەکی حەز لێ‌کردووە کە ئەمەندە جوان نەبووە • لــەپاش مودەتێ مەحەبەت تەئسیری تێ‌دەکا و وەك مەجنون دەکەوێتــە دەشــت و کێوی کوردستان و لە ئەترافی سنە و سابلاغ چەند ساڵ روت و پەرێشان دەگەڕێ و (دایم) شیعر دەخوێنێتەوە ، بەعزەن خەڵك لێیان دەبیست و دەیاننوسی‌یەوە • شیعری زۆری گوم بووە •

---

(٩١) دەبێ مەبەستی ئەو شیعرەی بێ کەوا دەست پێ دەکا :

« خۆشم قوربان بە بەندیخانەوو زنجیر و سێدارەت »

( بۆتەواوی بڕوانە : « دیوانی کوردێ » ، ل ١٢ ــ ١٣ ) .

(٩٢) « دیوانی کوردێ » ، ل ٤ ــ ٩ . هەروەها بڕوانە : علاءالدین سجادی : سەرچاوەی ناوبراو ، چاپی دووەم ، ل ٣٢٧ ــ ٣٤٠ .

له زمان جۆششی مەحبەت تەماشا کەن چی ئەڵێ
ئەم سەرە سەر بۆچە دایم پڕ لە عیشقی یار نەبێ
ئەم دڵە دڵ بۆچی دائیم والەوو غەمبار نەبێ
هەرکەسێ بێتو بڵێ من عاشقم باوەڕ مەکە
تا لەسەر گۆنای نیشانەی جێگە گەستەی مار نەبێ (٩٣)

ئەم دوو بەیتە پەرێشانی مەحەبەتی ئەم شاعیرە چەند ساف و راست بەیان (دەکەن) ، ئەوی بیانخوێنێتەوە ئیتر ئیحتیاج ناکا بۆ تەرجەمـەی کوردی بـگەڕێ .

ئەم غەزەلەی لە هەمو شیعرەکانی‌تری زیاتر کوردانەیە :

بۆ گەڕانی ئاشی دڵ فرمێسکی چاو آفی دکرە
غەیری هیجران و بەلا ئەسڵەن بە من نادا مزە
هەر ئەوەڵ رۆژ بۆی بە تیرئەنداز شوکور پێکات دڵم
دەلێ فیدای دەست و کەمانت کچەی چاو مامزە
هێند بە جۆش هات خوێنی مەزلومان لە موژگانی سیات
ئەسپەکەت دوێنێ سپی بۆ ئەمڕۆ رەنگی قرمزە
وەزنی ضەربی پەنجەت ئەمڕۆ صەرفی رۆی جانانە کرد
ئەی موعەللیم بۆچ کەرت کرد هەی لە جەرگت چی چزە

---

(٩٣) جیاوازی‌یەکی زۆر لەنێوان ئەم بەیتانەی « تێگەیشـتنی راسـتی » و ئەوانەی ناو دیوانە چاپکراوەکەی هەیە . نێوە بەیتی یەکەم لەمیاندا نی‌یە. ئەوانی‌تری بـەم‌جۆرەن :

« ئەو سەرە سەر بۆچی دائم پڕ لە عیشقی یار نەبێ
ئەو دڵە دڵ بۆچی دائم عاجز و خەمبار نەبێ
هەرکەسێ بێت و بڵێ من عاشقم باوەڕ مەکە
تا بە پەیکانی موژەی مەحبوبەکەی زامار نەبێ »

( ل ٥٢ ) .

**سنگ بە ناری سینە جەرگم بۆی کەباب کرد ئەو ئەڵێ**
**(کوردێ) زۆر چاکە کەبابت ئاخ چ فایدە بۆکرە (٩٤) » (٩٥) .**

لە ژمارە بیستیدا «تێگەیشتنی راستێ» وتارێکی گەورە و گرنگی دەربارەی ئەدەبی کورد بڵاوکردۆتەوە و تێیدا هەوڵی‌داوە بە بەڵگە و بەراوردەوە بەرزێ ئەو ئەدەبە بخاتە بەرچاو . ئەمەیان یەکەم وتاری درێژی‌یە دەربارەی ئەدەبی کورد ، لەوە دەکا کورتە باسە ئەدەبی‌یەکانی پێشوی بە دڵی خوێنەر بوبێ . دوور نی‌یە ئەم وتارەیان مێجەر سۆن نوسیبێتی ، جۆری قسە و شێوازی داڕشتنی وا دەڵێن . لەو وتارەید

---

(٩٤) دیسان جیاوازێ زۆر لەنێو ئەم بەیتانەی « تێگەیشتنی راستێ » و ئەوانەی ناو دیوانە چاپکراوەکەیدا هەیە . جیاوازێ سەرنج راکێشەر لەنێو وشەی ( کچەی ) ناو « تێگەیشتنی راستێ » و ( کوڕەی ) ناو دیوانەکەدایە کە بەم جۆرەی خوارەوەیە :

**« بۆ گەڕانی ئاشی دڵ فرمێسکی چاو آڤ دەنگەزە**
**غەیری هیجران و بەلا ئەصلەن بە من نادا مەزە**
**هێند بەتاو هات خوێنی کوژراوان لە موژگانی سیات**
**نەسپەکەی جاران سپێ بۆ ئیستەکە رەنگی قرمزە**
**هەر لەوێ رۆژ بۆیە تیرئەنداز شوکور پێکات دڵم**
**ئەی فیدای دەست و کەمانت بم کوڕەی چاو مامزە**

**وەزنی ضەربی پەنجەت ئەمڕۆ صەرفی رۆی جانانە کرد**
**ئەی موعەللیم بۆ کرت کرد دەڵە لە جەرگت چێ کرە**

**دڵ لەنێو زامی فیراقی بووە کەباب و ئەو دەڵێ**
**کوردێ زۆر چاکە کەبابت ئاخ چ فایدە بۆکرە »**

( ل ٤٨ ).

(٩٥) « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە بیستو یەك ( دوبارە ) ، ٢٥ی مارتی ١٩١٨ . ئەو هەمو بایەخەی « تێگەیشتنی راستێ » بە بەرهەم و ژیانی مستەفا بەگی ساحێبقرانی داوە قسەکانی شێخ رەزا دێننەوە یاد کە وتویە : « ... ئەگەر هەمو بوێژانی پێشومان زیندو ببونایەوە هەر یەکەی رۆژێ جارێکم دیدەنێ دەکردن ، بەڵام کوردێ رۆژی پێنج جاران » ( بڕوانە : « دیوانی کوردێ » ، ل ٨ ) .

«تیگەیشتنی راستی» نوسیویە دەلێ :

«عولەمای ئەوروپا و حەتا تورك دەیانوت کە ئەکراد ئەدەبیاتی نی‌یە . ئەما ئێمە لەو رۆژنامە (کوردی‌یانەی) کە لەمەوپێش نەشر (کران) [٩٦] ئیسپاتمان کرد کورد ئەدەبیاتێکی نازك و رەنگین و شیرینیان و خصوصەن لە شیردا دەستێکیان هەیە . ئەوی واقیفی حالی کوردستان بێ دەزانێ کە زمانی کوردێ چەند شێوەیەکی جوێ جوێی هەیە ، ئەما وەکو عەرەبێکی بەغدا چۆن زمانی هەمو عەرەبەکانی‌تر دەزانێ سلێمانی‌یەکیش ( واتە یەکێکی دانیشتوی سلێمانی وەك ئەو عەرەبە ـ ك . م . ) هەمو زمانی کوردەکانی‌تر تێدەگا . لە هەمو شێوەکاندا شیعری تەڕ و خۆش بێژراوە :

١ ـ شێوەی سنە :

وا لە سەربانی عەمارەت نیشتگە وەك بازی تۆڕ
من دەیێژم بێرە ئەگرە ، دەلێ لاچۆ هەتیم
من نەوەی خاصان و ئەم کرمانج بێ‌ئەسڵ و نەسەو
گیانی خان باوا بە مردن بچمە رێ ئەم شۆنە تیم (٩٧)

سا نایێ نەیێ ، سا موطریب دەفێ
قەزای پەنجەکەت لە گیانم کەفێ (٩٨)

٢ ـ شێوەی (زەنگەنە) و عەشایری ئەو (تەرەفە) :

ئەدەبیاتی ئەم شێوەیە زۆر واسیعە . گەلێ (حیکایەتی خەیالی و تاریخێ) پێ نەظم کراوە . «شیرین و فەرهاد» و «بارام و گوڵ ئەندام» و «هەفت لەشکر» و «ئەرچە و شێرۆ» لەو جوملەیەن . ئەمانە زۆر عالێ تەسویر کراون .

جەنابی مەولەوێ (ابن هانێ) ئەم شێوەیەیە . تەماشای ئەم دوو بەیتەی کەن :

(٩٦) مەبەستی‌یە بڵێ لە ژمارەکانی پێشوی « تێگەیشتنی راستی »دا .
(٩٧) و (٩٨) دیارە فولکلۆرن .

بالا خانەی چەم دیوانخانەی تۆن
یا نەمای چە گل ئەستانەکەی تۆن

تکەش عاجز کەرد خەیالت تیشـــدا
جاریٚ ئەی عەزیز یا نیۆ پێشـــدا

پۆست تەپڵ گوش نەم کێشا کەم کەم
ئەی سەرەو سەرن دۆربینەکەی چەم

مەولەویٚ ـ مەعلۆمیٚ

٣ ـ شێوەی سلێمــانیٚ :

لەبەر ئەمە کە سلێمانی تا ئەم ئاخری‌یە مەرکەزی حکومەتی بابان بـو بــالطبع زمانی کوردیٚ گەلیٚ ئەلفازیٚ لە عەرەبیٚ و فارسیٚ وەرگرت [٩٩] و زمانێکی سیاسیٚ و ئەدەبیٚ هێنـــایە ناو وەسەطی کوردستـــانی تـــابیعی ئەم شێوەیە • زمانی کوردیٚ شێوەی زۆرە ، جەنوبی کوردستان کە لوڕستانە و شیمالی کە ئەنادۆلی شەرقی‌یە شێوەیان جویٚیە • ئێمە لێرە مەقصودمان ئەمە نی‌یە کە زمانی کوردیٚ تەدقیق بکەین ، ئەما دەمانەویٚ نیشـــانی بدەین کە ئەکراد ئەدەبیاتێکی رەنگینیان هەیە • نالیٚ تابیع بەشێوەی سلێمانی شیعری وتووە ، ئەم زاتە (موتەنەبیٚ) ئەکرادە ، ئاساری نازك و شیرینە ، شـــیعری مەوزون و مەعنادارە ، ئەم چەند شیعرە لە موتەخەباتی ئەبیاتی ئەوە :

هەر پەرچەم و پێشانی‌یە فیکری شەو و رۆژم
هەر گەردەن و زولفە ئەمەلی دوور و درێژم (١٠٠)



---

(٩٩) نایەویٚ باســـی زمانی تورکیٚ بکا ، چونـــکە بەلایەوە زمانی رۆمی‌یانە و ئەوانیش دوژمنی ئینگلیزن . ئەم خستنە پشت‌گویٚ‌یەی زمانی تورکیٚ لێرەدا زیاتر لە کاری سۆن دەکا کە ، وەك وتمان ، لەوانەیە ئەم وتارە ئـــەو نوسیبێتی .

(١٠٠) جیاوازیٚ لەگەڵ دیوانەکەی نی‌یە ( بڕوانە « دیوانی نالیٚ » ، ل ٢٧٧ ) .

بۆ ماچی دەمت ڕەنگە لە عیشوەی خەمی ئەبرۆت
جۆیایی بەقا خۆی لە دەم تێغی فەنادا (١٠١)

★ ★ ★

دەستم کە بە صەد وەعدە لە صەد لاوە (١٠٢) شکاوە
جەبری نی‌یە ئەم کەسرە هەتا نەیخەیە ئەستۆ

★ ★ ★

هەناسەم زولفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی
نەسیم ئەنگوت و شەو رابورد و نەرگس هەر لە خەودایە (١٠٣)

★ ★ ★

گۆشەگیرم لە برۆت و موتەوەححیش لە موژەت
ڕۆح شیرینە لە تیر و لە قولابی نادەم (١٠٤)

★ ★ ★

پێم ئەڵێن خێل و هەردوو چاوی شەڕ دەکا
خێل و قیچە یا تەرازوی نازی نەختی سەر دەکا(١٠٥) » (١٠٦)

دوای نالی «تێگەیشتنی ڕاستی» لە بەشی «ئەدەبیاتی کورد»ا باسی

---

(١٠١) لە دیوانەکەیدا :
« بۆ ماچی دەمی ڕەنگە لە عیشوەی خەمی ئەبرۆی
جۆیایی بەقا خۆی لە دەمی تیغی فەنا دا »
( ل ٨٦ ) .

(١٠٢) لە دیوانەکەیدا : « ... لە صەد جێگە » ( ل ٣٨٥ ) .

(١٠٣) جیاوازی لەگەڵ دیوانەکەی نی‌یە ( بڕوانە ل ٥٥٩ ) .

(١٠٤) لە دیوانەکەیدا :
« گۆشەگیرم لە برۆت و ، موتەوەححیش لە موژەت
ڕۆحی شیرینم ئەبەر شیر و قولابی نادەم »
( ل ٣٠٧ ) .

(١٠٥) لە دیوانەکەیدا :
« پێم دەڵێن : مەحبوبە خێل و قیچە ، مەیلی شەڕ دەکا
خێل و قیچە یا تەرازوی نازی نەختی سەر دەکا ؟ »
( ل ١٠٨ ) .

(١٠٦) « تێگەیشتنی ڕاستی » ، ژمارە بیست ، ١١ی مارتی ١٩١٨ . دوو جار و لە دوو ژمارەی یەك لەدوای یەکدا ئەم وتارە وەك خۆی چاپکراوە .

حەریقی کردووە و دەڵێ : « حـەریق شـاعیرێکی نوکتەسـەنجی کوردە . شیعری تەڕ و خۆشە ، ئەم غەزەلە هینی ئەوە :

**هەمو کەس با بزانێ من کە سەودای زولفی دۆتانم (١٠٧)**
**لە خانەی کۆلەدا کۆلم لە دەوری شای ڕوخت ماتم (١٠٨)**
**ئەگەرچی ساکینی مولکی عەجەم بۆم دوور لە ڕۆم کەوتم**
**لە سایەی پەرچەمی تووە رەئیسی مولکی شاماتم**
**موتالای حاشیەی زولفت لەسەر صەفحەی خەتت صەعبە**
**بەوەم چا بۆ بە منداڵی لە دەرسی عیشق راهاتم (١٠٩)**
**نەوای نالەی حەزینم راستە وەك قافلەی حیجازی دێ**
**وەرە سەر نالەیی پڕ تەرزشی شۆڕی مەقاماتم (١١٠)**
**دلم هەروەك رەعیەت خۆشنشینی مولکی ئەعزاتە**
**لە هەرجێ دادەنیشی لێی‌گەڕێ قوربانی باڵاتم**
**مورێدی خانەقا بوم مووددەتێ ئەمما بحمد الله**
**ئەمیستاکە لەبەر چاوت شەراب خۆری خەراباتم (١١١)**

---

(١٠٧) لە زۆر شوێن جیاوازێ لەنێو ئەم بەیتانەی « تێگەیشتنی راستێ » و ئەوانەی ناو هەردوو چاپی دیوانەکەی حەریقدا هەیە ( بڕوانە : «دیوانی حـەریق » ، لـە بڵاوکراوەکانی مەحموود خاکێ ، کەرکوك ، ١٩٦٩ ؛ ل ٢٩ – ٣٠ ) .

(١٠٨) لـە دیوانەکەیدا :
**« لە خانەی کۆکدا گولم بە فەرزی شای و رخت ماتم »**
( ل ٢٩ ) .

(١٠٩) لـە دیوانەکەیدا :
**« موتالای حاشیەی زولفی سەری سەفحەی روخی سەعبە**
**لەبۆم چا بۆ بە منداڵی لە دەرسی عەشقا راهاتم »**
( ل ٢٩ ) .

(١١٠) لـە دیوانەکەیدا :
**« وەرە سەر سەیری بەزم و سۆزش و شۆری مەقاماتم »**
( ل ٢٩ ) .

(١١١) لـە دیوانەکەیدا :
**« بە یادی مەدرەسەی عیشقت گەلێ عیلمم کەسب کردن**
**ئەمێستاکە لەبەر چاوت شەراب خۆری خەراباتم »**
( ل ٣٠ ) .

**کوا پارچەی غەزەل دەبڕێ (حەریق) ئەمڕۆ لە دیوانت**
**ئەڵێی هەر چاوەڕێی دەستەی خەیاتەی زولفی دۆ تاتم(١١٢)»(١١٣)**

دوای نالی و حەریق و کوردیی « تێگەیشتنی راستی » لە گۆشـەی « ئەدەبیاتی کورد » دێتە سەر باسی شاعیرێکی ناوداری ترمان کە ئەویش ( سالم ) ە و هەمو ئەو بەشەی ژمارە بیستو دوّی بۆ باسی ژیان و نمونەی بەرهەمی تەرخان کردووە • دەربارەی سالم « تێگەیشتنی راستی » دەڵێ :

« عەبدوڕڕەحمان بەگ سالم ••• شاعیرێکی نوکتەپەروەری کوردە ، لەقەبی (سالم)ە موعاسیری نالی بو • ئەم زاتە هەرچەند کە خزمی مستەفا بەگە ئەما وەك ئەو شاعیرێکی عاشـق نیە ، رەند مەشرەبە ، لا ئوبالیە ، شیعرەکانی زەریفانەیە ، مەیلی هەجوی زۆرە ••• زۆر میللەت پەروەر بو ، لە عەلەیهی تورکان دەدوا ، حەتا لە جەوابی قەسیدەیەکی نالی ، ئەوی لە مەککەوە بۆ سلێمانی ناردبو ، سالم ئەڵێ :

**رومی ئەمندە شومە لە شەخسیش ئەدا زەرەر**

سالم شیعری ( حافظی ) تەلمیع دەکرد ، یانی نیوەی ئەوەڵی بە کوردی دەوت و لەگەڵ نیوە فارسیەکەی تر رێکی دەخست • تەماشای بەیتی ئاتی بکەن :

**نەصیحەت بگرە گوێ جانا لەلایان زۆر بە تەعظیمە**
**جوانان سعادتمند پند پیر دانارا (١١٤)**

---

(١١٢) لـە دیوانەکەیدا :
**« کەوای پارچە غەزەل دەبڕێ ( حەریق ) ئەمڕۆ لە دیوانت**
**ئەڵێ هەر چاوەڕێی دەستە خەیاتەی زولفی تاتاتم »**
( ل ٣٠ ) .

(١١٣) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە نۆزدە ، ٥ی مارتی ١٩١٨ .

(١١٤) وەك بەیتی ناو دیوانە چاپکراوەکەیەتی ( بڕوانە : کوردیی مەریوانی ، دیوانی سالم ، بەغدا ، ١٩٣٣ ، ل ٤ ) .

**دڵا هەرچی بڵێ ناصیح لە چاك و خراپ بەجێی بێنە**
**کە سالك بی خبر نبود ز راه و رسم منزلها (١١٥)**

سالم لەگەڵ (میرزا محەمەد سەراج) کە ئەویش لە شـوعەرای کوردە موشاعەرەیەکی رەندانەی هەیە • سالم بەو ئەڵێ :

**میرزا محەمەد لێم لاوە ، دەستی من و دامانت (١١٦)**
**جوستەن بکەم نەشکێنم وەك نەی هەمو ئێسقانت (١١٧)**
**من بازم و تۆ قازی مەفڕێنە بە دەورمدا**
**با حەملە نەکەم گێر کەم چنگێ لـە چیکلدانت (١١٨)**
**بۆ من قەڵەمە نیزە ، بۆ تۆ سوپەرە دەسـتگا**
**بۆ تەجرەبە با لێدەم یەك حەربە لە قەڵخانت (١١٩)**

میرزا محەمەدیش جوابێکی رەندانەی ئەداتەوە ، ئـەما مەعەلئەسەف هەر بەیتێکی لە خاترماتا ماوە (کە) ئەڵێ :

---

(١١٥) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
**« دلا هەرچی بڵێ ناصیح لە نیك و بەد بەجێی بێنە**
**کە سالك بیخبر نبود ز راه و رسم منزلها »**
( ل ١٢ ) .

(١١٦) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا ئەم نێوە بەیتانە لە شوێنی تردا یـەك تەواو دەکەن . لەودا بەمجۆرەیە :
**« میرزا وەرە لێم لادە دەستی من و دامانت »**
( ل ٢٢ ) .

(١١٧) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
**« جستن کەم و بشکێنم وەك نەی هەمو ئێسقانت »**
( ل ٢٢ ) .

(١١٨) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
**« تۆ قازو ئەمن شـاهێن مەفڕێنە بە دەورمدا**
**نەك حەملە بەر گێر کەم چنگێ لە چیقلدانت »**
( ل ٢٢ ) .

(١١٩) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
**« بۆ من قەڵەمە نیزە و بۆ تۆ سوپەرە دەزگا**
**بۆ تەجرەبە با لێدەم یەك ضەربە لە قەڵغانت »**
( ل ٢٢ ) .

**شیعرم هەمو رەنگینە وەك نەقشی تكلتوی زین**
**تیژێ درەوشی منت نەدیوە (١٢٠) بە ئیمانت**

سالم وەکو وتمان شیعرەکانی هەمو رەندانەیە ، جۆشێکی عیشقی تێدا نیە ، ئەما چونکی طەبایعی موختەلیفە لەلای بەعزێ کەس شیعرەکانی سالم موقعیێکی هەیە ، ئەشعاری (وەسفی) زۆر خۆشە • ئەم غەزەلە (١٢١) لە چاکترین ئەبیاتی ئەوە :

لە نوری لامیعی تەشتێکی راگرت و وتی رۆمە
بە دۆشا ئەژدەهای پڕنێشی راکێشا وتی مۆمە
وتم تەنها منم پابەندی عیشقی تۆ وتی شێتی
هەزارانێکی وەك تۆ بەستەی زنجیری گیسۆمە
وتم تەنها منم کوژراوی عیشقی تۆ وتی لاچۆ
هەزارانێکی وەك تۆ کوشتەیی شمشێری ئەبرومە
وتم تاکەی لە خوانی وەسلی تۆ نەومید و بێبەش بم
وتی مردوت مرێ عاشق بەدایم زار و مەحرومە
وتم ( سالم ) دزێ دەستی بلندکرد ئاینەی راگرت
وتی ئێشکچی ئەم باغە دایم خالی هیندومە

حەقیقەتەن ئەوی تەماشای ئەم غەزەلە بە دیققەت بکا دەبینێ کە سەراپا زمرافەتی لێ دەبارێ • دەرەجەی رەندێ سالمی بەئاسانی لێ دەفامرێتەوە •

سالم لە هەجودا مەهارەتێکی تەواوی هەیە ، ئەما چونکە موافیقی مەسلەکی رۆژنامەکەمان نیە لە دەرجی سەرفی نەزەرمان کرد (١٢٢) • ئەوی دەیەوێ بیخوێنێتەوە دەتوانێ دەست خۆی بخا چونکی دیوانی ئەم شاعیرە لە کوردستاندا زۆرە » (١٢٣) •

«تێگەیشتنی راستێ» لە هەمو شاعیرە ناودارەکانی کورد زیاتر بایەخی

---

(١٢٠) بە هەڵە « من نت دیوە » چاپکراوە .
(١٢١) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نیە .
(١٢٢) بەداخەوە « لە دەرجی سەرفی نەزەریان کرد » ، ئەگینا لەوانەبو زانیاریمان دەربارەی سالم دەوڵەمەندتر کا .
(١٢٣) « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە بیستو دوێ ، ای نیسانی ١٩١٨ .

به بەرهەمی هونەری حاجی قادری کۆیی داوە • چەند گۆشەیەکی «ئەدەبیاتی کورد»ی ژمارەکانی بۆ ئەو تەرخان کردووە • جگە لەوە زۆر جار « تێگەیشتنی راستی» وتارە سیاسی و مێژوییەکانی خۆی بە شیعری ماناداری حاجی رازاندۆتەوە • بەمجۆرە گەر باسی سالی وەفاتەکەی لە رۆژنامەی «کوردستان»دا بخەینە لاوە «تێگەیشتنی راستی» دەبێتە یەکەم چاپەمەنی کوردی کە حاجی قادری بە خوێنەری کورد ناساندووە و دروست بەرهەمەکانی هەلسەنگاندووە • لە گۆشەی « ئەدەبیاتی کورد »ی ژمارە بیستو سێیدا « تێگەیشتنی راستی » دەربارەی حاجی نوسیویە دەلێ :

« حاجی قادر لە شاعیرە موجەدیدەکانی کوردە ، خەلکی کۆیەیە . شیعرەکانی تەڕ و خۆشە ، رەندانەیە • زۆرترینی شیعری ئیجتیماعییە • لە رۆژنامەکانی ئایندەدا [١٢٤] لە ئاساری ئەوی بەفیکرمانا بێ [١٢٥] دەرجی دەکەین ••• لێرەدا غەزەلێکی ( ؟ ) [١٢٦] موهیمی تاریخی و ئیجتیماعی ( ئەو ـ ك• م• ) دەنوسین • ئەلێ :

ئەگەر کوردێك قسەی بابی نەزانێ
موعەییەن دایکی ••• بابی ••• (١٢٧)

---

(١٢٤) دیارە مەبەستییە بلێ : « لە ژمارە داهاتووەکانی تێگەیشتنی راستیدا ... » .

(١٢٥) ئەمەی کە دەلێ « ئەوی بە فکرمانا بێ دەرجی دەکەین » بەلگەیەکی ترە کە ئەو کەسەی « تێگەیشتنی راستی » و گۆشەی ئەدەبیاتەکەی دەردەکرد تەواو شارەزای کورد و شاعیرانی کوردستان بو ، بەرادەیە وا پێدەچێ بەرهەمی ئەو شاعیرانەی لەبەربوبێ .

(١٢٦) ئەو پرسەکە لەلایەن ئێمەوە دانراوە .

(١٢٧) تەواوی ئەم نیوە بەیتە وایە : « موعەیەن دایکی حیزە و بابی زانێ » . لە دیوانە چاپکراوەکەیدا : « موحەققەق ... » ( بڕوانە : « دیوانی حاجی قادری کۆیی » ، گرد و کۆ و پەخشکار گیوی موکریانی ، چاپی سێیەمین ، هەولێر ، ١٩٦٩ ، ل ٧١ ) .

صەلاحەددین و نورەددینی کوردێ
عەزیزانی جەزیر و مۆش و وانێ (١٢٨)
موەططەل و ئەردەشێر و دەیسەمی شێر
قوباد و باز و میری ئەردەلانێ (١٢٩)
ئەمانە پاکیان کوردن نیهایەت
لەبەر بێدەفتەرێ و نوسینەفانێ (١٣٠)
کتێب و دەفتەر و تاریخ و کاغەز
بە کوردێ گەر بنوسرایە زوبانێ (١٣١)
مەلاو شێخ و میر و پادیشاهان
هەتا مەحشەر دەما نام و نیشانێ (١٣٢) » (١٣٣)

لە ژمارەی داهاتویدا و لە هەمان گۆشەیدا «تێگەیشتنی راستێ» جارێکی‌تر هاتۆتەوە سەر باسی حاجێ قادری کۆیێ و دەڵێ :

---

(١٢٨) ئەم بەیتەی پەڕاندووە :
وەرە با بۆت بکەم باسی نیهانێ
تەفەننون خۆشە گەر چاکی بزانێ

(١٢٩) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« موەططەل ئەردەشێری دیسمی شێر
قوباد و باز و میری ئەردەلانێ »
( ل ٧١ ) .

(١٣٠) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« لەبەر بێدەفتەرێ ون بون و فانێ »
( ل ٧١ ) .

(١٣١) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« بە کوردێ گەر بنوسرایە زمانێ »
( ل ٧١ ) .

(١٣٢) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« مەلا و زاناوو میر و پادیشاهان
هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانێ »
( ل ٧١ ) .

(١٣٣) « تێگەیشتنی راستێ » ، ژمارە بیستو سێ ، ٨ی نیسانی ١٩١٨ . ئەو شیعرەی حاجێ زۆر لەوە زیاترە ، بەڵام « تێگەیشتنی راستێ » زۆر جار تەنها چەند نمونەیەکی هەڵدەبژارد و بڵاوی دەکردەوە .

« حاجی قادر وتمان شاعیرێکی بێ‌نه‌ظیری کورده ، شـیعره‌کانی زۆر موته‌جه‌دیدانه‌یه خۆی (غایه‌ت) میلله‌ت په‌روه‌ره . وه‌ك شاعیره‌کانی‌تر بـه زولف و (خاڵه‌وه) خۆی خه‌ریك نه‌کردووه ، هه‌ر له‌گه‌ڵ ئیجتیماعیاتی قه‌ومی کورد حه‌یاتی شیعری رابواردووه . ته‌ماشای ئه‌م مه‌نزومه‌یه بکه‌ن چه‌نـد ته‌نقیدکارانه و ئیجتیمـاعیانه‌یه :

**تا یـه‌ك نه‌که‌ون قه‌بیله‌ی ئه‌کراد (١٣٤)**
**هه‌روا ده‌بنه خه‌رابه ئاباد**
**ئه‌نواعی میله‌ل له گه‌وره‌و پچـوك (١٣٥)**
**خه‌ملیوه مه‌مالیکی وه‌کو بـوك**
**یه‌ك به‌رگن و یه‌ك زبان (١٣٦) و یه‌ك ره‌نگ**
**بێ‌غه‌ییه‌ت و عه‌یب و عار و بێ‌ده‌نگ**
**هه‌ر کوردان ئه‌گه‌رچی پاکی مه‌ردن**
**پاماڵی زه‌مانـه قه‌تلی (١٣٧) کردن (١٣٨)**
**هه‌ر مانه‌وه بێ‌نه‌واو مـه‌زلوم**
**وه‌ك بومی خه‌رابه زاری مه‌شئوم**
**گه‌ر باعیسی ئه‌مه ده‌پرسی کامه**
**شه‌رتێکه که بۆ هه‌مو ته‌مامه**
**ئـه‌و شـه‌رته به کوللی ئیتیفاقه**
**گه‌ر مه‌رعه‌شی و وانـه گه‌ر عـیراقه**

---

(١٣٤) له دیوانه چاپکراوه‌که‌یدا :

**« تا رێك نه‌که‌ون قه‌بیله‌ی ئـه‌کراد »**

( ل ٩٦ ) .

(١٣٥) له دیوانه چاپکراوه‌که‌یدا :

**« ئه‌نواعی میله‌ل بـه گه‌وره‌وو چوك »**

( ل ٩٦ ) .

(١٣٦) له دیوانه چاپکراوه‌که‌یدا : « زمان » ( ل ٩٦ ) .

(١٣٧) بـه هه‌ڵه « متل » چاپکراوه .

(١٣٨) له دیوانه چاپکراوه‌که‌یدا :

**« هه‌ر کوردن ئه‌گه‌رچی پاکی مه‌ردن**
**پاماڵی زه‌مانـه مه‌حوی کردن »**

( ل ٩٦ ) .

**سەد شێخ و مەلا و ئەمیر و خەڵق**
**بۆ لەززەتی عەیشی زیندەگانی (١٣٩)**
**لەولاوە ئەوان بە حیلەبازی (١٤٠)**
**لەملاوە ئەمان بە تەقلەبازی**

**قوڕیان بە هەموو وڵاتەوەدا**
**تا مولك و رەعیەت پاکی فەوتا**

**یەکیان ئەمی تۆ دەیکەی نەیانکرد**
**غەمیان نەبو کورد ئەگەر هەموو مرد » (١٤١)**

هەر یەکسەر دوای ئەم بەیتانە «تێگەیشتنی راستی» ئەم چەند بەیتەی تری حاجی قادری کۆیی لە گۆشەی ئەدەبیاتی هەمان ژمارەیدا بڵاوکردۆتەوە :

**« حاجی سا بەسی‌یە سەد هەزار دەفعە (١٤٢)**
**پێم گوتی ئەم قسانە بێ‌نەفعە**

**رۆژی ئەوەڵ لە بەندەوو ئازاد**
**خزمەتی خەلقە قیسمەتی ئەکراد (١٤٣)**

**باوکە هەر چۆنی ئەڵێی ئەتۆ وایە**
**ظەن دەکەم ئەم قسانە خۆڕایە (١٤٤)**

---

(١٣٩) تا ئێرە جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی لەگەڵ دیوانە چاپکراوەکەی نی‌یە شایانی باس بێ .

(١٤٠) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا : « ... بە حیلەسازی » (ل٩٦) .

(١٤١) لەم شیعرەی حاجی «تێگەیشتنی راستی» تەنها ئەم بەیتەی پەڕاندووە :

**دونیا بە تڕان دەخۆن و دەیدەن**
**هەرچۆنی مەرامیانە دەیکەن**

(١٤٢) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :

**« بەسە ( حاجی ) دۆ سەد هەزار دەفعە »**

( ل ٩٣ ) .

(١٤٣) ئەم بەیتە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نی‌یە .

(١٤٤) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :

**« باوکە هەرچۆنی تۆ دەڵێی وایە**
**تێدەگەم ئەم قسانە خۆڕایە »**

( ل ٩٣ ) .

**قوڕی کام جێ بکەم بەسەر خۆما**
**ئەمە لێم بۆتە عادەت و سەودا (١٤٥)**
**بە قسەی چاکە دەستیان دەگرم**
**تەرکی ناکەم بە لۆمە تا دەمرم (١٤٦) »**

ئینجا «تێگەیشتنی راستی» بەمجۆرە شیعرەکانی حاجی قادر و مەبەستەکانی دەنرخێنێ کە بۆ سەردەمی خۆی بۆچوێکی ورد و شایانە :
«ئەگەر کوردێکی عاقڵ بە دیققەت تەماشای ئەم دوو مەزوومەی حاجی قادر بکا هیچ وەختێك لە یاری‌یەدانی قەومی پاش ناکەوێ ٠ ئەگەر کوردان هیمەتیان بکردایە تا ئەمڕۆ هەم نوسینێکی چاك هەم خەتێکی چاکیان دەبوو (تاریخ) و ئەحوالی مەشاهیریان بە زمانی کوردی دەنوسرا ٠ ئەمەمان هەیە کە جوانانی ئازاد و قەوم پەروەری کورد لە موستەقبەلێکی نزیکدا بۆ بڵندی قەومی خۆیان سەعی بکەن ، چونکی قەومێك کە تاریخ و ئەدەبیاتی تەدوین نەکرابێ قیمەتێکی ئیجتیماعی و سیاسی نابێ ٠ ئەم مەسەلانەش هەر ئەحراری قەوم دەتوانن سەعی بۆ بکەن ٠ ئەوی دەماغی بە جەزری مەنفعەت و بە خزمەتکاری ئەم و ئەو راهاتبێ و حەیاتی خۆی لە زۆر حەیاتی قەومی خۆی راگرتبێ ئەم نەوعە ئیشە (گەورە و) عالی جەنابانەی لەدەس نایە ٠ حاجی قادر کورد بۆ ئیتیفاق دەعوەت دەکا ٠ لە هەمو شتێکدا تەئسیساتی ئیجتیماعی لازمە ئەویش تاریخ و ئەدەبیاتە ، سیاسەت لەپاش ئەمانە دەست پێ دەکا » (١٤٧) ٠

دیسان «تێگەیشتنی راستی» بێ دواخستن لە ژمارەی داهاتویدا دێتەوە سەر باسی حاجی قادری کۆیی و ئەمجاریان دەرحەق بەو نوسیوە دەڵێ :

---

(١٤٥) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
**« ئەمە لێم بۆتە عیللەتی سەودا »**
( ل ٩٣ ) ٠

(١٤٦) بە هەڵە ( مردم ) چاپکراوە .

(١٤٧) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە بیستو چوار ، ١٥ی نیسانی ١٩١٨ .

« لەمەو پێش چەند مەنزوومەیەکی حاجی قادری (کۆیی) کە لە ئەفازیلی موتەئەخیرینی شوعەرای کوردە نەشر کرا . لەلامان موحەققەقە کە ئەم شیعرانە ... جوانانی ئەدەب شونافسی کوردی هێناوەتە شەوق ، چونکە ئەم شاعیرە جەلایەکی‌تری بە ئەدەبیاتی کورد داوە . شیعرەکانی (لەگەڵ) شیعری قودەما فەرقی زۆرە ، هەر بەیتێکی عالەمێکی [148] ئیجتیماعات و ئیسلاحە . ئەمڕۆ مەنزوومەیەکی زۆر عالی نەشر دەکەین و ئەمەلمان هەیە کە موقی ئاشنایانی ئەدەب بە دیقەتێکی تەواو (بیخوێننەوە) :

سلام الله منی کل یوم (۱٤۹)
لە ئەصحابانی صاحیب غیرەت و دین
لە بێعاری هەموویان کەوتە یادم (۱٥۰)
رەمزی ئیتیفاق و ئیتیحادم (۱٥۱)
لەبەر دووری لە ئەقران و لە ئەمثال
لە کوردانم ئەپرسی ضەربولئەمثال
لەبۆ ئەم یەك دوو ئەشعاری رەش و روت
هەتا پەیمابو رۆحم (۱٥۲) گەییە سەر لوت
دەفەرمووی ئەم عەزابە (۱٥۳) بۆچ دەکێشی
چ مەنزوومە ئەگەر چاوت نەیێشی
قوزی کوێ کەم بەسەر خۆما لە غوربەت (۱٥٤)
خەموم نایە لە داخی مولك و میللەت

---

(۱٤۸) لە رۆژنامەکەدا « عمانیکی » چاپکراوە .
(۱٤۹) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« سلام الله علیکوم کل یوم »
( ل ۱۱۳ ) .
(۱٥۰) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا : « ... کەوتنە یادم » ( ل ۱۱۳ ) .
(۱٥۱) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« بە رەمزی ئیتیفاق و ئیتیحادم »
( ل ۱۱۳ ) .
(۱٥۲) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا : « گیانم » ( ل ۱۱۳ ) .
(۱٥۳) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا : « عەزابەی » ( ل ۱۱۳ ) .
(۱٥٤) بە هەڵە ( غیرت ) چاپکراوە .

ئەگەر وەك من خەبەردار بێ لە دەولەت
لە حەیفان خۆت دەخنکێنی بە بێ پەت (۱۵۵)
چوار ملیۆنە کوردستان نفوسێ
بە قسەی ئەهلی تەخمین کە نوسێ (۱۵٦)
هەمویان شێری بێشەن حاتەمی جوّد
لە شـەڕدا کێوی جودی و بەحری مەحدوّد (۱۵۷)
وەلاکین فاتیەی چی هەرج و مەرجن
لە دەعوادا لەگەڵ یـەکتر بـە مەرجن
لە گوێی گا نوستون هەرچەندە شێرن
وەکو کەروێشکی چاو ئاژا و کوێرن (۱۵۸)
ئەوێ ئەعلایە دەســتەی هەر شکارە (۱۵۹)
ئەوی ئەدنـایە بەستەی زولفی یـارە
ئەوی ئاژایە شەهنامە دەخوێنێ
ئەوی (۱٦۰) مسکینە گەنم و جۆ(۱٦۱) دەچێنێ

---

(۱۵۵) ئەم بەیتە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا بە کۆ « جمع » هاتووە :
« ئەگەر وەك من خەبەردار بن لە دەولەت
لە حەیفان خۆ دەخنکێنن بە بێ پـەت »
( ل ۱۱۳ ) .

(۱۵٦) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« دوازدە ملیۆنە کورد نفوســێ
بە قسەی ئەهلی تەخمینێ کە نوسێ »
( ل ۱۱۳ ) .
دیارە ئەوەی «تێکەیشتنی راستێ» بۆ سەردەمی حاجێ قادر راستترە .

(۱۵۷) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« لە شەڕدا کێوی ( جوّد ) و بەحری مەحدوّد »
( ل ۱۱۳ ) .

(۱۵۸) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« وەکو کەروێشکی چاو راماو کوێرن »
( ل ۱۱٤ ) .

(۱۵۹) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« ئەوێ ئەعلایە سەردەستەی شکارە »
( ل ۱۱٤ ) .

(۱٦۰) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا : « ئەمەی » ( ل ۱۱٤ ) .
(۱٦۱) بـە هەڵە ( خود ) چاپکراوە .

## ئەمانە بێشعور و گێژ و وێژن
## موطیعی لوتی‌خۆر و (١٦٢) هەرزەبێژن

سەیرکەن ئەم شاعیرە عالی جەنابە چل پەنجا ساڵ لەمەوپێش (چۆن ـ ٥٠ م٠) بە حیسیاتی ئیجتیماعی‌یە موتەحەسیس بووەو لە عالەمی شیعردا بەسەر هەمو شاعیرەکانی (تردا ـ لە٥٠ م٠) فائیق بووە چونکە لە حەیاتی ئەزمیدا ئینقیلابێکی گەورەی ٠٠٠ کردووە ٠ ئەوی تەماشای ئەم مەنزومەیە بکا بێ‌ئیختیار مەغلوبی حیسیاتی قەومی و وەتەنی دەبێ » ٠

لێرەدا «تێگەیشتنی راستی» بیرێکی سەرنجڕاکێش دەخاتە بەر چاو کە دەڵێ : «ئەگەر حەقیقەت مولاحەزە بکرێ دەبینرێ کە شوعەرای کورد مەعرێکیان لەگەڵ تورك و عەرەب و فورسەکان ، بەڵکو لەپێش ئەوان سالێکی تەرزی تازەی شیعر بون و شیعریان تێکەڵاوی ئەحواڵی (ئیجتیماعی) کردووە چونکە (شاعیرانی) پێشوی کورد وەکو شاعیری کۆنی ئەقوامی سائیرە بەحسیان لە مەی و مەحبوب و زوڵف و خاڵ دەکرد ، ئەما حاجی قادری (کۆیی) ئەم تەرزەی گۆڕی و شیعری تێکەڵاوی ئیجتیماعیات کرد و لەم مەسەلەکەدا بە موئەسیس حساب کرا ٠ هیچ شوبهە نیە کە جوانانی موستەقبەلی کورد حاجی قادر موقابیلی کەمال بەگی [١٦٣] تورك و ئەمسالی ئەگرن و بە موهەیجی حیسیاتی وەتەنی و قەومی دەزانن ٠٠٠» [١٦٤] ٠

دوای حەوت ژمارە «تێگەیشتنی راستی» جارێکی‌تر دێتەوە سەر باسی بەرهەمەکانی حاجی قادری کۆیی ٠ بە قسەکانی ئەمجارەیدا وا دەردەکەوێ خوێنەرانی رۆژنامەکە بایەخیان بەو باسانە دابێ کە لەسەر حاجی

---

(١٦٢) مفتەخۆر ٠

(١٦٣) دەبێ مەبەستی نامیق کەمال ( ١٨٤٠ ـ ١٨٨٨ ) بێ کە نوسەر و نیشتمانپەروەرێکی ناودار و دوربین و نوێخوازی تورك بوو کاری کردۆتە سەر زۆر کەس لە نوسەرانی رۆژهەڵات ٠

(١٦٤) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە بیستو پێنج ، ٢٢ی نیسانی ١٩١٨ ٠

بلاوی دەکردنەوە . لە ژمارە سیو دوێدا «تێگەیشتنی راستی» نوسیویە دەڵێ :

« لە چەند نوسخەی لەمەوپێش ئەم قەسیدە غەزایەی حاجی قادری کۆییمان دەرج کردبو... بۆ (باقی‌یەکەی) ئەربابی فیکری ئەدەبی ئینتیزاری دەکرد ، لەبەر ئەمە ئەمجارە ستونی جەریدەکەمانی پێ تەزیین کرد . ئەوی تەماشای ئەم قەسیدەیە[١٦٥] بکا حەقیقەتەن حەیرانی زەکای ئەو داهی‌یەی کوردە دەبێ . هیچ شوبهە نی‌یە کە حاجی قادر یەکە عالمی ئیجتیماعی کوردە

**کەسێکی وا نەبو هەستێتە سەر پێ**
**بزانێ چۆن هەموکەس کەوتە سەر رێ (١٦٦)**
**بکا سەیری جەریدە و حالی میللەت**
**کتێبی تازەو تاریخی دەوڵەت**
**بزانێ چ قەوماوە لە ئەتراف**
**سەراپا ئاگرە ئەتراف و ئەکناف**
**ئەگەر کارێك نەکەن لەمبەینەدا زۆ**
**مەمالیك (١٦٧) کاتێکی زانیت لەدەس چو**
**کەمێ صەحراو دەریا دێتە جولان**
**بە غەیری پێکەوە (١٦٨) فەوجی سواران**
**« بتر خانێ » (١٦٩) بەسەر ناچێ لەماوپاش**
**لە هەرلاوە دەتان هاڕن وەکو ئاش**

---

(١٦٥) دوابەشی ئەو شیعرەیە کە نیوەی یەکەمی لە گۆشەی ئەدەبیاتی ژمارە بیستو پێنجدا بلاوکراوەتەوە .

(١٦٦) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :

**« کوڕێکی وا نی‌یە هەستێتە سەر پێ**
**بزانێ خەلکی چۆن کەوتونە سەر پێ »**

( ل ١١٤ ) .

(١٦٧) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا : « ولاتت ... » ( ل ١١٤ ) .

(١٦٨) بە هەڵە ( پێکەرە ) چاپ کراوە .

(١٦٩) واچاپ کراوە . لە دیوانەکەیدا :

**« بەدرخانێ و لەسەرچێ لەمەوپاش »**

( ل ١١٥ ) . بەلام ئەمیشیان لەگەل نیوە بەیتی دووەمدا ناگونجێ .

لەژێر پێیدا دەچن حەیف و مەخابن (۱۷۰)
گەدا بن ، دوژمنتان شا بن (۱۷۱)

لە هەر وەقتێ یەکێکی بێتە هاوار
لە جوتیار و شوان و ئەهلی بازاڕ (۱۷۲)

وەکو بیســـتومە بۆ دەفعی مەصـــایب
ئەمە تەدبیری کورت و فیکری صائیب (۱۷۳)

لە دەشت و دێ و ویلایەت بینە ئەحباب (۱۷٤)
وەکو شەخسێکی واحید بن لە هەر باب

---

(۱۷۰) بەهەڵە « تغابن » چاپکراوە .

(۱۷۱) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :

« لە ژێرپێدا دەچن حەیف و موخابین
گەدا بن ئێوە دوژمنتان بە شـــا بن »

( ل ۱۱٥ ) .

دوابەدوای ئەمە لە شـــیعرەکەی حاجی قادردا دوو بەیتیتر هـــەیە کە « تێگەیشتنی راستی » بڵاوی نەکردوونەوە ، دەبێ لـــەبەر ئەوە بێ کە لەوێدا ناوی (رۆمی) خراوەتە تەنیشت ناوی رووس و تایبەت ئینگلیز . بەیتەکان لە دیوانە چاپکراوەکەیدا بەمجۆرەن :

« بە غەیری رۆمی و ئینگلیز و رووسی
بێحەددە دەوڵەتان ناویان بنوسی
لەجێی خۆیان هەڵستاون بە غیرەت
لە دونیا ناوی خۆیان ناوە دەوڵەت »

( ل ۱۱٥ ) .

(۱۷۲) ئەم بەیتە لە دیوانە چاپکراوەکەی حاجیدا نییە .

(۱۷۳) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :

« وەکو بیستومە بۆ دەفعی مصائیب
ئەمەی تەگبیر کرد ئەو فیکر صاحب »

( ل ۱۱٥ ) .

(۱۷٤) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :

« هەمو گەورەی ویلایەت بینە ئەحباب »

( ل ۱۱٦ ) .

**له بۆتان بابیان سەرحەدی رێ (١٧٥)**
**له ئەولاتر وەها تۆش ببتە سەر رێ (١٧٦)**
**ئو ببتە یەك له تەعلیم و لـە نوستین**
**جل و بەرگ و زوبان و خەت و ئایین (١٧٧) ، (١٧٨) »**

له دواگۆشەی «ئەدەبیاتی کورد» «تێگەیشتنی راستی» دیسان دوور و درێژ دێتەوە سەر باسی حاجی قادری کۆیی و ئەمجاریان دەڵێ :

«٠٠٠ چەند نوسخەیەکی رۆژنامەکەمان بە ئاساری نەفیسەی حـاجی قادری کۆیی (رازاندەوە) ٠ هیـچ شوبهـە نیه کە منـەوەرینی کورد نە ئەبیاتی ٠٠٠ گەلێ مەسرور دەبن ، لەبەرئەمە له هەرکوێ چاومان بە بەیتێکی ئەو بکەوێ بە کەمالی ئیفتیخار دەرج و عەرزی ئەتزاری کوردی دەکەین ٠ تەماشای ئەم چەند بەیتە مەعنادارە کەن :

**هەر کوردە له بەینی کوللی میللەت**
**بێبەهرە له خوێندن و کیتابەت (١٧٩)**
**بێگانە بە تەرجومەی زوبانی (١٨٠)**
**ئەسـراری کتیبی خەلکی زانی**

---

(١٧٥) وەها چاپ کراوە .

(١٧٦) له دیوانە چاپکراوەکەیدا ئەم بەیتە وای لێ کراوە :

**« لەمەولا گشتیان با بێنە سـەر وەی**
**له بۆتان و بەیات تا سـەرحەدی رەی »**

( ل ١١٦ ) .

(١٧٧) له دیوانە چاپکراوەکەیدا :

**« هەمویان بێنە یەك تەعلیم و نوستین**
**وە یەك بەرگ و زمان و رەسم و ئایین »**

( ل ١١٦ ) .

(١٧٨) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە سیو دو ، ١٠ی حوزەیرانی ١٩١٨ .

(١٧٩) بە هەڵە ( کتاب ) چاپ کراوە .

(١٨٠) له دیوانە چاپکراوەکەیدا :

**« بێگانە له تەرجومەی زمانی »**

( ل ١٣٥ ) .

یەکسەر عولەما درشت و وردی
ناخوێننەوە دوو حەرفی کوردی (١٨١)
صاحیبی کتێب (١٨٢) و پەیامە هەرکەس
ئێمە نەبێ بوێنە قەومی چەرکەس (١٨٣)
کاکە ئێمە موئمینین نــە روســین
بۆچ کفرە زبانمان بنوســین (١٨٤)

... ئەم شاعیرە ئیجتیماعی‌یە هەرچی‌یە موتەعەلیــق بە قــەومی‌یەت و وەتەنی‌یەت بێ نەزمــەن بەیانی کردووە . حەقیقەتەن کوردەکان تــا ئیمڕۆ نوسینێکیان بۆ خۆیان نەهێنایە ناوەوە و موحتاجی خەلق بون ، حەتا کیتابەتی زمانی خۆیان تەرك کردووە ، بە لوغەت و خەتی فارسی مەرام پێك (دێنن).. ئەمە بۆ قەومێك زۆر عەیبە . ئەمڕۆ موافیقی لیسانی کوردی تەختی حروف و تەلەفوز ئیسلاح بکرێ ئیملا و ئینشایەکی کوردی زۆر چاك پەیدا دەبێ کە (الی الابد) سەرمایەی فەخری کوردان دەبێ ... قەومێك دەبێ دائیمەن بۆ مانەوەی عــادەت و قیــافەت و زمان ســەعی بکا تــا رێ و شــوێنی ون نــەبێ (١٨٥) » (١٨٦) .

---

(١٨١) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« نەیخوێندووە هیچ دوو حەرفی کوردی »
( ل ١٣٥ ) .

(١٨٢) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا « کوتوب » نوسراوە
( ل ١٣٥ ) .

(١٨٣) بە هەڵە ( حرکس ) چاپکراوە .

(١٨٤) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« خۆ مۆمینین ئێمە و نە روسین
بۆچ کفرە زمانمان بنوســین »
( ل ١٣٥ ) .

(١٨٥) ئەم قسانە دیسان بەڵگەی بایەخدانی « تێگەیشتنی راستی »ن بە زمانی کوردی و هەوڵدانی بۆ دارشتنی رێنوسێکی لەبار بۆی ( بڕوانە یەکەم باسی ئەم بەشە : ( « تێگەیشتنی راستی » و زمانی کوردی ) .

(١٨٦) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە سیو سێ ، ١٧ی حوزەیرانی ١٩١٨ .

دوابەدوای ئەم قسانەی لە ئاخی دڵێکی دڵسۆزەوە هەڵقوڵاون و بە نیازی چەسپ‌کردنیان لە دەرونی خوێنەری کوردا «تێگەیشتنی راستی» چەند بەیتێکی‌تری حاجی دەخاتە بەرچاو کە لەگەڵ مەبەستی نوسەر تەواو دەگونجێن :

« میللەتی بێ‌کتێب و بێ‌نوسین
غەیری کوردان نی‌یە لە رۆی زەمین
جەنگەی ئێرە باوجوودی کەرن (۱۸۷)
هەروەکو دۆمی ئێمە دەربەدەرن
ئێوە عاقڵترن بە صەد مەنسەب
کوڕی خۆیان دەنێرنە مەکتەب (۱۸۸)
ئێستەکی کوردەکانی کوردستان (۱۸۹)
هەر لە بۆتانەوە هەتا بابان
ئەم هەتیوانەی مەکتەبی یەکسەر
کوردەکان بار دەکەن وەکو ما ...(۱۹۰)
وادیارە هەتاکو دونیا بێ
کوردەکان حالیان دەبێ وابێ » (۱۹۱)

دوای ئەمە «تێگەیشتنی راستی» دەڵێ : «حاجی لێرەدا زمانێکی چەند شەدید ئیستیعمال دەکا ، ئەوی تەماشای ئەم چەند بەیتە بکا و چاك ماناکەی

---

(۱۸۷) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« چینگەنەی ئێرە باوجودی کەرن »
( ل ۱۳٦ ) .

(۱۸۸) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« هەتیوی خۆ دەنێرنە مەکتەب »
( ل ۱۳٦ ) .

(۱۸۹) لە دیوانە چاپکراوەکەیدا :
« ئیستێکە ئامیرانی کوردستان »
( ل ۱۳٦ ) .

(۱۹۰) تەواوی ئەم نیوە بەیتە وایە :
« کوردەکان بار دەکەن وەکو ماکەر »
( ل ۱۳٦ ) .

(۱۹۱) « تێگەیشتنی راستی » ، ژمارە سیو سێ ، ۱۷ی حوزەیرانی ۱۹۱۸ .

ته‌ریگا ده‌زانێ ئه‌م پیاوه ئیجتیماعی‌یه چه‌ند جگه‌ری بۆ قه‌ومی سوتاوه ، حه‌تا مه‌حرومن له رقانا جوێنیان پێ ئه‌دا ، وه‌لحاصل حـاجی قـادری کۆیی له‌نـاو شوعه‌رای ( کوردستاندا ) بێ ئه‌مســاله » (۱۹۲) .

«تێگه‌یشتنی راستی» به راده‌یه‌کی له حاجی و نالی که‌متر باسی ژماره‌یه شیعری نـاوداری‌تری کوردی کردووه . له گۆشـه‌ی ئه‌ده‌بیـاتی یه‌کێ له ژماره‌کانی ، «تێگه‌یشتنی راستی» کورته باسێکی ده‌رباره‌ی غه‌ریقی و مه‌حوی هێناو کردۆته‌وه . ده‌رباره‌ی یه‌که‌میان نوسیویه ده‌لێ : «غه‌ریقی یه‌کێکه لـه شوعه‌رای موته‌ئه‌خیرینی کورد . هه‌رچه‌نده شیعری زۆر نه‌زم نه‌کردووه ، ئه‌ما ته‌بیعه‌تێکی (ناسکی) هه‌یه . ئه‌و چه‌ند به‌یته که هێناویته قه‌له‌م له‌نـاو کوردانا زۆر مه‌شهوره ، حه‌تا به‌سته‌بێژه‌کان (دایم) به‌گۆرانی ده‌یلێن . ئه‌م غه‌زه‌له‌ی لــه چاکترین ئه‌بیاتی ئه‌وه :

لەسەر صەفحەی لەتیفی رۆت جەوابێکە لە هەرلایی
شکستەی خەتی دوو ئەبرۆت خەمی زولفی‌چلیپایی
بنازم شۆرشی حوسن و نیزامی تیپی موژگانت
لەبۆ تەسخیری مولکی دڵ عەجەب شایستە پاشایی
لە هەرلا موددەعی گەر تیرەبارانی غەریقی کەن
لەپێناوی دەنێم صەد جانی شیرینم لە هەر لایی » (۱۹۳)

دوابه‌دوای ئه‌مه « تێگه‌یشتنی راستی » یه‌کسه‌ر دێته ســه‌ر بـاسی مه‌حوی و ده‌لێ : «مه‌شوی یاخود مه‌حوی شـاعیرێکی گه‌وره‌ی کورده ، هه‌تا چه‌ند ساڵ له‌مه‌وپێش له حاڵی حه‌یاتدا بو . ره‌ونه‌قێکی ته‌واوی بـه شیعری کوردی دا . له ( ا ) تا (ی) دیوانێکی ته‌رتیم کردووه . له شیعریدا دائیمه‌ن لوغه‌تی کوردی له لوغاتی‌تر ته‌جرید ده‌کا . غایه‌ت نوکته په‌روه‌ره . ئه‌م چه‌ند به‌یته هینی ئه‌وه :

---

(۱۹۲) « تێگه‌یشتنی راستی » ، هه‌مان ژماره .
(۱۹۳) « تێگه‌یشتنی راستی » ، ژماره سێو دوو ، ۱۰ی حوزه‌یرانی ۱۹۱۸ .

ئەری دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵ ڕەنگت لە گوڵ چیبکا
کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ بولبول لە چڵ چیبکا
بای غەم گەر ڕەقیبانت بسوتێنێ ئەی گوڵی ڕەعنا
مەڕەنجە تو خودا ، ئاگر لە ئاقاری چڤڵ چیبکا
لە عوششاق و ڕەقیب ئەو شۆخە چاوی لوتفی وەرگێڕا
کە ئاهو ئادەمێ یا سەگ ببینێ غەیری سڵ چیبکا
فەلەک هەرگا کەسێکی هەڵبڕێ وەقتی هیلاکەتیە
کە سەر بۆ گەینە پەت بێ پێ لە کورسی‌و ئەسکەمل چیبکا
لە هەر جێگا هەڵێ خورشیدی حوسنی مەهروان (مەحوی)
ئەگەر عەقڵی بێ لەو جێیە ئاونگی عەقڵ چیبکا » (١٩٤)

لە ژمارە سێو چوارەوە ئیتر گۆشەی «ئەدەبیاتی کورد» لە «تێگەیشتنی راستی»دا نەماوە ، وادیارە زۆر بونی هەواڵەکانی شەڕ (تایبەت لە مەیدانی عیراق و فەلەستین و سوریە) و نزیک‌بونەوەی کۆتایی شەڕ بونە هۆی ئەم وەستانە ، چونکە زوربەی هەرە زۆری ژمارەکانی‌تری «تێگەیشتنی راستی» تەنها بۆ باسی شەڕ و پێشکەوتنی لەشکری ئینگلیز تەرخان کراون ، ڕێشی تێدەچێ ئینگلیز ویستبێتیان وریابونەوەی کورد و بزواندنی هەستی نەتەوەیی لە سنورێکی تەسک تێنەپەڕێ و چالاکی شوکرتلفەضلی‌یان لەم مەیدانەدا بە زۆر دیبێ بۆیە وا لەپڕ ئەو گۆشەیەیان وەستاند ، هەر چۆن بێ ئەو چەند گۆشە ئەدەبیەی «تێگەیشتنی راستی» کارێکی پڕ کەلکی ئەوتۆیە کە سەنگی ڕۆژنامەکەی لە هەمو ڕوێەکەوە زۆر پێ بەرز بۆتەوە، بایەخ دانی «تێگەیشتنی راستی» بە مێژوی کورد ئەوکارەی ئەوەندەی‌تر پارسەنگ کردوە .

## «تێگەیشتنی راستی» و مێژوی کورد :

ڕۆژنامە و گۆڤار یەکێ لە سەرچاوە گرنگ و ڕەسەنەکانی تۆژینەوەی مێژوی نوێ و هاوچەرخی گەلانن . هەن «ئەرکی ڕۆژنامەنوس» لەگەڵ

---

(١٩٤) « تێگەیشتنی راستی » ، هەمان ژمارە .

«ئەرکی مێژوونوس» جیا ناکەنەوە و دەڵێن «هەردوکیان وەك یەك دەبێ بەر نە هەموشت عەودالی راستی بن» و ئەو «راستی‌یە وەك خۆی بخەنە بەردەمی خوێنەر » [195] .

نەك هەر رۆژنامەنوسی نوێ بەڵکو هەمانکات ئەو بەرهەمە زوانەش کە تارادەیە لە رۆژنامەیان دەکرد دەچنە خانەی سەرچاوەی مێژوویی رەسەنەوە. ژمارە پارێزراوەکانی ئەو «روداوی رۆژانە»یەی یولیۆس قەیسەر کاتی خۆی دەری‌دەکردن [196] دەمێکە بونەتە سەرچاوەی رەسەن و بایەخدار بۆ توژینەوەی گەلێ رویِ گرنگ و نەزانراوی مێژووی کۆنی رۆما .

بایەخی رۆژنامەنوسی نوێ وەك سەرچاوەی مێژوویی لەوەش زیاترە . دەمێکە رۆژنامە و گۆڤار بونەتە سەرچاوەی پێویستی توژینەوەی ئالوگۆڕی ئابوری و کۆمەلایەتی و بەرەوپێش‌چونی بزوتنەوەی روناکبیری گەلان . مەرجی گرنگی ئەمە لەوەدایە کە چەند رۆژنامەنوس لایەنگر بێ ئینجا ناتوانێ هەمو راستی بشارێتەوە . مێژوونوسی ورد دەتوانێ لە هەزار کەلەبەرەوە بە ناوەی رۆژنامە و گۆڤار بگاتە ئەو راستی‌یانەی مەبەستی‌یە . بێ‌گومان ئەو ۱۳۵۰ رۆژنامەیەی سالانی شۆرشی فەرەنسە دەرچون [197] گەورەترین سەرچاوەی رونکردنەوەی بەسەرهاتی مێژوویی ئەو سەردەمە هەرە گرنگەی فەرەنسە پێك‌دێنن .

لە سەرەتای پەیدابونی‌یەوە رۆژنامەنوسی کوردی بەپێی توانا بایەخی داوە بە مێژووی کورد . «کوردستان»ی یەکەم رۆژنامە لە چەند ژمارەیەکیدا

---

(۱۹۵) بڕوانە :
F. Williams, Press, Parliament and People, London — Toronto, 1946, P. 139.

(۱۹٦) دەربارەی بڕوانە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە .
(۱۹۷) لە ماوەی یازدە سالی یەکەمی شۆرشی فەرەنسەدا ( ۱۷۸۹ ــ ۱۸۰۰ ) ۱۳۵۰ رۆژنامەی فەرەنسی دەرچو .

باسی سەلاحەددین و میرانی جزیر و بەدرخان پاشای گەورەی کردووە[198].
«کوردستان» بۆخۆی سەرچاوەیەکی یەکجار گرنگە بۆ شیکردنەوەی زۆر رووی ژیانی سیاسی و رووناکبیریی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا[199] . «ژین»ی ئەستەمۆل چەند وتارێکی دەربارەی مێژووی کوردستان و شوێنەواری کۆنی و بابان[200] و مەولانا خالید و سەرداری تر بڵاوکردۆتەوە . جگە لەوە «ژین» بۆ خۆی سەرچاوەیەکی رەسەنە بۆ باسی چالاکی دەستەی رووناکبیری کورد[201] . رۆژنامە و گۆڤارەکانی مەهابادیش زۆر بایەخیان دەدا بە بڵاوکردنەوەی باس و وتاری مێژوویی . لە دیوی ناوەوەی بەرگی یەکەمی ژمارە یەکی «کوردستان»ی مەهاباد نوسراوە :

«کوردستان گۆوارێکی ئەدەبی ـ تاریخی ـ کۆمەڵایەتی .. مانگی کوردی‌یە . یەکەمین ئارمانی بژار و ژیانەوەی زمان و ئەدەبیاتی کوردی‌یە و ... بۆ ژیانەوەی [202] ئاساری زانایانی کورد تەقەلا دەدا . لەبەرئەوە تکا لە خوێندەوارانی خۆشەویست دەکەین هەرکەس بەیت و

---

(198) « کوردستان » وتارێکی بە کوردی و بە تورکی دەربارەی بەسەرهاتی ژیان و خەباتی بەدرخان پاشا بڵاوکردۆتەوە ( بڕوانە : « کوردستان » ، ژمارە سیازدە ، ٢٠ی ( ذی القعده )ی ١٣١٦ ، ل ٣ ـ ٤ ؛ ژمارە چواردە ، ٩ی ( ذی الحجه )ی ١٣١٦ ، ل ٢ ـ ٤ ) .

(199) زانیاریی زۆر گرنگ دەربارەی مێژووی کوردستان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمید لە رۆژنامەی « کوردستان »دا هەیە و گەلێکیان دەتوانن یاریدەی مێژوونوس بدەن بۆ تێگەشتنی چەند مەسەلەیەکی مێژوویی گرنگی وەك باسی پەیوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن و سوارەی حەمیدی بەجۆرێکی باشتر .

(200) « ژین »ی ئەستەمۆل زنجیرەیە وتاری دەربارەی بابانەکان بڵاوکردۆتەوە کە مامۆستا عەبدولعەزیز یامولکی نوسیونی .

(201) بۆنمونە « ژین » پرۆگرامی رێکخراوە سیاسی‌یەکانی کوردستانی ئەو سەردەمەی بڵاوکردۆتەوە کە لە نرخاندن نایەن .

(202) دەقی ئەم رستەیە واچاپکراوە : «بۆ ژیانەوە نێو ئاساری زانایانی کورد » .

حیکایەت و سەرگوزشتەی پیاوێکی مەزن یا عەشیرەتێکی کوردی لەکن بێ و یەن توسراوێکی [٢٠٣] لەلا بێ یا لەبەر بێ ، کوردێ ، فارسێ ، عەرەبێ ، مدامێك هێ زانایانی کورد بێ و لەچاپ نەدرابێ بۆمان بنێرن کە بە یارمەتی خودا لە چاپی بدەین تا [٢٠٤] بەسەرهاتی رۆژگار لە تێوی نەبا » [٢٠٥] •

جێگەی خۆیەتی باسی ئەوەش بکەین کە سەرەتای سالی ١٩٣٨ ـمۆستا سالح قەفتان گۆڤارێکی تیو مانگێ «ئەدەبێ ـ مێژوێی» لە شاری سلێمانی بە ناوی «زانستی»یەوە دەرکرد •

دیارە تواناى لێکۆلینەوەی زانستیانەی مێژوی کورد ئەو سەردەمە کەم بو ، بۆیە زۆرجار هەڵە و لێکدانەوەی ناڕاست دەکەونە بەرچاو [٢٠٦] •

بە هەرجۆر مێژو شوێنی دیاری لە رۆژنامەنوسی کوردیدا هەبو • ئەم لایەنە لە «تێگەیشتنی راستێ»دا باش رەنگی داوەتەوە • لەمەدا شارەزایێ زۆری مێجەر سۆن [٢٠٧] و بەرادەیەکی کەمتر شوکرتلفەضلی دەوری دیاری بینیوە • شایانی باسە «تێگەیشتنی راستێ» زوربەی باسە مێژوییەکانی وەك سەروتار بلاو دەکردەوە •

پێویستە بەر لە هەمو شت سەرنج بۆئەوە راکێشین کە «تێگەیشتنی راستێ» یەکەم سەرچاوەی کوردییە هەولیداوە باسی رەگەزی کورد

(٢٠٣) مەبەستی دەستوسی کونە .
(٢٠٤) لە ئەسلدا (کە) چاپکراوە .
(٢٠٥) «کوردستان» ، ژمارە یەك ، ٦ی دیسامبری ١٩٤٥ ، بەرگی ناوەوەی .
(٢٠٦) بۆنمونە بڕوانە ئەو لێکدانەوە سەیرەی « پێشکەوتن » دەربارەی رەگەزی کورد بلاوی کردۆتەوە ( « پێشکەوتن » ، ژمارە بیستوچوار ، ٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٠ ) .
(٢٠٧) سۆن تەواو شارەزای مێژوی کورد بو . شایانی باسە مامۆستا ئەمین زەکی بۆ باسی نەژادی کورد کەلکی لە نوسینەکانی سۆن وەرگرتووە (بڕوانە : محمد امین زکی ، خلاصة تاریخ الکرد وکردستان ، ص ١٠٨ ــ ١١٢ ) .

بەشێوەیەکی زانستێ دروست بکا و دیسان یەکەم سەرچاوەی کوردی‌یە پەیوەندێ میدیا و کوردی خستۆتە بەرچاو ٠ لە ژمارە یازدەیدا «تێگەیشتنی راستێ» وتارێکی بە ناوی «قەومی کورد»ەوە بڵاوکردۆتەوە تێیدا دەڵێ :

« قەومی کورد لە شوعبەی ئاری‌یە و لە فیرقەی زەندی‌یە ٠ (زەندێ عیبارەتە لە کورد و فورس و ئەفغان و ئەرمەن و بلوج ٠ ئەم پێنج قەومە هەم دراوسێی یەکن هەم زۆر لەگەڵ یەکتری ئیختیلاطیان کردووە ، لەبەر ئەمە (زمان و عاداتیان) زۆر موشابیهی یەکە و عەلاوەی ئەمە ئەم قەومانە خالیس نەمان ، وەکو لەگەڵ یەك تێکەڵ بون لەگەڵ شوعبەی (سامی و مەغۆلی)ش دیسان تێکەڵی‌یان هەیە ٠ ئەما هەر (قەومە) زمان و جێی خۆی موحافەزە کردووە ٠٠٠ کورد قیسمێکی گەورەی مەملەکەتی ئاشور و میدیا و ئیلاء ئیشغال دەکەن و لە زەمانێکی زۆر پێشووەوە هەر لەو جێ‌یانە بون و هیچ قەومێك تەواو زەفەری پێ نەبردون ٠ لە تاریخی قەدیم ئەوروپایێکان کردۆخی (کاردۆخێ ــ ك٠م٠)یان پێ‌ئەڵێن و لە تاریخی تازە کە نەتیجەی تەحقیقاتێکی چاکە هەندێ لە عولەما کۆشی (کاشێ ــ ك٠م٠) و هەندێکیش ئاردۆخێ (کاردۆخێ ــ ك٠م٠)یان ناو دەنێن ٠٠٠ » (٢٠٨) ٠

« تێگەیشتنی راستێ » لە ژمارە دوازدەیدا جارێکی‌تر دێتەوە سەر باسی نەژادی کورد ٠ لە سەروتاری ئەم ژمارەیەیدا « تاریخی قەومی کورد و ئاساری عەتیقە ــ عەتیکە » دەڵێ : «تاریخی پێشوی قەومی کورد وەك گەلێ ئەقوامی‌تر هێشتا تەواو کەسبی وزوحی نەکردووە و لە بەینی عولەمای ئاساری عەتیقە ــ عەتیکە و (نوسەرانی) تاریخی قەدیم دەرحەق بە ئەسلی (کورد ــ ك٠م٠) کەم و زۆر ئیختیلاف هەیە ٠ ئەما ئەکسەری‌یەت لەسەر ئەمەیە کە کورد قەومێکی ئاری‌یە ٠ بۆ تاریخی قەدیمی ئەقوام جاران هەر

---

(٢٠٨) «تێگەیشتنی راستێ» ، ژمارە یازدە ، ٥ی شوباتی ١٩١٨ ٠

ئەوان بەدەستەوە هەبو ، موئەریخەکان هەمو لەو دەرحەق بە ئەقوامی قەدیمە مەعلوماتیان وەردەگرت • تەبیعی بەوندە ئیش پێك نەدەهات ، گەلێ حەیالات و خەرافاتیشیان تێکەڵ دەکرد، لەبەر ئەمە بە حەقیقەتی ئەقوامی پێشو گەیشتن موشکیلە بو • لەم ئاخری‌یە عولەمای ئاسار هاتنە پێشێ و جێی مەملەکەتە کۆنەکانیان هەڵکۆڵی ، بەرد و دیوار و صورەتی نوسراویان هێنایەدەرێ کە هەمو بە (خەتی) قەدیمەی میسماری و ئەنواعی‌تر ئەحوالی ئەقوامی پێشویان بەیانکرد • لەگەڵ ئەم خەتانە زۆر خەریك بون ، حەرفەکانیان خوێندەوە و ... سەرلەنوێ دەستیانکرد بە تاریخی ئەقوام » [٢٠٩] •

دوای ئەم پێشەکی‌یە «تێگەیشتنی راستی» دێتە سەر باسی شوێنەوارە کۆنەکانی ئاشور و بابل و ئەو بەڵگە مێژوییانەی تیایاندا دۆزراونەوە و دەڵێ هەندێکیان پەیوەندی کورد بە کاشی و ئیلامەوە نیشان دەدەن و مانی کورد بەرامبەر بە نەمانی گەلی دێرینی وەك ئاشور و ئەکەد و کلدان و ئیلام بە بەڵگەیەکی مێژویی مانادار دادەنێ •

لە مەیدانی مێژوودا «تێگەیشتنی راستی» دەیتوانی باش رابوردو لەگەڵ کاری سیاسی رۆژانە پێکەوە ببەستێ • بۆ ئەو مەبەستەی زۆر جار لە تیوەی دووەمی وتارە مێژوییەکانیدا دێتە سەر باسی سیاسەت • لە بەشی دووەمی ئەو وتارەیدا کە بە ناوی «قەومی کورد»ەوە بلاوی کردۆتەوە « تێگەیشتنی راستی » دەڵێ :

« لەم تەفسیلاتە وادەردەکەوێ کە کورد قەومێکە دائیمەن ئیسپاتی مەوجودی‌یەتی کردووە و ناوی لە تەواریخی عالەمدا هەیە • حەیف نی‌یە ئەم ... قەومە ئازایە لەناو ئەقوامی تازە خۆی پیشان نەدا • ئەمڕۆ زەمانێکە

---

(٢٠٩) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە دوازدە ، ٩ی شوباتی ١٩١٨ .

که هەمو ئەقوام داوای حەقی خۆیان دەکەن • بۆچی کوردیش لە هەمو جێ جەمعیاتی عیلمیە تەئسیس و تاریخی ئەدەبیاتی خۆیان تەدوین نەکەن ، لەگەڵ ئەمە کە تاریخێکی موحتەشەم و ئەدەبیاتێکی موتەزەمیان هەیە • کورد ئەگەر خۆیان بۆ خۆیان سەعی نەکەن کەس بەفریادیان ناگا • گەورە گەورەکانی ئەکراد دەبێ بۆ تەرەقی ئەوان فکر (بکەنەوە) و هەرچی لازمە بەجێی بێنن • ئینگلیز کە قەومێکی عادلن هەڵبەتە سەعادەتی کوردیشیان دەوێ • ئیستیناد بە تورك کردن خەتایەکی گەورەیە •••» [210] •

جێگەی خۆیەتی بۆ ئەم باسە نمونەیەکی تریش بخەینە بەرچاو • ئەمە نمونەیەیان بریتییە لە باسێ دەربارەی سەلاحەددینی ئەیوبی کە «تێگەیشتنی راستی» وەك سەروتاری ژمارە هەشتی بلاوی کردۆتەوە و ناوی ناوە «سولتان سەلاحەددین و تورکەکان» • «تێگەیشتنی راستی» لەو وتارەیدا دەڵێ :

« سولتان سەلاحەددین بە تەواتورێ کە موقەیەدی یەقینە ، بە ئەخباری تاریخی کە جێی باوەڕ بێ یەکە پادشای کوردە• کوردان تا ئەمڕۆ پیاوێکی تری وایان پێ نەگەیاندوە ، رەنگە پێشی نەگەیێنن • بۆیە ئەڵێین رەنگە و ناڵێین موحەقەقە چونکی عەقڵ رۆژبەرۆژ لە تەرەقیدایە و قەومییەت هەتا دێ لە تەکامولدایە ، مومکینە ••• قەومی کورد لە زەمانێکی ئایندەدا بە عیلم و مەعریفەت خۆی ئارایش بدا و بە ئیرادە و حەزم سەر بەرز بکاتەوە و یەك لەپاش یەك هەزاران سەلاحەددینی ئەیوبی بهێنێتە ناو • بەڵێ سەعی ئینسان کێویش لە بن دەردەهێنێ • ئیستا با واز لەم (باسە) بێنین ، چونکە دەمانەوێ قسەیەکی زۆر عەجایەب بە کوردەکان تێبگەیێنین : ••• هەمو کەس دەیزانێ کە تورکەکان خەریکی ئەوە بون ••• ئەقوامی عەرەب و

(٢١٠) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە یازدە ، ٥ی شوباتی ١٩١٨ •

کورد و ئەرمەن بکەن بە تورك و وازیان لە قەومیەتی خۆیـان پێ بهێنن •
ەگەڵ ئەمە کە نەیاتتوانی (بیبەنە) سەر (بەڵام ـ ك•م•) ئەم ئیشە مومکین
بو چونکی کوردێکی زیندو قابیلە بێ بە تورك ، ئەما عەجایەب ئەوەیە •••
تورکەکان خەریکی کردنی مردووەکانیش بون کە بیانکەن بە تورك • (یەکێ)
مو کوردە مردواتە سەلاحەددینی ئەیوبیە • جەنابی تـاریخ نوسی تـورك
مجیب عاصم لەو ( کتێبەیدا ) کە لە ١٣١٦دا نەشرو بڵاوی کرد لـە لاپەڕە
٤٤٠دا ئـەڵێ :

هەرچەند ••• وەکو وتمان ئیتیفاق کراوە لەسەر ئەمە کە سەلاحەددینی
ئەیوبێ کوردە ، ئەما لەلای من تورکە و لەسـەر ئەمە چەند ( دەلیلێکی )
بێ‌مەعنا دێنێ : ١ـ مەعیەتی سـەلاحەددین هەمو تورك بون ، ٢ـ ئـەو
مەملەکەتانە کە ئـەو و خولەفاکانی پادیشاهیان تێدا کرد پێشـتر بەدەس
تورکەوە ( بون ) ، ٣ـ نـاوی باوکی سەلاحەددین شـادیێ بۆ ئەم‌ناوە نە
کوردیە نە فارسیە ، ٤ـ خولەفاکانی تورانشاە ناویان تێدا هەیە»[٢١١] •

یەکسـەر « تێگەیشتنی راسـتێ » دەربارەی ئـەم « بەڵگانەی »
مێژوونوسی عوسمانی نەجیب عاصم دەڵێ : «ئەم دەلیلانە لە خۆیانەوە مردون،
چونکە وڕێنەی یەکێکن کە فیێی تورکێ گرتبێتی و عەقلی لەسەردا نەهێشتبێ•
ئەم تورکە جاهیلانە پادیشاهێکی وەکو سەلاحەددینی ئەیوبێ و سیلسیلەی
سەلاتینی ئەیوبێ کە کوردایەتیان مەعلومی عالەمە و لەگەڵ ئەمەش کە مردون
تەمایانە بیانکەن بە تورك ، هەڵبەتە دەرحەق بە زیندووەکان هیچ قسـور
ناکەن، دەستیان کەوێ بە رۆژێ نیوەڕۆ یا هەمویان سەردەبڕن وەیا دەیانکەن
بە تورك و رێ‌وشوێنی باوو ( باپیرانیان ) پێ گوم دەکەن ••• »[٢١٢] •

(٢١١) «تێگەیشتنی راستێ» ، ژمارە هەشت ، ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩١٨ .
(٢١٢) «تێگەیشتنی راستێ» ، هەمان ژمارە . لەم ژمارەیەوە « تێگەیشـتنی
راستێ» دەستی کردووە بە بایەخدان بە مێژووی کورد .

« تێگەیشتنی راستی » چەند وتارێکی بۆ باسی مێژوی کوردستانی سەدەکانی ناوەند تەرخان کردووە چونکە ، وەك خۆی دەڵێ ، « تاریخی قرونی وسطای کورد قیمەتێکی هەیە »[213] • لە ژمارە بیست و سێیەوە « تێگەیشتنی راستی » لە گۆشەی « تاریخ و مەشاهیری کورد »دا بەدرێژی باسی چەند ئەمارەتێکی ئەو سەردەمەی کوردستان دەکا و بەمجۆرە هۆی دامەزراندنیان لێك دەداتەوە :

« ••• ئەحوالی خەلافەتی عەبباسی شێوا و لە هەمو لا حکومەتی سەربەخۆ بە واسیطەی پیاوانی بەکار هاتە ناو • قەومی کوردیش ••• لەم حاڵە پەرێشانە ئیستیفادەی کرد و چونکی جێیان هەمو شاخ و داخ و سەختە چاکتر هاتنە دەست و چەند حکومەتێکی موناسیبیان تەئسیس کرد »[214] •

لە چەند ژمارەیەکیدا « تێگەیشتنی راستی » بەدرێژی باسی ئیمارەتە کوردییەکانی ئەو سەردەمە و دەسەڵاتدارە ناودارەکانیانی کردووە •

هەمان کات « تێگەیشتنی راستی » بۆ خۆی سەرچاوەیەکی رەسەن و گرنگە بۆ باسی زۆر رووی ناسکی مێژوی کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا کە قۆناغێکی پڕکارەسات و رووداوی گەورەیە لە ژیانی گەلی کوردا • لە رێگەی وتار و باس و هەواڵ و رەخنە و هێرشە توندەکانی ئەم رۆژنامەیەوە دەتوانین لە سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر کوردستان و لەباری سەختی ژیانی ئابوری کۆمەڵانی خەڵکی ئەو ناوچەیە و شەڕەکانی نێوان لەشکری عوسمانی و ئینگلیز لە مەیدانەکانی باکوری عیراق و لە گەلێ شتی تر

(٢١٣) بڕوانە : «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە بیست و سێ ، ٨ی نیسانی ١٩١٨ •

(٢١٤) «تێگەیشتنی راستی» ، هەمان ژمارە .

پتر تێبگەین[٢١٥] • تەنانەت « تێگەیشتنی راستی » دەستدەدا ببێتە سەرچاوە بۆ باسی روداوەکانی دواسالی شەڕی یەکەم لە شەڕگەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ، تایبەت لە سوریە و فەلەستین •

شایانی باسە چەند دەکومەتێکی سیاسی ـ مێژویی گرنگ بۆ یەکەم جارو دواجار لە « تێگەیشتنی راستی »دا بە کوردی بلاو کراونەوە • لە لاپەڕە دوو سێی ژمارە پەنجاو چواریدا هەر بیستو پێنج بەندی موتارەکەی (صلح)ی نێو دەولەتە سوێندخۆرەکان و دەولەتی عوسمانی و نۆزدە بەندی موتارەکەی نێو ئەو دەولەتانە و نەمسە بلاوکراونەوە[٢١٦] • لە ژمارەی داهاتویدا دیسان بۆ یەکەمجار « تێگەیشتنی راستی » بەکوردی دەقی ئەو بەیاننامە گرنگەی بلاو کردۆتەوە کە بەریتانیا و فەرەنسە « موشتەرەکەن لە لۆندرە و پاریس و نیویۆرق و میسری قاهیر رۆژی هەشتەمی تەشرینی (دووەمی) ١٩١٨ نەشریان کرد »[٢١٧] •

بێ گومان ئەم لایەنانە ، وەك لەئەنجامدا باسیدەکەین ، لە نرخ و بایەخی « تێگەیشتنی راستی » ، بەزردەکەنەوە •



---

(٢١٥) شایانی باسە زانیاریکانی ناو «تێگەیشتنی راستی» یاریدەیەکی زۆری داین بۆ دەولەمەند کردنی چەند باسێکی ناو ئەو کتێبەمان کە دەربارەی مێژوی کوردستانە لە سالەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا ( بڕوانە : الدكتور كمال مظهر احمد ، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى ، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ، بغداد ، ١٩٧٧ ) .

(٢١٦) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە پەنجاو چوار ، ١١ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ .

(٢١٧) «تێگەیشتنی راستی» ، ژمارە پەنجاو پێنج ، ١٨ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ . مەبەست ئەو بەیاننامەیەیە کە تێیدا گفتی مافی چارەنوسی گەلان درابو .

# ئەنجام

لێکدانەوە و بەراوردی زانیاری‌یەکانی ناو پێشەکی و بەشەکانی ئەم کتێبە بە ڕوونی شوێنی دیاری « تێگەیشتنی ڕاستی » لە ڕۆژنامەنوسی کوردیدا نیشان‌دەدەن • ڕاستە ئینگلیز لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیاندا ئەم ڕۆژنامەیەیان دامەزراند و سەیر دەبو گەر وا نەبوایە ، بەڵام هەمان کات « تێگەیشتنی ڕاستی » لە زۆر ڕێگەوە خزمەتی باشی ژیانی ڕوناکبیری کوردی کرد • ئەمەش بۆ خۆی ئەنجامی چەند هۆیەکی تێکەڵاو بو • ئەو سەردەمە ئینگلیز دەیویست کورد لە عوسمانی دوربخاتەوە و هەستی بە لای خۆیدا ڕاکێشێ و گەر توانی دژی تورکیا چەکی پێ هەڵگرێ • دیارە بزواندنی هەستی نەتەوەیی دەیتوانی دەوری خۆی لەمەدا ببینێ و ئەوساش بزواندنێکی‌وا لەوانە نەبو هیچ کێشەیە بۆ ئینگلیز دروست کا •

بێ‌گومان « سەربازێکی نەناسراو»ی شارەزای ئەدەب و مێژو و سیاسەت دڵسۆزانە بۆ کورد دەوری گەورەی لە دەرکردنی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا بینیوە • ئەو بەڵگانەی بەدەستەوەن گومان لەوەدا ناهێڵن کە ئەو سەربازە شوکری‌فەضلی بووە • دیارە لە هەڵسەنگاندنی دەوری ئەو پیاوەدا دەبێ مەرجەکانی سەردەمی خۆی بەپێی کات و شوێن بگرینە بەرچاو • دواکەوتویی و زۆرداری عوسمانی کارێکی وای کردبو ئەو ڕۆژە بۆ دەرمان یەکێ هەڵنەکەوێ بتوانێ دروست لە سروشتی ئیمپریالیزمی دەوڵەتە گەورەکان تێ‌بگا • قوتاربون لە دەسەڵاتی عوسمانی ئامانجی گەورەی

حەوان بو • دوربین و کورتبینی ئەو رۆژە شەیدای پێشکەوتنی رۆژئاواییەکان بون و بۆ خۆیان خەویان پێوە دەدی • لەبەرئەوە بێ حۆفرۆشتن و مەبەستی خراپ یەکێکی وەك شوکرتلفەضلی وێنەی ئینگلیزی بە رەنگی دلگیر و عوسمانی بە رەش دەکێشا •

مێجەر سۆن دەستی بالآی لە دەرکردن و بەڕێوەبردنی « تێگەیشتنی راستی »دا هەبو • بونی مێجەر سۆن لە دو سەرەوە کاری کردبووە سەر شێواز و ناوەرۆکی « تێگەیشتنی راستی » • بەهۆی ئەوەوە لایەنی ئینگلیز پەرستی زیاتر و زیرەکانەتر لەسەر لاپەڕەکانی « تێگەیشتنی راستی » رەنگی دابۆوە • بەلآم هەر بەهۆی ئەویشەوە «تێگەیشتنی راستی» لە رۆژنامەیەکی ئاسایی گەلێکی دواکەوتو پێشکەوتوتر بو • وتارەکانی بە ناوەرۆك دەولەمەند و بەپێز بون ، هەلەیان کەم بو ، شێوازیان باش بو ، سەرنجی خوێنەریان رادەکێشا و شتی نوێیان دەخستە بەرچاو • ئەمانەش وەك ئاشکرایە ، دەسکەوتی بەنرخن بۆ مەیدانی کاری رۆژنامەنوسی •

« تێگەیشتنی راستی » گەلێ خزمەتی بە ژیانی روناکبیری کورد گەیاندووە • زمان و ئەدەب و مێژوی کورد بۆ یەکەمجار بەوجۆرە لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەیەکی کوردی رەنگیان داوەتەوە • دەیان سالی‌تر پێویست بو تا گۆڤارێکی وەك « هاوار » یا « روناهی » بیگرێتەوە یا گۆڤارێکی وەك « گەلاوێژ » بۆڕی بدا • ئینجا بۆ ئەمەش دەبێ دەوری کات و شوێن و بەرەوپێش‌چون لەیاد نەکەین • دو کەس حەفتەی جارێ یا دو جار «تێگەیشتنی راستی»یان دەردەکرد ، بەلآم دەیان کەسی شارەزا و دونیا دیدە مانگی جارێ یا ئەوپەڕەکەی دو جار یەکێ لەو گۆڤارانەیان بلآو دەکردەوە(١) •

وا پێ‌دەچێ لەگەل تەواوبونی شەڕی یەکەم و ئال و گۆڕە تازەکانی

---

(١) جاری وا هەبو « گەلاوێژ » بە دو مانگ جارێك دەردەچو .

ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبو « تێگەیشتنی راستی »ش یا ڕێبازی خۆی بگۆڕێ یا لەکارکەوێ • ئینگلیزەکان ڕێگەی دووەمیان هەڵبژارد . وادیارە بەباشیان زانی رۆژنامەیەکی کوردیتر لە یەکێ لە شارەکانی کوردستان دابمەزرێنن ، ئەوەبو سۆن دەستیکرد بە دەرکردنی رۆژنامەی « پێشکەوتن » لە شاری سلێمانی •

دوا راستی کە هەڵدەگرێ سەرنجی بۆ راکێشین و کۆتایی ئەم بەرهەمەی پێبهێنین ئەوەیە کە « تێگەیشتنی راستی » تاقە چاپەمەنی کورد و کوردی بو لە سەرانسەری ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهاندا کە قۆناغێکی گرنگ لە مێژوی هەمو مرۆڤدا پێکدێنن •



## چەند تێبینی‌یەك

تائێستا ژمارەیەك نوسەری خۆمـان و بێگانـە چەنـد لیستەیـەکی بیبلیۆگرافی‌یان بۆ ناوی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانە داناوە کە بە زمانی کوردی دەرچون • بێ‌گومان ئەوکارەیـان ئەنجـامی ئـەرك و تەقـەلای زۆرە و سەرەتایەکی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوەی لایەنی جیاوازی مێژوی رۆژنامەنوسی کوردی • بەڵام کێشە زۆرەکانی ئەو مێژووە و بەر لە هەموشـت پەرش و بڵاوی رۆژنامە و گۆڤارە کوردی‌یەکان و فەوتانی بەشێکی زۆریان بونـەتە هۆی ئەوەی ئەو لیستانە بێ کەم و کورتی نەبن • هەر بۆ نمونە «ژیانەوە» کە لە ١٨ی ئابی ١٩٢٤وە دەرچو و تـا ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٢٦ ژیـا و یەکسەر «ژیان» جێگەی گرتەوە بەلای فایق بەطی‌یەوە کە یەکێکە لە هـەرە شارەزاکانی رۆژنامەنوسی عیراق ، تەنها یەك مـانگ ژیـاوە [1] • نمونەی لـەم‌بابەتە لەو لیستـانەدا زۆرە و جاروبـار لە بـەشی دووەمی ئـەم کتێبەدا هەندێکیانمان خستۆتە بەرچاو •

ئەمە هۆی یەکەمی رێکخستنی ئەم دوو لیستـەیە کە وەك پاشـکۆ پێشکەشیان دەکەین بەنیازی نانی هـەنگاوێکی‌تر بۆ نزیـك‌کەوتنەوە لـە

---

(١) بڕوانە : فائق بطي ، الموسوعه الصحفيه العراقيـه ، بغـداد ، ١٩٧٦ ، ص ٧٠ . گەلێك هەڵەی‌تری لەو بابەتە لەم کتێبەدا هەیە .

دانانی بیبلیۆگرافیایەکی دروستی رۆژنامەنوسی کوردی کە بۆ خۆی کارێکی زانستی پێویستە • بڕوا ناکەم ئەم دوو لیستەیەی منیش بێ کەم و کورتی بن • بێ گومان خزمەتێکی بەجێ دەبێ گەر شارەزایان بتوانن زانیاری تر لەم بارەیەوە بڵاوبکەنەوە یا هەڵەی ناو لیستەکانی پێشوو و ئەم دوو لیستەیە راست بکەنەوە •

بە پێویستم زانی لەم دوو لیستەیەدا زۆرتر دەربارەی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانە بدوێم کە دەگمەنن یا باسیان بەهەڵە کراوە • دیارە ئەمە یارمەتی خوێنەر و تایبەت شارەزایان دەدا زیاتر ئاگاداری رووەکانی مێژووی رۆژنامەنوسی کوردی بن •

ناوی هەمو رۆژنامە و گۆڤارە نهێنی‌یەکان لەم دوو لیستەیەدا نەهاتووە چونکە ئەو کارە هێشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوە و بەراوردی زۆرە • لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا هەندێك زانیاری نەزانراو یا کەم زانراو دەربارەی رۆژنامەنوسی نهێنی کوردی بڵاوکراوەتەوە •

هەر ناو و ژمارە و قسەیەك ئەستێرەیەکی لاوە بو لە سەرچاوەی ترەوە وەرگیراوە • بەشێك لە بارستی رۆژنامە و گۆڤارەکان لەو ژمارانەیان وەرگیراوە کە لە کتێبخانە گشتی‌یەکانـدا پـارێزراون بۆیـەکا دوور نی‌یـە جیاوازی‌یەکی کەمی چەند ساتیمی دروست بوبێ •



# پاشکۆی یەکەم

## ناو و شوێن و کاتی دەرچوونی ڕۆژنامە کوردی‌یەکان

**« کوردستان »**
**قاهیرە ـ جنێف ـ لەندەن ـ فۆلکستۆن ـ جنێف**
**ژمارە یەکی : ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨**

یەکەم ڕۆژنامەی کوردی‌یە . وتارەکانی بە شێوەی کرمانجیی ژوروو بون . میقداد مەدحەت بەدرخان و دوای ئەو عەبدوڕڕەحمان بەدرخانی برای سەرپەرشتیی دەرکردنیان کرد . تا نیسانی ١٩٠٢ بەسەر یەکەوە ٣١ ژمارەی ێ دەرچو . (٢٦×٨ر٣٣) یا (٥ر٢٥×٥ر٣٢) سانتیمە .

**« کورد تەعاون وە تەرەقی غەزەتەسی »(*)**
**ئەستەمۆل**
**دوای شۆڕشی سالی ١٩٠٨ لە تورکیا**

ئۆرگانی یەکەم کۆمەڵەی سیاسیی کورد بو کە دوای شۆڕشی سالی ١٩٠٨ بنەماڵەی شەمزینی و بەدرخان دەریان‌کرد . بە کوردی و تورکی بلاو دەبۆوە [٢] .

---

(٢) چەند نوسەرێکی کورد باسی ڕۆژنامەی «کورد»یان کردووە کە گوایە شێخ عەبدولقادری شەمزینی سالی ١٩٠٧ لە ئەستەمۆل دەری‌کردووە . هیچ بەلگەیەکی باوەڕپێکراو بۆ ئەمە بەدەستەوە نی‌یە و ڕێی تێ‌ناچێ ئەو سەردەمە سولتان عەبدولحەمید ماوەی دەرچونی ڕۆژنامەیەکی وای دابێ . وا دیارە مەبەست هەر ئەو «کورد تەعاون وە تەرەقی غەزەتەسی»یە‌یە کە دوای شۆڕشی ١٩٠٨ دەرچو و ناوی لە چەند ڕاپۆرتێکی دیپلۆماسیی نهێنی و ژمارەیە سەرچاوەی باوەڕپێکراودا هاتووە .

« تێگەیشتنی راستی »
بەغـدا
ژمارە یەکی : سێشەممەی یەکی کانونی دووەمی ١٩١٨
ئەو رۆژنامەیەیە کە ئەم کتێبەمان لەبارەیەوە نوسیوە •

« پێشکەوتن »
سلێمانی
ژمارە یەکی : ٢٩ی نیسانی ١٩٢٠

مێجەر سۆن دایمەزراند • لە ژێر نـاوی رۆژنـامەکەدا نـوسراوە « حەفتەی جارێك دەردەچێت» • لە سەرو نـاوی رۆژنـامەکەوە وشـەی «سلێمانی»ی نوسراوە کە لەوە دەچێ یا بە مۆر لێی درابێ یا بە زەنگۆگراف بۆی نوسرابێ ، دیارە سۆن مەبەستی ئەوە بووە بە «پێشکەوتنی سلێمانی» لە قەڵەم بدرێ • تا ژمارە ٩٦ی (٢٣ی شوباتی ١٩٢٢) ٤ لاپـەڕە بو ، لـە ژمارە ٩٧ی‌یەوە (٢ی مارتی ١٩٢٢) بۆتـە ٦ لاپـەڕە (٣٢ × ٢٠ سـم)ە • «پێشکەوتن» تا گەڕانەوەی شێخ مەحمود (ناوەنـدی سـاڵی ١٩٢٢) بـە رێکوپێکی دەرچو • دوا ژمارەی کە من دیومە (ژمارە ١٤٤)ە کە رۆژی ٢٩ی جۆن (حوزەیران)ی ١٩٢٢ی بەسەرموەیە •

« رۆژی کورد ــ شەوی عەجەم » ، ــ «رۆژی کورد» ، ــ «کورد»(*)
ورمێ
سەرەتای بیستەکان

ئۆرگانی بزوتنەوەی سمکۆ بو • زۆ نـاوەکەی گۆڕی بـە « رۆژی کورد» و ئینجا تەنها بە «کورد» • بەپێی روداوەکانی بزوتنەوەی سمـکۆ دەبێ ساڵی ١٩٢١ دەرچوبێ • چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچو • سەروتاری ژمارەکانی بە فارسیش بڵاودەکرانەوە • بەرپرسیاری محەمەد تورجانی بـو • لە چاپخانەی « غیرەت » چاپ دەکرا •

### « بانگی کوردستان »
### سلێمانی
### ژمارە یەکی ٢ی ئابی ١٩٢٢

لەم لاو لەو لای ناوەکەیەوە نوسراوە : «صاحب امتیاز و مدیری مسؤول و سرمحرر مستەفا پاشا ، محرری کوردی و فارسی علی کمال و مە نوری ، محرری تورکی رەفیق حلمی » • لە ژێرییەوە نوسراوە :ـ « علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزتەیەکی حرو سەربەست و ملییە ، هەفتەی جارێك دەردەچێ » ، ٦ لاپەڕەیە ( ٣٢ × ٢٠ سم )ە • ئۆرگانی ئەو رژێمە بو کە شێخ مەحمود دایمەزراند • چواردە ژمارەی بەم جۆرە لێدەرچو ( دوا ژمارەی : ٨ی حوزەیرانی ١٩٢٣) • سەرەتای سالی ١٩٢٦ مستەفا پاشا لە بەغدا ٣ ژمارەیتری لێ دەرکرد کە ژمارە (١٤ ــ ١) و (١٤ ــ ٢) و ( ١٤ ــ ٣)یان لەسەر نوسراوە و رۆژی ٢٨ی کانونی دووەم و ١٥ی شوبات و ١ی نیسان دەرچون • لەسەر ئەو سێ ژمارەیە نوسراوە : «مدیر مسؤول و سر محرر : مستەفا پاشا ، محرر : مستەفا شەوقی ، مدیری ادارە : کریم رۆستەم » • سالی ١٩٧٤ « وەزارەتی راگەیاندن ، بەڕێوەبەرێتی گشتی رۆشنبیریی کوردی » هەر حەڤدە ژمارەکەی بە ئۆفسێت چاپکردەوە [٣] •

### « رۆژی کوردستان »
### سلێمانی
### ژمارە یەکی ١٥ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٢

لەملاو لەولای ناوەکەیەوە نوسراوە : « سر محرر و مدیری مسؤول م• نوری ، محرر علی کمال » ، لە ژێرییەوە نوسراوە : « سیاسی ، ئەدەبی ، اجتماعی ، غزتەیەکی رەسمییە ، هەفتەی جارێك دەردەچێ» ، ٤ لاپەڕەیە (٣٢ × ٢٠ سم)ە• ژمارە پازدەی کە دوا ژمارەیەتی رۆژی ٣ی مارتی ١٩٢٣

---

(٣) «بانگی کوردستان» ، کۆکردنەوە و لەسەر نوسینی : جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ١٩٧٤ •

بڵاوکراوەتەوە • ئۆرگانی ئەو رژێمە بو کە شێخ مەحمود دایمەزراند • کاتێک شێخ ناچار بو بەهۆی فشاری ئینگلیزەوە سلێمانی بەجێ بهێڵێ و چاپخانەکەی شاری گواستەوە ئەشکەوتی جاسەنە «رۆژی کوردستان» لە دەرچـون وەستا [٤] • ساڵی ١٩٧٣ « وەزارەتی راگەیاندن ، کارگێڕی رۆشنبیری کوردی» بە ئۆفسێت هەر ١٥ ژمارەکەی چاپکردەوە [٥] •

### « بانگی حەق »
### ئەشکەوتی جاسەنە (ناوچەی سلێمانی )
### ژمارە یەکی : ٨ی مارتی ١٩٢٣

تا نیسانی ١٩٢٣ ، ٣ ژمارەی لێ دەرچو • ژمارە سێی دوّ لاپـەڕەیە و رۆژی پێنج شەممەی ١٢ی نیسانی ١٣٣٩ ، ٢٦ی شەعبانی ١٣٤١ی لەسەر نوسراوە • وا دیارە تەنها ئەو سێ ژمـارەیەی لێ دەرچو ، چونـکە زۆری نەخایاند کە شێخ مەحمود ناچـار بو ناوچەی سـورداش بەجێ بهێـڵێ و چاپخانەکە بەو جۆرە کەوتەوە دەست ئینگلیز کە دیسـان گواستیـانەوە سلێمانی و پاش ماوەیە «ژیانەوە»یان پێ دەرکرد •

### « ئومێدی ئیستیقلال »
### سلێمانی
### ژمارە یەکی : ئەیلولی ١٩٢٣

رۆژنامەیەکی حەفتانە و ئۆرگانی بزوتنەوەکەی شێخ مەحمود بو • لای ناوی رۆژنامەکەوە نوسراوە : «مودیری مەسئول : خواجە ئەفەندی زادە و

---

(٤) زاهیدە ئیبراهیم دەڵێت گوایە ئینگلیزەکان بۆ کاری پرۆپاگەندەی خۆیان دەریان‌دەکرد و پارەیان تێدا خەرج دەکرد . وا دیارە ئەو قسەیەی لـە مامۆستا عەبدورڕەزاق حەسەنی وەرگرتووە ( بڕوانە : زاهدە ابراهیم ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٨٣ ؛ عبدالرزاق الحسنی ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٨٧ ــ ٨٨ ) .

(٥) «رۆژی کوردستان» ، کۆکردنەوە و پێشەکی جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

ئـەحمەد صەبری » ٠ وا دیارە ٢٥ ژمارەی لێ بڵاوبۆتەوە (*) ، من تـا
ژمـارە نۆزدەیم دیوە کە رۆژی پێنج شەممەی ٢٢ی شەعبانی ١٣٤٢ی کۆچی
٣مەی مارتی ١٣٤٠ی رۆمی لەسەر نوسراوە ، واتە ٢٧ی مارتی ١٩٢٤ ( ٣٤×
٢٠ سـم )ە ٠

« ژیانەوە »

سلێمانی

ژمارە یەکی : دۆ شەممەی ١٧ی موحەڕڕەمی ١٣٤٣ ، ١٨ی ئابی ١٩٢٤ ٠

لە ژێر ناوی رۆژنـامەکەدا نوسراوە : «ئەم غەزەتـەیە غەزەتـەیەکی حکومەتی‌یە ، هەفتەی جارێك دەردەچێ» ٠ لە ژمـارە نۆزدەیـەوە ( ٢ی مارتی ١٩٢٥) لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : « غەزەتەیەکی سیاسی ، ئەدەبی ، اجتماعی‌یە ، هەفتەی دۆ جار دەردەچێ» ، (٣٢×٢٠سـم)ە ٠ رۆژی ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٢٦ دوای پەنجاو شەشەمین ژمارەی لە دەرچون وەستا و «ژیان» جێگەی گرتەوە ٠ «ژیانەوە» دانەی بە عانەیـەك ، واتـە ٤ فلس دەفرۆشرا ٠

« ژیـان »

سلێمانی

ژمارە یەکی : ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٢٦

جێگەی «ژیانەوە»ی گرتەوە ٠ لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : « ئـەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی ، ئەدەبی اجتمـاعی‌یە ، هەفتـەی جـارێك دەردەچێ » ٠ بە ٤ لاپەڕە لە چاپخانەی شارەوانی سـلێمانی چـاپ دەکرا (٣٢×٢٠ سم)ە ٠ لە ئابی ١٩٣٤وە پیرەمێرد بووە لێپرسراوی، تا وەستانی (١٠ی مارتی ١٩٣٨) ٥٥٣ ژمارەی لێ دەرچـو ٠ زۆری نەخایـاند «ژین» جێگەی گرتەوە ٠

ـحمد صەبری » ٠ وا دیارە ٢٥ ژمارەی لێ بلاّوبۆتەوە (*) ، من تـا
ـەرە تۆزدەیم دیوە کە رۆژی پێنج شەممەی ٢٢ی شەعبانی ١٣٤٢ی کۆچی
ـی مارتی ١٣٤٠ی رۆمی لەسەر نوسراوە ، واتە ٢٧ی مارتی ١٩٢٤ ( ٣٤×
ـسم )ە ٠

**« ژیانەوە »**

**سلێمانی**

**ژمارە یەکی : دۆ شەممەی ١٧ی موحەرّەمی ١٣٤٣ ، ١٨ی ئابی ١٩٢٤ ٠**

لە ژێر ناوی رۆژنـامەکەدا نوسراوە : «ئەم غەزەتـەیە غەزەتـەیەکی حکومەتی‌یە ، هەفتەی جارێك دەردەچێ» ٠ لە ژمـارە تۆزدەیـەوە ( ٢ی ـرتی ١٩٢٥) لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : « غەزەتەیەکی سیاسی ، ئەدەبی ، جتماعی‌یە ، هەفتەی دۆ جار دەردەچێ» ، (٣٢×٢٠ســم)ە ٠ رۆژی ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٢٦ دوای پەنجاو شەشەمین ژمارەی لە دەرچون وەستا و «ژیان» جێگەی گرتەوە ٠ «ژیانەوە» دانەی بە عانەیـەك ، واتـە ٤ فلس ئەفرۆشرا ٠

**« ژیـان »**

**سلێمانی**

**ژمارە یەکی : ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٢٦**

جێگەی «ژیانەوە»ی گرتەوە ٠ لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : « ئـەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی ، ئەدەبی اجتمـاعی‌یە ، هەفتـەی جـارێك دەردەچێ » ٠ بە ٤ لاپەڕە لە چاپخانەی شارەوانێ سـلێمانێ چـاپ دەکرا (٣٢×٢٠ سم)ە ٠ لە ئابی ١٩٣٤وە پیرەمێرد بووە لێپرسراوی، تا وەستانی (١٠ی مارتی ١٩٣٨) ٥٥٣ ژمارەی لێ دەرچـو ٠ زۆری نەخایـاند «ژین» جێگەی گرتەوە ٠

**« ڕێیا تــازە »**
**یەریڤــان**
**ژمارە یەکی : ٢٥ی مارتی ١٩٣٠**

ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستانی سۆڤیەتە • لەگەڵ ئەوەش کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك (١٩٣٨ تاوەکو ١٩٥٥) دەرنــەچو بەڵام تا ئیستــە بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی‌یە • تا ١٩٣٨ بە پیتی لاتینی بڵاودەکرایەوە . لە ١٩٥٥ەوە بە پیتی روسی ــ سلاڤی بڵاودەبێتەوە •

**« ژیــان »**
**سلێمانی**
**ژمارە یەکی : ١٢ی ئەیلولی ١٩٣٧**

شارەوانی سلێمــانی بڵاوی‌دەکردەوە و مامۆســتا صــالح قەفتــان سەرپەرشتی‌دەکرد • دەوروبەری دوو ساڵ ژیا •

**« ژین »**
**سلێمانی**
**ژمارە یەکی : ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٣٩**

پیرەمێردی شاعیر دایمەزراند و تا وەفاتی (١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٠) هەر خۆی سەرپەرشتی دەکرد • دوای ئەو چەند جارێك سەرپەرشتی‌کەرانی گۆڕزان • (جەمیل سائیب و گۆران و نوری ئەمین بەگ و ئەحمەد زرنگ هەر یەکەیان ماوەیەك سەرپەرشتی‌یان کردووە) • بارستی «ژین» زۆر جار گۆڕزا . بەڵام بەشیکی زۆری ژمارەکانی (٣٤×٣٠ سم)ن •

**« کوردستان »**
**مەهاباد**
**ژمارە یەکی : پێنج‌شەمۆی ٢٠ی بەفرانباری ١٣٢٤ ، ١١ی کانونی دووەمی ١٩٤٦**

ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان بو • بە چوار لاپەڕە حەفتەی سێ ژمارەی لێ بڵاودەبۆوە : شەممەوان و دۆشەممەوان و چوارشەممەوان • (٣٩ × ٢٨ سم)ە •

### « کوردستان »
### باکۆ ( ؟ )
### ژمارە یەکی : ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٤٧

لەسەر رۆژنامەکە نوسراوە : «ماوەی رۆژنـامەی کوردستـان»ە ،
ـەبەستی ئەو رۆژنامەی «کوردستان»ەیە کە سالی ١٩٤٦ لە مەهاباد دەرچوە
ە ژمارە دەیەوە (١٦ی بەفرانباری ١٣٢٨ ـــ ٦ی کانونی دووەمی ١٩٤٨) لـە
ـێر ناوەکەیدا نوسراوە : «ئـۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردسـتان»ە ٠
ـەشێکە لە رۆژنـامەی « ئازەربایجان » کە ئۆرگانی «فیرقەی دیموکراتی
ئازەربایجان»ە ٠ دوکتۆر عەلی گەلاوێژ و دوکتۆر رەحیمی قازی و دوکتۆر
ع٠ شەمزینی بە ناوی خۆیانەوە بەرهەمیان تێدا بلاوکردۆتەوە ٠ دەوروبەری
١٠ سال ژیا ٠ (٣٩،٥ × ٢٩ سم)ە ٠

### « رێگا » (٭)
### مەهاباد
### ژمارە یەکی : ١٩٤٨ ( ؟ ) (٦)

### « هەولێر »
### هەولێر
### ژمارە یەکی : ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٥٠

کۆمەلی مامۆستایانی هەولێر دەریدەکرد ، نزیکەی سێ سال ژیا و بە
عەرەبی و کوردی بلاودەبۆوە ٠

### « راوێژ »(٭)
### تێران
### ژمارە یەکی : ١٩٥٢ (؟) (٧)

---

٦ دەربارەی بڕوانە : جمال خزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری کوردی، ل ٥٤ .

٧ دەربارەی بڕوانە هەمان سەرچاوە ، ل ٦١ .

**« پێشکەوتن »**
**ـ « التقدم »**
**بەغـدا**
**ژمارە یەکی : سەرەتـای ١٩٥٨**

سەرەتا لە شێوەی گۆڤاردا دەردەچو ( بڕوانە : «پێشکەوتن» ـ پاشکۆی ناوی گۆڤارەکاندا ) • دوای شۆڕشی گەلاوێژی ١٩٥٨ بە ماوەیەک بووە رۆژنامە • لەسەر دوا لاپەڕەی ژمارە ٦٥ی نوسراوە : «رۆژنامەیەکی کوردیی حەفتانەیە رۆژانی دوشەممە دەرئەچێت•خاوەن و بەڕێوەبەری محەمەد بریفکانی یە» • بە کوردی و عـەرەبی دەردەچو • شـوباتی ١٩٦٣ داخر • (٤٢ × ٢٩ سم)ە •

**« خەبات »**
**ـ « النضال »**
**بەغـدا**
**ژمارە یەکی : ٤ی نیسانی ١٩٥٩**

ئۆرگانی ئاشکرای «پارتی دیموکراتی کوردستان» بو • سەرەتا چەند ژمارەیەکی کەمی بە کوردی و عەرەبی دەرچو ، دوایی هەموی بووە عەرەبی بێ ئەوەی ناوی بگۆڕێ • تا داخستنی (٢٨ی مارتی ١٩٦١) ٤٦٢ ژمارەی لێ دەرچو • سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوەی زۆر روی مێژوی کورد •

**« راستی »**
**مۆسل**
**ژمارە یەکی : نیسانی ١٩٥٩**

پارێزەر جەرجیس فەتحوڵلا و نوسەر ئەنوەر مائی بڵاویاندەکردەوە • ماوەیەکی کەم ژیا و تەنها ٢٣ (؟) ژمارەی لێدەرچو •

**« کوردستان »**
**تـاران**
**ژمارە یەکی : ٢٩ی نیسانی ١٩٥٩ (؟)**

رۆژنامەیەکی حەفتانە بو • خاوەن و بەرپرسیـاری : عەبدولحەمیـد

حیزبی حیوزززمان ، سەرنوسەری : دوکتۆر محەمەد صەدیق مفتی زادە بو ٠
حزوبەری ٥ ساڵ (؟) ژیا ٠

**« ئازادی »**
**کەرکوك و بەغدا**
**ژمارە یەکی : ای مایسی ١٩٥٩**

لەژێر ناوەکەیدا نوسراوە : «رۆژنامەیەکی رۆژانــەی ســیاسی‌یە» ٠ خاوەن ئیمتیازو لێپرسراوی نافیع یونسی مەحامی بو ٠ ئۆرگانی ئاشکرای «پەرتی کۆمۆنیستی عیراق» بو ٠ تا داخستنی (کۆتــایی تەشرینی دووەمی ١٩٦٠) ١٥٦ژمارەی لێ دەرچو ٠ رۆژنامەیەکی دەولەمەنــدە ٠ (٢٩×٤٤ سم )ە ٠

**« رای گەل »**
**کەرکوك**
**ژمارە یەکی : ٦ی ئەیلولی ١٩٥٩**

ئۆرگانی «پارتی نیشتمانی ـ دیموکراتی» بو ٠ خــاوەنی : صدیــق بلوکینی ، لێپرسراوی : پارێزە صدیق عەبدوللا ٠ دەوروبەری سێ ساڵ ژیا، بەلام کەمی لێدەرچو ٠

**« بڕوا »**
**سلێمانی**
**ژمارە یەکی : ٢ی تەموزی ١٩٦٠**

پارێزەر کەمالی میرزا کەریم خاوەن و سەرنوسەری بو ٠ تا وەستــانی (٢٥ی کانونی دووەمی ١٩٦٣) ٩٥ ژمارەی لێ دەرچو ٠

**« دەنگی کورد »**
**ـ « صوت الاکراد »**
**بەغــدا**
**ژمارە یەکی : ١٧ی ئابی ١٩٦٠ (؟)**

خاوەن و سەرنوسەری : عومەر جەلال حەوێزی ٠ سەرەتا بە کوردی و دوایی بە کوردی و عەرەبی دەرچو ٠ دەوروبەری ساڵێك ژیا ٠

« کوردستان »
بەغـدا
ژمارە یەکی : شەممۆی ٤ی مارتی ۱۹٦۱

ئۆر گانی ئاشکرای « پارتی دیموکراتی کوردستان » بو • لەسەر نوێ لاپەڕەی نوسراوە : «رۆژنامەیەکی سیاسی رۆژانەیە» • چەند ژمارەیـەکی کەمی لێ‌دەرچو • (۲۸×٤۳ سم)ە •

« هەولێر »
هەولێر
ژمارە یەکی : ۱۰ی شوباتی ۱۹٦۲ (؟)

شارەوانی هەولێر بە کوردی و عەرەبی دەری‌دەکرد • دەوروبـەری دوَ سـاڵ ژیا •

« دیجلە و فورات »(*)
ئەستەمۆل
ژمارە یەکی : تەشرینی یەکەمی ۱۹٦۲(۸)

« راپەڕین »
ـ « النهضة »
سلێمانی
ژمارە یەکی : حوزەیرانی ۱۹٦٤ (؟)

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : « رۆژنامەیەکی کوردی و عەرەبی‌یە لـە چاپخانەی «ژین» لە سلێمانی دەرئەچێت• خاوەنی : عبدالعزیز صالح الطالبی• سەرۆکی نوسین : محامی صدیق عبدالله مختار» • ساڵی ۱۹٦۸ لە دەرچون وەستا • (٤۳×۵۵ سم)ە •

« دەنگوباس »
ـ « الاخبار »
بەغدا
ژمارە یەکی : کانونی دووەمی ۱۹٦٦

رۆژنامەیەکی رۆژانەی کوردی و عـەرەبی بو محـەمەد بریفـکانی

(۸) دەربارەی بڕوانە : جمال خزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری کوردی، ل ۹۰.

ـەری‌دەکرد • حەوت لاپەڕەی بە عەرەبی و یەك لاپەڕەی بە کوردی چاپ ـەو • تا ٢٧ی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٧ ژیا •

« برایەتی »
بەغدا
ژمارە یەکی : ٦ی مایسی ١٩٦٧

سەرنوسەری : صالح یوسفی • ئۆرگانی ئاشکرای « پارتی دیموکراتی کوردستان» و پاشکۆی خولی یەکەمی رۆژنامەی «التآخي» بو • تەشرینی دوومی ١٩٦٨ وەستا •

« روناکی »
ـ « النور »
بەغدا
ژمارە یەکی : مایسی ١٩٦٩

پاشکۆی کوردی «النور» بو و تەنها دو ژمارەی لێ دەرچو ( ژمارە دوی : تەشرینی یەکەمی هەمان ساڵ) • خاوەنی : حیلمی عەلی شەریف ، سەرنوسەری : پارێزەر عومەر مستەفا • بە شێوەی گۆڤار و بە زنجیرەی ژمارەی رۆژنامەکە دەرچو •

« هاوکاری »
بەغدا
ژمارە یەکی : ٩ی کانونی دوومی ١٩٧٠

لای راستی ناوەکەیەوە نوسراوە : «رۆژنامەیەکی هەفتانەی گشتی‌یە ئە دەزگای هاوکاری چاپ و بلاوکردنەوەی کوردی دەردەچێ» • ( ٥٦ × ٤٢ سم)ە • سەرەتا «دار الجماهير» دەری‌دەکرد • تا ئیستەش بلاودەبێتەوە •

« ژین »
سلێمانی
ژمارە یەکی : ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠

لەسەری نوسراوە : «خاوەنی ئیمتیاز : حەمە ئەمین قادر (کاکەی فەلاح)،

سەرەك نوسین : عەبدولقادر بەرزنجی» • لـەگەڵ «ژین»ەكەی پیرەمێـرد جیاوازی‌یەكی ئەوتۆی نی‌یە • (٤٢ × ٢٨ سم )ە • •

« كوردستان »
؟
ژمارە یەكی : ڕێبەندانی ١٣٤٩ ، ژانویەی ١٩٧١

لە ژێرەوەی ناوی ڕۆژنامەكەدا نوسراوە : «ئۆرگانی ناوەندی حیزبی دیموكراتی كوردستان»ە ( ٤٢ × ٣٠ سم )ە • •

« ڕێگای یەكێتی »
؟
ژمارە یەكی : نیسانی ١٩٧١

لەسەر دوا لاپەڕەی ژمارە دەی ساڵی یەكەمی (ژانیومری ١٩٧٢) ئەم ئاگاداری‌یە بلاوكراوەتەوە : « ئاگاداری : ڕۆژنامەی ڕێگای یەكێتی بە زوبان بلاو ئەبێتەوە : فارسی و توركی ــ ئازەربایجـانی و كوردی » • لـە ژمارە یازدەیەوە ( شوباتی ١٩٧٢) لە ژێرەوەی ناوی ڕۆژنامەكەدا نوسراوە «یەكیەتی ــ تێكۆشان ــ سەركەوتن • ڕۆژنامەیەكی مانگانەیە» • لە ژمارە ٢٠یەوە (كانونی یەكەمی ١٩٧٢) لای ڕاستی ناوی ڕۆژنامەكەوە نوسراوە « ڕێگای یەكێتی بە زوبانی میللەتە مەزنەكانی ئێران دەردەچێت كە كورد و فارس و توركی ئێرانی و عەرەب و بلوجن» • دوا ژمارەی كە من دیومـە ژمارە سێ‌یەكە كە «ساڵی سێیەم ، ئابـانی ١٩٧٣»ی لەسـەر نوسراوە • ( ٤١ × ٢٩ سم )ە • •

« دەنگی فەلاح »
ــ « صوت الفلاح »
بەغدا
ژمارە یەكی : ١٠ی مایسی ١٩٧١

بەشێكە لە ڕۆژنامەی «صوت الفلاح» كە «یەكیەتی گشتی جوتیارانی

عی ق‌ دەری‌دەکات • ئـەم بەشـە کوردی‌یـەی لە ژمـارە ۱۲۱یەوە
ـستی‌پێ‌کرد •

**« برایەتی »**
**سلێمانی**
**ژمارە یەکی : ۱۱ ئەیلولی ۱۹۷۱**

پاشکۆی «التآخی» بو • سەرنوسەری : دارا توفیق • رەمزی قەزاز
سەرپەرشتی دەکرد • تا وەستانی (۱۸ی مارتی ۱۹۷۲) ۱۷ ژمارەی لێ‌دەرچو •

**« برایەتی »**
**بەغدا**
**ژمارە یەکی : ۲٦ی مایسی ۱۹۷۲**

پاشکۆیەکی‌تری رۆژنامەی «التآخی»یە •

**« بیری نوێ »**
**بەغدا**
**ژمارە یەکی : ۱۷ی حوزەیرانی ۱۹۷۲**

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : «خاوەنی ئیمتیاز فەخری کەریم زەنگەنە ،
سەرنوسەر و لێپرسراو : دە حسەین قاسم عەزیز» • ئۆرگانی ئاشـکرای
پارتی کۆمۆنیستی عیراقە • سەرەتا بارستی (۵۷ × ۳۳ سم) بو ، لە ژمارە
۸۰یەوە بووە (٤٦ × ۳۲ سم) و لە ژمارە ۱۲۷یەوە بووە (٤۲ × ۳۰ سـم ) و
ئینجا (٤٥×٥۸ سم) و ئیستـەش (٤۱×۲۹ سـم)ە • پاشـکۆی عەرەبێ
رۆژنامەی هەفتەیی (الفکر الجدید)ە •

**« برایەتی »**
**بەغدا**
**ژمارە سفری : سێ‌شەممەوی ۱ی کانونی دووەمی ۱۹۷٤**

خاوەن ئیمتیاز : حەبیب محەمەد کەریم • سەرنوسەر : دارا تۆفیق •
ژمارە یەکی ۱۰ لاپەڕەیە • (٤۱×۲۹ سم)ە •

« برایەتی »
بەغدا
ژمارە یەکی : پێنج شەممەی ١٥ی مایسی ١٩٧٥ (٢٦٧٥ی کوردی)

خاوەنی ئیمتیاز عەزیز عەقراوی • لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە «پاشکۆی ڕۆژنامەی التاخییە بە زمانی کوردی » ، ٨ لاپەڕەیە • چەند ژمـــارەیەکی لێدەرچو و وەستا • (٤٠×٢٨ سم)ە •

★ ★ ★

# پاشکۆی دووەم

## ناو و شوێن و کاتی دەرچوونی گۆڤارە کوردی‌یەکان

**« رۆژی کورد »**
**ـ « هەتاوی کورد »**
**ئەستەمۆل**
**هاوینی ۱۹۱۳**

ئۆرگانی کۆمەڵەی «هیڤی کورد» بو ٠ ژمارە ۳ی یەکی ئاب و ژمارە ٤ی ۳۰ی ئابی ۱۳۲۹ ، واتە ۱۹۱۳ دەرچون ٠ بە کوردی و تورکی بڵاو دەبۆوە ٠ دوایی ناوی گۆڕڕا بە «هەتاوی کورد» و ئەویش چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچو و بەهۆی دەست‌پێ‌کردنی شەڕەوە داخرا ٠

**« یەک بوون »**
**ئەستەمۆل**
**نیوەی دووەمی ساڵی ۱۹۱۳**

ژمارە ۲ی رۆژی ۱۹ی ئەیلول و ژمارە ۳ی رۆژی ۳۰ ئەیلولی ۱۳۲۹ (۱۹۱۳) دەرچون ٠ بە کوردی و تورکی بڵاو دەبۆوە ٠ چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچو ٠ دوور نی‌یە بەهۆی دەست‌پێ‌کردنی شەڕی یەکەمەوە داخرابێ ٠

**« بانگی کورد »**
**بەغدا**
**ژمارە یەکی : ۱۲ی «ربیع الاول»ی ۱۳۳۲ ، ۸ی شوباتی ۱۹۱٤**

جەمالەددین بابان بە کوردی و تورکی بڵاوی دەکردەوە ٠ چەند

ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچو • لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی یەکەم •
دەرچون وەستا •

« کوردستان » (*)
سابلاغ (مەهاباد) یان ورمێ (رەزائیە)
ژمارە یەکی : نیسانی ١٩١٤

میسیانێرە پرۆتستانتی‌یەکان دەریاندەکرد • مینۆرسکی کە ژمارە یەکی ئەم گۆڤارەی هەبو دەڵێت لە سابلاغ چاپدەکرا ، بەڵام گومان دەکرێ ئەوسا مەهاباد چاپخانەی خۆی هەبوبێ • جگە لەوە مەڵبەندی چالاکی زوربەی میسیانێرەکانی ئەو ناوچەیە ورمێ بو کە هەر لە زوەوە چاپخانەی خۆی هەبو • وا دیارە چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچووە •

« کوردستان » (*)
حەلەب
ژمارە یەکی : سالی ١٩١٥ (؟)(٩)

« ژین »
ئەستەمۆڵ
ژمارە یەکی : یەکسەر دوای شەڕی یەکەم (١٠)

ژمارە ٦ی ڕۆژی ٢٥ی کانونی یەکەمی ١٣٣٤ی لەسەر نوسراوە کە دەکاتە ٢٥ی کانونی یەکەمی ١٩١٨ • بەو ژمارانەدا کە من دیومن وا دەردەکەوێ مانگی ٣ تا ٤ ژمارەی لێ دەردەچو و هەر ژمارەیەی ١٥ تا ٢٠ لاپەڕە دەبو • بەکوردی و تورکی چاپ دەکرا • خاوەن ئیمتیاز و لێپرسراوی ئەشرەف حەمزە و دوای ئەو مەمدوح سەلیم بو • گۆڤارێکی دەوڵەمەندە •

(٩) دەربارەی بڕوانە : محەمەدی مەلا کەریم ، سەرچاوەی ناوبراو .
(١٠) دوور نی‌یە ژمارە یەکی تەشرینی یەکەم یا دووەمی ١٩١٨ دەرچوبێ .

### « کوردستان »
### ئەستەمۆڵ
### ژمارە یەکی : ٣٠ی کانونی دووەمی ١٣٣٥ (١٩١٩)

ژمارە یەکی ٢٨ی «ربیع الاخر»ی ١٣٣٧یشی لەسەر نوسراوە ٠ سەید حەیبن ناو بەرپرسیاری بو ٠ لە چاپخانەی «نجم استقبال» چاپ دەکرا ٠ بە بەرست گەورەیە (١٩×٢٧ سم) ٠ لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا بە تورکی نوسراوە کە «تەنها سیاسەت ئەبێ ئیتر گشت باسێك بەهەر زمانێك بێ حەفتەی جارێك بلاوی دەکاتەوە» ٠ بەلام بەو ژمارانەیدا کە من دیومن وا دیارە هەر دوو حەفتە جارێك ژمارەیەکی لێ دەردەچو ٠ بە پێنج زمان : کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی و فەرەنسی وتاری بلاودەکردەوە ٠ دوا ژمارەی کە من دیومە ژمارە ١٩ی سالی دووەمی لەسەر نوسراوە کە رۆژی ٢٩ی مارتی ١٣٣٦ (١٩٢٠) ، ٧ی رەجەبی ١٣٣٨ی لەسەر نوسراوە ٠ ئەو ١٩ ژمارەیە بەسەر یەکەوە ٢٥٦ لاپەڕەن ٠ گۆڤارێکی رێکوپێکە و گەلێك ژمارەی بە وێنەی ناودارانی کورد رازێنراوەتەوە ٠ زۆر جار گۆڤاری «ژین» لە دوا لاپەڕەیدا هەوالی دەرچون و ناوەرۆکی ئەم گۆڤارەی رادەگەیاند ٠

### « دیاری کوردستان »
### بەغدا
### ژمارە یەکی : ١١ی مارتی ١٩٢٥

صالح زەکی صاحێبقڕان بە کوردی و عەرەبی و تورکی دەری‌دەکرد ٠ تا وەستانی (مایسی ١٩٢٦) تەنها ١٦ ژمارەی لێ دەرچو ٠ دوا ژمارەی کە من دیومە سیازدەو چواردەیە کە بەسەر یەکەوە ٤٠ لاپەڕەیە ٠ زوربەی ژمارەکانی‌تری ٢٤ لاپەڕەن ٠ گۆڤارێکی دەولەمەندە ٠ لە بەغدا بە ٣ و لە دەرەوەی بە ٤ عانە بو ٠ (١٦×٢٢ سم)ە ٠

## « زاری کرمانجی »
## رەواندز
### ژمارە یەکی : ١٢ی «ذو القعدە»ی ١٣٤٤ ، ٢٥ی مایسی ١٩٢٦

لە رەواندز لە «چاپخانەی زاری کرمانجی» چاپ دەکرا • لەم لاو حەی لای ناوەکەیەوە نوسراوە : « خاوەن و مدیر سید حســین موکریــانی» . «مدیری ادارە عبدالرحمن» • لە ژێری‌یەوە نوسراوە : «گۆڤارێکی اجتماعی تاریخی فنی ادبی مانگی‌یە» • زوربەی ژمارە زووەکانی ٢٠ تا ٢٤ لاپەڕەن و ئەوانی تر ١٢ تا ١٦ لاپەڕەن (٢٨×٢٠ سم)ە • تا ژمارە ٢٢ی ئەم گۆڤارە دیوە کە ٣٠ی نیسانی ١٩٣٠ دەرچووە و ١٦ لاپەڕەیە • بــەپێی وتــارێکی «هەتاو» ئەم گۆڤارە تا ساڵی ١٩٣٢ ژیاوە و ٢٤ ژمارەی لێ دەرچووە [١١] .

وتارەکانی ئەو ٢٢ ژمارەیەی من دیومن هەمەجۆرن (مێژوو ، ئەدەب . پەخشان ، دەنگوباس ••• هتد) و ناوی کەسیان بەسەرەوە نی‌یە یەك دوو جار نەبێ کە ناوی (خدۆك) و (داماو) هاتووە • (داماو) نازنــاوی موکریــانی خۆیەتی •

## « پەیژە »
## بەغدا
### ژمارە یەکی : ١٩٢٧

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : «ئەدەبی ، ئیجتیمــاعی‌یە بەکوردی بــۆ کوردایەتی ئەدوێ • دانەری مستەفا شەوقی» • نــاوەرۆکی بریتی‌یــە لــە ژمارەیەك وتار و شیعر کە لەوە دەچێ هەموی مستەفا شەوقی خۆی نوسیبێ• کوردی‌یەکەی ریکوپێك و رەوانە • هەر ئەو ژمارەیەی لێ دەرچو • زیاتر لەو نامانە دەکات کە دەستەی «الاهالی» دەریان دەکرد [١٢] • ئەو ژمارەیەی

---

(١١) بڕوانە : «هەتاو» ، ژمارە ١٨٦ ، ئەیلولی ١٩٦٠ ، ل ٧ .

(١٢) لەم لیستەیەدا ناوی چەند بەرهەمێکی‌تری لەم بابەتە هــاتووە کە لــە راستیدا کۆمەڵە بەرهەمن و لە شێوەی گۆڤاردا بڵاوکراونەتەوە .

«پەڕە» ٤٤ لاپەڕەیە ، بەڵام بە بارست پـچوکترین گۆڤـاری کوردی یـە (١٨ × ١٢ سم) •

« هـاوار »
شـام
ژمارە یەکی : ١٥ی مایسی ١٩٣٢

جەلادەت بەدرخان بڵاوی‌دەکردەوە • سـالی یەکەم ٢٠ ژمـارەی لێ دەرچو ، ئەو ژمارانە لەگەڵ ٣ ژمارەی سالی دووەمی بە پیتی هیجا و لاتینی چاپ‌کراون ، لە ژمارە ٢٤یەوە (١ی نیسانی ١٩٣٤) هەموی تەنها لاتینی‌یە • تا ئیستە بەتەمەنترین گۆڤاری کوردی‌یە : یازدە ساڵ ژیا و تا ١٥ی ئـابی ١٩٤٣ (٥٧) ژمارەی لێ‌دەرچو کە بەسەر یەکەوە ٨٠٨ لاپەڕەن • یەکێکە لە گۆڤارە کوردی‌یە دەولەمەندەکان • نوسـەرانی کوردی عـیراق گەلێـك بەرهەمی نایابیان تێدا بڵاوکردۆتەوە ، تایبەت لە ٢٣ ژمارەی یەکەمیـدا • (٢٨ × ٢٠ سم)ە •

« رونـاکی »
( ROONAKI )
هەولێر
ژمارە یەکی : ٢٤ی تەشرینی یەکەمی ١٩٣٥

خاوەن و بەرپرسیاری : پارێزەر شیت مستـەفا • لەژێر نـاوەکەیدا نوسراوە : «گۆوارێکی هەفتەیی ، علمی ، اجتمـاعی ، ادبی کوردی‌یە» • لەسەر بەرگی پشتەوەی نوسراوە : «روناکی بە دڵێکی بـاش بۆ یەکیـەتی عیراقی دەکۆشێ ، روناکی ئەدەبیات و زانستی کورد کۆدەکاتەوە ، روناکی بیرەوەری بۆ کورد دەکات ، روناکی رەوشت و خوی کورد تازە دەکاتەوە ، روناکی ناوی ناودارانی کورد بەخێو دەکا ، روناکی گۆوارێکە لە ژمارەکانیدا دیوانی ئیستا و رابوردو و فەرهەنگ و شێوەی کورد و زانستی اجتماعیات نەشر دەکا» • ١٦ لاپەڕەیە (٢٨×٢٠ سم)ە • بەشێکی زۆر لە وتارەکانی

حسەین حوزنی موکریانی نوسیونی • دڵدار ، ڕاست ، مەحمود فەهمی • س• ناکام ، ڕەشۆ ، وریا ، محەمەد عەلی کوردی ، هیجری دەدە ، یونس مستەفا ، هەوری و بێخود لە نوسەرانینی • ژمارەیەك قوتابی تازەپێگەیشتو بەرهەمیان تێدا بڵاوکردۆتەوە • ژمارە یەك و دۆی لە مۆسڵ لە چاپخانەی «الموصل الحديثة» چاپکراوە ، لە ژمارە سێیەوە لە ڕەواندز لە «چاپخانەی زاری کرمانجی» چاپکراوە • هەمۆی بەسەر یەکەوە ١١ ژمارەی لێ دەرچو • دوا ژمارەی : ١٦ی مایسی ١٩٣٦ •

**« زانستی »**
**سلێمانی**
**ژمارە یەکی : ٢٥ی شوباتی ١٩٣٨**

مامۆستا صالح قەفتان سەرپەرشتی دەرکردنی دەکرد • هەر ئەو سەردەمە کۆمەڵ و قوتابخانەی «زانستی» لە سلێمانی هەبو • زۆر نەژیا •

**« گەلاوێژ »**
**بەغـدا**
**ژمارە یەکی : کانونی یەکەمی ١٩٣٩**

خاوەن و بەرپرسیاری مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و سەرنوسەری مامۆستا عەلائەددین سەجادی بۆ • دوای «هاوار» بەتەمەنترین گۆڤاری کوردی‌یە : دەوروبەری ١٠ ساڵ ژیا • دوا ژمارەی ئابی ١٩٤٩ دەرچۆ ، دوای ئەوە داخرا • یەکێکە لە گۆڤارە بەرزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی سەردەمی خۆی • (٢١ × ١٤ سم)ە •

**« ڕوناهی »**
**( RONAHI )**
**شـام**
**ژمارە یەکی : ١ی نیسانی ١٩٤٢**

جەلادەت بەدرخان بە ئەلفبای لاتینی دەری‌دەکرد • گۆڤارێکی مانگانە

و • بەشی زۆری ناوەرۆکی بۆ هەواڵەکانی شەڕ تەرخان کراوە • لە هەمو
ڕۆژنامە و گۆڤارێکی کوردی زیاتر وێنەی تێدا بڵاوکراوەتەوە کە ئەوانیش
یەن روداوەکانی شەڕ نیشان دەدەن • لە زۆر رووەوە «رونـاهی» لـە
«دەنگی گیتی تازە» دەکات • لەگەڵ تەواوبونی شەڕ ئەمیش وەستا • تـا
ـرتی ١٩٤٥ (٢٨) ژمارەی لێدەرچو کە بەسـەر یەکەوە ٥٨٤ لاپـەڕەن •
٢٠×٢٨ سم)ە •

## « نیشتمـان »
## تەورێز
## نـاوەندی ساڵی ١٩٤٣

ئۆرگانی کۆمەڵەی «ژ•ك•» بو • لە تەورێز بە دزی‌یەوە لە چاپخانەی
کاپرایەکی ئەرمەنی چاپدەکرا • ژمارە ٧ و ٨ و ٩ی بەسەر یەکەوە دەرچون و
خەکەلێوە و بانەمەڕ و جۆزەردانی ١٣٢٣یان لەسـەر نوسراوە کە دەکەنـە
مارت و نیسان و مایسی ساڵی ١٩٤٤ • ئەو سێ ژمارەیە بەسەر یەکەوە ٣٢
لاپەڕەن و ٢٠ باسی هەمەجۆریان تێدایە • بارستی (١٧×٢٢ سم)ە • دوای
روخانی کۆماری مەهاباد مامۆستا زەبیحی بە نهێنی ساڵی١٩٤٨ ژمارەیەکی تری
«نیشتمان»ی لە عیراق دەرکرد کە وەك خۆی دەڵێت ٢٤ لاپەڕە بو •

## « دەنگی گیتی تازە »
## بەغـدا
## ١٩٤٣

سەرەتا (لە نیسانی١٩٤٣وە) وەك پەخشە دەردەچو ، لە تەشرینی یەکەمی
هەمان ساڵەوە بووە گۆڤار • تا ساڵی ١٩٤٧ ژیا • لەگەڵ ئەوەش کە ئینگلیز
بۆ کاری پرۆپاگەندەی خۆیان لە سـاڵەکانی شـەڕی دووەمی جیهـاندا
دەریاندەکرد بەڵام پڕە لە وتار و بەرهەمی ئەدەبی و زانستی بایەخدار • لـە
ژێر ناوی گۆڤارەکەدا نـوسراوە : «ئەدەبی ، خوێنـەواری ، زمـانی ،
اجتماعی ، پەیامی ، هەفتەیی ــ کوردی‌یە» • (٢٨×٢٣ سم)ە •

**« رۆژا نو »**
**( ROJA NO )**
**بێروت**
**ژمارە یەکی : مایسی ١٩٤٣**

بە پیتی لاتینی و شێوەی کرمانجیی ژورو دە کامەران عالی بەدرخان بلاوی‌دەکردەوە و جەلادەت بەدرخانی برای یاریدەی دەدا ٠ بەشی زۆری ناوەرۆکی بۆ باسی رووداوەکانی شەڕی دووەم تەرخان کراوە ٠ وێنەی زۆری تێدایە ٠ چەند سالێکی کەم ژیا (تا دەوروبەری کۆتایی شەڕی دووەم) ٠

**« ستێر »**
**( STER )**
**شـــام**
**ژمارە یەکی ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣**

بە پیتی لاتینی و شێوەی کرمانجیی ژورو دە کامەران عالی بەدرخان بلاوی دەکردەوە ، جەلادەت بەدرخانی برای یاریدەی دەدا ٠ بەشی زۆری ناوەرۆکی بۆ باسی رووداوەکانی شەڕی دووەم تەرخان کراوە ٠ جاروبار بە فەرەنسیش نوسینی بلاودەکردەوە ٠ تا دەوروبەری کۆتایی شەڕی دووەم ژیا ٠

**« هاوار »**
**ـ « هاواری کورد »**
**مەهاباد**
**ژمارە یەکی : رەزبەری سالی ١٣٢٤ ، ئەیلول ـ تەشرینی یەکەمی ١٩٤٥**

لەسەر بەرگی یەکەمی تەنها «هاوار» و لەسەر بەرگی دووەمی «هاواری کورد» نوسراوە ٠ ژمارە یەکی ٣٠ لاپەڕەیە ٠ (٢٠ × ١٤ سم)ە ٠

**« کوردستان »**
**مەهاباد**
**ژمارە یەکی : ١٥ی سەرماوەزی ١٣٢٤ ، ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥**

بلاوکەرەوەی بیری پارتی دیموکراتی کوردستان بو ٠ تا کۆتایی سالی

۱۹۰۰ چەند ژمارەیەکی لێ دەرچو • ژمارە یەك و دوّی هەر یەکەیان ۲۰ لاپەڕەیە • ژمارە سێ و چواری هەر یەکەیان ۳۸ لاپەڕەیە • ژمارە ٦ و ٧ی پێکەوە دەرچون و بەسەر یەکەوە ٦٠ لاپەڕەن • (٥ر۲۱×۱٤ سم)ە •

**« ئاوات »(*)**
**مەهاباد**
**سالی ۱۹٤٥**

گۆڤارێکی وێژەیی ــ زانستی ــ کۆمەڵایەتی بو • تەنها ۳ (؟) ژمارەی لێ دەرچو •

**« هەڵاڵە »**
**بۆکان**
**ژمارە یەکی : رەشەمێی ۱۳۲٤ ، سەرەتای مارتی ۱۹٤٦**

ژمارە یەکی ۳۰ لاپەڕەیە • لەسەر دوا لاپەڕەی و لە چوارچێوەیەکی تایبەتیدا دیسان ناوی گۆڤارەکە چاپکراوە و لە لای سەرەوەی نوسراوە :

با بەرێ بۆنی «هەڵاڵە» و بەیون
ئابڕوی عەتری گوڵی کاشانی

چەند ژمارەیەکی کەمی لێدەرچو • (۲۳×۱٥ سم)ە •

**« هاواری نیشتمان »**
**مەهاباد**
**ژمارە یەکی : ای خاکەلێوەی ۱۳۲٥ ، ۲۱ی مارتی ۱۹٤٦**

لەسەرەوەی لاپەڕە یەکییەوە نوسراوە : «بڵاوکەرەوەی بیری یەکیەتی جەوانانی دیموکرات » • ژمارە یەکی ٤٠ لاپەڕەیە • (۲۲×٥ر۱٤ سم)ە •

**« گڕوگاڵی منداڵانی کورد »**
**مەهاباد**
**بەهاری ۱۹٤٦**

ژمارە ۲ی یەکی جۆزەردان و ژمارە ۳ی یەکی پوشپەڕی ۱۳۲٥ ، ۲۱ی

مایس و ۲۱ی حوزەیرانی ۱۹٤٦ دەرچون • قادری مودەریسی سەرپەرشتی بلاوکردنەوەی دەکرد • وا دیارە تەنها ئەو سێ ژمـارەیەی لێ دەرچووە • (٥ر۲۲×۱٥ سم)ە •

« ئاگا و روداوی هەفتەیێ »
بەغـدا
ژمـارە یەکی : ۱۹٤٦ ( ؟ )

لە ژێر ناوەکەیـدا نوسراوە : « لە لایـەن کاروبـاری ئـالوگۆڕی خوێندەواریێ ئەمەریکا لە بەغدا دەرئەهێنرێ » • پتر لە ۲۰۰ ژمـارەی لێ دەرچو • دوا ژمارەی کە من دیومە ژمارە ۱۹۳یە و ۸ی حوزەیرانی ۱۹٥۳ دەرچووە ، ۲۰ لاپەڕەیە • (۲۱×۱٦ سم)ە •

« نزار »
بەغـدا
ژمارە یەکی : ۳۰ی مارتی ۱۹٤۸ •

مامۆستا عەلائەددین سەجادی بە کوردی و عەرەبی بلاوی‌دەکردەوە • تا داخستنی (١٥ی شوباتی ۱۹٤۹) ۲۲ ژمارەی لێ‌دەرچو •

« ئیرە بەغدایە »
بەغـدا
ژمارە یەکی : سالی ۱۹٥۰ ( ؟ )

مانگی جارێك کارگێڕیێ گشتیێ ئاراستە و ئیزگە (مديرية التوجيه والاذاعه العامه) بە عەرەبی و کوردی بلاوی‌دەکردەوە ، تا شۆڕشی گەلاوێژی سالی ۱۹٥۸ ژیا •

« خۆرنشین »(*)
مەهاباد
۱۹٥۱

بە کوردی و فارسی دەردەچو • دەوروبەری سالێك ژیاوە •

### « پەیام »
### بەغدا
### ژمارە یەکی : ۱۹۵۲

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە : «گۆڤارێکی خوێندەواریی هەفتەیی‌یە لە لایەن کاروباری ئالوگۆڕی خوێندەواریی ئەمەریکاوە دەرئەهێنرێ» • پتر لە ۲۰۰ ژمارەی لێ‌دەرچو • دوا ژمارەی کە من دیومە ۱۲ی نیســانی ۱۹۵٤ دەرچووە • (۲۱×۱۵ سم)ە •

### « راویژ »(*)
### ئێران
### ۱۹۵۲ (۱۳)

### « هەتاو »
### هەولێر
### ژمارە یەکی : شەممەی ۱٥ی گولان (مایس)ی ۱۹۵٤

لە ژێر ناوی ژمارە یەکیدا نوسراوە :«گۆڤــارێکی کوردی وێــژەیی (ادبی)یە ، جارێ هەر لە پازدە رۆژاندا جارێکی پەخش دەکرێت» • خاوەن و سەرپەرشتی‌کەری مامۆستا گیو موکریانی بو • پارێزەران ئیبراهیم عەزیــز دزەیی و محەمەد شەهاب دەباغ ناویان لە دەرکردنی «هەتاو»دا هــاتووە • ژمارەیەك نوسەری کوردی ناوداری دەرەوەی عــیراق بەرهەمیــان تێــدا بڵاوکردۆتەوە • تا وەستانی (تەشرینی دووەمی ۱۹٦۰) ۱۸۸ ژمارەی لــێ دەرچو • (۲۰×۱۳٫٥ سم)ە •

### « هیــوا »
### بەغــدا
### ژمارە یەکی : تەموزی ۱۹۵۷

لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا نوسراوە : «گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی‌یــە

(۱۳) لەوە دەچێت ئەم جۆرە گۆڤارانەی ئێران بەنهێنی دەرچوبن .

مانگی جارێك دەرئەچێ» • خاوەنی ئیمتیازی یانەی سەرکەوتن و ، موديری مەسئوڵی تا ژمارە (٨)ی ساڵی (٢)ی حافز مستەفا قازی و پاشان دوکتۆر هاشم دۆغرمەچی بۆ • زوربەی ژمارەکانی لە ٨٠ لاپەڕە زیاترن • شوباتی ١٩٦٣ داخرا • ( ٢١ × ١٤ سم )ە •

**« شەفەق »**
**ــ « بەیان »**
**کەرکوك**
**ژمارە یەکی : ١٥ی کانونی دووەمی ١٩٥٨**

خاوەن و سەرنوسەری : عەبدولقادر بەرزنجی • بە کوردی و عەرەبی دەردەچو • لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٩دا گوێزرایەوە بۆ سلێمانی و ناوی بووە «بەیان» و مامۆستا گۆران سەرپەرشتی دەکرد • بووە ئۆرگانی ئاشتیخوازان • پاش ماوەیەك دیسان گواسترایەوە کەرکوك و ناوەکەی جارانی وەرگرتەوە • سەرەتای ساڵی ١٩٦٣ داخرا •

**« پێشکەوتن »**
**ــ « التقدم »**
**بەغدا**
**ژمارە یەکی : ٢٨ی شوباتی ١٩٥٨**

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە «گۆوارێکی هەفتەیی گشتییە ــ مجلة اسبوعية عامة باللغتين الكردية والعربية » • دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ و لە ژمارە ٦٥یەوە بووە ڕۆژنامە • شوباتی ١٩٦٣ داخرا • (٤٢×٢٩ سم)ە • بڕوانە : «پێشکەوتن» لە پاشکۆی ناوی ڕۆژنامەکاندا •

**« کوردستان »**
**ــ (( KURDISTAN ))**
**ساندرلاند**
**( ئینگیلتەرە )**
**ژمارە یەکی : مارتی ١٩٥٨**

ناو بە ناو بە چەند زمانێك «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا»

ڵاوی دەکردەوە . ژمارە ٢ و ٣ی لە پۆرتسمۆث و ژمارە ٤ی لە لەندەن چاپکراون . ژمارەیەکی تایبەتی بە زمانی عەرەبی بە بۆنەی بەستنی «کۆنگرەی خوێندکارانی عەرەب»ەوە لە ئەوروپا بڵاوکردۆتەوە . هەر لەو ژمارەیەدا نامەیەکی سەرۆك عەبدولناصر بڵاوکراوەتەوە کە بۆ دارا تۆفیقی ناردووە . عومەر رەمزی مەلا مارف و صەلاح سەعدوللا و فوئادی صالحی رەشە و زاهیر حسەین و کەمال فوئاد دەوری چالاکیان لە دەرکردنیدا بینیوە . گۆڤارێکی پڕ لە بەڵگە و دەوڵەمەندە . بارستی زوربەی ژمارەکانی ( ٢٦ × ٢٠ سم )ە .

**« نیشتمان »**

**سلێمانی**

**ژمارە یەکی : مارتی ١٩٥٩**

دەستەیەك مامۆستا و قوتابی «دار المعلمین»ی سلێمانی دەریاندەکرد و تەنها ئەو ژمارەیەی لێ بڵاوبۆوە .

**« رزگاری »**

**بغدا**

**ژمارە یەکی : نیسانی ١٩٥٩**

ئۆرگانی ئاشکرای «پارتی دیموکراتی کوردستان» بو . تەنها دوو ژمارەی لێدەرچو . سەرنوسەری : صالح حەیدەری بو .

**« نەورۆز »**

**سلێمانی**

**ژمارە یەکی : نیسانی ١٩٥٩**

پارێزەر کەمالی میرزا کەریم دەری‌دەکرد ، سێ مانگ لەسەر یەك دەرچو و ئیتر وەستا .

الدكتور كمال مظهر احمد ، اول مدرسة كردية في ايران ، ـ «التآخي» (صفحة «الثقافة الكردية») ـ ٨ ـ ) ، ٢٠ تشرين الثاني ١٩٧٣ .
الدكتور كمال مظهر احمد ، جمعية هاوار ومجلة پشكو ، ـ «التآخي» ( صفحة «الثقافة الكردية») ، العدد ـ ١٧) ، ـ «التآخي» ، ١١ شباط ١٩٧٤ .
الدكتور كمال مظهر احمد ، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى ، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ، بغداد ، ١٩٧٧ .
كوركيس عواد ، الاب انستاس ماري الكرملي . حياته ومؤلفاته (١٨٦٦ـ١٩٤٧)، بغداد ، ١٩٦٦ .
كوركيس عواد ، المخطوطات التاريخية في مكتبة المتحف العراقي ، بغداد ، ١٩٥٧ .
محمد امين زكي ، تاريخ السليمانية وانحائها ، نقله الى اللغة العربية الملا جميل الملا احمد الروزبياني ، بغداد ، ١٩٥١ .
محمد امين زكي ، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان ، ترجمة محمد علي عوني ، القاهرة ، ١٩٣٦ .
محمد امين زكي ، مشاهير الكرد وكردستان في العهد الاسلامي ، الجزء الثاني ، بغداد ، ١٩٤٧ .
محمد القزلجي ، التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها ، بغداد ، ١٣٥٦ هـ ( ١٩٣٨ م ) .
محمد الملا عبدالكريم ، الصحافة الكردية درب شائك ومسيرة مجيدة ، ـ «التآخي» ، بغداد ، ١٥ حزيران ١٩٧٠ .
الدكتور محمد نجيب ابو الليل ، الصحافة الفرنسية في مصر منذ نشاتها حتى نهاية الثورة العرابية ، القاهرة ، ١٩٥٣ .
محمد نصر ، صحافة الملايين ، القاهرة ، ١٩٦٥ .
الدكتور محمود نجيب ابو الليل ، الصحافة الفرنسية في مصر .
منصور شليطا ويوسف ملك ، ذكرى الامير جلادت بدرخان (١٨٩٧ ـ ١٩٥١) ، بيروت ، بلا .
«موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي السري» ، الجزء الاول ، بغداد ، ١٩٤٩ .
مينورسكي ، فلاديمير ، الاكراد احفاد الميديين ، ترجمة وتعليق الدكتور كمال مظهر احمد ، ـ «مجلة المجمع العلمي الكردي» ، المجلد الاول ، العدد الاول ، ١٩٧٣ .
مينورسكي ف. ف. ، الاكراد . ملاحظات وانطباعات ، ترجمة الدكتور معروف خزندار ، بغداد ، ١٩٦٨ .
« نقابة الصحفيين في القطر العراقي في عامي ١٩٧١ـ١٩٧٢» ، بغداد ، ١٩٧٣.

هشام توفيق بحري ، صحافة الغد ، القاهرة ١٩٦٨ .
يعكوب يوسف كوريا ، حكايات عن الصحافة في العراق ، بغداد ، ١٩٦٩ .

## سەرچاوە بە زمانی ئینگلیزی

Berry Th. E., Journalism to day. Its Development and Practical Applications, Second Printing, New York, 1958.

Cox L, The Struggle in Iraq, — (( World News )), Vol. I, No. 19, May 8, 1954 .

David Lloyd George, The truth about Peace Treaties, Vol. II, London, 1938.

Eagleton W., The Kurdish Republic of 1946, London, 1963.

Edmonds C. J., A Kurdish Newspaper : (( Rozhi — Kurdistan )), — (( Journal of the Central Asian Society )), Vol. XII, Part I, 1925.

Edmonds C. J., Kurds, Turks and Arabs. Politics travel and research in North — Eastern Iraq, London, 1957.

Edmonds C. J., The Kurds of Iraq, — (( The Middle East Journal )), Vol. XI, No. 1, 1957.

Elwell L. P. — Sutton, The Press in Iran to — day, — ((Journal of the Royal Asian Society )), Vol. XXXV, July — October, 1948, Parts III and IV.

Ghassemlou A. R., Kurdistan and the Kurds, Prague, 1965.

Hamilton A. M., Road through Kurdistan. The Narrative of an Engineer in Iraq, London, 1937.

Hay W. R., Two Years in Kurdistan. Experiences of a Political Officer 1918 — 1920, London, 1921.

(( Journalism in Modern India )), Edited by R. W. Wolseley, Second Servised edition, London, 1964.

(( Journalism Tomorrow )), Edited by W. C. Clark, New York, 1958.

Main E., Iraq from Mandate to Independence, London, 1935.

Martin K., The Press the Public wants, London, 1947.

Natarjan S., A history of the Press in India, London, 1962.

Ramsaur E. E., The Young Turks. Prelude of the Revolution of 1908, Princeton — New Jersey, 1957.

Rucker F. W. and Williams A. L., Newspaper — Organization and Management, Third Reprinting, Iowa, U.S.A., 1961.

Safrastian A., Kurds and Kurdistan, London, 1948.

Sellery G., The Renaissance. Its Nature and Origins, Madison, 1962.

Soane E. B., To Mesopotamia and Kurdistan in disguise, London, 1926.

(( The Press in Authoritarian Countries )), Published by the International Press Institute, Zurich, 1959.

Upton J. M., The history of Modern Iran. An introduction, Fourth Printing, Massachusetts, 1968.

(( War memories of Lloyd George )), Vol. V, London, 1936 .

Williams F., Press, Parliament and People, London — Toronto, 1946.

Wilson A. T., Loyalities Mesopotamia 1914 — 1917. A Personal and Historical Record, London, 1930.

Wilson A. T., Mesopotamia 1917 — 1920. A Clash of loyalities, London, 1931.

## سەرچاوە بە زمانی روسی (*)

Алиев Г.З., Турция в период правления младотурок ( I908-I918 ), Москва, I972.

ئەلیێف گ. ز. ، تورکیا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی تورکانی لاودا (١٩٠٨ – ١٩١٨ ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ .

Богданов Н. и Вяземский Б., Справочник журналиста, Ленинград, I965, стр.652.

بەگدانۆف ن. و ڤیازیمسکی ب. ، رابەری رۆژنامەنوس ، لینینگراد ، ١٩٦٥ .

---

(*) جکە لەو سەرچاوە روسی‌یانەی ناویان لێرەدا تۆمار کراوە کەلکمان لە وتاری « رۆژنامەنوسی» ناو «ئەنسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤیێتی» (چاپی دووەم ، بەرگی ٣٤ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٥ ؛ چاپی سێیەم ، بەرگی ٢٠ ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ ) و «ئەنسکلۆپیدیای مێژوویی سۆڤیێتی» (بەرگی ١١ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ ) وەرگرتووە .

Вильчевский О., Библиографический обзор зарубежных курдских печатных изданий в XX столетии,-" Иранские Языки ", т.I, Москва, Ленинград, 1945,

ڤلچێڤسکێ و. ، سەرنجێکی بیبلیۆگرافی لە چـاپەمەنێ کوردێ لە دەرەوە (ی سۆڤیێت ـ ك. م.) لە سەدەی بیستدا ، ـ کتێبـی : « زمـانە ئێرانی‌یەکان » ، بەشی یەکەم ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، ١٩٤٥ .

Гази Р.Г., Курдистанская демократическая партия - организатор и руководитель национально-освободительного движения в Иранском Курдистане ( 1945-1946 гг. ), Автореферат дисс. на соискание уч. ст. канд. ист. наук, Баку, 1954.

ڤازێ ر. ح. ، پارتی دیموکراتی کوردستان ـ ڕێکخەر و ڕەهبەری بزووتنەوەی نەتەوەیێ ـ ڕزگاریخواز لە کوردستانی ئێران ( ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ ) ، باکو ، ١٩٥٤ .

Желтяков А.Д., Начальный этап книгопечатания в Турции,-" Ближний и Средний Восток. История, Культура, Источниковедение", Москва, 1968.

ژێلتیاکۆف ا. د. ، سەرەتای چاپکردنی کتێـب لە تورکیـا ، ـ کتێبـی « ڕۆژهـەلاتی نزیـك و ناوەڕاسـت . مێـژوو ، ڕوونـاکبیری ، کـاری بیبلیۆگرافی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ .

Иванов М.С., Очерк истории Ирана, Москва, 1952.

ئیڤانۆف م. س. ، کورتەی مێژووی ئێران ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ .

Ихсан Фуад, Творчество Хаджи Койи и его место в курдской литературе, Автореферат, Москва, 1966.

دوکتۆر ئیحسان فوئاد ، هونەرمەندیێ حاجێ قادری کۆیی و شوێنی لە ویژەی کوردیدا ، کورتەی نامەی دوکتۆراکەی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

Камаль М.А., К истории издания первой курдской газеты,-"Народы Азии и Африки", 1968, № 4.

کمال مەزهەر ئەحمەد ، دەربارەی مێژوی یەکەم رۆژنامەی کوردی ، ـ گۆڤاری
« گەلانی ئاسیا و ئەفەریقا » ، مۆسکۆ ، ژمارە ٤ ، ١٩٦٨ .

Камаль М.А., Национально-освободительное движение в Иракском Курдистане 1918-1932, Баку, 1967,

کمال مەزهەر ئەحمەد ، بزووتنەوەی نەتەوەیی ـ رزگاریخواز لە کوردستانی
عیراق سالانی ١٩١٨ ـ ١٩٣٢ ، باکو ، ١٩٦٧ .

Котлов Л.Н., Становление национально-освободитнльного движения на Арабском Востоке ( середина XIX в.-1908 г. ), Москва, 1975.

کاتلۆف ل. ن ، پەیدابونی بزووتنەوەی نەتەوەیی ـ رزگاریخواز لە رۆژهەلاتی
عەرەب ( ناوەندی سەدەی نۆزدە ـ سالی ١٩٠٨) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ .

Лазарев М.С., Курдистан и курдская проблема ( 90-е годы XIX века-1917 ), Москва, 1964.

لازاریڤ م. س. ، کوردستان و کێشەی کورد (نەوەدەکانی سەدەی نۆزدە ـ
١٩١٧) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ .

Лазарев М.С., Курдский вопрос ( 1891-1917 ), Москва, 1972.

لازاریڤ م. س. ، مەسەلەی کورد ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ .

Минорский В.Ф., Курды. Заметки и впечатления, Петроград, 1915.

مینۆرسکی ف. ف. ، کورد . تێبینی و سەرنج ، پێترۆگراد ، ١٩١٥ .

Новичев А.Д., Турция. Краткая история, Москва, 1965.

نۆڤیچێڤ ا. د. ، تورکیا ، کورتەی مێژوی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

"Печать зарубежных стран. Западная Европа, Америка, Австралия", Под редакцией Н.Г.Пальгунова и М.А.Харламова, Москва, 1962, стр. 322-323.

« چاپەمەنی وڵاتانی دەرەوە ـ ئەوروپای ڕۆژئاوا ، ئەمەریکا ، ئوستورالیا » ، لەژێر چاودێری ن. گ. پالگونۆڤا و م. ا. خارلامۆڤا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢.

"Роже - Курд",-"Восточный Сборник", СПб., Изд. Об-ва Русских Ориенталистов, 1913. кн. I.

«ڕۆژی کورد» ـ «کۆمەڵە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتی» ، پەتروسبورگ، بڵاوکراوەی ڕۆژهەڵاتناسانی ڕووس ، ١٩١٣ ، کتێبی یەکەم .

"Современная Турция", ( Справочник ), Москва, 1965.

« تورکیای ئێمڕۆ » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

Хазнадар М., Очерк истории современной курдской литературы, Москва, 1967.

مارف خەزنەدار ، کورتەی مێژۆی ئەدەبی کوردی هاوچەرخ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧.

سەرچاوە بە زمانی تر

(( Eski harfli Türçe süreli yayinlar toply Katalogu )), Ankara, 1963.

(( Kurdische Handschriften )), beschrieben Van Kamal Fuad.

(( La Question Kurde. Ses origines et ses causes )), Par le Docteur Bletch Chirguh, le Caire, 1930.

Nikitine B., Les Kurdes. Etude Sociologique et Historique, Paris, 1956.

Nikitine B., (( Ria Teze )), Journal Kurde d'Erevan, — (( Afrique et l'Asie )), Paris, No. 3, 1958.

Rondot R., Publication Kurde en caractéres latins (( Hawar, Komela Kurdi )) ((Revue Kurde . . .)), — (( Bulletin d,études Orientales)), T. II, 1932.

## رۆژنــامه و گۆڤــار (*)

« افاق عربية » ، بغداد ، العدد ٣ ، تشرين الثاني ١٩٧٦ .
« بانگی حەق » ، جاسەنە ، ژمارە ٣ ، ١٢ی نیسانی ١٣٣٩ (١٩٢٣) .
« بانگی کورد » ، بەغدا ، ١٩١٤ .
« بانگی کوردستان » ، سلێمانی ، ١٩٢٢ ــ ١٩٢٣ .
« پشکۆ » ، ژمارە ــ ١ ــ ، بەرگی ــ ٢ ــ ، ١٩٤٥ .
« پەیژە » ، بەغدا ، ١٩٢٧ .
« پێشکەوتن » ، سلێمانی ، ١٩٢٠ ــ ١٩٢٢ .
« تێگەیشتنی راستی » ، بەغدا ، ١٩١٨ ــ ١٩١٩ .
« خەباتی کوردستان » ، مایسی ١٩٥٧ .
« الدستور » ، بیروت ، العدد ٣٤٩ ، کانون الاول ١٩٧٦ .
« رزگاری » ، ژمارە ٢ ، سالی ٩ ، حوزەیرانی ١٩٥٥ .
« رۆژی کورد » ، ئەستەمۆل ، ١٩١٣ .
« رۆژی کوردستان » ، سلێمانی ، ١٩٢٢ ــ ١٩٢٣ .
« روناهی » ، شام ، ١٩٤٢ ــ ١٩٤٤ .
« زاری کرمانجی » ، رەواندز ، ١٩٢٦ .
« ژین » ، ئەستەمۆل ، ١٩١٩ .
« العرب » ، بغداد ، ١٩١٧ ــ ١٩١٩ .
« کوردستان » ، ئەستەمۆل ، ١٩١٩ .
« کوردستان » ( رۆژنامە ) ، مەهاباد ، ١٩٤٦ .
« کوردستان » ، قاهیرە ، جنێڤ ... هتد ، ١٨٩٨ ــ ١٩٠٢ .
« کوردستان » ( گۆڤار ) ، مەهاباد ، ١٩٤٥ ــ ١٩٤٦ .
« گڕوگالی منداڵانی کورد » ، مەهاباد ، ١٩٤٦ .
« گەلاوێژ » ، بەغدا ، ژمارە ٤ ، سالی ٦ ، نیسانی ١٩٤٥ .
« گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ .
« گۆڤاری گەلانی ئاسیا و ئەفەریقا » ، بەزمانی روسی ، مۆسکۆ ، ژمارە ٢ ، ١٩٦٢ .
« لغة العرب » ، بغداد ، الجزء الخامس من السنة الثالثة ، تشرین الثاني ١٩١٣ .
« نیشتمان » ، مەهاباد ، ١٩٤٣ .

---

(*) ناوی تەنها ئەو رۆژنامە و گۆڤارانە تۆمار کراوە کە ناویان لە ناوەرۆکی ئەم کتێبەدا هاتووە . ئەوانەی ناویان تەنها لە پاشکۆی ناوی رۆژنامە و گۆڤارەکاندا هاتووە لێرە دوبارە نەکراونەتەوە .

« هاوار » ، شام ، ۱۹۳۲ ــ ۱۹٤۳ .
« هاواری کورد » ، مەهاباد ، ۱۹٤٦ .
« هاواری نیشتمان » ، مەهاباد ، ۱۹٤٦ .
« هەتاو » ، هەولێر ، ژمارە ۱۸٦ ، ئەیلولی ۱۹٦۰ .
« هەڵاڵە » ، بۆکان ، ۱۹٤٦ .
« یەکبوون » ، ئەستەموڵ ، ۱۹۱۳ .

★ ★ ★

# پێرستی ناو و شوێنەکان

## ناو(*)



---

(*) — لێرەدا ئەو ناوانە تۆمار نەکراون کە لە ناوەرۆکی کتێبەکەدا زۆر جار دووبارەبوونەتەوە ، وەك کورد و کوردستان ، یا «تێکەیشتنی راستی» ؛
— پیتی (پ) کورتکراوەی پەراوێزە ، ئەو ناوانەی ئەم پیتەیان لاوەیە لە پەراوێزی لاپەڕەکەدان . جاری وا هەیە ناوێك لە ناوەرۆك و هەمان لاپەڕەدان ، بۆ ئەوە هیچ نیشانەیەك دانەنراوە ؛
— پیتی (هـ) کورتکراوەی هۆزە ؛
— ئەو رۆژنامە و گۆڤارانـەی ناویـان وەك یـەکە بە نیـازی لە یـەك جیاکردنەوەیان شوێن ، یا شوێن و ساڵی دەرچونیانمان لەگەڵ نوسیون.

ـ گ ـ



ـ ل ـ



ـ م ـ

نـاوی
رۆژنامە و گۆڤـار

ـ ز ـ



ـ ژ ـ



ـ س ـ



ـ ش ـ



ـ ص ـ



ـ ظ ـ



ـ ع ـ

## — شوێن —

— ا —

ـ ب ـ

# راستکردنەوەی هەڵەکانی چاپ

| لاپەڕە | دێڕ | هەڵە | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ١٧ | ١٠ | برایانی | برایانێ |
| ٢٣ | ٢٤ | ڕۆژنامەنوسێ | ڕۆژنامەنوس |
| ٣٥ | ٦ | ئوکراینا | ئۆکراینا |
| ٣٧ | ٢٤ | The | the |
| ٣٧ | ٢٥ | Institnte | Institute |
| ٤٤ | ٦ | واتم | واتـه |
| ٥٨ | ١٨ | عەبدوللا | ئیسحـاق |
| ٥٩ | ٢٩ | ٢٣٨ر | ٣٣٨ر |
| ٦٠ | ١٩ | مینورسکی | مینۆرسکی |
| ٦١ | ١٥ | شیرکو | شێرکۆ |
| ٧٥ | ١٨ | ١٩٢٩ | ١٣٢٩ |
| ٨٩ | ٢٣ | بغداد ١ ١٩٤٩ | بغداد ، ١٩٤٩ |
| ١٠٧ | ١٩ | To Kurdistan and Mesopotamia | To Mesopotamia and Kurdistan |
| ١٥٦ | ١٩ | وەفایی | وەفاتی |

# پێڕست

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# « تيگەيشتني راستي [ فهم الحقيقة ] »
# وموقعها في الصحـافة الكرديـة

تأليف

الدكتور كمال مظهر احمد

بغداد ـ ١٩٧٨

* * *

A PUBLICATION OF THE KURDISH ACADEMY

DR. KAMAL MADHHAR AHMAD

# (( TEGAYISHTNI RASTEE ))
# AND ITS PLACE IN KURDISH JOURNALISM

KURDISH ACADEMY PRESS
BAGHDAD — 1978

* * *

М.А.Камаль

"ТЕГАИШТНИ РАСТИ"

И ЕЕ МЕСТО В КУРДСКОМ ПРЕССЕ

(На Курдском Языке)

Издательство Курдской Академии Наук
Багдад, 1978

د. كەمـــال مـەزهـەر

# چەنـد لاپەڕەیــەك لە مێژووی گەلی كورد

## (بەشی یەكەم)

بە یارمەتی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی لەچاپ دراوە

چاپخانەی ( الادیب البغـدادیـة )

بـــەغدا - ١٩٨٥

شركة مطبعة الاديب البغدادية المحدودة

هـــاتف ٧١٨٨٢٨١ - ٧١٨٨٢٨٧

پێشکەشە بە

بنەماڵەی سەربەرزی کەریمی عەلەکە !

# پێشەکی

«چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد» بریتی‌یە لە بەشێکی ئەو وتارانەم کە دەربارەی باسی جیاوازی مێژووی کورد لە چاپەمەنی‌یە کوردی‌یەکاندا بلاوم کردوونەوە .

وتارەکان هی وایان تێدایە تەمەنیان خەریکە دەگاتە چارەکە سەدەیەك ، بەپێی بۆچوونی خۆم هەمووشیان بایەخیان هەیە ، بۆیەکا بەپێویستم زانی کۆیان بکەمەوەو سەرلەنوێ پێشکەشی خوێندەوارانیان بکەمەوەو بەو جۆرەش لە فەوتاندن ڕزگاریان بکەم .

لە شوێنی زۆر پێویستدا نەبێ دەستکاری‌ی ناوەرۆكو ڕێنوسی وتارەکانم نەکردووە ، لەگەڵێك ڕووەوە بلاوکردنەوەیان بەو جۆرە باشترە . بە ناچاریش هەندێك شوێنم لێ لابردوون یا کەمێکم گۆڕیون . . . ! ئەوانەش بوونەتە هۆی کەمێك جیاوازی‌ی تەنانەت لە شێوازی نووسینی باسەکاندا .

هیوادارم بەم بەرهەمەم توانیبێتم خزمەتێك پێشکەشی خوێندەواری کوردی خۆشەویست بکەم . لە دەمێکیشەوە دەمویست وتارێك دەربارەی کەریمی عەلەکەی وەزیری دارایی شێخ مەحمودو شوێنی دیاری ئەو بنەماڵە سەربەرزە بنووسم ، بەلام جارێکا با ئەم دیاری‌یەم لە بریتی ئەویان بێت . خوا لە وێنەیان زۆر بکات،لە سایەی خواشەوە شوێنەواری کەریمی عەلەکە کوێر نەبۆتەوە . . . کوردینە تۆ بڵێیت یەکێك هەبێت مامۆستا مەسیح ئەسکەندەر بناسێت‌و بە دڵ خۆشی نەوێت‌و ڕێزی نەگرێت . هیچ دوور نی‌یە گەر مەسیحی گەورە زیندوو بێتەوە دەستی پیرۆزی بەسەریدا بهێنێت‌و پێی بڵێت :

«بەختەوەرم پیاوێکی وەك
تۆ هەڵگری ناوم بێت !» .

ئەتوانم بلێم (٭) تا ئێستا کەس لە رووی شارستانی یەتی یەوە باسی مێژووی کوردی نەکردووە ، ئەگەرچی جاروبار لە ناو ئەم وتار ، یان ئەو پەڕاوەدا ئەو باسە لە چەند دێرێکی پچڕ پچڕدا بەسەرپێی ی دەبینرێت .

نەتەوەی کورد هەر لە کۆنەوە نیشتەجێی شوێنێکی زۆر گرنگ بووە . بێ گومان کوردستان وەك بڕبڕە وایە بۆ رۆژهەلاتی ناوەراست .

هەر لەبەر ئەوەشە ، جگە لە سامانی زەبەندی ، هەموو دەولەتە ئیمپریالی یەکان چاویان تێ بڕیوەو دەیانەوێ بیکەنە بنکەی خۆیان .

ئەوەی گومانی تێدا نی یە کوردستان لە کۆنیشدا هەر وا گرنگ بووە ، چونکە ئەو کاتە کەوتبووە ناوەراستی شارستانی یەتە کۆنەکانەوە کە زۆربەیان لە رۆژهەلاتی نزیکدا پەیدا بوون و پەرەیان سەندووەو لە سەرووی هەمووشیانەوە شارستانی یەتی فارس و شارستانی یەتی عەرەبی ی ئیسلامی یە کە لە عیراقدا ، کاتی حوکمی عەباسی یەکان ، گەیشتە بەرزترین پلەی پێشکەوتنی . کەواتە دەتوانین بلێین نەتەوەی کورد دەوری لەم شارستانیەتی یانەدا بووە ، واتە کاری تێ کردوون ، هەروەك چۆن ئەوانیش کاریان تێ کردووە . ئەممان بەتەواوی بۆ روون دەبێتەوە ئەگەر بێتو بزانین شارستانی یەتی بە کۆن و نوێ یەوە بریتی یە لە توانەوەی بیروباوەڕو بەرهەمی گەلێك نەتەوەی جیاواز ، چونکە وەك دەرکەوتووە تێکەل بوونی بیروباوەڕو بەرهەمی چەند نەتەوەیەك دەبێتە

---

(٭) سالی ١٩٥٩ ، واتە ئەو سالەی زانکۆی بەغدام تەواو کرد ، ئەم وتارەم لە ژمارە پێنج و شەشی گۆڤاری «بلێسە»دا بلاوکردەوە . لێرەدا وەك خۆی چاپی دەکەمەوەو زۆر کەم نەبێت دەستکاری ی ناوەرۆك و شێوازی نووسینم نەکردووە .

هۆی پەیدابوونی شارستانی‌یەتی‌و ئەنجامی تێکەڵ بوون فراوان بوونی سنووری بیرکردنەوەیە . بێ‌گومان تێکەڵیش بە شێوەیەکی زۆر لە نێوان ئەو نەتەوانەدا دەبێت کە لەیەکەوە نزیکن .

ئەو نەتەوە کوردەی لەسەر سنووری فارس‌و عەرەب ژیاوە لە. سەردەمی شارستانی‌یەتی هەردوو نەتەوەکەدا ، هەرچۆنیٚ بێت ، زۆر یا کەم ، کاری کردۆتە سەر ئەو دوو شارستانی‌یەتە . بەڵام ئەوەی سەرنج ڕائەکێشیٚ ئەوەیە کە زۆر کەس شارەزایی نی‌یە بەرامبەر دەوری کورد ، هەندێکیش دەیزانن ، بەڵام خۆیانی لیٚ گێل دەکەن .

لەوەش خراپتر ئەوەیە کە هەندێك لە مێژوونووسە شۆڤێنی‌یە کلاسیکی‌یەکان دواکەوتن‌و بیٚ‌هێزبوونی شارستانی‌یەتی عەرەبی دەگێڕنەوە بۆ بەهێزبوونی هەندێك نەتەوەی تر لە ناو گیانی کۆمەڵی ئیسلامیدا .

بە کورتی زۆر کەس شارەزاییەکی تەواوی نی‌یە لە بارەی دەوری کوردەوە لە مێژووی شارستانیەتیدا ، بەتایبەتی ئەو خزمەتە بەنرخانەی ئەو نەتەوەیە پێشکەشی کردووە بە شارستانی‌یەتی ئیسلامی‌و زانیاری‌ی عەرەبی . پێویستیشمان بە لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژو زۆر قوڵ نی‌یە بۆ دەربڕینی کاری کورد بۆ سەر گەلیٚ ڕووی شارستانی‌یەتی فارس‌و عەرەب ، بە تایبەتی لە ڕووی بیروباوەڕو کۆمەڵایەتی‌و زانیاری‌و هەتا سیاسیشەوە ، وەك ئێستا بۆمان دەردەکەویٚ .

### کاری کورد بۆ سەر شارستانی‌یەتی فارسی :

نەتەوەی کورد بەهۆی دراوسێیەتی‌یەوە ، هەروەها وەك پاشماوە مێژوویی‌یە دێرینەکان دەری‌دەخەن بەشدار بووە لە دامەزراندن‌و پی‌گەیاندن‌و پێشخستنی شارستانیەتی فارسەکاندا . بەڵام ئەگەرچی هەندێکیش دان بەمەدا نەنێن ئەوا ئێمە دەتوانین لە ڕێگەیەکی ترەوەو بە شێوەیەکی‌تر دەری‌بخەین کە وا کورد کاری کردۆتە سەر ئەم شارستانی‌یەتە . جا با سەری ڕێگەی دووەم بگرین‌و نەختێك لێی وردبینەوە تا بەو ئەنجامەی دەمانەویٚ پێی بگەین .

زۆر مێژوونووسی بەناوبانگ دانیان بەوەدا ناوە کە سەرچاوەی نەتەوەی کورد ئەگەڕێتەوە بۆ سەر میدی یەکان . سەرەرای ئەمەش گەلێك بەڵگەی مێژوویی ئەوتۆ هەیە کە بە تەواوی دەری دەخا میدی یەکان باپیرە گەورەی ئەم نەتەوەی کوردەی ئێستەن .

میدی یەکانیش بەلای کەمەوە سێ سەدە لەپێش فارسەکانەوە هاتوونەتە ئێرانو ئەوێنەتو شارستانی یەتی خۆیان دروستکردووەو پێوەندی یان لەگەڵ شارستانی یەتە پێشکەوتووەکانی عیراق بە تایبەتیو میسردا پەیدا کردووەو لەگەڵ کلدانی یەکان زۆر ڕێك بوون ، بە رادەیەکی ئەوتۆ دەستیان خستە ناو دەستی یەك بۆ لەناوبردنی ئیمپراتۆری ی ئاشوری .

بەم جۆرە میدی یەکان گەلێك کەڵکیان لەو شارستانی یە کۆنانە وەرگرتو هیچ گومانی تێدا نی یە کەوا لە دوای ئەوەی فارسەکان بەسەریانا زاڵ بوونو ئەمان دایانە شاخەکانی زاگرۆس بۆ رزگار بوون لەدەست ژێردەستەیی کۆنە ژێردەستەکانی خۆیان ، شارستانی یەتەکەیان لە ولاتە کۆنەکەی خۆیان بۆ فارسەکان بەجێ هێشت ، وتە بێ سێو دوو دەتوانین بڵێین کاکڵەی شارستانی یەتە پێشکەوتووەکەی فارسەکان بریتی یە لەو شارستانی یەتەی باپیرە گەورەی کورد دایمەزراندو بەجێی هێشت .

سەرەرای ئەمە دەتوانین بڵێین کاری کورد بۆ سەر شارستانی یەتی فارسەکان لەم رادەیەدا نەوەستا ، بەڵکو بێ کۆڵدان لەگەڵ فارسەکانی دراوسێ یاندا خەریکی گۆڕینو پێشخستنی ئەو شارستانی یەتە بوونو هیوامان زۆرە لێکۆڵینەوەی ئارکیۆلۆجی ئەمەمان لە دوارۆژدا بۆ روون بکاتەوەو ناوی ئەو زانا کوردانەی خزمەتی شارستانی یەتی فارسیان کردووە بۆمانی دەربخا بۆ ئەوەی وەك زانا کوردە موسڵمانەکان دەناسینو دەزانین کێن ئەوانیش بناسین .

بەم جۆرە دەرکەوت نەتەوەی کورد کاری کردۆتە سەر شارستانی یەتی فارسەکان . بەڵام خۆ ئەگەر بێتو هەموو ئەمانەش بخەینە لاوە دەتوانین لە لایەکی ترەوە زۆر بە باشی کاری کورد بۆ سەر ئەم شارستانی یەتە دەربڕین . زانایانی مێژوو دەڵێن شارستانی یەتە کۆنەکانی عیراق کارێکی زۆر گەورەیان کردۆتە سەر شارستانی یەتی فارس . لێرەدا پرسیارێکی یەکجار گرنگمان دێتە رێ : لە کوێوەو لە کام ڕێگەوە شارستانی یەکانی عیراق کاریان کردۆتە سەر شارستانی یەتی فارس ؟ .

تەنها یەك وەڵام هەیە بۆ ئەم پرسیارە ، ئەویش ئەوەیە کە ئەم کارە لە رێگەی کوردستانەوە گەیشتۆتە وڵاتی فارس ، چونکە ئەگەر سەیری نەخشە بکەین ئەبینین کوردستانو زنجیرە شاخەکانی‌یە کە عیراقو ئێران لە یەکتر جیا ئەکاتەوە . جگە لەمە هیچ رێی تێ ناچێت کورد وەك یاساولی سەر سنوور خۆی دوورە پەرێز گرتبێ لە شارستانی‌یەتی فارس ، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەوەوە ، شتی‌ی نوێی داوەتێ . هەروەکو لێشی وەرگرتووە ، چونکە سروشتی شارستانی‌یەتی لەسەر کەڵك بەخشینو کەڵك وەرگرتن وەستاوە .

دوور نی‌یە هەبن وابزانن میللەتی کورد میللەتێکی دواکەوتوو بووە ، لەبەر ئەوە هەر کاری تێ‌کراوە لە رووی شارستانی‌یەوە ، بێ ئەوەی کاری کردبێتە سەر هیچ شارستانی‌یەك . بەڵام بۆ وەڵامی ئەمە دەڵێین کە دوو میللەتی دراوسێ هەردووکیان بە هەموو جۆرێ کار ئەکەنە سەر یەکتر ، با یەکێکیشیان زۆر پێشکەوتوو و ئەوی‌تریان زۆر دواکەوتوو بێ . باشترین بەڵگە بۆ ئەمە هندی‌یە سوورەکانی ئەمەریکان کە گەورەترین کاریان کردۆتە سەر سازو ئاوازی ئەمەریکی لەگەڵ ئەو هەموو دواکەوتنەی خۆشیاندا . کەواتە لەمەوە بە ئاشکرا دەرئەکەوێ کە نەتەوەی کورد ئەگەرچی دواکەوتووش بوبێت ، هەرچەندە وانەبووە چونکە دامەزرێنەری شارستانی‌یەتی میدی ئەو بوو ، هەر کاری خۆی کردۆتە سەر شارستانی‌یەتی فارس ، چونکە ، هەروەك وتمان ، شارستانی‌یەتی هی تەنها یەك نەتەوە نی‌یە ، بەڵکو بریتی‌یە لە توانەوەی بیروباوەڕو بەرهەمی چەند نەتەوەیەك .

ئەم وتارە (٭) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی‌یە لە زمانەکەمان ، وەڵامێکە بۆ ئەوانەی ئەڵێن زمانەکەمان لقێکە لە زمانی فارسی .

ژمارەیەك لە مێژوونووسان وادەزانن زمانی کوردی بەشێکە ، یا زارەوەیەکە لە زمانی فارسی .

زۆر دوور نەڕۆین نەهرۆیش لە نووسراوەکەیدا «لمحات من تأریخ العالم» ، لە لاپەڕە ٢٥٩دا دەڵێت «کوردەکان بە زمانی فارسی‌ی کۆن گفتوگۆ دەکەن» .

بەڵام ڕەخنەی لێ‌ناگیرێت چونکە خۆی لە پێشەکی‌ی پەڕاوەکەیدا داوای لێبوردنی کردووە لە هەموو جۆرە کەموکوری‌یەك لەبەر ئەوەی پەڕاوەکەی لە کاتێکدا نووسیوە کە لە بەندیخانەدا بووەو بەشێوەی نامە ناردوویەتی بۆ کچەکەی (٭٭) بێ ئەوەی دەستی بگاتە هیچ سەرچاوەیەك تا کەموکوری لە باسەکانی ببڕێت ، هیچ دووریش نی‌یە وشەی ئێرانی‌یان لە نووسراوەکەیدا بە فارسی تەرجەمە کردبێت ، خەتای ئەمەش دەکەوێتە سەر شانی ئەو کەسانەی پەڕاوەکەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی ، چونکە زۆر لە مێژوونووسەکان وشەی ئێران بە واتای هیندو – ئەورووپی بەکار دەهێنن . بەڵام زۆر نووسەری‌ترکە هیچ دوور نی‌یە لەبەر هۆیەکی شارراوە زمانی کوردی دەگێڕنەوە بۆ سەر زمانی فارسی‌و ئەمەش لە بنچینەوە بە بیرێکی چەوت دەژمێررێ ، کەواتە با نەختێ لەم باسە بدوێین بە شێوەیەکی مێژوویی‌و زانیاری‌ی ڕاست .

---

(٭) لە ژمارە سێی ساڵی یەکەمی گۆڤاری «بلێسە»دا بلاوکراوەتەوە (تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ ، ل ٣٥-٤٢) .

(٭٭) مەبەست ئیندیرا غاندی‌یە .

هەرکەسێك بیەوێ لە ڕەگەز ، یا زاراوەی هەر گەلێك لە گەلەکانی ڕۆژهەلاَت بدوێ پێویستە بگەڕێتەوە بۆ پەڕاوەکانی مێژوونووسەکان ، بەتایبەتی ڕۆژهەلاَتناسەکان . بەلاَم ئەمانیش هەموو بە سەرڕاستی باسەکانیان نەنووسیوە . بەڵکو ، هەروەك مامۆستا ئەمین زەکی دەڵێ ، دەتوانین بیانکەین بە سێ بەشەوە بەشێکیان هیچ مەبەستێکیان نەبووە لە نووسینەکانیاندا ئەوە نەبێت پێ‌یان بگوترێ مێژوونووس . بەشی دووەمیشیان بەپێی ڕێگەیەکی دانراو لە شوێنی خۆیەوە باسەکانیان نووسیوە . خۆ هیچ دوور نەڕۆین ئەگەر یەکێك لەمانە ئیستە بیەوێ نە بارەی کوردەوە بنووسێ‌و شتێکی بە دەمدا بسورێ لە لایەن تۆرانی‌یەکانەوە ، ئەو یەکسەر بێ ئەوەی سێ‌و دووی لێ بکات گەلی کورد دەگێڕێتەوە سەر تورك‌و پێ‌یان دەڵێ «تورکە شاخاوی‌یەکان» . بەشی سێیەمیش ئەو زانا پایە بەرزانەن کە نە باسەکانیاندا ڕێگەی زانستی‌ی ڕاستیان بەرەلاَ نەکردووە لەبەر زرەی پارە ورشەی زێڕ . ئەوانە بەسیانە کە بە چاکە ناو دەبرێن‌و جێگەی خۆیان لە لاپەڕەی مێژوود کردۆتەوە .

جا ئەم دەستە زانایە چونکە ڕێگەیەکی ڕاستیان گرتووە نووسینەکانیان پڕکەڵکە ، بەلاَم ئەوانەی کورد دەگێڕنەوە سەر ڕەگەزی تورك ، یا فورس ، یـ دەڵێن زمانەکەیان زمانی خۆیان نی‌یە ، بەڵکو بە زاراوەی دراوسێکانیان گفتوگۆ دەکەن ، ئەوانە هەموویان لە دەستەی یەکەمن یا دووەم کە لە خۆیانەوە بیروباوەڕیان دروست کردووە بۆ فرۆشتن . بەلاَم دەریایەکی خاوێن‌و جوان ئەگەرچی جۆگەیەکی پیسیشی تێ‌بڕژێ لیخن نابێت .

خۆ ئەوەش ئاشکرایە لە گەلی کورد هەژارو بێکەستر نی‌یە تاوەکو بڵێین زاناکانی دەستەی سێیەمیان هانداوە بۆ ئەوەی لە بارەی زمان‌و مێژووی کوردەوە بە ئارەزووی گەلی کورد بنووسن . کەواتە تەنها ئەوانن ڕێگەیەکی ڕاستی زانیاری‌یان گرتووە بۆ لێکۆڵینەوە لە بنچینەی کوردو زمانەکەیان ، نەك لەبەر خاتری چاوی کاڵی کورد . بەڵکو لەڕێی زانیاریدا ، جا بیروباوەڕی ئەمان نەبێت بیروباوەڕی دوو دەستەکەی‌تر هیچ نرخێکی نی‌یەو بە هیچ ناچێت .

ئا ئەمە بەسە بۆ هەموو کەسێکی تێگەیشتو ، کورد بێت یانا ، بۆ ئەوەی بزانێ :
هەر کەسێك ڕەگەزی کورد ، یا زمانیان بگێڕێتەوە بۆ سەر ڕەگەزێك یا

ـەتێکی تر لە ڕاستی یەوە دوورەو لەبەر هۆیەکی شارراوە ئەو درۆ زلانە ئەکات ، ئەو ـرۆیانەی مێژوو هەرگیز لێیان خۆش نابێت !.

ئەمەی نووسیمان سووکە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی دەڵێن زمانی کوردی فارسی یە .
حڵام با نەختێکی تریش لەم باسە بدوێین و پەنا بەرینە بەر بیروباوەڕی ڕۆژهەڵاتناسە سەرراستەکان ، ئەوانەی ڕێگەی زانیاری یان بەرنەداوە .

سێر سدنی سمث لە ژێر ناوی «کوردستانی کۆندا» بەکورتی دەڵێت : هیچ گومانی تیا نی یە ئەو کاردۆخی یانەی زەینەفون باسیان دەکات هەر گەلی کورد بوون . جا با بزانین زەینەفون کێ بووەو چی ی گوتووە لەبارەی گەلی کوردەوە .

کۆرشی بچوکی برای ئەرتەحششتای پاشای فارس سەرپەرشتی کاروباری ئاسیای بچوکی دەکرد . دەوروبەری ساڵی ٤٠٤ی پێش لە دایك بوون کۆرش ئارەزووی ئەوەی دەکرد جێگەی بگرێتەوەو خۆی ببێتە پاشای فارسەکان ، لەبەر ئەوە سوپایەکی گەورەی بۆ هێنانە دی ی ئامانجەکەی پێکهێنا . جگە لەم سوپا گەورەیە سوپایەکی تریشی لە ئیغریقەکان پێکهێنا بۆ یارمەتی ی سوپای یەکەم . ئەم سوپا ئیغریقی یە لە مێژوودا بە « سوپای دە هەزارە » ناسراوە .

پاش کوشتنی کۆرش لە عیراق ، زەینەفون کە یەکێك بووە لە سەربازە ئیغریقی یەکان کاروباری سوپاکەیانی گرتۆتە دەست و بۆتە سەرۆکی و سوپاکەی گێڕاوەتەوە بەرەو وڵاتی خۆیان یۆنان . باسی چون و هاتنەوەی ئەم سوپایەو هەموو بەسەرهاتی بە شێوەیەکی مێژوویی کاتی خۆی لە پەڕاوێکدا نووسراوەتەوە(...) کە باسی کوردیشی تێدا کراوەو دەڵێت : کاتێك سوپاکەمان گەیشتە ناوچەی زاخۆ گەلێکی ئازاو شەڕکەرمان لێ هەڵکەوت ناوی کاردۆخی یە . . . ئەم گەلە لە ناوچەیەکی شاخاویدا دەژیان و ئارەزووی جیابوونەوەیان هەبوو لە شاو حەزیان بە سەربەخۆیی و ئازادی دەکرد .

کەواتە لەمەوە بە باشی بۆمان دەردەکەوێ کە تینوێتی ئەو گەلە بۆ سەربەستی و ئارەزووی ئازادی و جیابوونەوەی لەبەر ئەوە بووە کە زمانەکەیان زمانێکی سەربەخۆ بووە ، نەك زمان یا زاراوەیەکی بێگانە .

---

(...) مەبەست کتێبی بەناوبانگی «ئەناباسیس»ە کە زەینەفون بۆ خۆی دایناوە .

ئینجا با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی سێر سدنی سمث کە لە لایەکی تری وتارەکەیدا دەڵێت :

لەم دواییەدا بیروباوەڕی ئەو زانایانەی لە زمانی کوردی دەکۆڵنەوە بەتەولوی گۆڕراوەو دەڵێن : زمانی کوردی نە لە فارسیو نە لە هیچ زمانێکی ترەوە وەرنەگیراوە ، بەڵکو زمانێکی تایبەتیو سەربەخۆیەو هەر لە کۆنەوە هەڵگیرو داگیری خۆی جوێ بووە . سدنی سمث کۆتایی باسەکەشی بەوە دێنێت کە ئەڵێت : «ئەوانەی وا دەزانن زمانی کوردی زاراوەیەکی فارسی‌یە مێژوو و زانست پێچەوانەی بیروباوەڕیانە» .

بەڵام مامۆستا سایسو ژمارەیەك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان دەڵێن : زمانی میدی‌یەکان یا ئەم کوردی‌یەی ئێستە بووە ، یا بنچینە بووە بۆی .

ئەمە بەتەواوی کۆنی زمانی کوردی دەردەخات ، چونکە میدی‌یەکان لە فارسەکان کۆنترنو لە پێش ئەوانیشدا هاتوونە ولاتی فارسەوەو دەوڵەتیان پێکهێناوە لە سەدەی حەوتەمی پێش لەدایك‌بووندا بوو گەورەترین دەوڵەتیان دروست کردو پەرەیان سەندو وا بەهێز بوون ساڵی ٦١٢ی پێش لەدایك بوون ناوی دەوڵەتی ئاشوری‌یەکانیان لەناو ناواندا نەهێشت ، ئەو دەوڵەتە گرنگەی نیوەی جیهانی لەژێر دەستدا بوو .

لەو کاتەشدا فارسەکان لەژێر دەستی میدی‌یەکاندا بوونو وا مانەوە هەتا دەوروبەری ساڵی ٥٥٠ی پێش لەدایك‌بوون ، ئەو کاتەی کۆرشی گەورە پەیدا بوو و توانی فارسەکان لەژێر چنگی میدی‌یەکان دەربهێنێو دەوڵەتیان بۆ پێکبهێنێت .

لێرەدا ئەم پرسیارەمان دێتە ڕێ ، ئەویش : ئایا ڕێی تێ دەچێ گەلێك بە زمانی گەلێکی تر گفتوگۆ بکات کە ژێردەستەی خۆی بووبێت ؟ ! ! .

گەلێك ئەوەندە کۆن بێت کە ٢٧٠ ساڵ لە پێش گەلی فارسدا هاتبێتە ئەو ناوچەیەوەو دەوری صەد ساڵێکیش لە پێش ئەواندا دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبوبێو تەنانەت فارسەکانیشیان لەژێر دەستدا بووبێ ، ئیتر چۆن ڕێی تێ دەچێ بوترێ ئەمان بەزمانی فارسی گفتوگۆیان کردووە ! ! . ئەمە لەوە دەچێت بڵێیت گەلی تورك لە تورکیادا بە زمانی کوردیی . . . ئەدوێن ! ! .

بەڵێ ئەوا وتمان میدی‌یەکان کە سەرچاوەی گەلی کوردن بە فارسی دەدوان ، کەواتە فارسەکان‌و میدی‌یەکان هەردوکیان یەك گەل بوون ، چونکە زمانیان یەك بووە .

ئەگەر وابوبێت ئەوساکە ئەم دوو پرسیارە ڕێگەمان لێ ئەگرێت‌و بەدرۆمان ئەخەنەوە :

یەکەم : ئەگەر ئەم دوو گەلە یەك بوون‌و جیاوازی‌یان نەبوبێت لە زمانا ئەی چۆن میدی‌یەکان ماوەیەکی دوورو درێژ فارسەکانیان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە ؟

دووەم : بۆچی فارسەکان هەوڵی جیابوونەوەیان دەدا لە دەوڵەتی میدی‌یەکان بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی نوێی سەربەخۆ دابمەزرێنن ؟ .

هیچ وەڵامێك نی‌یە لەوە زیاترکە بێ گومان زمانیان جیاواز بووە لە زمانی میدی‌و ئەم گەلانیش بە زمان‌و شێوە لێك جیا دەکرێنەوە .

هەر وەکو بۆمان دەرکەوت گەلی کورد گەلێك لە فارسەکان کۆنترن ، هەروەها زمانیشیان . جا ئەگەر ئێمە نەڵێین فارسی لە کوردی‌یەوە وەرگیراوە دەسا بیروباوەڕ فرۆشان چۆن ڕووی ئەوەیان هەیە بڵێن کوردی لە فارسی‌یەوە وەرگیراوە . وا دەرئەکەوێ ئەوانە هەتا ئێستا وشەی شەرمەزاری‌یان نەبیستووە ، لەبەر ئەوە درۆ بەلایانەوە هیچ نی‌یە ، درۆیەکی وا زلیش کە زمانی کوردی بەو کۆنی‌یەوە بکەن بە زاراوەیەکی فارسی . بەڕاستی ئەمە شتێکە هەر بۆ پێکەنین دەشێت ، لەوە ئەچێت بڵێت ئەو باوکە کوڕی کوڕەکەیەتی ، یا ئەو ئافرەتە هەشتا ساڵی‌یە کچی ئەو ژنە بیست ساڵی‌یەیە ! .

ئینجا سەرەی ڕۆژهەڵاتناس مێجەر سۆنە کە کورتەی باسەکەی دەڵێت : لە ساڵی ٤٠١ی پێش لەدایك‌بوونەوە . ئەو کاتەی زەینەفون گەلی کاردۆخی پی‌گەیشت . کوردستان بووە جێ‌نشتەنی گەلێکی کۆن کە خاوەنی زمانی تایبەتی‌ی خۆی بووە . ئەم گەلە خۆیان‌و زمانەکەشیان لە هەموو تێکەڵی‌یەك پاراستووەو ئەگەر ئێتو کوردی لەگەڵ هەر زمانێکی‌تر بەراورد بکەین دەبینین کورد زمانی خۆی لە هەموو گەلێکی‌تر زیاتر پاراستووە ، بە ڕادەیەك جیاوازی‌یەکی زۆر نی‌یە لە نێوان کوردی‌ی ئیستەو کوردی‌ی پێش سەدەها ساڵدا .

بەڵێ وەك مێجەر سۆن ئەڵێت گەلی کورد لە هەموو کاتێکدا هۆشی بە زمانەکەی خۆیەوە بووەو پاراستویەتی . بێ گومان ئەوی یاریدەی داون لەم پارستنەد سروشتە ، چونکە کورد لە شوێنێکی شاخاوی سەختدا ژیاون ، لەبەر ئەوە گەلانی دراوسیێیان نەیانتوانیوە بە ئاسانی پێوەندییان لەگەڵ پەیدا بکەنو کار بکەنە سەر زمانەکەیان ، بە تایبەتی پێوەندی ئابوری‌و بازرگانی‌و سیاسی کە گەورەترین هۆی تێکەڵی زمانن . نەبوونی ئەو جۆرە پێوەندییانەش گەورەترین قەڵغانە کە زمانی کوردیی پاراستووەو هەر بە خاوێنی ماوەتەوە ئەوە نەبێت چەند وشەیەکی عەرەبیی لە رێگەی دینەوە تێکەڵ بووە لە ئەنجامی بلاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستاندا ساڵی ١٨ی کۆچی ، ئەمەش تەنها لە زمانی کوردی رووی نەداوە . تەنانەت ئیستە ئەگەر زمانی تورکی ، یا فارسی پالاوتە بکەین نیوەی زیاتری ئەبێت بڕوات چونکە هەمووی وشەی عەرەبیە .

ئیستەش گەلی کورد هەستی بەمە کردووە ، بۆیەکا هەموو جۆرە وشەیەکی بێگانە لە زمانەکەماندا روو لە فەوتانە . سوکە بەراوردێك لە نێوان هۆنراوەی بوێژە کۆنەکانو تازەکاندا ، یا نووسراوی نووسەرە کۆنەکانو تازەکان راستی ئەمەمان بۆ دەردەخات ، دەریدەخات هەنگاوی پیرۆزی پالاوتنی زمانەکەمان لە وشەی بێگانە لە مێژەوە دەستی پی‌کردووە ئیستاش خەریکە بە ئامانج دەگات .

کەوابێت هۆی لە یەك چوونی زمانی کوردی‌و فارسی چی‌یە ؟ . ئەوەی گۆمانی تێدا نی‌یە نزیکی‌یەکی زۆر هەیە لە نێوان زمانی کوردی‌و فارسیدا ، بەلام ئەمە وا ناگەیەنێت کوردی زاراوەیەکی فارسی‌یە ، ئەبێت چەند هۆیەك هەبێت بۆ ئەم لەیەك چوونە ، دەسا با کەمێك وردبینەوەو بزانین ئەو هۆیانە چین .

هەر کەسێك دەربارەی مێژووی کۆنی کوردو جوغرافیای کوردستان شتێك بزانێت دەتوانێت لەگەڵما بڵێت هۆی ئەم لە یەك چوونە بۆ دوو شت دەگەرێتەوە :

یەکەم : هەردوو زمانی کوردیی‌و فارسی بەشێکن لە یەك خێزانی زمانی ، ئەوێش خێزانی زمانە هیندۆ — ئەوروپایی‌یەکانە .

لەبەر ئەوە ئەبینین لە یەك چوونێکی زۆر هەیە نەك تەنها لە نێوان زمانی کوردی‌و فارسیدا ، بەڵکو لە نێوان کوردیی‌و زمانەکانی‌تریشدا کە لەم خێزانی زمانی‌یەن .

گەلێك وشە هەن لە فەرەنسی‌و کوردیدا ، یا کوردی‌و ئیتالیدا یەك مانا دەبەخشن ، وەك برۆی چاوو ئەژنۆی کوردی‌و فەرەنسی‌و برۆو کی‌و کاروانی کوردی‌و ئیتالی .

جگە لەمانە گەلێك وشەی‌تریش هەن لە نێوان کوردی‌و ئیتالی‌و کوردی‌و فەرەنسی‌و ئینگلیزی‌و گەلێك زمانی‌تر کە لە خێزانی زمانە هیندۆ – ئەوروپایی‌یەکانن لە یەك دەچن‌و یەك ماناش دەبەخشن . . . بەلاّم ئایا ئەم لە یەك چوونە مانای ئەوەیە کوردی زاراوەیەکی فەرەنسی ، یا ئیتالی‌یە ؟ . کەواتە لە یەك چوونی فارسی‌و کوردیش چەشنی شتە ، هۆکەی ئەوەیە هەردووکیان لە یەك خێزانی زمانین .

دووەم : ئاشکرایە نزیکی لە نێوان کوردی‌و فارسیدا زۆرترە وەك لە نێوان کوردی‌و زمانە هیندۆ – ئەوروپایی‌یەکانی‌تردا ، هۆی ئەمەش نزیکی‌یە لە نێوان کوردستان‌و ئێراندا ، ئەو نزیکی‌یەی بۆتە هۆی تێکەڵ بوونی چەند وشەیەکی ئەوان لەگەڵ زمانی ئێمەو چەند وشەیەکی ئێمەش لەگەڵ زمانی ئەواندا . سەرەرای ئەمانەش زۆربەی هەردووك گەل موسڵمانن ، ئەمەش بەلای کەمەوە بۆتە هۆی لە یەك چوونی زۆربەی ئەو وشانەی پێوەندی‌یان بە دینەوە هەیە .

جگە لەم دوو هۆیە دەتوانین بە ئاسانی هۆیەکی مێژوویی‌تریش بدۆزینەوە ، چونکە ئەگەر یەکێك لە مێژووی میدی‌یەکان‌و چۆنیەتی فەوتانی دەوڵەتەکەیان بکۆڵێتەوە دەتوانێت لەگەڵیا هۆی نزیکی کوردی‌و فارسی بەم جۆرە روون بکاتەوە :

دەوروبەری ساڵی ٥٥٠ی پێش لەدایك‌بوون دەوڵەتی میدی پاش جەنگێکی گەورە لە نێوان شای میدی ئیستیاجزو شای فارس کورشی گەورەدا فەوتا . بەم جۆرە فارسەکان کە جاران ژێردەستەی میدی‌یەکان بوون وایان لێ هات میدی‌یەکانیان کەوتە ژێر دەست ، ئەمانیش کە سەربەخۆیی‌یان نەما بەشی زوریان بەرەو شاخەکانی کوردستان بوونەوەو لەوێ لەگەڵ گەلانی ئەو ناوە تێکەڵ بوون‌و گەلی کوردیان پێکهێنا . ئینجا ئەوی گومانی تێدا نی‌یە تیکەڵی‌یەك لە نێوان ئەم میدی‌و فارسانەدا پەیدا بوبو ، چونکە فارسەکان ماوەیەك لە ژێر دەستی میدی‌یەکاندا بوون ، ئەمانیش ماوەیەك لەژێر دەستی ئەواندا . بێ گومان ئەو تێکەڵی‌یەش کاری کردۆتە سەر هەردوو زمانەکەو سوکە لە یەك چوونێکی لە نێوانیاندا پەیدا کردووە .

ژمارەیەك لە مێژوونوسان دەربارەی ئەم لە یەك چوونە دەڵێن گەلێك هەبووە ناوی پارتی بووە کە لە گەلە هیندۆ – ئەوروپایی‌یەکان بوون‌و بەشێکیان تێکەڵ بە

فارس‌و بەشێکیشیان تێکەڵ بە کورد بوون‌و تیایاندا تواونەتەوە ، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی چەند وشەیەك لە زمانەکەیان تێکەڵ بە فارسی‌و کوردی ببێت ، ئیستەش ئەو وشانە بوونەتە هۆی پەیدا کردنی ئەم لە یەك چوونەی نێوان کوردی‌و فارسی .

پاش ئەم سوکە بەراوردکردن‌و لێکۆڵینەوەیە لە زمانی کوردی‌و فارسی با ئەم پرسیارە تازە بکەینەوە :

ئایا هەندێك لە بیروباوەڕ فرۆشەکان چۆن ڕووی ئەوەیان هەیە بڵێن کوردی زمانێك ، یا زاراوەیەکی فارسی ، یا بێگانەیە ؟ ؟ ! !

دەسا با بۆ دوا جاریش وەڵامیان بدەینەوەو بڵێین : دەریایەکی خاوێن‌و جوان ئەگەرچی جۆگەیەکی پیسیشی تێ‌بڕژێت لیخن نابێت !

* * *

**چەند تێبینی‌یەك** :

١ – دیارە سەرچاوەی سەرەکی‌ی ئەم دوو وتارەم بەرهەمەکانی مامۆستایان ئەمین زەکی‌و تەها باقر بوون .

٢ – وتاری یەکەمیان تەواو نەبووە ، وا دیارە چوونە دەرەوەم بۆ خوێندن لە مارتی ساڵی ١٩٦٠دا بۆتە هۆی نەنووسینی بەشەکانی‌تری .

٣ – زاراوەم بۆ «لهجه» بەکار هێناوە .

٤ – هەست‌و تووڕەیی بە هەردوکیانەوە دیارن .

# باسی سێیەم

# شەرەفنامە» لە کوردناسی ی سۆڤێتدا

خوێندەوارێکی کورد ، یا ڕۆژهەڵاتناسێك نی‌یە ناوی «شەرەفنامە»و شەرەف خانی بدلیسی نەبیستبێ‌ کە تاوەکو ئێستە بە گەلێك زمان‌و بە دەیان جار کورت‌و درێژ دەربارەیان نووسراوە(٭) . ڕۆژهەڵاتناسی‌ی سۆڤێت بە گشتی‌و کوردناسی‌ی سۆڤێتی بە تایبەتی بایەخی دیارو شایانیان بە هەردوك بەرگی «شەرەفنامە»و دانەری داوە . ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسانی شورەوی لە نووسینەکانیاندا کەڵکیان لە «شەرەفنامە» وەرگرتووە ، چ بۆ لێکدانەوەی مێژووی کوردستان‌و ، چ بۆ لێکدانەوەی مەڵبەندی‌تری ڕۆژهەڵاتی ناوەراست . لە سی‌یەکاندا داوا لە ڕۆژهەڵات‌و کوردناس ف . پ . ڕاستۆپچین[1] کرا «شەرەفنامە» بکاتە ڕووسی ،

---

(٭) ساڵی ١٩٧٣ لەگەڵ پێشەکی‌ی چاپی کوردی‌ی «شەرەفنامە»دا بڵاوکراوەتەوە .

(١) ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤێتی ف .پ . ڕاستۆپچین لە سی‌یەکاندا چەند بەرهەمێکی بەنرخی دەربارەی گەلی کورد بڵاوکردەوە . ڕاستۆپچین یەکەم زانایە لە جیهاندا کە یەکەم بیبلیۆگرافیای لەسەر کورد داناوەو کانی خۆی لە ژێر ناوی «بیبلیۆگرافیا دەربارەی کێشەی کورد» لە گۆڤاری «ڕۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ»دا بڵاوی‌کردۆتەوە (بڕوانە : «ڕۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ» ، بە زمانی ڕووسی ، ژمارە ٣-٤ ، ساڵی ١٩٣٣ ، ل ٢٩٢ - ٣٢٦و ژمارە ٥ی هەمان ساڵ ، ل ١٥٩ - ١٧٣) . یەکێك لە وتارە بەنرخەکانی ڕاستۆپچین «سەرەنج دەربارەی کورد»ە کە لە ژمارە ١٣ - ١٤ی ساڵی ١٩٣٢ی گۆڤاری «دەنگوباسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست»دا بڵاوی کردۆتەوە (بڕوانە گۆڤاری ناوبراو ، ل ٧٢ - ٩٣) .

ڕاستۆپچین لەو بەرهەمەی بۆ لێکۆڵینەوە لە ژمارەیەك ڕووی گرنگی ژیانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی کورد تەرخان کردووە . لە سەرەتای ئەم وتارەیدا ڕاستۆپچین هێرشێکی زۆر توندو تیژی کردۆتە سەر ئەو مێژوونووسە کورتبینانەی لە خۆڕا خەباتی گەلی کوردیان لەکەدار کردووە . هەمان کات ڕاستۆپچین بە توندی ڕەخنەشی لەو نووسەرە سۆڤێتی‌یانە گرتووە کە نەزانانە ، وەك دەڵێت «لە ژێر پەردەیەکی تەنکی مارکسیەتدا» تۆمەتی کۆنەپەرستی‌یان داوەتە پاڵ هەموو بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی کورد .

بەلاّم بە داخەوە مەرگی لە ناکاوی مۆلەتی جیّبەجیّ کردنی ئەم کارە زانستی‌یە پێویستەی نەدا .

بایەخ‌پێدانی رۆژهەلاّتناسی‌ی سۆڤیێت بە «شەرەفنامە» لە کۆتایی پەنجاکانەوە گەیشتە بەرزترین پلەی . لەوساوە بەشی کوردی‌ی لقی لێنینگرادی ئامۆژگای رۆژهەلاّتناسی‌ی کۆری زانیاری سۆڤیێت وەرگێرانی «شەرەفنامە»ی لە فارسی‌یەوە بۆ سەر زمانی رووسی سپاردە یڤگینا ڤاسیلیێڤا . جیّبەجیّ کردنی ئەو کارە چەند سالّێك ئەرکی بێ وچانی پێویست بوو . سالّی ۱۹٦۷ بەرگی یەکەمی «شەرەفنامە» لە ژێر چاپدا دەرچوو[٢] . بەر لەوەش بە چەند مانگێك فارمانبەری زانستی‌ی ئامۆژگای گەلانی رۆژهەلاّتی نزیك‌و ناوەراستی سەر بە کۆری زانیاری ئازەربایجانی سۆڤیێتی مەمێد شەمسی سەبارەت بەو نامەیەی تەرخانی کردبوو بۆ لێکۆلّینەوەی «شەرەفنامە» بە ناوی «شەرەفنامەی شەرەف خانی بدلیسی وەك سەرچاوەی مێژووی گەلی کورد»ەوە[٣] کە بەرهەمی کاری بێ وچانی چەند سالّێکی بوو ، نازناوی دوکتۆری پێ درا .

ئەم دوو شارەزایە بە شێوەیەکی زانیاری قوولّ نرخی «شەرەفنامە»و گەلێك رووی نەزانراوی خۆی‌و ژیانی شەرەف خانی بدلیسی‌یان بۆ یەکەم جار بە جۆرێکی رێکوپێك خستۆتە بەردەمی رۆژهەلاّتناسانی خۆیان‌و دەرەوە کە ، بێ‌گومان ، کورتە باسێکیان لە پێشەکی‌ی یەکەم چاپی کوردی‌ی «شەرەفنامە»دا کارێکی بەجێ‌و پێویستە .

بەرگی یەکەمی «شەرەفنامە» بە رووسی ٦١٩ لاپەرەیە[٤] کە تەنها ٤١٢ لاپەرەی بریتی‌یە لە وەرگێرانی نووسینەکەی شەرەف خان خۆی . ئەوی‌تری بریتی‌یە

---

(٢) لەگەلّ تەواو بوونی وەرگێرانی بەرگی یەکەمی «شەرەفنامە»دا ڤاسیلیێڤا دەستی دایە وەرگێرانی بەرگی دووەمیشی کە سالّی ۱۹۷٦ ئەویشیان بە رووسی چاپ‌کرا . لەبەر ئەوەی ئەم پێشەکی‌یە بەر لە دەرچوونی بەرگی دووەمی «شەرەفنامە» نووسراوە بۆیەکا باسی ئەو بەرگەی نەکردووە . دەربارەی بەرگی دووەمی «شەرەفنامە» بروانە : د . کەمال مەزهەر ، مێژوو . کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کوردو مێژوو ، بەغدا ، ۱۹۸۳ ، ل ۱۱۰ – ۱۲٦ .

(٣) ئەم نامەیە بە زمانی ئازەری نووسراوەو کورتەی بە رووسی چاپ کراوە . پاش ماوەیەك نامەکە خۆشی لە کتێبێکی سەربەخۆدا لە باکۆ چاپ کرا .

(٤) هەزارو سێ صەد دانە لە بەرگی یەکەمی «شەرەفنامە»ی بە رووسی بە شێوەیەکی رازاوەی بەرچاو چاپ‌کراوەو هەر زوو هەمووی فرۆشراو ئێستە بۆتە بەرهەمێکی دەگمەن .

ـه پێشەکی و پاشکۆو کورتە باسێکی کتێبەکە بە زمانی ئینگلیزی کە هەموویان لە لایەنِ
ـفرەتی زانای سۆڤێتی ی . ڤاسیلێڤاوە ئامادە کراون .
ی . ڤاسیلێڤا لە پەنجاو پێنج لاپەرەی پێشەکی یەکەیدا وەستایانە « شەرەفنامە »ی
هەڵسەنگاندووەو نرخی بەرزی زانستی ی دیار کردووەو گەلێك زانیاری ی نوێی لەم
ـارەیەوە بلاوکردۆتەوە کە زۆربەی هەرە زۆریان لای خوێندەواری کورد نەزانراو
بوون .

لەم پێشەکی یەدا زانای سۆڤێتی بە درێژی باسی مێژووی لێکۆڵینەوەی
«شەرەفنامە»و دەستنووسە کۆنەکانی و ئەو کتێبخانانەی ئەو دەستنووسە دەگمەنانەیان
لایەو ، گەلێك باسی تری لەم بابەتانەی بۆ تۆمار کردووین .
وەك ڤاسیلێڤا نووسیوی یە هێربیلۆ بە زمانی فەرەنسی ساڵی ١٧٧٦ لە لاپەرەی
٨٣٦ و ٨٤١ی ئەو کتێبەیدا کە بە ناوی «کتێبخانەی رۆژهەلات یا فەرهەنگی
گشتی»ەوە بلاوی کردۆتەوە بۆ یەکەم جار باسی «شەرەفنامە»ی بە جیهانی زانیاری ی
رۆژئاوا گەیاندووە[٥] . هێربیلۆی ناوبراو لە رێگەی یەکێك لە نووسراوەکانی
گەریدەی تورکی بەناوبانگی سەدەی حەڤدەمین کاتب چەلبی یەوە بە بوونی
«شەرەفنامە»ی زانیوە[٦] . دوای ئەوە جۆن مالکۆلم[٧] یەکەم ئەورووپایی یە
دەستنووسی «شەرەفنامە»ی دەستکەوتووە . مالکۆلم لە رووی زانستیشەوە کەڵکی لە
«شەرەفنامە» وەرگرتووە . ئەو لە بەرگی دووەمی کتێبە بەناوبانگەکەیدا کە دەربارەی

---

(٥) بەپێی ئەو زانیاری یانەی لە بیبلیۆگرافیاکەی ژ.کە موسەیلیاندا بلاوکراونەوە هێربیلۆ لە پێنج شوێنی کتێبەکەیدا باسی کوردو «شەرەفنامە»ی کردووە کە وان لە لاپەرەی ٣١٧و ٧٠٦و ٨٠٧و ٨٣٦و ٨٤١یدا (بروانە : ژ. س. موسەیلیان ، بیبلیۆگرافیای کوردناسی ، بە زمانی رووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ل ٥٥) .

(٦) بروانە لاپەرە چواردەی پێشەکی یەکەی ی . ڤاسیلێڤا .

(٧) جۆن مالکۆلم (١٧٦٩ – ١٨٣٣) یەکێك بوو لە کاربەدەستە ناسراوەکانی بەریتانیا ، ماوەیەکی زۆر لە هندستان و ئێران کاری کردووەو شارەزایەکی زۆری دەربارەی ولات و گەلانی رۆژهەلات هەبووەو گەلێك نووسراوی بەنرخی لەبارەیانەوە بەجێ‌هێشتووە . مالکۆلم لە ئێران ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەو دەستنووسی کۆنی دەستکەوتووە کە «شەرەفنامە»ی شەرەف خانی بدلیسی یەکێکیان بووە .

مێژووی ئێرانە[٨] چەند جارێك زانیاریی لە «شەرەفنامە»وە وەرگرتووە ، بەڵام بێ ئەوەی ناوی کتێبەکە یا دانەری بهێنێت .

بێ گومان بەکارهێنانی «شەرەفنامە» وەك سەرچاوە لەو کاتەدا لە لایەن شارەزایەکی وەك مالکۆلمەوە بەڵگەیەکی مێژوویییە بۆ نرخی بەرزو بایەخی زۆری «شەرەفنامە» .

دوای جۆن مالکۆلم بە ماوەی بیست ساڵێك مێژوونووسی فەرەنسەیی کاترمێر لە زۆر شوێنی ئەو کتێبەیدا کە ساڵی ١٨٣٦ لە پاریس بە ناوی «مێژووی مەغۆلەکانی ئێران»ەوە بڵاوی کردۆتەوە کەڵکی لە «شەرەفنامە»ی شەرەف خانی بدلیسی وەرگرتووە .

ی . ڤاسیلێڤا بە درێژی باسی شوێنی «شەرەفنامە»ی لە رۆژهەڵاتناسیی رووسیا کردووە . خ .د .فرێن یەکەمین زانای رووسە کە ساڵی ١٨٢٦ لە یەکێك لە رۆژنامەکانی پێتەربورگی پایتەختدا باسی «شەرەفنامە»ی وەك «سەرچاوەیەکی مێژووی یەکجار گرنگ» کردووە[٩] .

پاش سێ ساڵ دیسان فرێن لە نووسینێکیدا باسی «شەرەفنامە»ی کردووەو . داوای کردووە بە زووترین کات فارسیەکەی بڵاوبکرێتەوەو بگۆردرێتە سەر زمانێکی ئەورووپایی .

پاش ماوەیەك زاناو کاربەدەستی کۆڕی زانیاریی ئەوسای رووسیا ڤلیامینۆف زێرنۆف[١٠] ئەرکی بڵاوکردنەوەی «شەرەفنامە»ی بە فارسی گرتە ئەستۆی خۆی و

---

(٨) J. Malcolm , The history of Persia from the most early period to the present time, Vol . II , London, 1815, PP. 207 – 208

(٩) مامۆستا کوردۆیێف لە وتارێکیدا دەڵێت م . ڤۆلکۆڤ یەکەم کەسە کە ساڵی ١٨٢٩ بە درێژی باسی «شەرەفنامە»ی کردووە . بەپێی زانیارییەکانی مامۆستا کوردۆ جگە لە فرێنی ناوبراو ژمارەیەکی تریش لە رۆژهەڵاتناسانی رووس هەر لەو کاتەی ئەودا داوای بڵاوکردنەوەو وەرگێرانی «شەرەفنامە»یان کردووە (بروانە : ك . ك . کوردۆیێف ، کوردناسی ، کتێبی «موزەخانەی ئاسیایی – لقی لینینگرادی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی کۆڕی زانیاریی یەکێتی سۆڤیێت» ، مۆسکۆ . ١٩٧٢ ، ل ٣٨٦ – ٣٨٧) .

(١٠) ڤلیامینۆف زێرنۆف (ڤلادیمیر ڤلادیمیرۆڤیچ ١٨٣٠ – ١٩١٤) یەکێکە لە رۆژهەڵاتناسە ناسراوەکانی رووسیا . شارەزایەکی چاکی زمانو ئارکیۆلۆژیاو مێژوو بوو ، گەلێك زمانی دەزانی ، ساڵی ١٨٦١ کرایە ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری . بەشی زۆری بەرهەمەکانی ڤلیامینۆف زێرنۆف بۆ لێکۆڵینەوەی زمانو مێژووی گەلە رۆژهەڵاتییەکانی ناو رووسیای چارەکان تەرخان کراون . لەبەر ئەوەی یەکێك لەو زانانەی زێرنۆف بە رەوانی دەیزانی فارسی بوو بڵاوکردنەوەی «شەرەفنامە»ی پێ سپێردرا .

توانی ساڵی ١٨٦٠ بەرگی یەکەمی بە پێشەکی‌یەکی بیست لاپەڕەیی بەنرخەوە بە زمانی فەرەنسی بڵاو بکاتەوە[11] .

دوابەدوای ئەوە بە دوو ساڵ بەرگی دووەمیشی لەگەڵ پێشەکی‌یەکی فەرەنسی حەوت لاپەڕەییدا بڵاوکردەوە[12] . جێبەجێ کردنی ئەم کارە هێند لە پایەی زانستی‌ی ڤلیامینۆڤ زێرنۆڤی بەرز کردەوە کە شایەنی ئەوە بێت بە ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری هەڵبژێردرێت .

بەشێکی پڕکەڵکی پێشەکی‌یەکەی ڤاسیلێڤا بۆ باسی دەستنووسەکانی «شەرەفنامە» تەرخان کراوە کە ژمارەیان ، وەك دەڵێت ، یەکجار زۆرە . ژمارەی تۆمارکراوی دەستنووسی «شەرەفنامە تەنها لە کتێبخانە ناسراوەکانی جیهاندا دەگاتە ٢٢ دانە[13] . ئەمەش ، بێ‌گومان ، بەڵگەیەکی تری بایەخی «شەرەفنامە»یە کە وا دیارە لە زووەوە سەرنجی زانایانی ڕاکێشاوەو ژمارەیەکی زۆریان لەسەر نووسیوەتەوە[14] .

بەپێی ئەو زانیاری‌یانەی ی . ڤاسیلێڤا کۆی‌کردوونەوە کۆنترین‌و بەنرخترین‌و ڕاسترین دەستنووسی زانراوی «شەرەفنامە» ئەو دانەیەیانە کە بە دەستوخەتی پیرۆزی شەرەف خان خۆی بە ناوی «شەرەفنامەی تاریخی کوردستان»ەوە نووسراوەتەوەو ئێستە لە کتێبخانەی بودلیانی زانکۆی ئۆکسفۆرد هەڵگیراوە .

ئەم دەستنووسە نایابەی «شەرەفنامە» بریتی‌یە لە ٢٤٦ پەڕەو بە بیست وێنەی دەگمەن ڕازێندراوەتەوەو کۆتایی زولحەجەی ساڵی ١٠٠٥ی کۆچی ، سیازدەی تایی ١٥٩٧ی عیسایی شەرەف خان لە نووسینەوەی بۆتەوە . واتە ئەم دەستنووسە یەکەم دانەی نووسراوەی «شەرەفنامە»یە ، چونکە شەرەف خانی بدلیسی مانگی تایی ساڵی ١٥٩٧ لە نووسینەوەی بەرگی یەکەمی‌و مانگی مایسی ساڵی ١٥٩٩یش لە نووسینەوەی بەرگی دووەمی بۆتەوە .

---

(١١) بەشی فارسی‌یەکەی ئەم بەرگەی «شەرەفنامە» کەوتۆتە ٤٥٩ لاپەڕەوە .

(١٢) بەشی فارسی‌یەکەی بەرگی دووەمی «شەرەفنامە» ٤٥٩ لاپەڕەیە .

(١٣) بڕوانە لاپەڕە حەفدەی پێشەکی‌یەکی ی . ڤاسیلێڤا .

(١٤) دوور نی‌یە تا ئێستەش ژمارەیەکی زۆر دەستنووسی کۆنی‌تری «شەرەفنامە» لە کوردستان ، یا لە شوێنی‌تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبن .

دووەم دانەی بەنرخی دەسنووسی «شەرەفنامە» ئەویانەیە کە لە کتێبخانەی گشتیی لێنینگراد هەڵگیراوە. مێژووی نووسینەوەی ئەمیان ساڵی (١٥٩٨)ە. شەرەف خان بۆ خۆی پیاچۆتەوەو بە دەستی پیرۆزی مۆری تایبەتی‌ی خۆی پیا نوە زۆر بە داخەوە چەند شوێنێکی کەمی ئەم دەسنووسە نەماوە. شایانی باسە ئەم دەسنووسەی «شەرەفنامە» یەکێکە لە بەرهەمە بەنرخەکانی ناو کتێبخانەی بەناوبانگی سەفەوی‌یەکان کە رووسەکان لە رۆژگاری شەڕی ١٨٢٦ - ١٨٢٨دا لە ئەردەبیلەوە گواستیانەوە شاری پێتەربورگ.

دەسنووسێکی تری کۆنی «شەرەفنامە» کە ساڵی ١٦٠٦ لە شاری کلس لە لایەن حەسەن کوڕی نورەددینەوە لەبەر یەکەم نوسخەی «شەرەفنامە» ی. دەستکاری‌ی ە ٣٢٧ پەڕەدا نووسراوەتەوە لە کتێبخانەی بودلیان هەڵگیراوە.

جگە لەمانە ی. ڤاسیلیێڤا باسی ژمارەیەکی‌تر لە دەسنووسە کۆنەکانی «شەرەفنامە»ی کردووە، وەك ئەو دەسنووسانەی لە موزەخانەی بەریتانی‌و کتێبخانەی ئەستەمول‌و چەند شوێنێکی‌تر پارێزراون[١٥].

تا ئیستە چەند جارێك «شەرەفنامە» لە زمانی فارسی‌یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر ژمارەیەك زمانی‌تر. وەك ڤاسیلیێڤا دەیگێڕێتەوە کۆنترین وەرگێڕانی «شەرەفنامە» ئەو دوو وەرگێڕانەن کە بۆ سەر زمانی تورکی بە جیا کراون. یەکێکیان کورت‌کراوەی «شەرەفنامە»یەو، ئەوی‌تریان هەموویەتی. تا ئیستە دوو دەنووسی یەکەمیانو دەسنووسێکی دووەمیان دۆزراونەتەوە، بەلام هیچ کامێکیان بلاو نەکراونەتەوە. کورتەکەی «شەرەفنامە» لە لایەن محەمەد بەگی ئەحمەد بەگی میرزا ناوەوە ساڵی ١٠٧٨ی کۆچی (١٦٦٧ - ١٦٦٨ی عیسایی) وەرگێڕدراوەو ئەوی‌تریشیان نە هەشتاکانی سەدەی حەڤدەمیندا لە لایەن سامی ناوێکەوە کراوە[١٦].

دوای ئەوە بە دەوروبەری دوو صەد ساڵێك بەرگی یەکەمی «شەرەفنامە» لە لایەن یەکێك لە روناکبیرە هەرە زرنگەکانی سەدەی نۆزدەمینی کوردستان، مەلا

(١٥) بڕوانە لاپەڕە ١٧ - ٢٠ی پێشەکی‌یەکەی ی. ڤاسیلیێڤا.
(١٦) لاپەڕە ٢٠ - ٢١ی هەمان پێشەکی.

محمودی بایەزیدی‌یەوە[17] بۆ یەکەم جار کراوەتە کوردی . مەلا مەحمود دەوروبەری ساڵانی ١٨٥٨ – ١٨٥٩ ئەم کارەی بە هاندانی کوردناسی بەناوبانگی ڕووس ئەلێکسەندەر ژابا کردووە[18] . دەسنووسی ئەو کوردی‌یەی «شەرەفنامە» لە کتێبخانەی گشتی‌ی لینینگراد هەڵگیراوە .

هەر لەو دەوروبەرەشدا لە شاری ڤیەنای پایتەختی نەمسا «شەرەفنامە» لە لایەن گ . أ . باربەوە کراوەتە ئەڵەمانی‌و بەرە بەرە لە نێوان ساڵانی ١٨٥٣و ١٨٥٩دا لەگەڵ پێشەکی‌یەکی وەرگێڕدا بڵاوکراوەتەوە .

پاش ماوەیەك کارێکی زانستی‌ی گرنگ دەربارەی «شەرەفنامە» کرا کە بووە هۆی ناساندنی تەواوی بە کۆڕە زانیاری‌یەکانی ڕۆژئاوا . ئەوەبو پرۆفیسۆر ف . ب . شارموا ، کە ئەو کاتە بە گەورەترین زانای فارسی زانی ئەورووپا دادەنرا ، توانی لە نێوان ساڵانی ١٨٦٨ و ١٨٧٥دا لە پێتەربورگ هەردووك بەرگی «شەرەفنامە» بە زمانی فەرەنسی بڵاوبکاتەوە .

ئەو کارە بەرهەمی ڕەنجی بێ وچانی ٣٠ ساڵی شارموا بوو . شارموا «شەرەفنامە»ی لە چاپەکەی ڤلیامینۆف زێرنۆڤەوە وەرگێڕاوە ، بەڵام وێڕای ئەویش کەڵکی لە دوو دەسنووسی کۆنی‌تری وەرگرتووە .

چاپی فەرەنسی «شەرەفنامە» کەوتۆتە چوار بەرگی سەربەخۆوە ، بەشی یەکەمی

---

(١٧) مەلا مەحمودی بایەزیدی زانایەکی پایە بڵندی کوردە ، دەوروبەری کۆتایی سەدەی هەژدە لە دایك بووە ، گەلێك لە زمانی ڕۆژهەڵاتی زانیوە دوای خۆی ژمارەیەکی زۆر بەرهەمی بەنرخی بەجێ‌هێشتووە کە دەمێکە سەرنجی کوردناسانیان ڕاکێشاوە بەرز نرخاندوویانن . کردنی «شەرەفنامە» بە کوردی لە لایەن ئەوەوە بۆ خۆی کارێکی گەورەیە . دەربارەی ژیانەو بەرهەمەکانی مەلا مەحمودی بایەزیدی بڕوانە : «مێژوو» ، ل ١٢٦ – ١٣١ .

(١٨) ئەلێکسەندەر ژابا کاتی خۆی کۆنسوڵی ڕووس بووە ماوەیەکی باش لە ناو کوردا ژیاوە کوردی لە نزیکەوە ناسیوە گەلێك بەرهەمی بەنرخی دەربارەیان نووسیوە .

یەکێك لە بەرهەمەکانی ژابا «جامع ڕسالیانو حکایتان بزمانی کورمانجی»یە کە بریتی‌یە لە ژمارەیەکی زۆر پەندو چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی‌ی کە بۆ خۆی کۆی‌کردوونەوە کردوونی بە فەرەنسی‌و ساڵی ١٨٦٠ لە پێتەربورگ لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپی کردوون . ژابا هاوڕێیەکی نزیکی مەلا مەحمودی بایەزیدی بووە بە یارمەتی ئەو توانیوی‌یە گەلێك دەسنووسی بەنرخ پەیدا بکات‌و لە زۆر لایەنی زمان‌و ژیانی ڕووناکبیری‌ی گەلی کورد بکۆڵێتەوە کە جێگەیان لە کتێبخانەی کوردناسیدا دیارە .

بەرگی یەکەمی ساڵی ١٨٦٨ و بەشی دووەمی بەرگی یەکەمی ساڵی ١٨٧٠و بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی ساڵی ١٨٧٣و بەشی دووەمی بەرگی دووەمی ساڵی ١٨٧٥ لە چاپ دراون[١٩] . شارموا پەیڕەوی‌ی هەموو مەرجە زانیاری‌یەکانی وەرگێڕانی کردووە . بیروڕای خۆی‌و ئەو ڕاست‌و ڕوون‌کردنەوانەی بە پێویستی زانیون لە پەراوێزی کتێبەکەدا بلاوی‌کردوونەوە . هەروەها پێشەکی‌یەکی بۆ نووسیوە کە تێیدا باسی «شەرەفنامە»و هەندێك لایەنی ژیانی کوردەواری‌و جوگرافیای کوردستانی کردووە .

ڤاسیلیێڤا لەگەڵ ئەوەش کە چەند ڕەخنەیەکی بەجێی لە پێشەکی‌یەکەی ف .ب . شارموا گرتووە دانی بەوەدا ناوە کە وەرگێڕانەکە بۆ خۆی «تا ئیمڕۆکەش نرخی زانستی‌ی خۆی لەدەست نەداوە»[٢٠] .

دوابەدوای ئەم زانیاری‌یە بەنرخە کەم زانراوانە ی‌ێ . ڤاسیلیێڤا ئینجا بۆ خۆی دەکەوێتە هەڵسەنگاندنی «شەرەفنامە»و بیروڕای دەردەبڕێت‌و دەڵێت :

نرخی زانیاری‌ی ئەم سەرچاوەیە ئەوەندە زۆرە کە پێویستی بە پیاهەڵدان نی‌یە . هیچ نەبێت لەبەر ئەوەی بە یاریدەی «شەرەفنامە» دەتوانرێت جێگەی گرنگی ون‌بووی گەلی کورد لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دیار بکرێت[٢١] ، ئەمەش بێ‌گومان ، لە نرخاندن نایەت چونکە گەلی کورد ، هەر وەك چۆن ڕۆژهەڵاتناسی هەرەبەناوبانگی ڕووسیاو سۆڤێت ئۆربیللی[٢٢] دەڵێت «کارێکی یەکجار گەورەی کردۆتە سەر ژیانی ڕووناکبیری‌ی ڕۆژهەڵات . کورد گەلێك لە ڕۆڵەکانی خۆی لەژێر ناوی فارس‌و تورك‌و عەرەب‌و ئەرمەندا[٢٣] لەدەست داوە بەوەی ناویان وەك

(١٩) بڕوانە لاپەرە ٢١و ٤٩ی پێشەکی‌یەکەی ی‌ێ . ڤاسیلیێڤا .
(٢٠) لاپەرە ٢٣ی هەمان پێشەکی .
(٢١) لاپەرە ٣٧ی هەمان پێشەکی .
(٢٢) ئارکیۆلۆژو مێژوونووسی سۆڤێتی بەناوبانگ یوسف ئەبگارەویچ ئوربیللی (١٨٨٧ - ١٩٦١) یەکێکە لەو زانا پایە بڵندانەی بە ڤوولی لە زمانو مێژووی گەلی کوردو باری ژیانی سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌ی ئەو تێگەیشتووەو بە چاوی ڕێزەوە سەیری کردوونو خزمەتێکی زۆری کوردناسی‌ی کردووەو دەستێکی باڵای لە پێگەیاندنی ژمارەیەك لە زانا کوردەکانی سۆڤیەتدا هەبووە . شایانی باسە یوسف ئەبگارەویچ ئوربیللی ئەرمەنی‌یە .
(٢٣) دەبوو ئازەربایجانیشی بخاتە سەر .

شعیرو مۆسیقارو جەنگاوەری نەمر مێژووی چەند گەلێك دەرازێننەوە ، ئەمەش کارێکی وای کردووە لە زانستی ئەوروپاو رووسیادا وا باو بێت گوایە کورد نەك تەنها ناتوانێت شتێکی نوێ لە رووناکبیریدا بهێنێتە کایەوە ، بەڵکو توانای ئەوەشی نی یە تەنانەت لە بێگانەشەوە هیچ فێرببێت» . بەڵام ، وەك ڤاسیلێڤا دەڵێت ، بە یاریدەی «شەرەفنامە» دەتوانرێت ئەم کەلێنە گەورەیەی مێژووی گەلانی رۆژهەڵات پربکرێتەوەو شوێنی راستەقینەی نەتەوەی کوردی تێدا دیار بکرێت .

یەکێك لەو ئەنجامە گرنگانەی زانای سۆڤیێتی ئ . ڤاسیلێڤا دەربارەی ناوەرۆکی «شەرەفنامە» پێی گەیشتووە ئەوەیە کە کوردناسان دەتوانن بە یاریدەی ئەم سەرچاوە مێژووییە رەسەنە بە شێوەیەکی قووڵتر لە زۆر رووی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتی ئەمرۆی کورد تێبگەنو رەگو ریشەی خەباتی رەوای ئەم گەلە «لە پێناوی رزگار بووندا لە دەست چەوساندنەوەی نەتەوەیی‌و یەکسانیدا لەگەڵ گەلانی‌تر» دیار بکەن[٢٤] .

ئەم بۆچوونەی ڤاسیلێڤا زۆر راست‌و دروستە ، چونکە «شەرەفنامە»ی شەرەف خانی بدلیسی گەلێك لایەنی گرنگی خەباتی سەختی نەتەوەی کوردی لە سەدەکانی رابوردوودا تۆمار کردووە کە لای مێژوونووسانی خۆو بێگانە نەزانراو بوون ، بەڵکو تا ئەمرۆکەش بە تەواوەتی نەزانراونو ئەمەش بۆتە هۆیەکی گەورەی تێنەگەیشتنی بزوتنەوەی رزگاریخوای نەتەوەیی گەلی کورد لە لایەن بێگانانەوە .

ڤاسیلێڤا پتر لە ١٢٠ لاپەرەی کۆتایی کتێبەکەی بۆ تێبینیو روونکردنەوەو بەراوردکردنو راستکردنەوەو ناوی سەرچاوەو مەڵبەندو کورتە باسێك دەربارەی «شەرەفنامە» تەرخان کردووە . بێ گومان ئەمانەش هێندەی‌تر لە نرخی زانیاریی کارەکەیان بەرز کردۆتەوە . شایانی باسە رۆژهەڵاتناسیی سۆڤیێت هەر زوو بایەخی بەم کارەی ڤاسیلێڤا داو بە دەسکەوتێکی دیاری کوردناسیی لەقەڵەم دا[٢٥] .

زانای ئازەریش مەمێد (محەمەد) شەمسی جگە لە نامەی دوکتۆراکەی

---

(٢٤) لاپەرە ٦٧ی پێشەکییەکەی ئ . ڤاسیلێڤا .

(٢٥) بروانە گۆڤاری «گەلانی ئاسیاو ئەفریقا» ، بە زمانی رووسی ، مۆسکۆ ، ژمارە شەش ، ساڵی ١٩٦٨ ، ل ٢٠١ - ٢٠٢ . گۆڤاری ناوبراو دانی بەوەدا ناوە کە کارەکەی یەفگینا ڤاسیلێڤا لە هەموو رووییەکەوە تەواوو بێگەردەو ئەمەی بە دەسکەوتێکی گرنگی رۆژهەڵاتناسیی سۆڤیێت داناوە .

زنجیره‌یەك وتاری زانستی‌ی دەربارەی شەرەف خانی بدلیسی‌و «شەرەفنامە» بلاوکردۆتەوە ، وەك « مێژوونووسی بەناوبانگی کورد شەرەف خانی بدلیسی»[26] و «باسی ڕاپەڕینەکانی سەدەی شازدەمینی هۆزە کوردەکان لە شەرەفنامەدا»[27] .

دوکتۆر شەمسی لە نامەی دوکتۆراکەیدا بە درێژی باسی ژیان‌و بەسەرهاتی شەرەف خان‌و باری ژیانی سیاسی‌و کۆمەلایەتی کوردستان لە سەدەی شازدەمدا دەکات‌و لە ناوەرۆکی «شەرەفنامە» دەدوێت . بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسانە ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی کۆنی وەك «نزهة القلوب»ی حەمدەڵلا قەزوینی‌و بەرهەمی ژمارەیەك مێژوونووسی ڕۆژگاری شەرەف خانی بەکار هێناوە ، وەك بەرهەمی قازی ئەحمەدی غەفاری .

دوکتۆر شەمسیش ، وەك ڤاسیلیێڤا ، بە درێژی باسی بایەخی «شەرەفنامە»ی کردووەو لەو بارەیەوە نووسیویە‌یە دەڵێت : مێژوونووسانی دوای شەرەف خان . وەك کاتب چەلەبی‌و ئەولیا چەلەبی‌و زۆری‌تر ، لە بەرهەمەکانیاندا لە هەر سەرچاوەیەك زیاتر «شەرەفنامە»یان بەکار هێناوە . هەمان کات شەمسی ئەم هەڵەیەشی ڕاستکردۆتەوە کە گوایە شەرەف خان ، وەك ژمارەیەك مێژوونووس دەڵێن ، «شەرەفنامە»ی بە هاندانی شای ئێران داناوە . لە ڕاستیدا ئەو کاتەی شەرەف خان «شەرەفنامە»ی داناوە زۆر لە سوڵتانی عوسمانی‌یەوە نزیك بووەو بەپێی قسەی دوکتۆر شەمسی عوسمانی‌یەکان تەنانەت یاریدەشیان داوە .

کەچی لەگەڵ ئەوەش لە ناوەرۆکی «شەرەفنامە»دا تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر هەست بە بێ لایەنی‌و لانەدان دەکرێت . بە وێنە شەرەف خان بە یەك جۆر بە شانو باهوی شا توهماسب‌و سوڵتان موورادی سێیەمیدا هەڵداوەو خۆی لەوە کەڕ کردووە کە ئەو جووتە پاشایە شیرو تیریان لێك دەسوو . .

شەرەف خان بۆ خۆی بە ڕوونی ئەو هۆیەی دەستنیشان کردووە کە پاڵی پێوە ناوە «شەرەفنامە» بنووسێت . لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێت لەبەر ئەوەی

---

(٢٦) بڕوانە گۆڤاری «هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری ئازەربایجانی سۆڤێت» ، بە زمانی ڕووسی‌و ئازەری . ژمارە یەك ، ساڵی ١٩٦٧ . ل ٦٧ - ٧٢ .

(٢٧) هەمان گۆڤار ، ژمارە یەك ، ساڵی ١٩٦٨ ، ل ٤٠ - ٤٦ .

مێژوونووسان تاوەکو ئیستە هیچیان دەربارەی کوردو کوردستان نەنووسیوە من ویستم هێتی توانا لەو بارەوە کتێبێك بنووسم‌و ناوی لێ بنێم «شەرەفنامە»و هەموو ئاواتیشم ئەوەیە خانەدانانی کوردستان ناویان ون نەبێت !

کەوابێ بەر لە هەر شتێك‌و پتر لە هەر هەوەیەك گیان‌و هەستی کوردایەتی شەرەف خانیان بزرواندووە بۆ ئەوەی «شەرەفنامە» بنووسێت . بەڵگەی ئەم ڕاستی‌یە لە ناو «شەرەفنامە» خۆیدا جارەهای جار بەر چاو دەکەوێت . بە وێنە لە سەراپای «شەرەفنامە»دا بە ئاشکرا ، یا بەژێر لێوەوەو بە ناوی هەڵدان بە شان‌و باهوی سوڵتاندا ، شەرەف خان دەڵێت :

«کوردستان ولاتێکە نە بە کەس داگیر دەکرێت‌و نە سەر بۆ کەس شۆڕ دەکات ! » .

سەرەڕای هەموو ئەمانە شەرەف خانی بدلیسی یەکەم کەسە هەوڵی داوە بە شێوەیەکی دروست‌و بێ پێچ‌و پەناو دەستکاری‌ی سنووری کوردستان دیار بکات . بەر لە شەرەف خان‌و بە تایبەتی لە ڕۆژگاری سەلجوقیکانەوە کوردستان بەو مەڵبەندانە دەگوترا کە کەوتبوونە نێوان ئازەربایجان‌و لورستان‌و ڕۆژئاوای زنجیرە شاخەکانی زاگرۆسەوە . بەڵام لە «شەرەفنامە»دا سنووری کوردستان لە مەلاتی‌یەوە دەست پێ‌دەکات‌و لەسەر ڕۆخی خەلیج کۆتایی دێت . . ئەمانەش هەموو لە ڕاستیدا نیشانەی ئەوەن کە وا لە سەدەی شازدەمیندا سەرەتای دروست‌بوونی هەستی نەتەوەیی لە ناو سەردارانی کوردا لە ئارادا بووە .

ڕوویەکی گرنگی‌تری کارە زانستی‌یەکانی دوکتۆر شەمسی دەربارەی «شەرەفنامە» ئەوەیە کە بە یاریدەی ناوەرۆکی‌و لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازێکی زانیاری‌ی دروستدا توانیوی‌یە چەند لایەنێکی ئاڵۆزو کەم زانراوی ژیانی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌ی چەند ناوچەیەکی کوردستان لە کۆتایی سەدە ناونجی‌یەکاندا دیار بکات . بەپێی زانیاری‌یەکانی ناو «شەرەفنامە» بناغەی ژیانی ئابووری میرنشینی بدلیس لە سەدە ناونجی‌یەکاندا لەسەر جۆری زەویداری‌ی پچوك دامەزرابوو ، چاوساندنەوەی جوتیارانیش قاڵبی تایبەتی‌ی خۆی وەرگرتبوو ، بەوەی لە سنووری تەنها بەرهەم هێناندا چوبووە دەرێ . جوتیاران دەبوو وێڕای ئەوەش پارێزگاری‌ی بەرژەوەندە سیاسی‌یەکانی سەرۆکەکانیان بکەن‌و لە هەموو شەڕەکانی ئاغاکانیاندا بەشدار بن ،

ئەو شەڕانەی بەشێکیان ئەنجامی دووبەرەکی‌ی سەرۆکە دەرەبەگەکان خۆیان بوون.

شایانی باسە نامەی دوکتۆراکەی مەمێد شەمسی وەك کتێبیش بە هەمان ناوەوە بلاوکراوەتەوە. ئەم کتێبەش کە دەسکەوتێکی تری کوردناسی‌ی سۆڤێتە، بریتی‌یە لە ١٤٤ لاپەڕەو ١٧٠٠ دانەی لێ چاپکراوە. دوکتۆر شەمسی کەڵکی لە ٣٤ سەرچاوەی هەمەجۆر وەرگرتووە کە ناویان لە کۆتایی کتێبەکەدا تۆمار کراوە.

قەناتی کوردۆش ساڵی ١٩٧٢ لەو وتارەیدا کە بە ناوی «کوردناسی»یەوە بلاوی کردۆتەوە باسی «شەرەفنامە»ی کردووە[٢٨]. لەو وتارەیدا کوردۆیێف بە تایبەتی سەرنجی بۆ دەسنووسە کۆنەکانی «شەرەفنامە» راکێشاوە[٢٩].

وەك کوردۆیێف دەڵێت م. ڤۆلکۆڤ یەکەم کەسە بە درێژی لە بیستەکانی سەدەی نۆزدەمیندا لە چەند لاپەڕەیەکدا باسی دەسنووسەکانی «شەرەفنامە»ی کردووەو خ. د. فرێنیش یەکەم کەسە کە هەر لەو دەوروبەرەدا لە وتارەکانی خۆیدا باسی بایەخ و پێویستی‌ی بلاوکردنەوەو وەرگێرانی «شەرەفنامە»ی کردووە[٣٠]. دوای ئەوە مامۆستا قەناتی کوردۆ دێتە سەر باسی مێژووی لێکۆڵینەوەی «شەرەفنامە» لە لایەن رۆژهەلاتناسانی رووسیاو شورەوی‌یەوە.

بەم جۆرە «شەرەفنامە» شوێنی شایانی خۆی لە کوردناسی‌ی سۆڤێتدا هەیە. ئەو راستی‌یانەی لەسەرەوە باسمان کردن تا رادەیەك یاریدەی دیارکردنی نرخی زۆری چاپی کوردی‌ی «شەرەفنامە» دەدەن[٣١]. بێ‌گومان مامۆستا هەژار بە وەرگێرانی «شەرەفنامە» بۆ سەر زمانی کوردی کەلەبەرێکی گەورەی لە کتێبخانەی کوردیدا پڕکردەوەو «کۆڕی زانیاری کورد»یش بە بلاوکردنەوەی ئەرکێکی گرنگی سەر شانی بەجێ هێنا.

---

(٢٨) دەربارەی ئەو وتارەی کوردۆیێف بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٩.

(٢٩) بە تایبەتی ئەوانەیان کە لە ئارشیڤەکانی لینینگرادا پارێزراون.

(٣٠) ك. ك. کوردۆیێف، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٣٨٦ - ٣٨٧.

(٣١) مەبەست وەرگێڕانەکەی مامۆستا هەژاری شاعیرە کە کاتی خۆی بە یاریدەی «کۆڕی زانیاری کورد» چاپی کرد.

## گەردلێڤسکی (١٨٧٦–١٩٥٦) :

لە دەمێکەوە کوردناسی بووەتە لقێکی دیاری رۆژهەڵاتناسی سۆڤیەت. ژمارەیەك لە رۆژهەڵاتناسە ناودارەکانی رووسیا بەر لە شۆرشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ بە ماوەیەکی زۆر بناغەی کوردناسی‌یان دارشت[١]. وا رێك‌کەوت بەشێك لە دەستەی دووەمی ئەو رۆژهەڵاتناسانە ببنە هاوچەرخی دوو رۆژگارو دوو رژێمی جیاواز – سەردەمی رووسیای پێش ئۆکتۆبەرو سەردەمی سۆڤیەتستانی پاش ئۆکتۆبەر. یەکێك لەوانە رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ گەردلێڤسکی بوو.

ڤلادیمێر ئەلێکسەندرەڤیچ گەردلێڤسکی[٢] رۆژی نۆزدەی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٧٦ لە شاری سڤیابۆرگ لەدایك بووە. باوو باپیری ئەفسەری ئەشکری چارو سەر بە دەستەی خوێندەواری رۆژگاری خۆیان بوون، بەڵام ئەو رێگەی سەربازیی نەگرتەبەرو لە هەرەتی لاوی‌یەوە خولیای رۆژهەڵات دای لە کەللەی. ساڵی ١٨٩٩ لە مۆسکۆ بەشی زمانەوانیی رۆژهەڵاتی لەئامۆزگای لازەرێڤ تەواوکردو پاش پێنج ساڵ لق فیلۆلۆجیای سەر بە زانکۆی مۆسکۆی بری.

---

(١) شارەزایانمان ئاوەکو لیستە گەلێك بەرهەمی بەکەڵکیان دەربارەی کوردناسیی رووسی‌و سۆڤیەتی بلاوکردووەتەوەو وەرگێراوە (بەوێنە بروانە :
د. ئەورەحمان حاجی مارف، لەبارەی کوردناسی‌یەوە لە رووسیاو یەکیەتیی سۆڤیەت، – «گۆڤاری کۆری زانیاری کورد»، ژمارە ٢–١، ١٩٧٤، ل ٤٩٩ – ٥٦٨، تاريخ الاستشراق والدراسات العربية والكردية في المتحف الاسيوي ومعهد الدراسات الشرقية في لينينغراد ١٨١٨ – ١٩٧٨، تأليف مجموعة من المستشرقين السوفيات، ترجمه وعلق عليه وقدم له الدكتور معروف خزندار. بغداد ١٩٨٠).

(٢) بۆ نووسینی کورتەی ژیننامەو چالاکی‌یە زانستی‌یەکانی ڤ. أ. گەردلێڤسکی کەڵکمان لە چەند سەرچاوەیەکی ئەنسکلۆپیدی‌و لە پێشەکی‌یەکانی کارە هەڵبژاردەکانی خۆی وەرگرتووە.

گەرلێفسکی دوای ئەوەی ساڵی ١٩٠٧ بووە مامۆستا لە ئامۆژگای لازەرێف . ئیتر هاتە مەیدانی نووسین‌و توێژینەوەو فێرکردنەوە . لەوساوە وتەوەی زمان‌و مێژووی ئەدەبی تورکی پێ‌سپێردراو بە نۆ ساڵ گەیشتە پلەی بەرزی پرۆفیسۆر . ساڵی ١٩٢٩ گەردلێفسکی بووە ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری سۆڤیەت‌و ساڵی ١٩٤٦یش بووە ئەندامی کارای . دوا ساڵانی ژیانی بووە سەرۆکی بەشی زمان‌و ئەدەبی وڵاتانی رۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاستی سەر بە ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی کۆڕی زانیاری سۆڤیەت .

کارە زانستی‌یەکانی ڤلادیمێر ئەلێکسەندرەڤیچ گەردلێفسکی کەلێنێکی گەورەیان لە کتێبخانەی رۆژهەڵاتناسیدا پڕکردووەتەوە . ژمارەی ئەو کارانە خۆی دەدا لە نزیکەی ٣٠٠ وتارو کتێبی هەمەجۆر . تەنها بەرهەمە هەڵبژاردەکانی چوار بەرگی سەربەخۆیان پڕکردووەتەوە کە بەسەریەکەوە ٢٣١٠ لاپەڕەی گەورەن (١٦×٢٥سم) . بەرهەمەکانی گەردلێفسکی بەری شەونخونی‌و رەنجی بێ‌وچانی پەنجا ساڵەی زانایەکی زرینگ‌و لەخۆبوردوون .

گەردلێفسکی لە بەرهەمەکانیدا لە هەر شت زیاتر بایەخی بە زمان‌و ئەدەب‌و مێژووی تورك داوە ، بەتایبەتی لە رۆژگاری سەلجووقی‌و عوسمانی‌یەکاندا . بەهۆی ئەوەوە کە گەلێك زمانی دەزانی‌و لە تورکیدا تەواو قاڵ بووبوو سەرچاوەی باسەکانی هەمەجۆرو دەوڵەمەندو رەسەنن .

شەقڵی بێ‌لایەنی‌و وردی‌و بەراوردو تەتەڵەکردنی زانستی‌یانە بە بەرهەمەکانی‌یەوە دیارن . بەر لە شەری یەکەمی جیهان‌و لە ساڵەکانیداو دوای تەواوبوونی چەند جارێك گەردلێفسکی بۆ خۆی چووەتە ناو خاکی تورکیاوەو بست بە بست زۆر ناوچەی پێواوەو لە نزیکەوە تێکەڵ بە ئاغاو میرو جووتیارو کرێکارو پیشەگەرو فەرمانبەری ئەو وڵاتە بووەو وەستایانە ئەوەی مەبەستی بووە لێی وەرگرتوون‌و بەرهەمەکانی هێندەی‌تر پێ دەوڵەمەند کردوون . بەپێی قسەی شارەزایان ئەو کتێبەی کە ساڵی ١٩١٦ بە ناوی «تێکستەکانی فۆلکلۆری عوسمانی»یەوە بڵاوی کردووەتەوە تا ئیستەش کەم هاوتایە . گەردلێفسکی لاپەڕەکانی ئەو کتێبەی بەو گۆرانی‌و بەستەو پەندو قسەی نستەق‌و مەتەڵانە پڕکردووەتەوە کە بۆخۆی لەسەر زاری خەڵکی‌و لەناو خاکی تورکیادا کۆی کردوونەوە .

زانایان ڕەنجی بێوچانی ڤلادیمێر ئەلێکسەندرەڤیچ گەردلێڤسکی‌یان زۆر بەرز ڕخاندووە. عەرەبناسی بەناوبانگ‌و ئەندامی ژمارەیەك كۆڕی زانیاری ولاٌتە ڕۆژهەلاٌتی‌یەکان ئی. یو. کراچکۆڤسکی لە نامەیەکی تایبەتیدا پێی‌گوتووە:

«تۆ لە کەس ناکەیت، تارادەیەك لە هەموو
مێژووی زانستی ڕۆژهەلاٌتناسیماندا بێوێنەیت».

هەمووی بەسەریەکەوە چوار ساڵ بەسەر کۆچی دوایی گەردلێڤسکیدا تێپەڕی (ڕۆژی دەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٦ کۆچی دوایی‌کرد) کاتێك بەشی مێژووی کۆڕی زانیاری سۆڤیەت ڕۆژی ٨ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٧ بڕیاری بلاٌوکردنەوەی هەلٌبژاردەی کارەکانی دەرکردو بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو مەبەستە لێژنەیەکی تایبەتی لە چەند شارەزایەك دامەزراند. وەك گوتمان ئەو کارانەی گەردلێڤسکی بەتەنها چوار بەرگی گەورەیان پڕکردووەتەوە. بەرگی یەکەمیان[٣] بۆ بەشێك لە بەرهەمەکانی خاوەنی دەربارەی مێژووی سەدە ناوئجی‌یەکانی تورکیا تەرخان‌کراوە. لە بەرگی دووەمیاندا[٤] ئەو کارانەی گەردلێڤسکی بلاٌوکراونەتەوە کە لە زمان‌و فۆلکلۆرو ئەدەب دەکۆلٌنەوە. هەلٌبژاردەی زنجیرەیەکی‌تر لە بەرهەمە مێژوویی‌یەکانی گەردلێڤسکی لەگەلٌ چەند نووسراوێکی جیاوازی دەربارەی ژیانی ڕووناکبیری بەر بەرگی سێیەمیان کەوتوون[٥]. هەرچی باسەکانی دوا بەشی ئەو کارانەشە لە ئەتنۆگرافیاو مێژووی ڕۆژهەلاٌتناسی‌و بەرهەمی زانایان دەدوێن[٦].

---

(٣) ئەکادیمی ڤ. ا. گەردلێڤسکی، کارە هەلٌبژاردەکانی، بە زمانی ڕووسی، بەرگی یەکەم (بەرهەمی مێژوویی)، مۆسکۆ، ١٩٦٠، ٥٥٢ ل.

(٤) ئەکادیمی ڤ. ا. گەردلێڤسکی، کارە هەلٌبژاردەکانی، بەرگی دووەم (زمان‌و ئەدەب)، مۆسکۆ، ١٩٦١، ٥٥٨ ل.

(٥) ئەکادیمی ڤ. ا. گەردلێڤسکی: کارە هەلٌبژاردەکانی، بەرگی سێیەم (مێژوو و ڕووناکبیری)، مۆسکۆ، ١٩٦٢، ٥٥٨ ل.

(٦) ئەکادیمی ڤ. ا. گەردلێڤسکی، کارە هەلٌبژاردەکانی، بەرگی چوارەم (ئەتنۆگرافیا، مێژووی ڕۆژهەلاٌتناسی، نرخاندن)، مۆسکۆ، ١٩٦٨، ٦١٢ ل.

له هەر چوار بەرگی کارە هەڵبژاردەکانی گەردلێڤسکیدا ناوی کوردو کوردستانو ژمارەیەکی زۆر لە شارەکانی لە سەردەمی جیاوازدا هاتووە[٧] .

**چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی سەدە ناونجی‌یەکانی کورد :**

وەك زانایەکی بەتوانا ڤلادیمێر ئەلێکسەندرەڤیچ گەردلێڤسکی خۆی لە قاوغی تورکناسیدا نەبەستەوە . ئەو زۆر بەرز ڕۆڵی گەلانی ڕۆژهەلاتی لە مێژووی ژیاری مرۆڤدا دەنرخاند . هەروەها لە مەیدانی زانستی ڕۆژهەلاتناسی خۆشیدا دەستی باڵا بوو . لەبەر ئەو هۆیانەو چەند هۆیەکی تری وەك ئەوانە قەڵەمی گەردلێڤسکی گەلێك جار لە نزیکەوە توخنی ئەو باسانە کەوتووە کە پێوەندیان بە مێژوو و ژیانی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و ئەدەبی گەلی کوردەوە هەیە . جاری‌وا هەیە لە بەرهەمەکانی ئەو زانایەدا تووشی لاپەڕەی وای مێژووی کورد دێین کە بۆ خۆمان ، زۆر بەداخەوە ، شتێکی ئەوتۆیان لێ نازانین . ئەو ڕاستی‌یانەی سەبارەت بە کورد لە کتێبی «دەوڵەتی سەلجووقی‌یەکانی ئاسیای پچووك»دا هێناونی‌یەوە هەرچەندە بە ژمارە کەم‌و بە بارست پچووکن ، بە ناوەرۆك دەوڵەمەندو نایابن ، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەش لەیادنەکەین کە ڕوونکردنەوەی مێژووی سەدە ناونجی‌یەکانی کورد کارێکی ئاسان نی‌یەو هەر لەبەر ئەوەش زوربەی ئەو بەرهەمانەی تائیستە مێژوونووسە دڵسۆزەکانمان دەربارەی ئەو ڕۆژگارە دایانناون تا ڕادەیەکی زۆر پچڕ پچڕو لێك‌دابڕاون . پێم‌وایە زانیاری‌یەکانی ناو «دەوڵەتی سەلجووقی‌یەکانی ئاسیای پچووك» یاریدەی پڕکردنەوەی چەند درزو کەلەبەرێکی ئەو مێژووەمان دەدەن کە پێویستە ببێتە پرۆژەی بەرهەمێکی گەورەی دوارۆژ .

ساڵی ١٩٤١ گەردلێڤسکی کتێبی «دەوڵەتی سەلجووقی‌یەکانی ئاسیای پچووك»ی بۆ یەکەم جار بلاوکردەوە[٨] . ئەو کتێبە لەبەر چەند هۆیەك بە گرنگترینی بەرهەمەکانی گەردلێڤسکی دادەنرێ . مێژووی سەلجووقی‌یەکانی ئاسیای پچووك باسێکی گران‌و پڕ

---

(٧) بەوێنە لە بەرگی یەکەمیاندا سێ جار ناوی کوردستانو گەلێك لەوەیش زیاتر ناوی شارەکانی بەجیا هاتووە . تەنها ئامەد (دیار بەکر) یازدە جارو بتلیس نزیکەی بیست جار ناویان لەو بەرگەدا هاتووە .

(٨) یەکەم باسە کە لە کارە هەڵبژاردەکانیدا بلاوکراوەتەوە ، نزیکەی ٣٠٠ لاپەڕەی بەرگی یەکەمی گرتووەتەوە .

ـه کێشەیە ، بەتایبەتی چونکە هێرشی بێ ئامانی مەغۆلی لە سەدەی سیازدەمیندا بووە هۆی فەوتانی گەلێك بەڵگەو دەستنووسی بایەخدار دەربارەی ژیان و دام و دەزگای سەلجووقی یەکان . بەڵام گەردلێڤسکی بە یارمەتی سەرچاوە تورکی و فارسی و ئەرمەنی و گورجی و سریانی یە کۆنەکان و ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵینەوەی مێژوونووسە ئەورووپایی یەکان توانیویە لە زۆر لایەنی وردی ئەو باسە بکۆڵێتەوە . لە شازدە فەسڵی ئەو بەرهەمەیدا گەردلێڤسکی بەدرێژی باسی تورك و مەغۆل و ئۆغۆزو هۆزە کۆچەرەکانی ئاسیای پچووك لە سەدەی شازدەمینەوە تاوەکو سەدەی هەژدەمین و ، دەرەبەگایەتی ئەو مەڵبەندە لە هەمان ڕۆژگارو ، ژیان و دەسەڵاتی سوڵتانە سەلجووقی یەکان و پیشەگەری و پیشەسازی و بازرگانی و شارو لادێ و لەشکرو کارگێری و ئایین و داب و نەریتی سەلجووقی یەکانی ئاسیای پچووکی کردووە[9] .

سەلجووقی یەکان کە یەکێك بوون لە هۆزە ئۆغۆزە تورکمانە کۆچەرەکان سەرەتا لەو ناوچەیەی ئاسیای ناوەندا دەژیان کە کەوتووەتە لای ڕاستی ڕووباری زەرئەفشانەوە لە نێوانی بوخاراو سەمەرقەندا[10] .

شوانی پیشەی سەرەکی ئەوسای سەلجووقی یەکان بوو . دوای ئەوەی لە دەوروبەری کۆتایی سەدەی دەیەمیندا سەلجووقی یەکان موسوڵمان بوون ، ئاڵ و گۆڕێکی بنەڕەتی لە ژیانیاندا دەستی پێ کرد ، بەتایبەتی چونکە دەسەڵاتی سەرکردەکانیان لەژێر پەردەی ئەودا ئاسانتر دەگەیشتە زەوی وزاری گەلە ناموسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵات . ئەوە بۆخۆی بووە هۆیەکی گەورەی ڕاکێشانی سەلجووقی یەکان بەرەو ئاسیای پچووك کە بەشێکی زۆری ئەوساکە بەدەست عیسایی یەکانەوە بوو .

سەدەی یازدەمین کاتێك سەلجووقی یەکان بەرەو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست هاتن بەر لە هەر شوێن ڕوویان کردە ئێرانی نزیك خۆیان .

---

(٩) بڕوانە : ڤ . ا . گەردلێڤسکی . کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، ل ٣١-٣١٨ .

(١٠) بۆ باسی کورتەی مێژووی سەلجووقی یەکان جگە لە بەرهەمەکانی ڤ . ا . گەردلێڤسکی کەڵکم لە چەند سەرچاوەیەکی تریش وەرگرتووە ، بەتایبەتی لە کتێبی . أ . د . نۆڤیچێڤ . تورکیا . کورتەی مێژووی ، بە زمانی ڕووسی ،مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

سالّی ١٠٤٠ پێشەنگی سەلجووقی یەکان بۆ یەکەمجار پیٚیان نایە ناو خاکی ئێرانەوەو لە ماوەی پازدە ساڵدا توانی یان دەسەڵاتیان بگەیێننە هەموو ناوچەکانی. گرتنی ئێران توانای سەلجووقی یەکانی زیاتر کرد، وای لی کردن بێ سڵ کردنەوە رووبکەنە عیراق و سووریەو ئازەربایجان و کوردستان و ئەرمەنستان. لەنێوان ساڵانی ١٠٤٢ و ١٠٥١دا سەلجووقی یەکان توانی یان بەشی زۆری کوردستان داگیر بکەنو بیخەنە سەر دەوڵەتە فراوانەکەیان کە ساڵی ١٠٥٥ بە داگیرکردنی بەغدا هێندەی تر دەسەلاتی پەیدا کرد.

بەو جۆرە سەلجووقی یەکان تاوەکو ناوەندی سەدەی یازدەمین گەیشتنە سەر سنووری ئاسیای پچووك کە لەبەر زۆر هۆ سەرنجی راکێشابوون.

ئاسیای پچووك وڵاتێکی فراوان و دەوڵەمەندو خۆش و کەم دانیشتوو بوو. ئەوساکە بەشی زۆری ناوچەکانی بەدەست بیزەنتەیی یە عیسایی یەکانەوە بوو. لە دەمێکەوە فەرمانڕەوایانی جیهانی ئیسلام بیریان لەوە دەکردەوە ئەو پارچە گرنگەی رۆژهەلات بگرنە دەست خۆیان چونکە ببووە بنکەیەکی ترس لی کراوی عیسایی یەکان کە دەیانویست لە رێگەیەوە بگەنەوە مەڵبەندە پیرۆزەکانیان لە فەلەستین. سەردارە سەلجووقی یەکان دەیانزانی بەئاسانی دەتوانن رەوەی خەڵکی سادەو ساکار بەرەو ئەو ناوچانە بنێرن کە داگیرکردنیان، بێگومان، دەبووە هۆی بەرزبوونەوەی ناوو شۆرەتیان لەناو هەموو موسوڵمانانی جیهاندا.

لە ناوەندی سەدەی یازدەمینەوە سەلجووقی یەکان بۆ یەکەم جار کەوتنە هێرش بردنە سەر ئاسیای پچووك، بەلام بەهۆی تەوژمی بیزەنتەیی یەکانەوە هێرشەکانی ئەو قۆناغەیان پچڕ پچڕو کەم ئەنجام بوون، دوابەدوای هەر هێرشێك ناچار دەبوون بکشێنەدواوە. هەر لەوساشەوە بەشێکی زۆر لەو شەڕانەی لە نێوانی بیزەنتەیی و سەلجووقی یەکاندا دەقەومان بەر خاکی کوردستان کەوتن. لە شەستەکانی سەدەی یازدەمینەوە سروشتی هێرشی سەلجووقی یەکان بۆ سەر ئاسیای پچووك گۆڕا، لەوساوە ئیتر توانی یان بنکەی چەسپاو لەو مەڵبەندەدا بۆ خۆیان دابمەزرێنن. ئەوەبوو ساڵی ١٠٧١ لە نزیك مەلازگردی[١١] کوردەواری یەوە لەشکری بیزەنتەیی یان بەزاند.

---

(١١) مەنازکرت.

پاش دە ساڵ سەلجووقی یەکان ئیزنیکیان داگیرکردو کردیانە پایتەختی خۆیان . ساڵی ١٠٨٥ ئەزمیریشیان گرت و بەو جۆرە دەوڵەتی سەلجووقی لە ئاسیای پچووکدا دامەزرا کە میرنشینی سەلجووقیشی پێ دەگوتری و بریتی بوو لە بەشێك لە دەوڵەتی گەورەی سەلجووقی یەکان . ساڵی ١١١٦ سەلجووقی یەکانی ئاسیای پچووك شاری قۆنیەیان کردە پایتەختی میرنشینەکەیان کە لەوساوە بە ناوی میرنشینی قۆنیەشەوە ناودەبری .

میرنشینی سەلجووقی ئاسیای پچووك تا دەهات پەرەی دەسەند ، بەتایبەتی دوای ئەوەی ساڵی ١١٨٠ توانی میرنشینی دانشمەندیی دراوسێی لەناوبەرێت[١٢] . کە دەسەڵاتی سەلجووقی یەکان گەیشتە ئەورادەیە ئینجا زیاتر بەرەو رۆژئاوا کشان تا گەیشتنە ئەو ناوچانەی ئاسیای پچووك کە کەوتوونەتە سەر دەریا .

بەو جۆرە لە کۆتایی سەدەی دوازدەمین و سەرەتای سەدەی سیازدەمیندا دەوڵەتێکی گەورەی تورك بە سەرکردایەتیی بنەماڵەی سەلجووقی لە ئاسیای پچووکدا دامەزرا . ئەو دەوڵەتە لە رۆژگاری فەرمانرەوایی سوڵتان عەلائەددین کەیقوبادی یەکەمدا (١٢١٩ – ١٣٢٦) گەیشتە لەقەپۆپەی دەسەڵات و پێشکەوتن . لەژێر سێبەری ئەو سوڵتانەدا باسی ئاوەدانیی قۆنیەو قەیسەری یەو سیواس و شارانی تری ئاسیای پچووك کەوتبووە سەر زاران .

لە دەوروبەری ناوەندی سەدەی سیازدەمینەوە لەگەڵ هێرشی مەغۆلەکاندا رۆژی میرنشینی سەلجووقیی ئاسیای پچووك بەرەو کەل رووی لە ئاوابوون کرد . تا سەرەتای سەدەی چواردەمین شیرازەی بەجارێك تێکچوو ، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی ١٣٠٧ەوە بەسەر ژمارەیەك میرنشینی پچووکدا دابەش بوو . زۆری نەبرد عوسمانی یەکان بوونە میراتگری و جێگەیان گرتەوە .

لەبەر ئەوەی میرنشینی سەلجووقیی ئاسیای پچووك توانیی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەیەکی فراوانی کوردستان و عەرەبستان و ئەرمەنستاندا داسەپێنێ مێژووی

---

(١٢) ساڵی ١٠٦٧ دانشمەندەکان . کە ئەوانیش هۆزێکی تورك بوون . توانی یان میرنشینێکی سەربەخۆ لە ناوچەکانی باکووری رۆژهەڵاتی ئاسیای پچووکدا دابمەزرێنن و شاری سیواسیان کردە پایتەختی . لەوساوە دووبەرەکی قورس لەنێوان میرنشینی دانشمەندو میرنشینی سەلجووقیدا دەستی پێ کرد کە بە سەرکەوتنی دووەمیان کۆتایی هات .

بەسەرهاتو رووداوەکانی لە هەزار سەرەوە لەگەڵ مێژووی کوردو عەرەبو ئەرمەنو رۆمدا[13] یەك دەگرنەوە . لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا بەداخەوە تاوەکو ئیستە مێژوونووسانمان ، هێندەی من ئاگادارم ، نەیانتوانیوە ، یا بۆیان نەلواوە نە شتێکی کەم بەولاوە دەست بۆ هیچ لایەنێکی ئەو مێژووە بەرن . مێژوونووسی گەورەمان مامۆستا ئەمین زەکی چەند لاپەرەیەکی پێوندی کوردی بە سەلجووقی‌یەکانی ئێرانو عێراقەوە بۆ روونکردووینەوە[14] ، بەڵام زۆر کەم نەبێ دەستکاری هیچ کامێك لە باسەکانی پێوەندی کوردی بە سەلجووقی‌یەکانی ئاسیای پچووکەوە نەکردووە[15] . تەنها عەبدولرەقیب یووسف لە کتێبەکەی خۆیدا کە لەبارەی دەوڵەتی دۆستەکی‌یەوەیە[16] چەند راستی‌یەکی بایەخداری سەرەتای ئەو رۆژگارەی کوردستانی بۆ هێناوینەوە چونکە دەوروبەری ساڵی ٤٧٦-٤٧٨ك (١٠٨٣-١٠٨٦ز) دەوڵەتی دۆستەکی لەسەر دەستی سەلجووقی‌یەکانی ئاسیای پچووکدا رووخا .

کەوابێ کەلێنێکی دیار ، وەك زۆر کەلێنی گەورەی‌تر ، وا لە مێژووی سەدە ناوێجی‌یەکانی کوردا کە پڕکردنەوەی پێویستی بە قوڵنگی فەرهادیی دڵسۆزانە . ئەوانەی ناچارن بە دەرزی بکەونە کێوی بێستوون تاوەکو بتوانن دێرە ونەکانی مێژووی ئەو رۆژگارە بدۆزنەوە . جاروبار ئەو دێرانە لە دووتوێی بەرهەمی رۆژهەڵاتناساندا بەدی دەکرێن کە بۆیان هەیە چمکێك بخەنە سەر گەنجینەی تاوەکو ئیستە هەژاری مێژووی رابوردوومان . دەبێت لەو قوژنەوە بەهای ئەو زانیاری‌یانە دیاری‌بکەین کە ڤلادیمێر ئەلێکسەندەرەڤیچ گەردلێڤسکی دەربارەی کورد لە رۆژگاری سەلجووقی‌یەکانی ئاسیای پچووکدا هێناوی‌یەوە .

---

(١٣) مێژوونووسانی ئیسلام ناوی رۆمیان لە بیزەنتی‌یەکان نابوو . ناوی شاری ئەرزرۆم (ئەرزی رۆم)یش هەر لەوەوە هاتووە .

(١٤) محمد امين زكي ، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان ، ترجمة محمد علي عوني ، القاهرة ، ١٩٣٦ ، ص ١٤٥ - ١٥١ .

(١٥) بەوێنە بڕوانە ئەو چەند دێرەی دەربارەی هێرشی عەلائەددین کەیقوبادی سەلجووق بۆسەر ئامەد (دیاربەکر) هێناوی‌یەوە (هەمان سەرچاوە . ل ١٥٨ - ١٥٩) .

(١٦) عبدالرقيب يوسف ، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى . دراسة تاريخية واقتصادية واجتماعية وحضارية ، الجزء الاول ، بغداد ، ١٩٧٢ .

که دێته سەر باسی داگیرکردنی کوردستانی باکوور لەلایەن سەلجووقی یەکانەوە گەردلێفسکی دەڵێ هەمان کات سەلجووقی یەکان ویستیان بشگەنە گورجستان ، بەڵام هەوڵی ئەو مەیدانەیان بەفیڕۆ چوو . بۆ ماوەیەکیش توانی یان شاری ئێدێسا (ئوورفە) بگرن ، بەڵام زۆری نەبرد ئەوێشیان لەکیس چوو . کەچی بەرامبەر بەوە «توانی یان بگەنە ناخی کوردستان ، ئەو کارەی دوایی ڕێگەی بۆ هاتنی عوسمانی یەکانیش خۆش کرد»[17] .

سەلجووقی یەکان دوای ئەوەی لە باکوورو باشوورەوە هاتنە ناو خاکی کوردستانەوە ئینجا کەوتنە خۆ ئامادەکردن بۆ داگیرکردنی ئامەد (دیاربەکر) یش کە بەدەست کوردە مەروانی یەکانەوە بوو . سەلجووقی یەکان توانی یان ئەو شارەیش بگرن . بەڵام زۆری نەبرد ئامەد بووە هۆی دووبەرەکی لە نێوانی سەلجووقی یەکان و ئەیووبی یەکاندا . سوڵتان عەلائەددین کەیقوبادی یەکەم[18] بەپەرۆشەوە دەیویست ئامەد بگرێ ، بەڵام دووجار تێیدا شکایەوە . کەچی ساڵی ١٢٤١ کەیخوسرەوی دووەمی کوری[19] توانی ئەو شارە بگرێ . بۆ ئەوەی دڵی دانیشتوانی ئامەد بەلای خۆیدا رابکێشێ کەیخوسرەو فەرمانی لابردنی ژمارەیەك باج و سەرانەی دەرکرد ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە خرابوونە سەر کەلوپەلی هێنراوو میوەو سەوزەی ناوبازار ، پیاوانی سوڵتان ئەو فەرمانەیان بەسەر دیواری مزگەوتی گەورەی شاردا هەڵواسی .

لەگەڵ هەراو بگرەی هێرشی مەغۆلەکاندا مەلیك کامیلی ئەییووبی کە دوژمنی سەلجووقی یەکان بوو توانی دەست بەسەر ئامەددا بگرێ . بەڵام هۆلاکۆخان دیسان ئەو شارەی دایەوە دەست سەلجووقی یەکان بە سەرکردایەتی کەیکاوسی دووەم[20] و ڕوکنەددین قلیج ئەرسەلانی چوارەم کە برا بوون[21] . ساڵی ١٢٨٠ شاری ئامەد

---

(١٧) هەولم‌داوە بەپێی توانا بەگشتی مەبەستەکانی ف . ا . گەردلێفسکی ڕابگەیێنم .

(١٨) وەك گوتمان سوڵتان عەلائەددین کەیقوبادی یەکەم لەنێوانی ١٢١٩ - ١٢٣٦دا فەرمانڕەوای میرنشینی سەلجووقی ئاسیای بچووك بوو .

(١٩) سوڵتان غیاسەددین کەیخوسرەو لەنێوانی ١٢٣٦ - ١٢٩٥دا فەرمانڕەوایی کرد .

(٢٠) سوڵتان عیزەددین کەیکاوسی دووەم لەنێوان ساڵانی ١٢٤٩ - ١٢٥٧دا فەرمانڕەوای میرنشینی سەلجووقی ئاسیای بچووك بوو .

(٢١) فەرمانڕەوایی سوڵتان ڕوکنەددین قلیج ئەرسەلانی چوارەم بەر ساڵانی ١٢٥٧ و ١٢٦٥دا دەکەوێت .

بەدەست کەیخوسرەوی سێیەمەوە بوو[٢٢] .

سەلجووقی یەکان کە وا چاوەڕوان بوون داگیرکردنی ئاسیای پچووک دەسەڵاتیـ بگەیێنێتە سەرتاپای گێتی نەك تەنها جیهانی ئیسلامی ،شانازی یان بە داگیرکردنی ئامەدەوە دەکرد . سوڵتان کەیخوسرەوی دووەم ناوی خۆی نابوو :

«قاتل الکفرة والمشرکین و سلطان الروم و أرمینیا و دیاربکر و سوریا و حمی السواحل»[٢٣] .

لەوەدا سوڵتان کەیخوسرەوی دووەم حەقی بوو چونکە داگیرکردنی شاری ئامەد کارێکی ئاسان نەبوو . وەك لەپێشدا گوتمان دوو هێرشی عەلائەددین کەیقوبادی یەکەم بۆ سەر ئامەد سەریان نەگرت ، هەرچەندە میرنشینی سەلجووقی یەکانی ئاسیای پچووك لەو سوڵتانە بەتواناتری بەخۆیەوە نەبینی . ماوەیەکی باش قەڵای ئامەد خۆی نەدا بەدەستەوەو بەرگری کرد تا یەکێك لە سەردارانی کورد بە ناوی (بدر الدینار)ەوە لەژێرەوە لەگەڵ سوڵتان ڕێك کەوت و چەکدارانی سەلجووقی بەدزی یەوە گەیاندە ناو قەڵاکەوەو لەوێوە دەروازەی شاریان بۆ گەمارۆدەران خستە سەر گازی پشت[٢٤] . گرتنی شاری ئامەد بەلای سوڵتانی سەلجووقی یەوە هێند بایەخدار بوو وای لی کرد دەست لە باغ و باغات و بێستانی دانیشتوانی هەڵبگرێ ، ئەگینا سەلجووقی یەکان هەر شوێنێکیان داگیردەکرد بی بەزەیی یانە دەکەوتنە ڕەگ و ڕیشەی دارو درەخت و ڕەزو میوەی و هەموویان لە بن دەهێنا .

دیارە سەلجووقی یەکان دوای ئەوەی جی پێی خۆیان لە ئاسیای پچووکدا قایم کردو دەسەڵاتی تەواویان گرتە دەست ، ئاغاو بەگ و میران و خەڵکی ساکاری گەلانی تر هەریەکەیان لەبەر هۆو مەرامێك دەورەیان دان .

لەوەدا دەبوو کوردیش بەشی خۆی هەبێ . یەکێك لەو زانیاری یانەی گەردلێڤسکی هێناوێتی یەوە بە شێوازێکی تایبەتی ئەو ڕاستی یەی بۆ دەرخستووین .

---

(٢٢) ف . أ . گەردلێڤسکی . کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، ل ٥٨-٥٩ ، ١٨٣ .
(٢٣) ف . أ . گەردلێڤسکی . هەمان بەرگ ، ل ٦٠ .
(٢٤) ف . أ . گەرلیڤسکی . هەمان بەرگ ، ل ١٨٣ .

بەك ئەو دەڵێ "کاتێك سوڵتان عەلائەددین کەیقوبادی یەکەم[٢٥] چووە تۆبروك ٥٠٠ نەفسەرو سەرهەنگی ، ڕووسی‌و گورجی‌و کوردو دەیلەمی‌و گورگانی‌و قەزوینی‌و گەوری‌و[٢٦] هی‌تر چواردەوریان دابوو . خوێن لە چاویان دەباری . . . بەناو حەلکەکەدا ڕێگەیان بۆ سوڵتان دەکردەوە . . ."[٢٧] .

هەمان‌کات بەشێك لە لەشکری گەورەی میرنشینی سەلجووقیی ئاسیای پچووك کە جاری‌وا هەبوو ژمارەی خۆی دەدا لە نزیکەی ٢٥٠ هەزار کەس[٢٨] لە هۆزەکانی کوردستان پێکهاتبوو ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە لە ئامەدو مەڵبەندەکانی دەوروبەری دەژیان[٢٩] . فەرمانڕەوایانی ئەو میرنشینە لە کاتی تەنگانەدا پەنایان دەبردە بەر یاریدەی چەکدارانی کورد ، وەك لە ڕۆژانی ڕاپەڕینە گەورەکەی بابە ئیسحاقدا رووی‌دا .

لە ئەنجامی چەوساندنەوەو فشاری زۆری باج‌و سەرانەی دام‌و دەزگاکانی میرنشینی سەلجووقیدا ساڵی ١٢٣٩ ئاگری ڕاپەڕینێکی فراوان زۆر ناوچەی ئاسیای پچووکی گرتەوە . کۆچەری‌و نیشتەجێی ئەو ناوچانە وەك یەك بۆ ماوەی دوو ساڵ لەو ڕاپەڕینەدا بەشداربوون کە پیاوێکی لەخۆبوردوو بە ناوی بابەئیسحاقەوە سەرکردەی بوو . بابەئیسحاق خۆی بە نیمچە پێغەمبەرێك دادەنا ، لایەنگرانی بە خۆیان‌و ژن‌و منداڵیانەوە بۆ ماوەیەکی باش کەوتنە هێرش بردنە سەر قەڵاو زەوی‌وزاری دەرەبەگە گەورەکان .

دوای ئەوەی شۆڕشگێڕەکان بەسەر لەشکری میریدا زاڵ‌بوون‌و بانگی خەلیفایەتی بابەئیسحاقیان‌دا ڕاپەڕینەکەیان وا تەشەنەی کرد خەریك بوو گلۆڵەی میرنشینی سەلجووقیی ئاسیای پچووك بخاتە لێژی . ئەوسا سوڵتان کەیخوسرەوی دووەم کەوتە خۆی‌و "لە مەلاتی‌یەوە داوای یاریدەی تورك‌و گەرمیانی کرد" . مەبەستی

(٢٥) بڕوانە پەراوێزی ژمارە هەژدە

(٢٦) هۆزێکی ئەفغانی‌یە .

(٢٧) ف . ا . گەردلێفسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، ل ١٨٨ .

(٢٨) ا . د . نۆلیچێف ، سەرچاوەی ناوبراو . ل ١٠ .

(٢٩) ف . ا . گەردلێفسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، ل ٧٩ .

سوڵتان له گه‌رمیان ئه‌و هۆزه کورده بوو که دوایی میرنشینێکی به‌هێزیان دامه‌زراند[30] . به‌وجۆره سوڵتان توانی به‌سه‌ر ناحه‌زه‌کانیدا زاڵ‌بێ ، بابه‌ئیسحاق به‌خسیر کردو هه‌ڵیواسی‌و پاش ماوه‌یه‌ك هه‌موو ڕاپه‌ڕینه‌كه‌ی دامرکانده‌وه .

له کتێبی «ده‌وڵه‌تی سه‌لجوقی ئاسیای بچووك»دا ڤلادیمێر ئه‌لێکسه‌ندره‌ڤیچ گه‌ردلێڤسکی چه‌ند زانیاری‌یه‌کی گرنگی ده‌رباره‌ی ده‌وری ژیاری‌و ڕووناکبیری کوردی ئه‌و ڕۆژگاره هێناوه‌ته‌وه . وه‌ك زانراوه سه‌لجوقی‌یه‌کان له دوڵی زه‌ره‌ئه‌فشانی نیشتمانی یه‌که‌میاندا به کۆچه‌ری ژیانیان ده‌برده‌سه‌ر ، په‌روه‌رده‌کردنی ئاژه‌ڵ‌و که‌مێك کشت‌و کاڵ پیشه‌ی سه‌ره‌کی‌یان بوو . هه‌ر ئه‌وسا پێوه‌ندی په‌تریارکی (باوکایه‌تی) له‌ناویاندا باو بوو ، پشتاوپشت پێکه‌وه‌ی به‌ستبوونه‌وه[31] ، له‌به‌ر ئه‌وه کاتێك گه‌یشتنه ئاسیای بچووك هێشتا له ڕووی ژیاری‌یه‌وه له‌دواوه بوون ، بۆیه زۆر شت له مه‌لاو ده‌روێشانی کوردو عه‌ره‌ب‌و ئازه‌ره‌وه فێرده‌بوون . گه‌ردلێڤسکی له‌و باره‌یه‌وه نووسیویه ده‌ڵێ :

«ئه‌و ده‌روێشانه‌ی ده‌هاتنه ئاسیای بچووك ته‌نها مامۆستاو فێرکه‌ری ئایینی نه‌بوون ، به‌ڵکو له هه‌مان کاتدا ده‌شبوونه ڕێ‌نیشانده‌ری کارگێری‌و ڕووناکبیری کۆچه‌رانی ئه‌و مه‌ڵبه‌نده ، ده‌وریان له یه‌کگرتنیاندا ده‌بینی‌و دژی مه‌غۆله‌کانیان ده‌بزواندن . . له چوار ڕێگه‌وه ده‌روێش ده‌هاتنه ئاسیای بچووك : خۆراسان‌و ئازه‌ربایجان‌و سووریه‌و عیراق . . ده‌روێشه‌کانی عیراق له به‌غداو هه‌ولێره‌وه ده‌هاتن . جووتیارو پیشه‌گه‌رو بێکاره له‌ده‌وریان کۆده‌بوونه‌وه»[31] . ئه‌و ده‌روێشانه له ڕاپه‌ڕینه‌که‌ی بابه‌ئیسحاقیشدا ده‌وریان بینی . دیسان گه‌ردلێڤسکی ده‌ڵێ گوایه بیروباوه‌ری ئایینی دژ به سۆفیزم له هه‌ولێره‌وه ده‌گه‌یشته ئاسیای بچووك ، «دانیشتوانی هه‌ولێر کوردو ، واديارە ئه‌وسا مه‌یلداری شیعه بوون»[32] .

شوێنه‌وارو پاشماوه‌و به‌ڵگه‌ی به‌جێ‌ماوی ڕۆژگاری سه‌لجوقی‌یه‌کانی ئاسیای بچووك به‌گشتی که‌من . یه‌کێك له به‌جێ‌ماوه که‌مه‌کانی ئه‌وسا میحرابێکه له مزگه‌وتی

---

(30) ف . ا . گەردلێڤسکی ، هەمان بەرگ ، ل ١٧٨ – ١٧٩ .

(31) ف . ا . گەردلێڤسکی ، هەمان بەرگ ، ل ٢٠٤ .

(32) ف . أ . گەردلێڤسکی ، هەمان بەرگ ، ل ٢٠٤ – ٢٠٥ .

عەلائەددین لە شاری قۆنیە کە لە تەختە هەڵکەندراوەو لەسەری نووسراوە «حاجی دیشتووی خەلات (خلاط – اخلاط) ساڵی ١١٥٥ دروستی کردووە» . بەپێی بۆچوونی گەردلێڤسکی ئەو میحرابە کاتی خۆی لە خەلاتەوە گوێزراوەتەوە قۆنیەی پایتەختی میرنشینی سەلجووقی[٣٣] . هەروەها لە ساڵی ١١٨٣ وە هەژدەهای شێوازی چینی لەسەر قاپییەکانی ئامەد هەڵکەندراوە ، کە ئەوەیش وا دەگەیێنێ بەر لە هێرشی مەغۆلەکان نەك لە ڕێگەی ئەوانەوە ، وەك دەگوترا ، ئەو هونەرە گەیشتووەتە ئاسیای پچووك[٣٤] .

بەهۆی نەبوونی سەرچاوەی کۆنەوە بۆ لێکدانەوەی پێوەندی دەرەبەگی لەنێوان سەلجووقییەکانی ئاسیای پچووکدا ڤلادیمێر ئەلێکسەندەرە ڤیچ گەردلێڤسکی چەند جارێك پەنای بردووەتە بەر دیاردەکانی ئیمڕۆی کوردستان . لەو ڕێگەیەوە گەردلێڤسکی هەوڵی داوە زۆر ڕووی ژیانی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیی میرنشینی سەلجووقیی ئاسیای پچووکی ئەوسا ڕوون بکاتەوە . بەلای گەردلێڤسکییەوە ئەوە کە ڕێگەیە بۆ تێگەیشتنی لایەنە جیاوازەکانی ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتیی ئەو ڕۆژگارەی سەلجووقییەکان ، چونکە ، بەپێی بۆچوونی ئەو ، جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان ژیانی کوردستانی باکووریی سەرەتای سەدەی بیستەمو ژیانی ئاسیای پچووکی سەدە ناوەنجییەکاندا نییە[٣٥] . لەوەدا گەردلێڤسکی کەڵکی لە چەند سەرچاوەیەکی نوێی تورکی وەرگرتووە وەك ئەو کتێبەی ناشید حەقی دەربارەی ناوچەی دەرسیم دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینە گەورەکەی شێخ سەعیدی پیران دایناوە[٣٦] .

---

(٣٣) هەمان بەرگ ، ل ١٦٠ .

(٣٤) هەمان بەرگ ، ل ١٦٤ .

(٣٥) هەمان بەرگ ، ل ٩٦ – ٩٧ .

(٣٦) Nasit Hakki, Derebeyi ve Dersim, Ankara, 1932.

خاوەنی سەرەتا لە شێوەی زنجیرەیەك وتاردا لە گۆڤاری «حاکمیت ملی»دا بڵاوی کردووەتەوە . شایانی باسە أ . د . نۆلیجێڤ کورتەی بە زمانی ڕووسی بڵاوکردووەتەوە (بڕوانە : أ . د . نۆلیجێڤ ، دەربارەی مەسەلەی دەرەبەگی لە کوردستانی تورکیا ، – گۆڤاری «بیبلۆگرافیای ڕۆژهەڵات» ، لێنینگراد ، ١٩٣٤ ، ل ٥٤ – ٦٤) .

گەردلێڤسکی دەڵێ سەلجووقییەکان کاتی خۆی بە شەو لەترسی هێرشی کۆچەرەکان دەرگەو دەروازەی شارەکانیان قایم دادەخست ، ئەو نەریتەی تا دواساڵەکانی رژێمی عوسمانی لە شارێکی وەك دیاربەکردا پەیرەوی دەکرا[٣٧] . کە دێتە سەر باسی بەرەڵلایی هۆزە کۆچەرەکانی ئەوسای ئاسیای پچووك نموونەیەکی نوێی کوردستان دەهێنێتەوە . دەڵێ بەر لە دەست پێکردنی شەری یەکەمی جیهان تاران حاکمێکی نوێی بۆ ناوچەی ورمێ دانا ، بەلام ئەوەی داینا لە ترسی هەراو بگری کۆچەرەکانی ئەو ناوانە بۆ ماوەی سێ مانگ نەیتوانی لە تەوریزی نزیکەوە بگاتە شاری ورمێ[٣٨] .

هەر لەو کتێبەیدا ف . أ . گەردلێڤسکی راستییەکی گرنگی دەربارەی باری دیموگرافی و نەتەوەیی ئاسیای پچووکی رۆژگاری سەلجووقییەکان تۆمارکردووە ، وەك ئەوە کە دەڵێ زبانی تۆغۆزەکانی ئاسیای پچووك ئاسانو یەکجۆر نەبوو ، هەرچەندە ئەوان «موسوڵمانێکی خراپ بوون» بەلام ئایین بۆیان بووە قەڵغانی پاراستن لەو ناوچانەدا کە زۆرتری دانیشتوانیان عیسایی بوون ، کەچی لەو ناوچانەی رۆژهەلاتی ئەنادۆلدا کە زۆرتری دانیشتوانیان کورد یا عەرەبو وەك خۆیان موسوڵمان بوون جاری‌وا هەبوو بەئاسانی لە بۆتەیاندا دەتوانەوە[٣٩] .

ف . أ . گەردلێڤسکی لە بەرهەمەکانی تریشیدا چەند جارێك هاتووەتە سەر باسی مێژووی کورد لە سەدە ناوەندییەکاندا . لەو وتارەیدا کە ساڵی ١٩٢٢ دەربارەی «زبانی قزلباشەکانی ئاسیای پچووك» بلاوی کردۆتەوە[٤٠] راستییەکی نەزانراوی لە بارەی مەلا ئیدریسی بتلیسی ناودارەوە هێناوەتەوە .

لەوێدا کە دێتە سەر باسی ناکۆکیی نێوان شا ئیسماعیلی پاشای صەفەوی (١٥٠٢–١٥٢٤) و سوڵتان سەلیمی پاشای عوسمانی (١٥١٢ – ١٥٢٠) کە شالاوی

---

(٣٧) ف . أ . گەردلێڤسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی . بەرگی یەکەم ، ل ١٥٣ – ١٥٤ .
(٣٨) هەمان بەرگ ، ل ١٧٤ – ١٧٥ .
(٣٩) هەمان بەرگ ، ل ٧٣ .
(٤٠) هەمان بەرگ ، ل ٢٥٥ – ٢٧٥ .

ـگری زوربەی ناوچەکانی کوردستانی گرتەوەو باسی کوشتارە سەختەکەی سوڵتان سەلیم لەناو قزڵباشەکانی ئەو ناوەدا دەکات کە ، وەك باس دەکرێ ، بووە هۆی ـەناوچوونی ٤٠ هەزار کەسێکیان ، دەڵێ مەلا ئیدریسیش کە لایەنگری سوڵتان بوو ـەورۆژانەدا زۆر بە رِەق لەگەڵ قزڵباشەکان جوولاوەتەوە ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە لە ـاوچەی ماردیندا نیشتەجێ بوون . بە فەرمانی ئەو تەنانەت کلاوو سەروپێچی قزڵباشەکانیان کۆکردۆتەوەو یەکێك لە چاڵەکانی قەراغ شاریان پێ پڕکردووەتەوە . گەردلێفسکی دەربارەی ئەو کارەی مەلا ئیدریس دەڵێ :

«پێموایە کردارێکی سەیری ئەوتۆیە کە پیاو ناتوانێ لێکی بداتەوە . گۆڕی حیسامەددینی باوکی مەلا ئیدریس وا لە بتلیس . حیسامەددین ، وەك لە بتلیس بۆیان گێڕامەوە ، پیاوێکی بیرتەسك نەبوو[41] . . .»[42] .

لە بەرهەمێکی تریدا ف . أ . گەردلێفسکی دیسان هاتووەتەوە سەر باسی حیسامەددینی باوکی مەلا ئیدریسی بتلیسیو دەڵێ : « قورئانی لێکداوەتەوە . بەلایەوە وابوو موسوڵمانو عیسایی وەك یەك دەچنە بەهەشت . باوەڕی بە بوونی دۆزەخ هەبوو ، بەلاَم دەیگوت ئازاردان لە دۆزەخدا کارێکی وەختییە ، واتە بە چاوی ئەعراف[43] سەیری دۆزەخی دەکرد» . حیسامەددینی باوکی مەلا ئیدریس لە شاری بتلیس نێژراوەو گۆڕی بووەتە زیارەتگە[44] . گەردلێفسکی دەربارەی مەلا ئیدریس خۆیشی دەڵێ :

«هاوچەرخی سوڵتان سەلیمی یەکەم ، مێژوونوسێکی پیاهەڵدەرو[45] پیاوی دەوڵەت ، واتە سیاسی بوو»[46] .

---

(٤١) مەبەستی ئەوەیە حیسامەددین سونی مەزهەبێکی بیر تەسك نەبووە ، بەڵکو پیاوێکی ئایینی کراوە بووە .

(٤٢) ف . أ . گەردلێفسکی . کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، ل ٢٥٦ .

(٤٣) «اعراف» یا «مطهر» زاراوێکی ئایینییە ، بەو شوێنە دەگوترێ کە کەوتووەتە نێوانی دۆزەخو بەهەشتەوە . وشەی «الاعراف» لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە .

(٤٤) ف .أ . گەردلێفسکی ، بەرگی یەکەم ، ل ٣٩١ .

(٤٥) مؤرخ مداح .

(٤٦) ف . أ . گەردلێفسکی ، بەرگی یەکەم ، ل ٣٩١ .

## لەبارەی قزڵباش‌و قزڵباشەکانەوە :

لە نووسینەکانیدا ڤلادیمیر ئەلێکسەندرە ڤیچ گەردلێڤسکی بایەخی زۆری بە قزڵباشەکانی ئاسیای پچووك داوە کە بەشێکیان کوردن ، لە ئایین‌و داب‌و نەریت‌و مێژوویان کۆڵیوەتەوەو چەند جارێك بۆ خۆی تێکەڵیان بووەو گەلێك زانیاری بەکەڵك‌و سەیری لەبارەیانەوە کۆکردووەتەوەو لە چەند بەرهەمێکیدا بڵاوی کردوونەتەوە .

یەکەم بەرهەمی گەردلیڤسکی لەبارەی قزڵباشەوە لە کارە هەڵبژاردەکانیدا بەم ناوەوەیە : « لە گەڕانەکانم بەدوای باسە ئایینی‌یەکانی ئاسیای پچووکدا — قزڵباشەکان» . ئەو بەرهەمەی بریتی‌یە لە وتارێك کە ساڵی ١٩١٣ لە کۆڕێکی زانستیی تایبەتیدا خوێندوویەتەوە[٤٧] .

گەردلێڤسکی لە سەرەتای وتارەکەیدا گفتوگۆیەکی هێناوەتەوە کە کاتی خۆی لەگەڵ عەلی شانی کوڕی مەحموود پاشای سەرداری هۆزی قۆچگیری ناوچەی زارادا[٤٨] کردوویە . دەربارەی مەحموود پاشا دەڵێ سەرداری هۆزی بەدەسەلاتی قۆچگیری بوو کە یەکێکە لە هۆزە کوردەکانی ئەو ناوچەیە . بۆ خۆی «دادکارو فەرمانڕەوای هۆزەکەیەتی‌و هەرچی ئەو بیلێت بۆ کورد یاسایە» . ساڵی ١٨٩٥ لە کاتی کوشتاری ئەرمەنەکاندا مەحموود پاشا ڕێگەی نەدا بە پیاوەکانی لەو کوشتارەدا بەشدار بن ، لەبەر ئەوە ئەرمەن بە چاوی ڕێزو خۆشەویستی‌یەوە تێی دەڕوانن .

دوای ئەوە ڤ . أ . گەردلێڤسکی دەڵێ :

«هاتنی ئەو ئاغا کوردەم بە هەل زانی بۆ ئەوەی بیدوێنم تا بتوانم لە ڕێگەیەوە بگەمە نهێنی‌یەکانی قزڵباش . خاوەنی خانەکە هەرچەندە لەوە دوودڵ بوو هیچم دەستگیر بێ بەلام بڕیاری‌دا یاریدەم بدات‌و لەگەڵی کۆم بکاتەوە . دوای چارەکێك هەردوکمانی بردە ژوورێکی تەنهاو دەرگەکەی قایم لەسەر داخستین . کە چوومە ژوورێ لاوێکی بالابەرز بە بەرگی ئەورووپایی‌و تەراشی ڕێکوپێکەوە لەبەرم هەڵستا . ئەوساکە ڕەمەزان بوو ، منیش یەکسەرکەوتمە باسی ڕۆژوو . پێی گوتم قزڵباش دان

---

(٤٧) هەمان بەرگ ، ل ٢٤١ — ٢٥٤ .

(٤٨) زارا کەوتۆتە باشووری سیواسەوە .

ـە مانگی ڕەمەزاندا نانێن ، لەبریتی ئەو ساڵی دوازدە ڕۆژی موحەڕڕەم بەڕۆژوو
تەعین . لەو ڕۆژانەدا یادی تینوێتیی حسەین لە بیابانی کەربەلا دەکەنەوە . کە داوام
ی کرد باسی (خضر الیاس)م بۆ بکاتو لێمپرسی کەی دەست پێ دەکات ڕەنگێکی
هێناو ڕەنگێکی برد . گوتی ئەوە نهێنیی تایبەتی یە ، مەگەر دوایی بۆتی باس بکەم .
ئەوساکە تێگەیشتم قزڵباشەکان تا چ ڕادەیەك قایمکارن» .

واهدیارە گەردلێفسکی نەیتوانیوە شتێکی ئەوتۆ لە عەلی شان هەڵکرێنێ بۆیە
ناچاربووە لە ڕێگەی کابرایەکی ئەرمەنەوە بگاتە ژمارەیەك قزڵباشی ترو بەشێك لە
زانیاری یەکانی دەربارەیان کۆبکاتەوە . وەك دەیگێڕێتەوە یەکێکیان پێی گوتووە
قزڵباشەکان لەناو خۆیاندا یەکتر چاك دەناسنەوە ، گوایە بە تەوێڵی هەریەکەیانەوە
ئەستێرەیەك هەیە لە خۆیان بەولاوە کەس نایبینێ .

گەردلێفسکی کە دێتە سەر باسی ڕیشو سمێڵی قزڵباشەکان دەڵێ لە ٣٠
ساڵی یەوە ڕیش دەهێڵنەوەو ئیتر توخنی ناکەون ، «هی وایان هەیە مووی ڕیشی
بەشی شەرواڵێك دەکات» . کە پێی گوتوون لای سوننی یەکان ریش تاشین ڕەوایە ،
تێیان گەیاندووە ، چۆن هێشتنەوەی خێری بەدەمەوەیە چونکە بە هەر یەکێك لە
تاڵەکانیدا پەری یەك خۆی هەڵواسیوە ، لەبەر ئەوە تاشینی بەجێ نی یە . پشتی ئەو
قسەیە بە دوو «بەڵگە»ی تر قایم دەکەن . یەکەمیان گوایە کاتێك ئیمامی عەلی
پێغەمبەری شتووە ئاو لە ناوکیدا کۆبووەتەوە . کە ویستوویە وەك موفەرك ئاوەکە
بخواتەوە ڕیشو سمێڵی پێی تەڕبوون لەبەر ئەوە ئیتر تا مردن نەیتاشیون . بەڵگەی
دووەمیان «ڕیشە درێژەکەی» عیسای پێغەمبەرە .

نووسەر هەن ژمارەی قزڵباشی تورکیایان بە یەك ملیۆن داناوە ، بە لای
گەردلێفسکی یەوە ئەو ژمارەیە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم کەمە ، بەتایبەتی ، وەك
دەڵێ . ئەگەر ئەوەیش لەیادنەکەین کە ئاسیای پچووك پڕی یە لە قزڵباش .
ناوجەرگەی مەڵبەندی قزڵباش دەرسیمەو هەر ئەوێش جێگەی سەرداری
گەورەیانە . بەلام لە باشووری ئاسیای پچووکیش مەڵبەندی تایبەتیی خۆیانیان هەیە .
هەروەها لە ئەستەموولو برۆسەو کیلیکیا (قیلیقیا)ش قزڵباش هەن ، زۆربەیان
لەوناوانەدا پیشەگەرن . قزڵباش لە ویلایەتی دیاربەکریش دەژین .

گەردلێڤسکی کە بۆ خۆی چووەتە ناوچەی خەنس و لەوێ لیستەی تایبەتی بە ناوی دێهاتی قزلباشەوە داناوە . بەپێی ئەو زانیاری یانەی لینچ لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا داوێ ژمارەی گوندە قزلباشەکانی خەنس کە ناوچەیەکی کوردەواری یە تەنها پازدەیە . بەلام بەپێی لیستەکەی گەردلێڤسکی بی و پێنجە . گەردلێڤسکی ناوی هەموویان و ژمارەی ماڵەکانیانی تۆمار کردووە ، وەك قەلاجوك کە ٢٥ ماڵ و گەرمەك ٦ ماڵ و کەمسەر ١٢ ماڵ و سوارەم ٣٠ ماڵ و مەیدان ٢٠ ماڵ و حەیران ١٢ ماڵ و دەرەك ٨ ماڵ و گەوەرەش ١٠ ماڵ و مێرگەسوور ٥٠ ماڵ و خەلیفەکی ٣٠ ماڵ بوون . وەك دەلێ ئەو لیستەیەی لە سالانی شەری یەکەمدا داناوە ، واتە دوای ئەوەی لەشکری ڕووس گەیشتووەتە ئەو ناوچانە . بەپێی قسەکانی گەردلێڤسکی هاتنی لەشکری ڕووس بووەتە هۆی ئەوەی گەلێك خێزانی کوردی سوننی ئەو گوندانە لەترسانا کۆچ بکەن[٤٩] .

هەمان کات ڤلادیمێر ئەلێکسەندەرەڤیچ گەردلێڤسکی هەولی داوە کەلك لە هەموو هەلێك وەربگرێ بۆ کۆکردنەوەی داستان و ئەفسانەو پەندی پێشینان و حەکایەتی باوی ناو قزلباش و کوردی تر و سەرتاپای گەلانی ناو تورکیا .

### داستان و ئەفسانەو حەکایەت :

وەك لە سەرەتادا گوتمان ف . أ . گەردلێڤسکی زۆر بایەخی بە کۆکردنەوەی فۆلکلۆر دەدا ، شارەزایان بەرهەمە فۆلکلوری یەکانی بەرز دەنرخێنن ، بۆ هەر شوێنێك چووبێ گەردلێڤسکی لە زاری دانیشتوانی یەوە شتی باوی ناویانی کۆکردۆتەوەو دوایی لە وتاری تایبەتیدا بلاوی کردوونەتەوە . بە هەمان دەستوور کە چووەتە ناوچە کوردەواری یەکانیش بەپێی توانا لەو جۆرە بەرهەمانەی کۆکردووەتەوە[٥٠] .

---

(٤٩) ف . أ . گەردلێڤسکی . کارە هەلبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، ل ٢٦٠ - ٢٦١ .

(٥٠) گەردلێڤسکی سالی ١٩١٦ چووەتە شاری بتلیس و وەك خۆی دەلێ ماوەیەکی باشی لێ ماوەتەوە (بڕوانە لاپەڕە ٣٨٣ی بەرگی یەکەمی کارە هەلبژاردەکانی) .

راسته ئەوانەی لە ناوچە کوردەواری‌یەکاندا کۆی‌کردوونەتەوە زۆر نین ، بەلاّم شتی سەیرو سەرنج راکێشیشیان تێدایە . بەوێنە کە چووەتە بتلیس لەبارەی بنچو ‌بنەوانی ئەو شارەوە ئەمەیان بۆ گێراوەتەوە :

ئەسکەندەر کە نزیك بتلیس کەوتەوە لە دوورەوە قەلاّیەکی سەختی بەدی‌کرد ، دەرگەی قەلاّکە لە رووی خۆی‌و لەشکرەکەیدا داخرابو .

تومەس یەکێك لە پیاوانی ئەسکەندەر بە ناوی ئەبوولەیسەوە (أبو ليث) ئەو قەلاّیەی دروست کردووەو لە ئاغای یاخی بووە . ئەبوولەیس چەکی دژی ئەسکەندەر خستە کار ، بەلاّم لەشکری ئەم بەهێزتر بوو ، بۆیەکا قەلاّکە ئەنجام بەوانەی ناویەوە خۆیان‌دا بەدەستەوە . لەبەر سەختیی ئەو قەلاّیەو زەحمەتی زۆری داگیرکردنی ئەسکەندەر گوایە لەرقانا ناوی لیّ‌ناوە (بەد لەیس) (بەد + ليث) کە ئیستە بۆتە بتلیس[51] .

وەك دەیزانین زۆر جار لاپەرەی پرشنگداری مێژووی گەل تێکەلیّ بە یادی کۆمەلاّنی خەلّك دەبیّ‌و وەك فۆلکلۆر دەماودەم‌و پشتاوپشت بلاّودەبێتەوە . یەکێك لەو حەکایەتانەی ف . أ . گەردلێفسکی بە ناوی شەهابەددینەوە بلاّوی‌کردوونەتەوە گێرانەوەیەکی ساکارو نەمری راپەرینەکەی مەلا سەلیم ئەفەندیی خیزانی‌یە کە بەر لە دەست پیّ‌کردنی شەری یەکەمی جیهان بە ماوەیەکی کەم تەقی‌یەوە[52] . بەم جۆرە یەکێك لە دانیشتوانی بتلیس حەکایەتی شەهابەددینی بۆ گێراوەتەوە :

«شەهابەددین : سیّ شێخ لە خەنس دەژیان ، دوانیان برا بوون ، شەهابەددین‌و محەممەد شیرین کورانی سەید محەممەد . سێیەمیان سەید عەلی کوری جەلالەددین‌و کورەزای کاوس ، پیاوێکی غەیب‌زان بوو ، لە خەنسەوە دەیزانی چی لە بەغدا روودەدات .

سەید عەلی خۆی بۆ ئەو دونیا هەلّگرتبوو ، لە نوێژو رۆژوو بەولاوە هیچی‌تری نەدەزانی . شەهابەددین‌و محەممەد شیرینیش خۆیان بۆ خزمەتی خەلّك تەرخان‌کردبوو .

(٥١) ف . أ . گەردلێفسکی ، بەرگی یەکەم ، ل ٣٨٨ .

(٥٢) دەربارەی بروانە : د . کەمال مەزهەر ، کوردستان لە سالّەکانی شەری یەکەمی جیهاندا ، بەغدا ، ١٩٧٥ . ل ٤٣ - ٤٥ . ٧٥ .

شێخ شەهابەددین دڵی لای هەژارو بێکەسان بوو ، حەوت تەنووری بۆ ناندانی نەبووان هەڵخستبوو . شێخ شەهابەددین ڕەزی زۆرو لەوەڕگەی فراوانو هەزار سەر مەڕی هەبوو ، هەموویانی بۆ خزمەتی هەژاران دانابوو .

جارێکیان چوار پەل سەرباز هاتنە خێزان ، شەهابەددین بێپەروا خۆراکی گشتیانیدا . دوژمنانی زۆریان بۆ هەڵدەبەست ، دەیانگوت ئەو پارانەی خەرجیان دەکات بە مفتی زەوتیان دەکات . بەڵام هیچ دادی نەدان . ئاگری شەڕ لەنێوان کوردو عوسمانیدا هەڵگیرسا . شێخ بڕیاریدا بچێتە ڕووسیا ، بەداخەوە فریا نەکەوت ، بەدیل گیرا . هەرسێك شێخیان هێنانە بتلیسو لەبەر کۆنسولخانەی ڕووسیادا هەڵیانواسین . بەر لە وەفاتی شێخ نزای لە عوسمانییان کرد ، دوعای زوو گیرابوو ، هەراوبگر دەستی پێکردو شەڕی گشتی هەڵگیرسا[٥٣] . دوای وەفاتی هەموان شێخ شەهابەددینیان لەیادکرد تا جارێکیان کچە ئەرمەنێك لای پەنجەرەی ماڵەوەیان چرایەکی بەسەر گڵکۆی شێخەوە بەدیکرد . کچە واقی ورما ، بۆ سبەی چووە سەر گۆڕی شێخو ئیمانی هێنا . لەو ڕۆژەوە موسوڵمانەکانیش گۆڕی شێخیان کردە زیارەتگە . ئەرمەنەکان حاشایان لە کچە کرد . ڕۆژانی هەینی دانیشتوانی شار دەچنە سەر گۆڕی شێخ شەهابەددین»[٥٤] .

داستانە باوەکانی ڕۆژهەڵات لەناو کوردیشدا بڵاوونو شێوازی تایبەتیی خۆیان وەرگرتووە . لە بتلیس باسی «شاخی نەمروود» یان بەم جۆرە بۆ گەردلێڤسکی گێڕاوەتەوە :

«هەبوو نەبوو ، پاشایەکی بەدەسەڵات هەبوو ناوی نەمروود بوو . زۆر دەوڵەمەندو زەنگین بوو . کاروانی لە شاری گەورەی تەتوانەوە بۆ دەهات[٥٥] . نەمروود زۆر زوو لە خۆی بایی بوو ، قەڵایەکی بەرزی دروستکرد ، دەیویست بچێتە سەریو لەوێوە لەگەڵ یەزداندا بکەوێتە شەڕو گوایە بیکوژێ . خواوەندی

---

(٥٣) مەبەستی شەڕی یەکەمی جیهانە .

(٥٤) ف . أ . گەردلێڤسکی . بەرگی یەکەم . ل ٣٩١ .

(٥٥) تەتوان شارێکی ئەرمەنی بوو . بەپێی بەرگی چوارەمی ئەولیا چەلەبی تەتوان لە لەسڵدا «تەحق وانە» واتە ژێر وان بووەو لەسەر زاری کوردان بووەتە تەتوان .

گموره غەزەبی لیٚ گرت‌و مێشێکی بۆ نارد ، مێشە لە کونەلوتی‌یەوە چووە ناو کەلەسەریەوە ، گیزەگیزی مێشکی سەری برد . نەمروود لەتاوا فەرمانی دایە پیاوەکانی بە کوتەك بەربنە سەری بەڵکە مێشە لە کونە لووتیەوە دەرپەڕێتەوە ، بەلاّم خۆی تیاچوو .

بە فەرمانی خودا مێروولە دایانە قەلاّکەی‌و لە بنەڕەتەوە هەڵیانتەکاندو کاوڵیان کرد . هەرچی تاشە بەردی بناغەکەشی بوو توورِیان‌دایە ناو ئاوی دیاربەکرەوە[٥٦] . بەو جۆرە نەمروودی لەخۆبایی تەواوبوو»[٥٧] .

بە هەمان دەستوور ڤلادیمێر ئەلێکسەندرەڤیچ گەردلێڤسکی چەند بەرهەمێکی ڤۆلکلۆریی دەربارەی شارو شوێنەوارە بەناوبانگەکانی کوردستان‌و بەسەرهاتەکانیان کۆکردووەتەوە کە دیارە شارەزایان دەتوانن لە ڕێگەیانەوە بگەنە هەندیٚ لەو ڕاستی‌یانەی مەبەستیانە . ئەمانەی خوارەوەیش چەند نموونەیەکیانن :

«گۆمی وان چۆن دروست‌بوو : ڕۆژانی زوو لەو ناوانەدا کانیاوێکی گەورە هەبوو . لە نزیکی‌یەوە کونێك دروست بووبوو ئاوی کانی‌یەکەی لێوە دەرِۆیی . جارێکیان ئافرەتێك لەویٚ خوری دەشت ، لەپرِ چنگێکی لەدەست بەربۆوەو کونەکەی گرت . لەوساوە ئاو کەوتە پەنگ خواردنەوە تا گۆمی وان دروست‌بوو»[٥٨] .

«داگیرکردنی خەلات : کە پێغەمبەر بانگی ئیسلامەتی داو داوای لە بت‌پەرستان کرد دەست لە بت‌پەرستی هەڵبگرن یەکێك لە هاورِێکانی کە ناوی خالید بوو لەگەڵ ٤٠ هاورِێی خۆیدا ڕوویان کردە خەلات (اخلاط) . بە ناوی بازرگانەوە هاتنە ناو شارەوەو بەو بیانووەوە تیا مانەوە . دوایی شەڕ هەڵگیرساو خالید کوژراو هەر لەوێش نێژرا»[٥٩] .

---

(٥٦) بەپێی ئەولیا چەلەبی شا تەهماسب سەدەی شازدە تەتوانی کاول کرد..
(٥٧) ڤ . أ . گەردلێڤسکی ، بەرگی یەکەم ، ل ٣٩١ - ٣٩٢ .
(٥٨) بەرگی یەکەم ، ل ٣٩٢ .
(٥٩) بەرگی یەکەم ، ل ٣٩٢ .

«مێژووی خەلات : حەوت پاشا فەرمانڕەوایی خەلاتیان دەکرد ، حەسەنو بەیاندیرو پێنجی‌تر . حەسەن مزگەوتێکی لەناو شاردا دروست‌کرد ، بەیاندیر خەزنەیەکی پڕی بەجێ‌هێشت کە ئیستە نەماوە . حەسەن‌و بەیاندیر قەڵایەکیشیان دروست‌کرد ، یاساوڵان لەوێوە تاقیی هێرشی دوژمنیان دەکرد . جاران خەلات شارێکی زۆر گەورە بوو ، لە ئەستەموولیش گەورەتر بوو . کە لە خەلاتەوە حەوت هەشت هەزار کۆچیان دەکردە سووریە[٦٠] هیچ بە شارەوە دیاری نەئەدا»[٦١]

ئەو جۆرە بەرهەمە فۆلکلۆری‌یانە بەشێکن لە سامانی ڕۆشنبیریی کۆنمان کە هەموو گەلێك لە وێنەیان هەیەو پێشکەوتووەکانیان بەپەرۆشەوە دەیانپارێزن . بێ‌گومان ئەو بەرهەمانە کەڵکیان زۆرە بۆ ڕووناکبیران بەگشتی‌و بۆ زمانەوان‌و مێژوونووس‌و زانایانی ئەدەب بەتایبەتی . ئەو بەرهەمانە بۆیشیان هەیە ببنە سەرچاوەی ئەدەب‌و چیرۆکی منداڵان . هەر لەبەر ئەو هۆیانەش کاتی خۆی «کۆڕی زانیاری کورد» بایەخی زۆری بە کۆکردنەوەیان دەدا .

کاتێك ف . أ . گەردلێڤسکی لە نووسینەکانیدا دێتە سەر باسی ناوچەکانی تری ناو تورکیا جاروبار دەگەڕێتەوە سەر ناوی کورد . بەوێنە دەربارەی شاری ئەرزرۆم دەڵێ لەناو دانیشتوانیدا وا باوە گوایە وڵاتەکەیان کاتی خۆی سێ ساڵ لەسەر یەك تووشی زستانی سەخت هاتووە کە بوونەتە هۆی نەمانی زۆربەی خەڵکەکەی ، تەنها ٦٠٠ ماڵیان ـ وەك دەڵێن ، لەدەست مەرگ ڕزگاریان بوو . ئەوسا کە عەلی ئاغای کورد بە خۆی‌و دوازدە هەزار لە پیاوەکانی‌یەوە لەوناوانەدا نیشتەجێ بوون[٦٢] .

گەردلێڤسکی ، وەك گوتمان ـ گەلێك حەکایەتی باوی ناوگەلانی تورکیای تۆمار کردووە کە ژمارەیەکی کەمیان پێوەندی‌یان بە کوردەوە هەیە . لە بەرگی یەکەمی کارە هەڵبژاردەکانیدا ئەم دوو حەکایەتە بڵاوکراونەتەوە :

«موشتاق بابا : جارێکیان موشتاق بابا کە جێگری مەلای گەورە حاجی حەسەنی شیروانی بوو چووە ئەستەموول . تامەزرۆی بینینی سوڵتان عەبدولمەجید بوو . کە زانیی نوێژی هەینی لە مزگەوتی ئەییووب دەکرێ بەسواری لەگەڵ پیاوە

(٦٠) مەبەستی هاتوچۆی کۆچەرەکانە .

(٦١) ف . أ . گەردلێڤسکی ، بەرگی یەکەم ، ل ٣٩٢ .

(٦٢) بەرگی یەکەم ، ل ٣٩٥ .

کوردەکانیدا رووی‌کردە ئەو مزگەوتە . کە گەیشتە جێ سوڵتان لە مزگەوت بوو ،
رێچکەی سوارەی کورد سەرنجی راکێشا ، لە پیرەمێردێکی پرسی ئاخۆ کێ‌بێ
هاتبێتە خزمەتی ؟ کە موشتاق بابا هاتە ژوورەوە ، سوڵتان پێی‌گوت : بۆچ عەزیەتت
داوە بەر خۆت ؟

موشتاق بابا لە وەڵامدا گوتی : موشتاق دیتنی خواوەندی گەورە بووم . بەو
جۆرە ناوی خۆی ، (موشتاق)ی ، تێکەڵی وەڵامەکەی کرد[٦٣] .

سوڵتان موشتاق بابای بانگ کردە دیوەخانی خۆی کە جێ‌نوێژی لێ‌بوو . سوڵتان
داوای لە موشتاق بابا کرد غەیبێکی پێ‌بڵێت . موشتاق گەلێك خۆی گرت تا سوڵتان
تێ‌پرسی :

چی بەبیرما هات ؟

لە وەڵامدا موشتاق بابا گوتی :

«نیازتانە گونەشم پێ‌ببەخشن کە یەکێکە لە ئافرەتانی حەریمی بەرزتان ،
ئەوەیش ئەنجام دەبێتە هۆی فەوتم» .

سوڵتان فەرمووی :

«جا ئەگەر وابێ لە بریاری خۆم پاشگەز بوومەوە» .

«نەکەی دەخیلتم ، خوا وای پێ‌چاکە» - هاوار لە موشتاق بابا هەڵسا .

سوڵتان قایل بوو ، گونەشی لە موشتاق بابا مارە کرد . دوای ئەوەی موشتاق بابا
گەرایەوە بتلیس هەموان بە چاوی زڕق‌و کینەوە تێییان دەروانی چونکە سوڵتان گەلێك
زەوی‌وزاری ئەو ناوەیشی پێ بەخشیبوو .

زۆری نەبرد دیسان موشتاق بابا بریاری‌دا بچێتەوە ئەستەموول . دوژمنەکانی کە
دڵنیا بوون ئەمجاریش سوڵتان بە تەخت‌و بەختەوە دەینێرێتەوە بریاری کوشتنیان‌دا .
بۆ ئەو کارە چەند کوردێکی هۆزی فەریق بەحری پاشایان بەکرێ گرت ، هەنگاو بە
هەنگاو دووی کەوتن . لە بایەزید موشتاق بابا لە قۆناغی حاکمی شار لایدا . کە
رۆژ ئاوابوو موشتاق بابا لەپڕ نوێژی بڕی‌و رووی کردە شێخ عارفی هاوەڵی‌و
پێی‌گوت :

---

(٦٣) چونکە وشەی (موشتاق)ی بە دوو مەعنا بەکارهێناوە .

«دەزانی ئیستە چی ڕوودەدا ؟ . دێن دەمکوژن ، نەکەی بگری ، ڕۆژم تەواوبووە ، خودا وای دەوێ ، کە هاتنە ژوری و پرسی یان من لەکوێم دەخیلە نەڵێی لێرە نی یە ، ئەگینا ، شێخ عارف ، تۆیش دەکوژن !» .

کە لە قسەکانی بووەوە موشتاق بابا ئاخێکی هەڵکێشاو چەند بەیتێکی نووسی و خستی یە ژێر بەرماڵەکەیەوە . کە کوردەکان هاتنە ژووری موشتاق بابا مۆڵەتی پێنج دەقیقەی لێ خواستن ، دەسنوێژی گرت و نوێژی کردو ئینجا بێ ترس ڕووی تی کردن و پێی گوتن :

«ئامادەم ، فەرموون بمکوژن» .

گۆڕی موشتاق بابا ئیستەش وا لە بایەزید ، بەرامبەری قۆناغی حاکمی شارە . هەرچەند کێلی گۆڕەکەی راست دەکەنەوە ئەو هەر خوار دەبێتەوە ، واپێ دەچێ سوجدە بەرێ .

بەپێی قسەی عەلی پاشای کوڕەزای موشتاق بابا ئەوەی باسمان کرد لە ناوەندی سەدەی سیازدەی کۆچی ، واتە پەنجاو شەستەکانی سەدەی نۆزدە قەوماوە . عەلی پاشا زۆری بەسەر دیوانی باپیریدا هەڵدا ، دەیگوت تەنها مەگەر حافظ لەو شاعیرتر بێ»[٦٤] .

«پەمبووك بابا : جارێکیان کابرایەك لە ئاق سەرای بەلای گۆڕی پەمبووك بابادا تێدەپەڕێ ، لەبەر خۆیەوە دەپرسێ :

بۆ لەناو کوردیشدا غەیب‌زان هەیە ؟

پەمبووك بابا کە گوێی لەو شەکرانە بوو قاچی لەژێر خاکەوە دەرپەڕاند ، ئەوسا کابرا تێگەیشت چ زەلەیەکی کردووە»[٦٥] .

بەرگی دووەمی کارە هەڵبژاردەکانی ڤلادیمێر ئەلێکسەندەرەڤیچ گەردلێڤسکی بۆ بەرهەمەکانی دەربارەی زمان و ئەدەبی تورکی تەرخان‌کراوە[٦٦] . لەبەر ئەوە تەنها چوار جار ناوی کوردو چەند جارێکی زۆر کەم ناوی شارەکانی کوردستانی تێدا

---

(٦٤) ڤ . أ . گەردلێڤسکی ، کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی یەکەم ، ل ٤٠٠ – ٤٠١ . ئەو حەکایەتەی لە ئەرزڕۆم نووسیوەتەوە .

(٦٥) بەرگی یەکەم ، ل ٤٥٧ .

(٦٦) بڕوانە پەراوێزی چوارەم .

هاتووه (ئامەد– دیاربەکر جارێك‌و جزیریش جارێك) .

لەو بەرهەمەیدا کە بۆ قسەی نەستەق‌و پەندی پێشنیانی عوسمانی‌یانی [٦٧] تەرخان کردووە گەردلێڤسکی جاروبار ناوی ئەو گەلانەش دێنێت کە خووو نەریتیان لەناو عوسمانی‌یەکاندا رەنگیان داوەتەوە . بەو نموونانەدا کە گەردلێڤسکی هێناونی‌یەوە وادەردەکەوێ عوسمانی‌یەکان بە یەك چاو نەیانڕوانیوەتە دراوسێکانیان ، جاری‌وا هەیە لە پەندە باوەکانیاندا بە رەق رەفتاریان لەگەڵ کردوون . کەچی وەك دەڵێ سەربەرزی‌و بەخۆنازینی کورد وەك گەلێکی شاخاوی لە هەر شت زیاتر سەرنجی راکێشاون . یەکێك لە پەندەکانیان دەڵێ :

«وەك کوردەی نۆ بزن‌دار ئەویش هەمووی دانا» ، بەوکەسە دەڵێن کە دەست گوشادو خواردە بێ ، ئەوەی وەك کوردەکە دەستی دەچێتە هەر نۆ بزنەکەی . گەردلێڤسکی دەڵێ جاری‌وا هەیە لەبریتی ناوی کورد «دای جەزائیری» بەکاردەهێنن [٦٨] . واتە دەڵێن وەك دای [٦٩] خاوەن نۆ بزن ئەویش هەمووی دانا .

بە هەمان دەستوور هەڵپەڕکێ‌و شایی کوردان سەرنجی عوسمانی‌یانی راکێشاوە . پەندێکیان هەیە دەڵێ :

«قەرەج بۆی دەڵێ‌و کوردە دەیژەنێ» [٧٠] .

بەڵام . وەك گەردلێڤسکی دەڵێ ، جاروبار حەکایەتی‌واش دەربارەی کورد بەرگوێ دەکەوێت :

«کوردان لەوە وەڕس بوون خۆیان بە دروست‌کردنی ساوەرەوە خەریك بکەن . دوای بژارو بەردەشۆرکردن گەنمی بۆ بکوڵێنن ، لەبەر ئەوە بریاریان‌دا یەکسەر بیرِوێنن . . . کە ساوەرە بەری‌نەدا چوونە لای قازی سکالای دڵیانی بۆ بکەن . ئەویش . . .» [٧١] .

---

(٦٧) مەبەستی تورکە .

(٦٨) ڤ . أ . گەردلێڤسکی . کارە هەڵبژاردەکانی ، بەرگی دووەم ، ل ٢٧٢ .

(٦٩) دای لە وشەی دایی تورکی‌یەوە هاتووە کە بەمانای مامۆ یا خاڵۆیە . لە رۆژگاری عوسمانیدا دای نازناوی فەرمانڕەوایانی جەزائیر بوو .

(٧٠) ڤ . أ . گەردلێڤسکی ، بەرگی دووەم ، ل ٢٧٢ .

(٧١) بەرگی دووەم ، ل ٢٩٠ .

لە بەرگەکانی تری کارە زانستی‌یەکانی گەردلێڤسکیدا دیسان گەلێك جار ناوی
کورد هاتۆتە ناوەوە کە هیواردارین لە دوارۆژێکی زوودا بتوانین لەگەڵ ئەم بەشەدا نە
بەرهەمێکی سەربەخۆدا بلاوی بکەینەوە .

ڕاپەڕینە گەورەکەی ساڵی ١٩٢٥ی کوردستانی تورکیا(*) یەکێکە لە حەڵقە خوێناوی‌یە هەرە گەورەکانی زنجیرەی خەباتی ڕزگاریخوای - نەتەوەیی کورد ، بەڵام میللەتەکەمان تاوەکو ئێستا شتێکی یەکجار کەمو تا ڕادەیەکی زۆر سەرپێی دەربارەی لاپەڕە گەورە پڕ شانازی‌یەکانی دەزانێت کە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی قوڵو دوورو درێژە بۆ دەرخستنی سروشتی ڕاستەقینەی ڕاپەڕینەکە خۆیو دیارکردنی ئەو دەرسە مێژووی‌یانەی میللەتە خەباتکەرەکەمان پێویستی پی‌یانە ، هیچ نەبێت بۆ ئەوەی یارمەتی ئەوەمان بدەن ئەمڕو هەڵەی دوێنێمان دووبارە نەکەینەوە .

لە دەرەوەی کوردستانیش تا ئێستا بە شێوەیێکی زۆر کورتو تا ڕادەیەکی دیار هەڵە لەم ڕاپەڕینە کوڵراوەتەوە . بەشێکی زۆر لە مێژوونووسە بێگانەکان ، بە ڕۆژهەڵاتناسە گەورەکانی سوڤیەتەوە (وەك پرۆفیسوری ناسراو أ . ف . میللەر) ئەم ڕاپەڕینە بە جووڵانەوەیەکی کۆنەپەرستی دەستکردی ئینگلیز دائەنێن ، کە گوایە دوو مەبەستی بنچینەیی هەبووە : یەکەمیان لاسەنگ کردنی مەوقفی ئینگلیز لەو خەباتە سەختە سیاسی‌یەیاندا کە لەگەڵ تورکەکاندا دەیانکرد لەسەر «ویلایەتی مووسڵ» و دووەمیشیان گوایە کۆنەپەرستی‌ی ناوخۆو دەرەوە ئەیانویست لە ڕێگای ئەو ڕاپەڕینەوە بەرهەڵستی گۆڕانە شۆڕشگێڕێکانی کەمالی‌یەکان[1] لە تورکیادا بکەن .

---

(*) لە ژمارە دووی گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان»دا بلاوکراوەتەوە (بەغدا ، تەمموزی ١٩٧١ ، ل ٤٦-٥٦) .

(١) ئەو جووڵانەوە گەورەیەی میللەتی تورك دوای شەڕی یەکەم بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال بۆ ڕزگار کردنی نیشتمانەکەی بەرپای کرد لە ڕابەری سیاسی‌دا بە «جوڵانەوەی کەمالی» و بەشدارەکانی بە «کەمالی‌یەکان» ناو دەبرێن .

یەکێك لەو هۆ گەورانەی ڕێوشوێنی ڕاستەقینەو سروشتی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ی لە مێژوونووسە بێگانەکان بە جارێك تێك‌داوە ئەو گێرە شێوێنی‌یە بێ‌شومارە بوو کە کاربەدەستە شوڤێنێکانی تورکیا بۆ ئەم مەبەستە نایانەوە ، بە تایبەتی دروست‌کردنی هەواڵ‌و دەکومێنتی درۆ کە لە دواییدا بوونە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی مێژووی ڕاپەڕینەکە . لە گفتوگۆیەکی تایبەتی نووسەری ئەم وتارە لەگەڵ ڕۆژهەلاتناسی گەورەی سۆڤیەت ئەناتۆلی فیلیپۆڤیچ میللەر ، کە وەك وتمان لەو بڕوایەدایە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ جوولانەوەیەکی کۆنەپەرست بووە[٢] ، ڕاستەو ڕەوان گوتی : « ئەو مەتریاڵ‌و بەڵگانەی بەدەستمەوەن ڕێگای ئەوەم نادەن بتوانم بە جۆرێکی‌تر سەیری ئەم ڕاپەڕینە بکەم ، بەلام کەی بەڵگەی مێژوویی باوەڕپێکراوی پیچەوانەیانم دەست کەوت ئەو کاتە هەڵبەتە منیش لەسەر ڕۆشناییان دەتوانم بیرو ڕایەکی نوێ دابڕێژم‌و دان بەوەدا بنێم کە هەڵە بووم » . لەو بڕوایەدام زۆربەی مێژوونووسە بێ‌لایەنەکانی‌تریش هەر لەسەر ئەو ڕایەن .

ئەمە بێ‌گومان ئەرکێکی یەکجار گەورە دەخاتە ئەستۆی مێژوونووسە کوردەکانو بەڵکو هەموو ڕۆشنبیرێکی کورد ، بەتایبەتی ئەوانەی لە نزیکەوە ئاگایان لە ڕووداوەکانی ئەم ڕاپەڕینەیە کە هەوڵ بدەن کارێکی وا بکرێت ئەو ڕاستی‌یە مێژوویی‌یە گرنگانەی پێوەندی‌یان پێوەی هەیە نەفەوتێن‌و کۆبکرێنەوەو بە شێوەیەکی قوڵ‌و زانیاریانەی دوور لە هەست لە ڕووداوەکانی بکۆڵنەوە .

نووسەری ئەم وتارە لە سنووری توانایا لە سالانی خوێندن‌و کاریدا لە دەرەوەی ولات بایەخێکی زۆری بەم باسە داو شوێنێکی تایبەتی‌ی لە نامەی دکتۆرێکەیدا بۆ تەرخان‌کرد کە دەتوانم بڵێم بێ‌ئەنجام نەبوو . ئەوە بوو لە کاتی یەکەم لێکۆڵینەوەی ئەو نامەیەدا لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٣دا لە ئینستیتوتی ڕۆژهەلاتناسی ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی بڕیار درا کە پێویستە شارەزاکانی «لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانەی لەو نامەیەدان جارێکی‌تر چاو بخشێننەوە بە بیرو ڕایاندا بەرامبەر ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥

(٢) بڕوانە : أ . ف . میللەر ، کورتەی مێژووی تورکیا ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٤٨ ، ل ١٩٢-١٩٣ ، أ . ف . میللەر ، دەربارەی مێژووی هەرەنوێی تورکیا ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ - لینینگراد ، ١٩٤٨ ، ل ١٥٢-١٥٣ .

ە کوردستانی تورکیا»[٣] . جگە لەوە یەکێك لە کوردناسە هەرە گەورەکانی سۆڤیەت و ڕۆژهەڵاتناسی بە توانا و . ڤیلچێڤسکی ڕایەکی دە لاپەڕەیی دەربارەی ئەو نامەیە نووسی کە بە ئاشکرا پاشگەزبوونەوەی خۆی لە هەڵەکانی ڕابوردوی تێدا تۆمار کردبوو ، وە دانی بە ڕاستیی ئەو ئەنجامانەدا نا کە لەو نامەیەدا دەربارەی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ دەست نیشان کرابوون . دوای ئەوە بە ماوەیەك دەزگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی ئازەربایجان و ئەرمینیای سۆڤیەت ئامادەکردنی کتێبێکی تایبەتی یان دەربارەی ئەو ڕاپەڕینە بە نووسەری ئەم وتارە سپارد بۆ ئەو کتێبە گەورەیەی بەدەستەوەیە لەسەر هەموو مێژووی کورد بڵاوبکرێتەوە . جا وا لێرەدا بە کورتی بەشێکی ئەو باسە دەخەمە بەرچاو ، هیوامە ڕۆژێك بێت بتوانم هەمووی بە سەریەکەوە بڵاو بکەمەوە . نووسەری ئەم وتارە خۆی زۆر بە بەختیار دەزانێت ئەگەر توانیبێتی بەم کارەی بەشێکی زۆر کەم لەو قەرزە گەورەیەی دایکی نیشتمانی دابێتەوە کە وا لە ئەستۆی هەموو کوردێکدا .



---

(٣) وێنەی ئەو بڕیارە کە بە ناوی سەرۆکایەتی ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی کۆڕی زانیاری سۆڤیەتەوە یارمەتیدەری سەرۆکی ئەو دەزگایە ر . ت . ئەخرامۆڤیچ و پرۆفیسۆر ب .م . دانتسیگ ئیمزایان کردووە لای خۆم هەیە . دوای ئەم بڕیارە لە کاتی دووەم لێکۆڵینەوەی هەر ئەم نامەیەدا ڕۆژی ١٥ی مایسی ساڵی ١٩٦٣ بەشی «مەسائیلی نێوان میللەتان» بڕیارێکی ڕەسمی تریان دەرکرد کە لە لاپەڕەی دووەمیدا دەربارەی ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٢٥ دەڵێت : «بێگومان یەکێك لە ڕووە گرنگەکانی نامەکەی کەمال مەزهەر ئەوەیە کە لەسەر ئەساسی بەڵگەی بەنرخ هەڵەی ئەو بیرو باوەڕە تەسکەی دەرخستووە کە لە ناو ئێمەدا بڵاوە دەربارەی ئەوەی گوایە هەموو جووڵانەوەیەکی کورد سروشتی عەمالەتی هەبووەو لەلایەن ئینگلیزەوە بەرپادەکران بۆ خزمەتی ئامانجەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا . نووسەری ئەم نامەیە دەری خستوە کە وا ڕاپەڕینەکانی کورد وەڵامی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بووە بەرامبەر چەوسانەوەی کولۆنیالی (لە عێراق) و سیاسەتی شۆڤێنی دەوڵەتە بورژوازییە نیمچە دەرەبەگەکانی تورکیاو ئێران و عێراق . ئەو ڕایەی بەر لە ئێستا لە ناو ئێمەدا بڵاو بووە دەربارەی سروشتی سەر بە ئینگلیزی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید لە تورکیا (ساڵی ١٩٢٥) لە کاتی بەراوردیدا لەگەڵ ئەو بەڵگانەی نووسەری ئەم نامەیە هێناونیتیەوە بەلای کەممەوە پێویستی بە ڕاستکردنەوەیەکی یەکجار قووڵە» .

بۆ دیار کردنی نەك تەنها سروشتی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ ، بەڵکو هەموو جووڵانەوەی ئازادی – نەتەوەیی کوردستانی تورکیا ، پێویستە چاوێك بە باری ژیانی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی ئەم بەشەی کوردستاندا لە ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەمدا بخشێنرێت تا بتوانرێت هێزە بزوێنەکانی ئەو جووڵانەوەیە بە شێوەیەکی دروستو ڕەوان دەستنیشان بکرێن .

کاتێك شەڕی یەکەم کۆتایی هاتو ئیمپراتوریەتی عوسمانی ڕووخا بزوتنەوەیەکی سیاسیو ڕووناکیری گەورە سەرانسەری کوردستانی ژووررووی گرتەوە . ئەو ڕێکخراوە سیاسییانەی بە هۆی شەڕەوە لە کار وەستابوون دووبارە هاتنەوە کایە . جگە لەوانیش چەند ڕێکخراوێکی تری نوێ دامەزرێنراو چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێکی کوردی کەوتنە دەرچوون . هەموو ئەم ڕێکخراو و چاپەمەنییانە بە گورجو گۆڵی کەوتبوونە خۆیان بۆ ئەوەی بتوانن کەڵك لە باری سیاسی نوێی جیهان ، بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، وەربگرن تا بتوانن کارێکی وا بکەن میللەتی کوردیش بە مافە نەتەوایەتییەکانی خۆی بگات . هەر بۆ ئەم مەبەستەش ئەم ڕێکخراوانە پەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەتە سوێندخۆرەکاندا بەست . تورکەکان کە مەترسی ئەوەیان لێ نیشت کوردستانی ژووررووش بدۆڕێنن دووبارە پەنایان بردەوە بەر چەکە تاقیکراوەکەیان لەگەڵ کوردا – جووڵاندنی هەستی ئایینییان (!) ، بەڵام کە زانییان ئەمجارە میللەتی کورد بەجارێك خولیای سەربەخۆیی کەوتۆتە کەلەیەوە ناچار بوون لیژنەیەکی تایبەتی دابمەزرێنن بە بەشداریی چەند وەزیرێكو هەندێك لە سەرۆکە بەدرخانیکان بۆ لێکۆڵینەوەی باری سیاسی کوردستان . لە ئەنجامدا لیژنەکە هاتە سەر ئەو بیرەی کە ئەگەر تورکیا بیەوێت کوردستانی لێ جیانەبێتەوە پێویستە دان بە مافی ئۆتۆنۆمی میللەتی کوردا لە ناو قەوارەی دەوڵەتی تورکیادا بنێت . بۆ ئەم مەبەستە بڕیارێکی تایبەتی دەرکرا[٤] ، بەڵام بە کردەوە هیچ نەکرا بۆ جێبەجێکردنی ، لە ڕاستیشدا زۆری پێ نەچوو کەمالییەکان شۆڕشی ڕزگارییان دژی حوکمەتی سوڵتانو داگیرکەری بێگانە بەرپا کرد ، ئەمەش بارێکی سیاسی نوێی هێنایە کایەوە

---

**(٤) بڕوانە : الدكتور بلەچ شيركوه ، القضية الكردية – ماضي الكرد و حاضرهم ، القاهرة ، ١٩٣٠ ، ص ٦٥–٦٧ .**

کە بە جارێك سەرتاپای وڵاتی گرتەوەو کارێکی گەورەشی کردە سەر ژیانی سیاسی میللەتی کوردو هەموو دوارۆژی .
شۆڕشی کەمالی بەشێکی زۆری لە میللەتی کورد جووڵاند کە دڵسۆزانە چوونە پاڵپشتی بۆ ئازادکردنی نیشتمانی هاوبەش لە داگیرکەری بێگانە [٥] . کورد بەم کارەی هەستێکی نیشتمانی زۆر بەرزو تێگەیشتنێکی سیاسی ڕاستی دەربڕی ، بەڵام هەر لەو کاتەشدا بەشێکی کەم لە دەرەبەگە کوردە سەر بە ئینگلیزەکان دەیانویست ببنە کۆسپ لەبەر دەم پەرەسەندنی ئەو شۆڕشەداو ئەم کردارەیان تا ڕادەیەکی دیار بورجوازی – نیشتمانی تورکیشی ترساند . لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی ڕووداوە گرنگەکانی شۆڕشەکە خۆیدا کورد زۆر بە ئاشکرا نیشانیدا دەتوانێت لە مێژووی تورکیادا ببێتە هێزێکی دروستکەری پێشکەوتنخوازی. گەورە بۆ قوڵ کردنەوەی ناوەڕۆکی گۆڕانە شۆڕشگێرییەکانی و بەرەوپیش بردنیان . ئەوەبوو مستەفا کەمالو هاوەڵەکانی زۆر بە ئاسانی توانییان جێ‌پێی خۆیان لە کوردستاندا بکەنەوە ، چەند جارێك بچنە ناو کوردەکانو . بەڵکو لە ساڵی ١٩١٩شدا چەند کۆبوونەوەیەکی سیاسی گەورەی خۆشیان لە ناو ئەواندا بگێڕن ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئەوە بوو کە هێزە دێموکراتێکانی کورد لەو بڕوایەدان بە سەرکەوتنی کەمالییەکان کێشەی نەتەوایەتی ئەوانیش لە سەر ڕێوشوێنێکی ڕاست چارە دەکرێت ، ئەوەی زیاتریش پاڵی پێوەنان بۆ ئەم بیرە ئەو هەوڵو تەقەلاو پەیمانە زۆرە بوو کە کەمالییەکان ئەیاندان بۆ نزیك کەوتنەوە لە کورد ، بەتایبەتی چونکە ئەشیانزانی ئەوە دەبێتە هۆیەکی یارمەتیدەر بۆ «سەندنەوەی» کوردستانی خوارووش کە لەسەری یەکسەر لەگەڵ ئینگلیزەکاندا کەوتنە کێشە . هەر لەبەر ئەمەش بوو زۆر جار ئەو پەیمانانەی دەیاندا بە

---

(٥) ژمارەیەك لە نووسەرە بێگانەکان باسی ئەوەیان کردووە کە مستەفا کەمال بێ یارمەتی میللەتی کورد نەیدەتوانی بەسەر دوژمنەکانی تورکیادا سەربکەوێت .
لەم ڕووەوە دیپلۆماسی ئەمەریکی ولیەم ئیگلتن نووسیویتی دەڵێت : «هەر چۆنێك بێت ئەتاتورك (تورکەکان لە خۆشەویستیدا مستەفا کەمالیان ناونا (ئەتاتورك) واتە باوکی تورك – نووسەر) نەیدەتوانی گوێ نەداتە پشتگیری هێزە کوردەکان لە خەباتیدا لە پێناوی یەکیەتی تورکیادا لە ماوەی ١٩٢٠–١٩٢٣دا» .

W. Eagleton, The Kurdish Republic of 1946, London, 1963 . P . 12.

کورد لە شێوەی بەیاننامەی تایبەتیدا بلاٌویان دەکردنەوەو دەشیاننارد نە ناوچەکانی کوردستانی خواروو . لە یەکێك لەو بەیاننامانەدا کە لە ئارارات‌و جۆلەمێرگ بلاٌوکراوەتەوەو چەند ژمارەیەکی گەیشتۆتە رەواندزیش دەڵێت :

«ئەی هاونیشتمانی‌یان : حوکمەتی کۆماری تورکی بە تەواوەتی سوورە لەسەر ئەوەی هەموو پێویستی‌یەکی شارستانێتی لە نیشتمانە خۆشەویستەکەمان کوردستانی تورکیادا بلاٌو بکاتەوە . رێگاو بانەکانتان قیرتاو دەکرێن . دێهات‌و شارەکانتان پڕ قوتابخانەو مامۆستا نامێننەوە ، خێزانەکانتان شادمان‌و بەختیارتر دەبن لە ژیانێکی پڕ لە خۆشیدا ، ئاسایش‌و یاسا دەبنە هۆی پەرەسەندنی خێرو خێراتی ولاٌتەکەتان . ژیان‌و ماڵ‌و شەرەفی هاونیشتمانی‌یەکانمان لە ژێر پارێزگاری ڕاستەقینەو دڵسۆزانەی یاسای کۆماردایە . .»[٦] .

جگە لەوە لە گەرمەی سەرەتای شۆڕشی بۆرجوازی‌ی تورکدا ژمارەیەکی زۆر لەو سەرۆکانەی لەگەڵ مستەفا کەمالدا ئەو شۆڕشەیان بەرپا کرد ، هەر وەك لە یادداشت‌و نامە کۆکراوەکانی خۆیدا دەردەکەوێت ، کورد بوون . بە وێنە کۆمیتەی سەرۆکایەتی کۆنگرەی ئەرزرۆم (٢٣ی تەمموز – ٦ی ئابی ١٩١٩) کە بە یەکێك لە نوقتە هەرە گرنگەکانی سەرەتای ئەو شۆڕشە دادەنرێت[٧] لە ٨ کەس پێکهاتبو کە سیانیان کورد بوون : شێخ فەوزی[٨] سەرۆکی نەقشبەندێکان لە ناوچەی ئەرزنجانداو سەعدوڵلا بەگی خەڵکی سعرت کە تا ساڵی ١٩١٨ ئەندامی پەرلەمانی عووسمانی بوو ، وە سەرۆکی هۆزی موتکی[٩] حاجی موسا بەگی میرزا زادە[١٠] .

(٦) بڕوانە :

A. M. Hamilton , Road through Kurdistan, London , 1937, PP. 295 – 296

(٧) لە کاتی ئەم کۆنگرەیەدا مستەفا کەمال دروشمی «خەباتی میللەت دژی داگیرکەر لە ڕێگای سەربەخۆیی نیشتمان»دای بەرز کردەوە .

(٨) حاجی شێخ فەوزی ئەفەندی ناسراو بوو ، ساڵی ١٨٦٨ لە دایك بووە . لە ئەرزنجان‌و دەرسیم دەست‌ڕۆیشتوو بوو . دژی داشناقەکان وەستا .

(٩) ئەم هۆزە لە ویلایەتی بەتلیس لە ناوچە شاخاوێکانی نزیك سەرچاوەی ڕووباری دجلە نیشتەجێ‌یە . «مووت یا موتکان»یشی پێ دەڵێن . لە سەردەمی عوسمانی‌یەکاندا هۆزی موتکی قەت سەری بۆ حوکمەت شۆڕ نەکردووەو هەموو کاتێك ژیانێکی نیمچە سەربەخۆی بردۆتە سەر .

(١٠) بڕوانە : « مستەفا کەمال – ڕێگای نوێی تورکیا» ، (نامەو وتارە کۆکراوەکانی مستەفا کەمال) ، چاپی ڕووسی ، بەرگی یەکەم ، مۆسکۆ ، ١٩٢٩ ، ل ٦٥ .

ستەفا کەمال لەگەڵ ئەمانەداو گەلێك کوردی ناسراوی‌تردا پەیوەندی زۆر نزیکی بووەو گەلێك نامەی تایبەتی بۆ ناردوون[11] .

لە «شواری نیشتمانی گەورە» (المجلس الوطني الكبير)ی تورکیادا کە کەمالی‌یەکان ە نیسانی ساڵی ۱۹۲۰دا لە شاری ئەنقەرە بەستیان ۷۲ نوێنەری کورد بەشداری کردووە[12] ، هەموو ئەندامانی ئەم شواریە زۆر بە گەرمی پێشوازی قسەکانی وێنەری شاری ئەرزرۆم حسەین عەونی‌یان کرد کە لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانیدا ووتی :

«لەم تریبونەوە (منصە) مافی قسە کردن هی دوو نەتەوەیە – کوردو تورك» ، لەم جۆرە قسەیەش چەند جارێك لە لایەن نوێنەرە تورکەکانەوە لە کاتی کۆنگرەی قوستەنتەنی‌یەدا بۆ لێکۆڵینەو ـ کێشەی مووسڵ دووبارە کرانەوە[13] .

بەلاّم کەمالی‌یەکان وەك نوێنەری چینی بۆرژوازی‌ی نەتەوەی دەسەلاّتدار زوو ، هەر دوای ئەوەی جی‌پێی خۆیان قایم‌کرد ، رووی راستەقینەی سیاسەتی نەتەوایەتی‌یان خستە روو کە بەشێکی گرنگی جیانەکراوەی سیاسەتی گشتی‌یان بوو بەرامبەر ژیانی دیموکراتی‌و چینە چەوساوەکان[14] ، ئەوە بوو لەلایەکەوە کەوتنە گیانی پرۆلیتاریاو جوتیاری تورکیا ، لەلایەکی تریشەوە بەربوونە نەتەوەکانی‌تر ، بە تایبەتی کورد کە دوای تورك گەورەترین نەتەوەیان پێك دەهێنا . ئەمە دیوی تاریك‌و کۆنەپەرستی سیاسەتی بورژوازی نیشتمانی تورك بوو کە بە تەواوی پێچەوانەی

---

(۱۱) هەمان سەرچاوە ، ل ٦٥ ، ٨١ ، ١٥٢ ، ٢٢٨ ، ٢٣٤ ، ٢٣٦ ، ٢٨٤ ، ٣١٢ .

(۱۲) بڕوانە :

A.R. Ghassemlou , Kurdistan and the Kurds, Prague, 1965 , P. 46.

(۱۳) دەربارەی هەوڵی کەمالی‌یەکان لە سەرەتای جوولاّنەوەکەیاندا بۆ نزیك‌کەوتنەوە لە کورد بە درێژی بڕوانە : بلەچ شیرکوە ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٧٤–٧٥ هەروەها :

A. Safrastian , Kurds and Kurdistan , London , 1948, PP. 81 – 82

(۱٤) بێ‌گومان یەکێك لەو هەڵە گەورانەی کاریگی وایان کردووە زۆربەی مێژوونووسە پێشکەوتن خوازەکانی دەرەوە لە راياندا بەرامبەر راپەرینی ساڵی ۱۹۲۵ بە هەڵەدا بچن ئەوەیە کە بە یەك چاوو لە یەك قاڵبدا سەیری سیاسەتی کەمالی‌یەکان بەرامبەر چینە چەوساوەکانی تورکیاو ژیانی دیموکراتی گشتی لە ولاّتدا لەگەڵ سیاسەتی نەتەوایەتی‌یان بەرامبەر کورد نەکردووە ، هەرچەندە جیا کردنەوەی ئەو دوو شتە پێکەوە بەستراوە لە هیچ کاتێك‌و لە هیچ شوێنێکدا ناتوانرێت بە راست دابنرێت .

دیوەکەی‌تری ئەو سیاسەتە بوو کە لە سەرەتای بیستەکاندا لەو خەباتە پڕ ـە قارەمانێتی‌یەدا خۆی نواند کە ئاراستەی هێزە ئیمپریالی‌یە داگیرکەرەکان کرابوو . دوای ئەویش بۆ چەند ساڵێك دژی هێزە کۆنەپەرستەکانی ناوخۆ . بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم مەبەستە دوولایی‌یە مستەفا کەمال پێویستی بەوە بوو هەموو دەسەلاّت لەدەست چینی بۆرژوازی‌ی نیشتمانیدا کۆبکاتەوەو لەو ڕێگایەشەوە دیکتاتوریەتی خۆی دابمەزرێنێت ، بۆیەکا لە ئابی ساڵی ۱۹۲۳دا حیزبێکی تایبەتی‌ی دروست‌کرد کە ناوی «میللەت»ی لی‌ناو لەکاتی هەڵبژاردنەکەی هەر ئەو ساڵەدا ۲٦٥ ئەندام ـە مەجموعی ۲۸٦ ئەندامی پەرلەمانی لی‌هەڵبژێررا[١٥] . ئەمە ئەوەندەی‌تر دەسەلاّتـو توانای دا بە مستەفا کەمالی نوێنەری چینی بۆرژوازی‌ی تورك کە بتوانێت سیاسەتە دوو لایی‌یەکەی خێراتر بەرێتە سەر . هەر دوای ئەو هەڵبژاردنە مستەفا کەمال چەنـد هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە نا کە لە هەموویان گەورەتر بڕیاری لابردنی خەلیفایەتی‌و[١٦] دامەزراندنی ڕژێمی کۆمار بوو لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۲۳ دا ، دوای ئەوە لە سەرەتای مارتی ساڵی داهاتودا خەلیفە بە خاوو خێزانەوە لە ولاّت دەرکراو ، لە مانگی نیسانیشدا دەستورێکی نوێ بـۆ ولاّت دانرا .

لا تاریکەکەی ئەو سیاسەتەش هەر زوو نەك تەنها بەرامبەر نەتەوەی کورد . بەڵکو بگرە لە پێش ئەویشدا لە چەند کارێکی سیاسی‌و کومەلاّیەتی‌تری گرنگـدا خۆی نیشاندا . پێش کورد بۆرژوازی‌ی تورك لە چینی کرێکاری دا ، هەرچەنـدە ئەم چینەو سەرۆکەکانی هەر لە یەکەم ڕۆژی خەباتی مستەفا کەمالەوە دژی داگیرکەر زۆر دڵسۆزانە پشت‌گیری‌یان کرد . یەکەم هەنگاوی کەمالی‌یەکان لەم ڕوومەوە ئەوەبوو کە هەر زوو لە «ئیتیحادی» و «پان - ئیسلامی»یە کۆنەکان حیزبێکی تایبەتی‌یان بۆ چینی کرێکار دروست‌کردو ، تەنانەت ناویشیان لی‌نا «حیزبی کۆمۆنیست» بۆ ئەوەی لەم ڕێگایەوە جڵەوی هەموو پرۆلیتاریای تورکیا بدەنە دەست چینی بۆرژوازی‌و لە ڕێکخراوەکانی خۆیانیان دوور بخەنەوە . کەمالی‌یەکان هەر

---

(١٥) بڕوانە : أ . د . نوفیچێف . تورکیا ، بەزمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٥ ، ل ۱٦۷ .

(١٦) ڕژێمی خەلیفایەتی دەمێك ساڵ بوو ببووە گەورەترین کۆسپ لەبەردەمی پێشکەوتنی تورکیادا .

ئەوەندە جێگیر بوون بەمەشەوە نەوەستان . لە کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۲۱دا جەندرمەکانی شاری تەرابزۆن ۱٦ سەرۆکی ناوداری خەباتکەری چینی کرێکاریان بە جەرێك کوشت ، یەکێکیان مستەفا سوبحی بوو کە ساڵەهای ساڵ بوو دڵسۆزانەو بێمەترسی خەباتی دەکرد لە رێگای ئازادی تورکیاو بەختیاری هەموو میللەتەکەیدا . ئەم رووداوانەو ، دەها بەڵگەی مێژوویی تری وا ئەو راستیەمان بـۆ دەردەخەن کە سیاسەتی نەتەوایەتی بۆرژوازیی تورك شتێکی تاكو تەراو تەنیا نەبوو ، بەڵکو تاقە ئەڵقەیەکی گرنگی سیاسەتێکی گشتی کۆنەپەرست بوو ، دیارکردنی ئەمەش بایەخی تایبەتیی هەیە بۆ دەستنیشان کردنی چوارچێوەی راستەقینەی سروشتی راپەڕینی ساڵی ۱۹۲٥ .

بیرتەسکی کەمالیەکان لەوەدا دەرکەوت کە نەك هەر نەیانتوانی یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی شۆڕشی بۆرژوازی دیموکراتی جێبەجێ بکەن کە ئەویش نەهێشتنی چەوسانەوەی نەتەوایەتیە ، بەڵکو بە تەواوەتی رێگایەکی پێچەوانەی ئەوەشیان گرتەبەر . سەرەتای ئەم رێگا نالەبارە هەر زوو دەرکەوت[۱۷] ، بەتایبەتی کاتی دانانی دەستووری نوێی تورکیا لە نیسانی ساڵی ۱۹۲٤دا .

ئەوەبوو لەو دەستوورە تازەیەدا تەنها ئەو بەندانەی دەستوورەکانی ساڵی ۱۸۷٦ و ۱۹۰۹ هێڵرانەوە کە بە تەواوەتی لەگەڵ بەرژەوەندە چینایەتیەکانی بۆرژوازیی پشتیانیدا دەگونجان ، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندیان هەبوو بە بێبەریکردنی چینە چەوساوەکانو نەتەوە ژێردەستەکان لەمافە سیاسیە رەواکانی خۆیان (وەك بێبەریکردنی ئەو کەسانەی نەتوانن بە تورکی بخوێننەوەو بنووسن لە مافی دەنگدانو دانانی زمانی تورکی بە تاقە زمانی رەسمی لە سەراپای وڵاتا) . هەر ئەم سیاسەتە پێش راپەرینەکەی ساڵی ۱۹۲٥ لە گەڵێك کردەوەیتردا خۆی نواندو زۆر بە خێرایی گەیشتە پلەی سیاسەتێکی شۆڤێنی لێکۆڵراوە کە ئامانجی ، وەك نووسەری

---

(۱۷) پێش ئەوەی کەمالیەکان بە تەواوەتی دەسەڵات بگرنە دەست ناوەرۆکی سیاسەتی شۆڤێنی بورژوازی تورك لە کاتی مۆرکردنی پەیمانی «سێڤەر»دا دەرکەوت ، بە تایبەتی لەو مەترسیەوە بێشومارەی ئەو بەندانەی پەیوەندییان هەبوو بە مەسەلەی کوردەوە خستیە دڵیانەوە ، چونکە جێبەجێ کردنیان مانای بێبەریکردنی بورژوازی بازرگانی تورك بوو لە بازارەکانی کوردستانی ژوورو .

ئینگلیزی ف. رایند دەڵێت ، ئەوەبوو «تورکیا بکرێتە دەوڵەتێکی یەك نەتەوەیی»[18] ، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمەش دیارە پێویست بوو هەموو نەتەوەکانی تری ئەم ولاتە لە بۆتەی نەتەوەی گەورەدا بتوێنرێنەوە .

وردە وردە دیوی شاراوەی ئەم سیاسەتە کەوتە روو . تەنانەت لەو بایاننامانەشدا کە کەمالیەکان بە کوردستاندا بلاویان دەکردەوەو بە ئاشکرا ، وەك دیمان ، مەرایی کوردیان دەکرد ، هەر لەو کاتەشدا پەنجەی هەرەشەیان لەو هێزە کوردانە رادەوەشاند کە بڕوایان بە هیچ هەرەوەزێك لەگەڵ تورکیادا نەبوو . کۆتایی ئەو بەیاننامەیەی لەسەرەوە باسمان کرد بەم جۆرە هاتبوو :

«ئەوانەی دژی یاسای کۆمارەکەمان ئەوەستن زۆر بە توندیو بێبەزەیی لێیان دەدرێت ، هەموو هەوڵێکی یاخی بوون یەکسەر دادەمرکێنرێتەوە بێ ئەوەی ماوەی بدرێت هیچ جۆرە سەرکەوتنێك بەدەست بهێنێت»[19] .

هەر لەو کاتەدا ، وەك مامۆستا شاوەیس لە نووسینەکانیدا ئەیگێرێتەوە ، کەمالیەکان نەیانهێشت کوردی تورکیا نوێنەری خۆیان بنێرن بۆ بەشداری کردن لە «کۆنگرەی میللەتانی رۆژهەلات»دا کە لە شاری باکۆ لە ئەیلوولی ساڵی ۱۹۲۰دا گیرا ، کەمالیەکان ویستویانە خۆیان وەفدێکی دەستکرد بکەنو بەناوی کوردەوە بینێرن بۆ ئەو کۆنگرەیە[20] چونکە ، وادیارە ، مەترسی ئەوەیان بووە نیشتمانپەروەرانی کورد مەسەلەی میللەتەکەیان لەبەردەمی ئەو کۆنگرە جیهانیەدا بە جۆرێکی وەها بهێننە پێشەوە کە لەگەڵ سیاسەتی ئەواندا نەگونجێت . هەر لەو ساڵەدا کەمالیەکان بڕیاری خنکاندنیان بەسەر کامەران عالی بەدرخاندا دا کە خێزانەکەی سەدەیەك ئەبوو بێ وچان خەباتی لە پێناوی رزگاریی کوردستاندا دەکرد . پاش ماوەیەك زیا گیۆك ئالپ ، کە بە یەکێك لە فەیلەسووفە نەتەوە پەرستە هەرە

---

(۱۸)

F . F . Rynd, Turkish racial theories (Jounal of the Royal Central Asian Society), Vol. XXI, July 1934 , Part II.

(۱۹) بڕوانە :

A.M. Hamilton, OP. Cit, P. 296

(۲۰) بڕوانە : «رۆژی نوێ» ، ژمارە - ۱- ، ساڵی - ۲ ، مارتی ۱۹٦۱ ، ل ۲۱ .

گەورەکانی تورکیای نوێ دائەنریت[٢١] ، لەو رۆژنامەیەدا کە لە شاری دیاربەکر بە زمانی تورکی دەرئەچوو چەند وتارێکی بلاوکردەوە دەربارەی ئەوەی گوایە دیاربەکرو دانیشتوانی‌و بگرە دانیشتوانی هەموو شارەکانی کوردستانی ژووروو تورکن[٢٢] . ئەم جۆرە نووسینانە بە جارێك هەستی ناسکی نەتەوایەتی بریندار کراوی کوردیان دەجوولاند ، بەتایبەتی هەستی رۆشنبیرە خوێن گەرمەکان .

لەلایەکی ترەوە سیاسەتی شوڤێنی کەمالی‌یەکان هەموو رێکخراوو رۆژنامە کوردی‌یەکانی ناچار کرد یا بە تەواوی دەست لە ئیش کردن هەڵبگرن ، یا بچنە کۆڕی خەباتی نەهێنی‌یەوە ، بەتایبەتی دوای ئەوەش کە کاربەدەستانی تورکیا خۆیان بە شێوەیەکی رەسمی قەدەغەیان‌کردن . لە ساڵی (١٩٢٤)ەوە کاربەدەستەکانی کوردستان بە ئاشکرا کەوتنە ئەوەی داوا لە خەڵکی بکەن لە کاروبارو گفتوگۆیاندا زمانی تورکی بەکار بهێنن ، هەر لەو ساڵەشدا ژمارەیەك لە سەرۆکە کوردەکان لە وڵات دوور خرانەوە[٢٣] .

ئەمانەو بە دەها کردەوەی تری وا بەجارێك هەستی نەتەوەیی هەموو چینەکانی میللەتی کوردیان بزواندو ، ئەمەش کارێکی یەکجار گەورەی کردە سەر ژیانی سیاسی کوردستانی تورکیا . لێرەشدا زۆر گرنگ‌و پێویستە ئەو راستی‌یە بخرێتە بەر چاو کە

(٢١) ئەم (زیا گۆك ئالپ)ە (١٨٧٦-١٩٢٤) خۆی خەڵکی دیاربەکر بووە ، بە رەگەز کوردە ، بەڵام لە هەموو تۆرانی‌یەك تۆرانی‌تر بووە . بۆیەکا پێی ناخۆش بووە پێی بڵێن کوردە . هەندێك لە دوژمنەکانی تۆانجی ئەوەیان تێدەگرت کە تورك نی‌یە ، کەچی لە هەموو کەسێکیش زیاتر لافی تورکایەتی لێ‌ئەدات . لە وەڵامی ئەوەدا پارچەیەك شیعری داناوە لە ژێر ناوی «بۆ ئەو پیاوەی بە من دەڵێت تورك نیم» کە تیایا وتویەتی :

من تورك بم یا نا
هاوڕێی تورکم
ئێوەش تورك بن یا نا
دوژمنی تورکن

(٢٢) بڕوانە :

(Turkish Nationalism and Western Civlization. Selected essays of Zia Kokalp), translated and edited by Niyazi Berkes, London,1959, pp.43 — 45, 140 — 141.

(٢٣) بڕوانە :

L.Rambout, Les Kurdes et le droit, Paris, 1947, P. 26.

ئەم بەشەی کوردستان لانکەی دروست بوونو گەشەکردنی بیروباوەڕی نەتەوایەتیو مەڵبەندی سەرەتای پەیدا بوونی جووڵانەوەی ئازادی – نەتەوەیی هەموو میللەتی کورد بووە [٢٤] ، بۆیەکا سیاسەتی شۆڤێنی چینە کاربەدەستەکانی تورك زۆر بە خێرایی ڕەمەکی خەڵکەکەی جووڵاند ، کە زۆربەی زۆریان لە بۆتەی خەباتی ساڵەهای ساڵی باوو باپیرو خۆیاندا قاڵ بووبوون . ئەمە ڕاستی‌یەکی مێژوویی یەکجار گەورەیە کە کارێکی زۆری کردۆتە سەر بەرپا بوونو سروشتی ڕاپەرینەکەی ساڵی ١٩٢٥ . بەڵام بە داخەوە زۆربەی مێژوونووسان خستویانەتە پشت‌گوێ .

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك مێژوونووسی بێگانەی دووربین پێش بەرپابوونی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ بە ماوەیەك سیاسەتی شۆڤێنی کەمالی‌یەکان بەرامبەر کورد ..ەرنجی ڕاکێشاونو خەمڵی ئەوەیان لێ‌داوە کە ئەو سیاسەتە لە ئەنجامدا پاڵ بە کوردەوە دەنێت ڕاپەڕن .

لەم ڕووەوە ڕای مێژوونووسی ئینگلیزی بەناوبانگ پرۆفیسۆر ئارنۆلد تۆینبی جێگاو سەنگێکی زۆر گەورەی هەیە . تۆینبی دوو ساڵ پێش ڕاپەرینەکە چۆتە تورکیاو لە نزیکەوە گفت‌وگۆی لەگەڵ کاربەدەستە گەورەکانو پیاوە سیاسی‌یە ناسراوەکانی ئەم وولاتەدا کردووەو پاش گەڕانەوەی لە یەکێك لە وتارەکانیدا باسی ئەوەی کردووە چۆن لەوێ « هەوڵ دەدرێت کورد بتوێنرێتەوە»وگەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم سیاسەتە ڕۆژێك لە ڕۆژان « دەبێتە هۆی نانەوەی کێشەو ناخۆشی لەلایەن کوردەوە بۆ ئەنقەرە ، بەڕادەی ئەو کێشەو ناخۆشی‌یەی لەلایەن ئەلبانی‌یەکانەوە کاتی خۆی بۆ ئیمپراتوریەتی عوسمانی نرایەوە [٢٥] . وابزانم مستەفا

(٢٤) زۆربەی جووڵانەوەکانی میللەتی کورد لە سەدەی نۆزدەمیندا لەم بەشەی کوردستان بەرپابوون ، بۆ یەکەم جار ساڵی ١٨٨٠ هەر لەم بەشەی کوردستاندا دروشمی سەربەخۆیی کوردستانی گەورە لە کاتی ڕاپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵلادا هەڵگیرا ، هەر کوردە نیشتمان پەروەرەکانی ئەم بەشەی کوردستانیش بوون کە یەکەم ڕۆژنامەیان بە زمانی کوردی دەرکردو یەکەم ڕێکخراوی سیاسی‌یان لە مێژووی هەموو کوردستاندا دامەزراند .

(٢٥) لە بیست‌و سی‌یەکانی سەدەی پانزەهەمدا تورکە عوسمانی‌یەکان هەموو ئەلبانیایان داگیرکرد ، هەر لەو کاتەوە میللەتی ئەلبانی زۆر بە گەرمی کەوتە خەبات دژی ئەم داگیرکەرە بێگانانەو دەها ڕاپەڕینی خوێناوی بەرپا کرد ، بۆیەکا زۆر جار دەگوترێت ئەلبانی‌یەکان لە هەموو لایەك زیاتر کێشەیان بۆ عوسمانی‌یەکان نایەوە ، بە وێنە ڕاپەڕینی ئەلبانی‌یەکان ساڵی ١٩١١ تا ڕادەیەکی زۆر بووە هۆی لاوازبوونی ڕژێمی «تورکە لاوەکان».

کەمال‌و هاوەڵەکانی زیاتر حیکمەت دەنوێنن ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بەربەستی ڕوودانێکی وەها بکەن بەوەی مافی هاونیشتمانی یەکسانی بدەن بە کورد ، بەڵام ئەوان لە تێگەیشتنەوە بێت یا نا سیاسەتی تواندنەوەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە»[٢٦] .

تەنها هەستی نەتەوایەتی‌و سیاسەتی شۆڤێنی کەمالی‌یەکان پاڵیان بە کوردەوە نە نا ڕاپەڕن ، بەڵکو گەلێك هۆی‌تریش لە ئارادا بوون کە بەشێکی زۆری ئەوانیش هەر ئەنجامی ئەو سیاسەتە بوون . بەر لە هەموو شتێك پێویستە چاوێك بە باری ژیانی ئابوری نوێی کوردستانی تورکیادا دوای سەرکەوتنی شۆڕشی بۆرژوازی‌ی لەم وولاتەدا بخشێنین تا بتوانین ئەو هۆ ئابووری‌یە گرنگانە دەست نیشان بکەین کە زرووفی تەقینەوەی سیاسی‌یان لەم بەشەی کوردستاندا بە جارێك گەیاندە ڕادەی کامل‌بوون .

دیارە لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی بۆرژوازی لە تورکیادا سیاسەتێکی ئابووری‌ی نوێ هاتە کایەوە . کەمالی‌یەکان لەم ڕووەوە چەند هەنگاوێکیان بەرەوپێشەوە نا بە مەبەستی لاوازکردنی چینی دەرەبەگ‌و جۆری بەرهەم‌هێنانی دەرەبەگایەتی‌و بەرەپێ‌سەندنی هۆو پەیوەندی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری چ لە کشتوکاڵ ، چ لە پیشەسازی‌و بازرگانێتیدا . بەڵام ئامانجی بەرو دوای هەموو ئەو هەنگاوانە بەهێز کردنی دەسەڵاتی سیاسی‌و ئابووری‌ی چینی بۆرژوازی‌ی خۆی بوو ، بۆیەکا لە ئەنجاما نەك هەر باری ژیانی چینە چەوساوەکان بەرەو باش‌بوون نەڕۆی ، بەڵکو لەگەڵێك ڕووەوە بەرەو خراپیش ڕۆی .

کەمالی‌یەکان نەیاندەویست لە بنەڕەتا لە دەربەگایەتی بدەن‌و بەوە جووتیار ڕزگار بکەن ، بەڵکو هەوڵ‌و تەقەلایان ئاراستەی ئەوە کرابوو کە جۆری بەرهەم هینانی دەرەبەگایەتی پلەیەك پێش بخرێت‌و شێوەی سەرمایەداری بدرێتێ ، ئەمەش لە هەموو شوێن‌و کاتێکدا دەبێتە هۆی قوڵ‌بوونەوەی چەوساندنەوەی جووتیارو بگرە هەموو لادێی . هەر ئەنجامی ئەم سیاسەتەش بوو کە تا ماوەیەك دوای سەرکەوتنی

---

(٢٦)

**Professor Arnold J. Toynbee, Angora and the British Empire in the East — (The Contemporary Review), London, June 1923 , PP. 386 — 387.**

شۆڕشی بورژوازی هەندێك لە سەرانەو باجی دەرەبەگایەتی هەر وەك خۆیان هێڵرانەوە ، بەڵكو كەمالی‌یەكان زۆر جاریش دەستی یارمەتیان بۆ خاوەن زەوی شارێكان ، كە پەیوەندی‌یان لەگەڵیاندا هەبوو ، درێژ دەكرد ، وەك ئەوەی قەرزیان ئەدانێ‌و لە دەرەوە تراكتۆرو ئەمرازی بەرهەم هێنانی‌تری نوێ‌یان بۆ دەهێنان . زەوی‌و زاری ئەم جۆرە خاوەن موڵكانە بەتایبەتی لەسەر حسابی جووتیارە ئەرمەنو یۆنانی‌یەكان لە پەرەسەندندا بوو ، ژمارەی جووتیاری بێ‌زەویش ، بەتایبەتی لە ناوچەی وەك كوردستاندا ، ڕوو لە زیادی بوو . تەنانەت عیسمەت ئینۆنۆی سەرەك وەزیران ساڵی ١٩٣٦ خۆی ناچار بوو دان بەوەدا بنێت كە «ژمارەیەكی بێ شومار جوتیاری بێ زەوی هەن»[٢٧] . پاش ئەویش بە ٢٤ ساڵ ڕۆژنامەی «یەنی صباح»ی توركی نووسیبووی كە وا «قسەی شێخ وەك قانوون وایە بۆ جووتیار كە تەنانەت مافی ئەوەشی نی‌یە بێ ڕەزامەندی ئەو بۆ هیچ كارێك پەنا بەرێتە بەر كاربەدەستە میرێكان»[٢٨] . ئەمانە هەموو ئەو ڕاستی‌یە دەخەنە بەرچاو كە وا سیاسەتی كشت‌وكاڵی بۆرژوازی تورك سیاسەتێكی قوڵ‌و سەركەوتوو نەبوو ، بۆیەكا بووە هۆی پەرەسەندنی دووبەرەكایەتی چینایەتی‌و كۆمەڵایەتی لە لادێكاندا[٢٩] .

دیارە ئەم جۆرە ڕێڕەوە نەیدەتوانی كارێكی وا بكات كشت‌وكاڵ لە توركیای كەمالیدا هەنگاوی گەورە بەرەوپێش بنێت . بە وێنە تا ساڵی ١٩٢٩ ئینجا ڕووپێوی ئەو زەوی‌و زارەی بۆ كشتوكاڵ بەكار دەهێنرا گەیشتەوە ڕادەی ساڵەكانی پێش شەڕی یەكەم ، بەڵام ئەو بەرهەمەی دەیدا لە دەوروبەری ٨٠٪ی بەرهەمی پێش شەڕ تێ‌نەدەپەڕی ، ژمارەی مەڕوماڵاتیش هەر لەو ساڵەدا بە زەحمەت خۆی دەدا لە ٨٥٪ی ژمارەی پێش شەڕ[٣٠] . لە ئەنجامی ئەمەدا گرانی هەتا دەهات پەرەی دەسەند . ئەم ژمارانە ، وابزانم ، زۆر بە ئاشكرا ڕادەی ئەو گرانی‌یە دەخەنە ڕوو : ساڵی ١٩١٣ حۆقەیەك گۆشت بە ٥ قرش بوو ، حۆقەی نان بە قرشێك‌و ڕۆنی

---

(٢٧) بڕوانە «مێژووی هەموو جیهان» ، بە زمانی ڕووسی ، بەرگی -٩ - مۆسكۆ ، ١٩٦٢ ، ل ٤٤١ .

(٢٨) لە گۆڤاری «الطریق» ، بیروت ، ٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٦١ ، ل ٩٣ وە وەرگیراوە .

(٢٩) زۆربەی مێژوونووسە پێشكەوتن خوازەكان پەنجەیان بۆ ئەم ڕاستی‌یە ڕاكیشاوە ( بە وێنە بڕوانە : ب . پ . مایسیفو م . أ . گاسرەتیان ، توركیا ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسكۆ ، ١٩٦٥ ، ل ٤٨) .

(٣٠) بڕوانە : أ . نۆفیچیف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٧٠ .

زەیتونیش بە ٣ ، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٨دا نرخی حۆقەیەك گۆشت گەیشتە ١٥٠ قرش‌و نان ١٨ و ڕۆنی زەیتونیش ٧٠ قرش . بەم جۆرە لەسەردەمی کەمالی‌یەکاندا نرخی شتومەکی پێویست لە ١٨ وە تا ٤٠ کەرەت بە نیسبەت پێش شەڕەوە زیادی کردووە[٣١] . تاقە تاقێك کەڵکی لەم گرانی‌یە وەرگتبێت بۆرژوازی‌ی بازرگانی تورك بوو کە ژمارەیەك مێژونووس بە هێزی جووڵێنەری شۆڕشی کەمالی‌ی دادەنێن ، بەڵام بە نیسبەت هەژار و چەوساوانەوە تاقە مانایەکی هەبوو – برسێتی ! .

تەنانەت ئەو پێش‌کەوتنەش کە دوای هاتنی کەمالی‌یەکان بەرهەمی پیشەسازی گرتەوە نەبووە هۆی ئەوەی باری ژیانی ئابووری وڵات بێتەوە سەر خۆی ، بەڵکو بە پێچەوانەوە پەرەسەندنی دەسەڵاتی سیاسی‌و ئابووری‌ی بۆرژوازی‌ی بووە هۆی ئەوەی چەوساندنەوەی چینی کرێکار تەشەنە بسێنێت . ڕۆژانەی کرێکاری شارەزا لە شاری ئەستەمول دەگەیشتە ١٢٠ – ٢٠٠ قرش ، ڕۆژانەی کرێکاری ڕەمەکیش لە دەوروبەری ٤٠ تا ١٠٠ قرشدا بوو[٣٢] هەرچەندە ڕۆژی کار زۆر جار خۆی داوە لە ١٦ سەعات . ئەم ڕوژانەیە ، وەك سەرچاوە ڕەسمی یەکان خۆیان دانیان پیا ناوە لە ڕاستیدا بە مقداری ١٧٪ کەمتر بووە لە ڕادەی ڕۆژانەی کرێکارانی ساڵی ١٩١٣[٣٣] .

ڕۆژانەیەکی وا کەم تەنانەت بەشی ژیانی کولەمەرگیشی نەدەکرد ، بە وێنە وەك یەکێك لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکان دەیگێڕێتەوە کرێکارانی کانە خەڵوزەکانی زەنگولّ – داغ لە نانی ڕووت‌و گەنمەشامی بەولاوە هیچی‌تریان نەدەخوارد[٣٤]

---

(٣١) دەربارەی ئەو ژمارانە بڕوانە :

The Times), London, July 8, 1929) ئەوی سەرنج ڕادەکێشیت تەنانەت کاربەدەستانی تورکیا خۆشیان بە شێوەیەکی ڕەسمی دانیان بەو گرانیەدا دەنا ، هەرچەندە هەوڵیان ئەدا لێی‌کەم بکەنەوە . سەرچاوە ڕەسمی‌یەکانی ئەو سەردەمە دەڵێن نرخی شتومەك ساڵی ١٩٢٩ لە ١٣وە تا ١٥ کەرەت بە نیسبەت ساڵی ١٩١٤وە زیادی‌کردووە (بڕوانە : ر .پ . کورنیـنکو ، جولانەوەی کرێکاران لە تورکیا (١٩١٨–١٩٦٣) ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ٥٧) .

(٣٢) بڕوانە : ر . کورینکو ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٧ .

(٣٣) بڕوانە : أ . نولیچێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٧٣ .

(٣٤) «جولانەوەی میهنی جیهانی» ، بە زمانی ڕووسی ، بەرگی – ٣ ، مۆسکۆ – لێنینگراد ، ١٩٢٦ ، ل ٤٢–٤٣ .

شان بە شانی فشاری ئابووری لەگەڵ هاتنی کەمالی یەکاندا فشاری سیاسیش بۆ سەر چینی کرێکار پەرەی سەند . هێشتا فریا نەکەوتبوون بەتەواوەتی دوژمن لە وڵات دەربپەڕێنن کاتێك دڕندانە کەوتنە گیانی چینی کرێکارو ڕێکخراوەکانی (تەنها پایزی ساڵی ۱۹۲۲ پتر لە ۳۰۰ لە سەرۆکە ئیش‌کەرەکانی ئەم چینە ئاخنرانە بەندیخانەکانەوە)[٣٥] . کەمالی یەکان لە کاتێکدا ڕێکخراوی کرێکارانیان دادەخست ، لە هەمان کاتدا ڕێکخراوی سەربەخۆیانیان دادەمەزراند بۆ ئەوەی بەو جۆرە نەهێڵن جووڵانەوەی کرێکاران پەرە بسێنێت‌و بچێتە قاڵبێکی یەکگرتووەوە .

هەموو چینە چەوساوەکانی تورکیا ، بێ جیاوازی نەتەوایەتی ، بە جارێك لە دەست ئەم سیاسەتە نالەبارانەی کاربەدەستە بورژوازێکانی تورکیاوە وەڕس بووبوون ، ئەمەش هەر زوو لە زنجیرە جووڵانەوەو مانگرتنێکدا پێش ڕاپەڕینەکەی ساڵی ۱۹۲۵ خۆی بە ئاشکرا نواند . بە وێنە جووتیاری هەندێك ناوچەی ڕۆژئاوای تورکیا ساڵی ۱۹۲۳ ڕاپەڕینێکی گەورەیان دژی حوکمەت‌و دەرەبەگایەتی بەرپا کردو گەلێك کاربەدەست‌و جاندرمەیان کوشت ، بەڵام حوکمەت زۆربە توندی‌و بێ بەزەیی یانە ئەو ڕاپەڕینەی دامرکاندەوەو لە مانگی تشرینی یەکەمی هەر ئەو ساڵەدا قانوونێکی دانا گوایە « دژی چەتەگری »[٣٦] کە سەراپای تەرخان کرابوو بۆ بەرهەڵستی هەموو جۆرە جووڵانەوەیەکی جووتیاران[٣٧] . هەر لەو کاتەدا نارەزایی‌و جووڵانەوەی کرێکاران شێوەیەکی تیژتری وەرگرتبو . تەنها لە هاوینی ساڵی ۱۹۲۳دا پتر لە ۱۲ هەزار کرێکاری کانە خەڵوزەکانی زەنگوڵ – داغ سێ جار مانیان گرت[٣٨] . گەلێك مانگرتنی تری لەو جۆرە لە ئەستەموڵ‌و شارە گەورەکانی تری

---

(٣٥) بڕوانە : ر . کورینیکو ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٤٢-٤٣ .

(٣٦) کەمالی یەکان تەنها ڕاپەڕینەکانی کوردیان بە «چەتەگری» لە قەڵەم نەدەدا ، بەڵکو هەموو جووڵانەوەیەك هەر ئەوەندە دژی خۆیان بوایە ئەو ناوو ناتۆرەیەیان دەدایە پاڵی .

(٣٧) پ . پ . مایسێف ، پەیوەندی کشتوکاڵ لە تورکیای ئەم سەردەمەدا ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۰ ، ل ۱۷۱-۱۷۲ .

(٣٨) بڕوانە : ل . کۆرینیکو ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٥٩ .

تورکیادا ڕوویان‌داو ئەوەی پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشرێت لەم ڕووەوە ئەوەیە کە نوێنەرانی هەموو نەتەوەکانی تورکیا لەم جۆرە جوولانەوانەدا بەشداری‌یان کردووە .

بەم جۆرە دەبینین دوای هاتنی کەمالی‌یەکان جۆرە نارەزایی‌یەکی گشتی لە هەموو تورکیادا هەبوو کە دیارە گەلی کوردیشی گرتبۆوە . بەلام چەند هۆیەکی تایبەتی لە ئارادابوون کە کارێکی وایان کردبوو ئەو نارەزایی‌یە لە کوردستاندا زیاترو ئەنجامی توندو تیژتر بێت . جارێکا بەر لە هەموو شتێك سیاسەتی ئابووری کەمالی‌یەکان لە کوردستاندا سەرەرای هەموو شتێك ڕێبازێکی شۆڤێنی ڕووتیشی وەرگرتبوو . بە وێنە لە کاتێکدا کەمالی‌یەکان لە ناوچە تورکەکاندا تا ڕادەیەکی زۆر تەنها دەسەلاتی سیاسی‌یان لە خاوەن زەوی‌یە گەورەکان سەندەوە ، دەبینین لە کوردستاندا هەولیان دەدا جگە لەوە لە بەرژەوەندی‌یە ئابوورێکانیشیان بدەن ، بە تایبەتی هی ئەو ئاغاو سەرەك هۆزانەی کە لە دەمێکەوە تێکەلی شەپۆلی جوولانەوەی ئازادی – نەتەوەیی گەلەکەیان بوبون . پێویستیشە ئەوە بلێین مەبەستی ئەم لێدانە ئازادکردنو بەو جۆرە ڕاکیشانی جووتیاری کورد نەبوو ، بەلکو بەشێك بوو لە سیاسەتی شۆڤێنی‌ی کەمالی‌یەکان . بە وێنە بەشێك لە باشترین زەوی‌و زاری کوردستان لە خاوەنەکانی زەوت‌کرا بۆ ئەوەی دابەش بکرێت بەسەر ئەو تورکانەی لە دەرەوە ، بە تایبەتی لە یۆنانەوە ئەگەڕانەوە[39] . تەنها لە سالی ١٩٣١دا بڕیار درا ١٠٠ هەزار تورکی بولغارستان‌و یۆگۆسلافیا بنێرنە هەندێك لە ناوچە کوردەوارێکان ، گوایە « بۆ بەهێزکردنی دانیشتووە تورکەکانیان »[40] . دیارە ئەم سیاسەتە بووە هۆی نارەزایی نەك تەنها جووتیاری کورد ، بەلکو لە گەلیاو ، هەر بەو ڕادەیەش چەوسێنەرەکانیشی .

هۆیەکی‌تری تایبەتی ئابووری لە ئارادا بوو کە کاری کردبووە سەر بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی کوردستان ، بە تایبەتی هۆزە نیمچە کۆچەرو بازرگانەکانی . ئەوە بوو لە سەدەی نۆزدەمینەوە سەرەتای دروست‌بوونی یەك بازاری لە هەموو کوردستاندا

---

(٣٩) بڕوانە : «کێشەکانی کشتوکال» . بەزمانی ڕووسی . بەرگی ١–٢ ، مۆسکۆ ، ١٩٣٦ ، ل ١٢٧ .

(٤٠) بڕوانە :

(The Times), August 27, 1931

دەستی پیکردبوو ، ئەم کارە گرنگە لە ئەنجامی بەستنی بازاری کوردستان بە بازارەکانی جیهانی سەرمایەداری‌یەوەو دەست پیکردنی رزگاربوون لە ئەنجامی ئەوەدا لە چوارچێوەی بەرهەم هێنانی تەبیعی ، رۆژ بە رۆژ لە پەرەسەندندا بوو . دابەش‌کردنی کوردستانیش بە ناو لە نێوان تورکیاو ئێراندا لەو سەردەمەدا هێشتا نەبووبووە کۆسپ لە بەردەمیدا . لەو ساڵانەدا ئاڵ‌و گۆری بازرگانی لە نێوان کوردستانی خواروو و ژووروودا تا رادەیەکی دیار لە گەشە کردندا بوو بە هۆی ئەو کاروانانەوە کە لە نێوان هەردوو لایاندا لە هات‌و چۆدا بوون بەو حەوت رێگایەو ئەو دۆڵە گەورەیەی کەوتۆتە عاستی گەیشتنی خابوور بە رووباری دجلەوە‌و کە پانایی ۲۰ کیلومەترێك دەبێت ، ئەو رێگایانەی بە جارێك ئەمدیوو ئەودیوی کوردستانیان پێکەوە بەستووە . تەنانەت لە کاتی دووبەرەکایەتی تورك‌و ئینگلیزدا لە سەر کوردستانی خواروو تورکەکان زۆر لەسەر ئەوە سوور بوون کە وا پەیوەندی بازرگانی لە نێوان ئەم بەشەی کوردستان‌و کوردستانی ژووروودا زۆر بە هێزەو بۆ بەڵگەش باسی ئەو حەوت رێگایەو دۆڵەکەی لای خابووریان کردبوو[41] . جگە لەوە هەر ئەو پەیوەندی‌ی ئابووری‌یە بوو کە پاڵی نابوو بەو لیژنە تایبەتی‌یەی «کۆمەڵەی گەلان» ناردبووی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو کێشەیە لە راپۆرتەکەیدا داوا بکات کە ئەگەر هاتو «ویلایەتی مووسڵ» درا بە عیراق ئەوا پێویستە رێگای خەڵکەکەی بدرێت بە سەربەستی بازرگانیی خۆیان لەگەڵ تورکیاو سوریادا بکەن‌و مافی ئەوەش بدرێت بە بازرگانەکانی کوردستانی تورکیا رێگاکانی ویلایەتی مووسڵ بۆ ئاڵ‌و گۆری بازرگانی بەکار بهێنن[42] .

بەڵام زرووفی نوێی دوای کۆتایی شەری یەکەمی جیهان‌و بە رادەی یەکەم داگیرکردنی کوردستانی خواروو لە لایەن ئینگلیزەوەو دابرینی لە کوردستانی ژووروو ، لەگەڵ سەرکەوتنی چینی بۆرژوازی لە تورکیاو ئێران مانای ئەوەیان دەبەخشی کە ئیتر

---

(٤١) بروانە :

(League of Nations .Qnestion of the frontier between Turkey and Iraq. Report submitted to the Council by the Commission instituted by the Council Resolution of the September 30th , 1924), Geneva, 1924, P. 29

(٤٢) Ibid, P. 90

کوردستان بە شێوەیەکی عەمەلی دابەش بوو بە چەند پارچەیەکەوە کە بە زۆر هەوڵ دەدرا بە یەکجاری لێك داببڕێن ، ئەمەش بێگومان کارێکی یەکجار گەورەی کردە سەر ژیانی ئابوری کوردستانو بە تایبەتی سەر عەمەلیەتی دروست بوونی یەك بازاری تیایا .

تورکەکان ئەیانویست بە جارێك دەست بەسەر هەموکوردستاندا بگرن ، بەلاّم زانی‌یان ناتوانن کوردستانی خواروو بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان ، بۆیەکا لە ساڵی ١٩٢٤وە کەوتنە ئەوەی بە سەرباز هەموو کونو کەلەبەری سنوورەکانی‌یان لەگەڵ سوریاو بە تایبەتی لەگەڵ عیراقدا بتەنن[43] . بەم جۆرە ڕێگای بازرگانێتی لە نێوان ئەم دوو بەشەی کوردستاندا تا ڕادەیەکی زۆر بەستراو نەك تەنها بازرگانەکانی هەردوولا ، بەڵکو هەردوو بازارەکەش لە ئەنجامدا زۆر زەرەربار بوون ، تەنانەت نوێنەرانی عیراق لە یەکەم کۆبوونەوەی کۆمیتەی دوو قۆڵی چاودێری سنووری نێوان تورکیاو عیراق کە کۆتایی ساڵی ١٩٢٦ لە زاخو گیرا بە شێوەیەکی تایبەتی سەرنجی هاوەڵە تورکەکانیان بۆ ئەم کێشە ئابووری‌یە ڕاکێشا[44] .

دابڕینی کوردستانی ژووروو و خواروو بە زۆر لە یەکتر کارێکی زۆری کردە سەر ژیانی ئابووری‌ی هۆزە نیمچە کۆچەرەکانیش . کاربەدەستانی تورکیا بە جارێك هاتوچۆی ئەو هۆزانەیان لە نێوان هاوین‌و زستانە هەوارەکانیانا کە کەوتبونە هەردوو بەشەکەی کوردستانەوە ، قەدەغەکرد . لە ئەنجامی ئەمەدا بە هەزارەها سەر مەڕو بزنی ئەو هۆزانە فەوتان . بە وێنە تەنها لە هاوینی ساڵی ١٩٢٧دا دەوروبەری ٦ هەزار کەس لە هۆزی ئەرتوشی‌و سەندی لە ئەنجامی دابڕینیان لە هاوینەهەوارەکانیان بە جارێك زەرەرمەند بوون[45] ، لە پێش ئەوانیشدا بە دوو ساڵ دەوروبەری

(٤٣) بڕوانە : A.Safrastian , Kurds and Kurdistan, PP. 87 — 88.

(٤٤) بڕوانە :

(Report by Britannic Majestys Government to the Conucil of the League of Natious on the administration of Iraq for the year 1926), London, 1927, P.21.

(٤٥) بڕوانە :

(League of Nations. Report by Britannic Majestys Government to the Council of the League of Nations of the administration of Iraq for the year 1927), London, 1928, p.26.

١٢٠٠ خێزان لە هۆزی میران ناچار بوون بە یەکجاری کوردستانی تورکیا بەجێ بهێڵن لە تاو بێبەری‌کردن لە هاوینەهەوارەکانیان کە کەوتبوونە کوردستانی خوارو لە قەراغ رووباری دجلەدا[٤٦] . دیارە لە ئەنجامی ئەمەدا نیمچە کۆچەرەکانی کوردستانیش بە تەواوەتی لە کاربەدەستە نوێکانی تورکیا داخ لە دڵ بوون .

ئەم نیمچە کوچەریانە لەگەڵ هەموو لادێکانی تری کوردستانو هەروەها کرێکارو هەژاری ناو شاریش هەر وەك چینە چەوساوەکانی هەموو تورکیا زەلالەتیان بوو بە دەست ئەو باجو سەرانە تازانەوە کە بە یەکجاری پەکی خستبوونو تەنانەت ماوەی کۆبوونەوەی سەرمایەشیان لە دەست حیرەفی‌یەکانو بازرگانە ناوبجیێکانیشدا نە ئەدا تا بتوانن لەگەڵ رێبازی سەرمایەداری نوێی تورکیادا خۆیان بەرن بەرێوە . فشاری ئەم باجو سەرانانە بۆ سەر لادێی لە هەموان زیاتر بوو ، چونکە لە سەردەمی عوسمانێکاندا زۆربەیان بە یەکجاری یا ساڵەو ساڵ خۆیان لە دانیان ئەدزێوە . بە وێنە ساڵی ١٩١٣ یەکێك لە خێزانە دەرەبەگەکانی ناوچەی بتلیس بیست ساڵی رەبەق بەسەر ئەوەدا تێپەر ببوو کە پوولێك باجو سەرانەی دەوڵەتی نەدابوو[٤٧] ، بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتی مەرکەزی بورجوازیدا دیارە ماوەی شتی وەها بە جارێك برا . گۆڤاری «رۆژهەلاتی نزیكو هیند»ی ئینگلیزی دوای تێپەربوونی چەند مانگێك بەسەر راپەرینەکەی ساڵی ١٩٢٥دا دەربارەی ئەم باسە نووسیوێتی دەڵێت : «وەزارەتی دارایی هیچ کونو کەلەبەرێکی نەهێشتۆتەوە دانیشتوانی تورکیا لە رێگایانەوە بتوانن خۆیان لە دانی باجو سەرانە رزگار بکەن»[٤٨] . لە لایەکی ترەوە ئەو باجو سەرانانە تا دەهات لە زۆربووندا بوون . بە وێنە تەنها لە ماوەی ساڵێکدا (١٩٢٨-١٩٢٩) داهاتی دەوڵەت لە باجو سەرانە پتر لە ٦٪ی زیادی کرد[٤٩]

---

(٤٦) بڕوانە :

(Report.... for the year 1926) P. 16

(٤٧) بڕوانە :

A. Safrastian, Kurds and Kurdistan, PP. 72 — 73.

(٤٨) بڕوانە :

(The Near East and India), Vol XXVIII, November 19, 1925, P. 612.

(٤٩) بڕوانە :

(The Near East and India), Vol XXXIV, August 9, 1929, P. 178.

ساڵی ١٩٣٨–١٩٣٩ باجی مباشر گەیشت بەرادەیەك كە پێنج ئەوەندەی ساڵی ١٩٣٠–١٩٣١ ئەبوو(٥٠) .

تەنانەت فشاری سەرانەو باجیش لە كوردستاندا زیاتر بوو وەك لە ناوچەكانی‌تر ، هیچ نەبێت لە ئەنجامی ئەوەدا كە بەشێكی زۆر لە سوپای دەوڵەت لێرە لە سەر ورگی ڕەمەكی خەڵكەكە دەژیان . عبدالعزیز یامولكی دەربارەی ئەمە نووسیویەتی دەڵێت : « سوپای تورك بەڵایەكی گەورە بوو بە سەر شانی جوتیاری كوردەوە كە ناچار بوو شتومەكی بۆ كۆبكاتەوەو بە كۆڵی خۆی بیگەیێنێتە سەربازخانەكانی‌و لێرەش بە ئارەزووی خۆیان نرخیان بۆ دادەناو هەر ئەوەندەیان بۆ دەهێشتەوە كە بتوانێت زستانی بە كولەمەرگی بە نان‌و بەڕوو پێ‌بەرێتە سەر»(٥١) . ئەم سیاسەتە بە جارێك خەڵكەكەی وەڕس كردبوو . بەشێك لە ڕێكخراوە سیاسێكانی كوردستان هەستیان بەمە كردبوو بۆیەكا هەندێكیان ، وەك «كۆمیتەی ئەرزرۆم» ، لە كاتی ڕاپەرینەكەی ساڵی ١٩٢٥دا بەیاننامەی تایبەتی‌یان بڵاو كردەوە كە تیایا پەیمانی لابردنی باج‌و سەرانەیان دابوو(٥٢) .

ئەمەبوو بە گشتی باری ژیانی ئابووری‌و كۆمەڵایەتی كوردستانی ژووروو دوای سەركەوتنی شۆڕشی بۆرژوازی لە توركیادا ، هەر لەم شەپۆلە فراوانە پڕ پێچ‌و پەنایەشدا بە ئاسانی دەتوانرێت هۆ بنەڕەتی‌یەكان‌و هێزە بزوێنەرەكانی هەموو جووڵانەوەی ئازادی – نەتەوایەتی كوردستانی توركیای دوای شەڕی یەكەم ، بە ڕاپەرینە گەورەكەی ساڵی ١٩٢٥وە ، دەست نیشان بكرێن .

ئەو هۆیانە ، وەك ئاشكرا دیمان ، لە ناو كومەڵەكە خۆیداو زۆربەیان لە زرووف سەركەوتنی شۆڕشی بۆرژوازی نەتەوەی دەسەڵاتدارا دروست بوون ، ئەو هۆیانەش نەك تەنها لە كوردستاندا ، بەڵكو لە هەموو شوێنێك‌و هەموو كاتێكدا لەو سەردەمەدا بەس‌بوون بۆ ئەوەی هەر میللەتێكی‌تر بێت بیگەیێننە ڕادەی تەقینەوە ، زۆر ئاشكرایە

---

(٥٠) «مێژووی هەموو جیهان» ، بەزمانی رووسی ، بەرگی ٩ ، ل ٤٤٥ .

(٥١) عبدالعزیز یاملكی ، كوردستان و كورد اختلال لری ، جلد – ١ – ، تهران ، ١٩٤٦ ، ص ٧٨ .

(٥٢) بڕوانە :

**A. Ghassemlon, Kurdistan and the Kurds, P. 50**

له زرووفی وادا ئەگەرچی هۆی دەرەوەش لە ئارادا بووبێت ئەوا ئەو هۆیە هەر بە پێی زانیاری مێژوو خۆی لە ئەوپەڕیدا ئینجا نەیتوانیوە لە دەورێکی پچووك زیاتر ببینێت‌و هیچ کاتێك ڕاست نی‌یەو ناتوانرێت بە چاوی هێزی جوولێنەری بنچینەیی ڕاپەرینەکەی ساڵی ۱۹۲۵ ، وەك گەلێك مێژنووس کردویانە ، دابنرێت .

کورتەیەك دەربارەی سیاسەت(*) :

هەرچەندە بەشێکی زۆری ئەم وتارە بۆ باسی چۆنیەتی دامەزراندنی «کۆمەڵەی گەلان» (عصبة الامم)و سروشتی ئەو دەزگایە تەرخان کراوە ، بەڵام ئەوە بۆی هەیە یاریدەمان بدات باشتر لە هەڵوەستی کۆمەڵە بەرامبەر بە گەلی کورد تێ بگەین . جا با لە پێشدا بە کورتەیەك دەربارەی سیاسەتو ئاڵۆگۆڕەکانی دەست پێ بکەین .

مرۆڤ لەوەتەی هۆشی بەبەردا هاتووەو کەوتۆتە بیرکردنەوە فێری سیاسەت ، یا وەك دەڵێن رامیاری ، بووە[1] . ئەو فێڵو فەرەجەی بۆ گوزەرانو پاراووەنانێك بەکاری دەهێنا یەکەم رووی ساکاریی سیاسەت بوو لە ژیانیدا .

وەك هەر دیاردەیەکی تری ژیان سیاسەتیش لەوەتەی پەیدابووە بێ وچان لە ئاڵو گۆڕو بەرەوپێش چووندایەو دەبێ . دەمێکە سیاسەت بۆتە پیشەو هونەرو زانست . لەو کاتەوەی کۆمەڵو دەوڵەت پەیدا بوون سیاسەت بۆتە ئەرکی یەکەمی سەر شانی زۆربەی دامودەزگاو کاربەدەستانیانو هەر لەبەر ئەوەشە وشەی «پۆلیتیکا»ی گریکیی کۆن کە واتای کاروباری کۆمەل یا دەولەت دەبەخشێ بە مانای (سیاسەت) تێکەڵ بە زمانە ئەوروپایی یەکان بووە[2] .

---

(*) لە لاپەرە ٢-٢٩ی ژمارە حەفتەی «کاروان»دا بلاّوکراوەتەوە .

(١) بۆ ئامادەکردنی ئەم وتارە کەڵکی زۆرم لەو موحازەرانەم وەرگرتووە کە بە یاریدەی گەلێك سەرچاوەی جیاواز بۆ پۆلی چوارەمی بەشی مێژووی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا ئامادەم کردوون .

(٢) وشەی (Politika)ی گریکی لە (Polis) ەوە هاتووە کە مانای دەوڵەتە . دیارە وشەی پۆلیسیش هەر لەمیانەوە هاتووە .

دوای دەوڵەت پەیدابوونی ئایینیش دەوری گەورەی لە بەرەوپێش بردنی سیاسەتدا بینی . ئایین بێ سیاسەت نەیدەتوانی بلاوبێتەوەو پەرەبسێنێ . لە سەرەتای سەدەی چوارەمەوە ئایینی عیسایی‌و دەوڵەت تێکەڵ بەیەك بوون‌و پاش ماوەیەکی کەم پاپای وا پەیدا بوو دەشیا لە سیاسەتبازیدا ببێتە مامۆستای دەیان میرو پاشای رۆژگاری خۆی .

پێغەمبەری خۆشەمان ، درودی خوای لێ بێ ، هەر لە یەکەم رۆژی هەلهاتنی خۆری ئیسلامەتی‌یەوە توند توند سیاسەت‌و ئایینی پێکەوە بەست . نامە بەناوبانگەکانی بۆ پاشایانی رۆم‌و فورس‌و حەبەش یەکەم نموونەی پێوەندی دیپلۆماسی‌ی جیهانی نوێی موسڵمانن .

وەك گوتمان سەرەتا سیاسەت یەکجار سادەو ساکار بوو . لەگەڵ پەیابوونی دەسەلات‌و دامەزراندنی دامودەزگای میری‌و ئاییندا سیاسەت رووی لە وردەکاری‌و ئاڵۆزی کرد .

بەرژەوەندی‌یەکانی ژیانی رۆژانەو پەرەسەندنی تێکەڵی یەك بوونی گەلانی دراوسێ‌و لێك نزیك لە رۆژگاری کۆنەوە بوونەتە هۆی پەیدابوونی پێوەندی‌ی لە نێوان دەزگا میری‌یەکانی جیهانی پێشکەوتووی ئەوساکەدا . سەرەتاو تا ماوەیەکی دوورو درێژ ئەو پێوەندی‌یەش ساکارو بێ گرێ بوو . هەرکاتێك پێویست بوایە وەفدی ولاتێك بۆ بەستنی پەیمانێك یا بردنی دیاری‌یەك یا گەیاندنی راسپاردەیەك یا بۆ خوازبێنی شازادەیەك رووی دەکردە ولاتێکی ترو لەگەڵ جێ‌بەجێ‌کردنی کارەکەیدا بەرەو نیشتمان دەگەرایەوە . هەرچەندە ئەرکی سەر شانی ئەو جۆرە وەفدانە ئاسان‌و بێ ئەمسەرو ئەوسەر بوو ، بەلام جێ‌بەجێ‌کردنی ماوەیەکی زۆری پێ‌دەویست کە جاری وا هەبوو لە مانگان تێدەپەری‌و دەچووە خانەی سالانەوە . چون‌و گەرانەوەی وەفدە بەناوبانگەکەی هارونە رەشید بۆ لای شارلەمانی گەورە نزیکەی ساڵێکی خایاند .

ئەرکی وەفدی ناوبراو بریتی بوو لە گەیاندنی نامەیەك‌و سەعاتێکی خەلیفەی موسڵمانان بە پاشای گاوران . پاش دەوروبەری چوار سەدە کاتێك مارکۆ نیکۆلۆ پۆلۆی ناسراو لەگەڵ باوکی‌و مامی لەسەر داوای فەرمانرەوایانی ڤینیسیای ئیتالیا چووە خزمەت خانی چین‌و ماچین پاش ٢٤ ساڵی رەبەق ئینجا گەرایەوە نیشتمان ، ساڵی

١٢٧١ ڕۆیشت‌و ساڵی ١٢٩٥ گەڕایەوە[٣] . مارکۆ پۆلۆ بە نزیکەی سێ ساڵ‌و شەش مانگ ڕێگەی نێوان ڤێنیسیای ئەورووپاو پەکینی[٤] ئاسیای بڕی‌و تەنانەت خاکی ئێمەش بەشێك بوو لەو ناوچەو وڵاتانەی پیایاندا تێپەڕی .

لەگەڵ پەیدابوونی ڕژێمی سەرمایەداری‌و دروست بوونی ژمارەیەك دەوڵەتی گەورەو دەسەلاتدارو چاوچنۆك قۆناغێکی نوێ لە ژیانی سیاسی‌ی گەلاندا دەستی پێ‌کرد . هیچ کامێك لەو دەوڵەتە گەورە ئەورووپایی‌یانە بە سنووری خۆی دابین نەدەبوو ، هەر یەکەیان چاوی بڕیبووە خاك‌و سامانی گەلانی ترو لەناو یەکیشدا دەستیان نابووە بیناقاقای یەکتر . هەر ئەوەندەت دەزانی کڵپەی ئاگری شەڕ بەرز دەبۆوەو بە هەزاران‌و بە دەیان هەزار دەبوونە قۆچی قوربانی . ئەو شەڕانەی ئەورووپا لە ڕۆژگاری ناپلیۆن بۆناپارتدا ، واتە سەرەتای سەدەی نوزدەمین ، گەیشتنە پلەیەکی ترسناکی ئەوتۆ کە مێژوو تا ئەو سەردەمە لە وێنەی بەخۆیەوە نەبینیبوو . زیانە زۆرەکانی‌ئەو شەڕانەو وەڕس بوونی بێ‌ئەندازەی گەلانی ئەورووپا پاڵیان نا بە فەرمانڕەوایانی ئەو کیشوەرەوە زیاتر بکەونە سۆراخی ڕێبازی چارەسەرکردنی ئاشتی‌یانەی کێشە نێو دەوڵەتی‌یەکان . لەبەر ئەوە سیاسەتکاران بە پێویستیان زانی دەزگایەکی باڵا بۆ چاودێری‌کردنی پێوەندی‌ی نێوان دەوڵەتە گەورەکان دابمەزرێنن ، ئەوان هاتبوونە سەر ئەو بیرەی دەشێ ئەوی بە چەك‌و شەڕو خوێن‌و فرمێسك دەبڕێتە سەر بە گفتوگۆو لێدوان‌و لێکدانەوەش هەمووی نەبێ بەشێکی زۆری جێ‌بەجێ‌بکرێ . بۆ ئەو مەبەستە دوای کەوتنی ناپلیۆن کۆنگرەی ڤیەنا بڕیاری دامەزراندنی جۆرە کۆڕێکی دا کە جاروبار نوێنەرانی ژمارەیەك دەوڵەتی گەورە بۆ لێدوان لە باسە گرنگەکانی جیهان دەیانبەست .

دوای کۆنگرەی ڤیەناو بەتایبەتی پاش ئەوەی لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەمینەوە وڵاتە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکان گەیشتنە قۆناغی ئیمپریالیزم ، سیاسەت‌و پێوەندی‌ی نێوان دەوڵەتان کەوتنە بارو دۆخێکی نوێی یەکجار وردو ئاڵۆزەوە کە تا دەهات گرێ کوێرەکانیان زیاترو باریان قورستر دەبوون‌و ئەنجام کار گەیشت بەوەی

---

(٣) مارکۆ پۆلۆ (M.Polo) ساڵی ١٢٥٤ لەدایك بووەو ساڵی ١٣٢٤ کۆچی دوایی کردووە .
(٤) بەزمانی چینی (پەکین) مانای پایتەختی باکوورە .

فەرمانڕەوایان پەنا بەرنە بەر چەك وەك دوا هیواو ئاواتی چارەسەرکردنی کێشەو بێنەوبەرە زۆرەکانی ولاتەکانیان . بەو جۆرە سەرەتای ئابی سالی ١٩١٤ شەڕێك بەرپا بوو کە مێژوو تا ئەو کاتە لە وێنەی بەخۆیەوە نەبینیبوو ، شەڕێکی ئەوتۆ کە هەموانی گرتەوەو بە ڕەوایی ناوی لیٚنرا «شەڕی یەکەمی جیهان» .

زیانەکانی شەڕی یەکەمی جیهان کوشندەو جەرگبڕ بوون . تەنها ئەوانەی بە بەرگی سەربازی‌یەوە لە شەرگەکاندا کوژران ، ژمارەیان خۆی دەدا لە نزیکەی (١٠) ملیۆن کەس . ئەوانەش کە لە جەنگەی شەڕدا بریندار بوون (٢٠) ملیۆن دەبوون کە سیٚ ملیۆن‌و نیویان تا مردن بە کەفتەکاری مانەوە . لە صەدا پەنجای لاوو(٤) هەزار گوندو (٢٣) هەزار کارگەو کانە ئاسن‌و خەلوزو (٥٥٠) هەزار خانوبەرەو (٥٨) هەزار کیلۆمەتر ڕێگەوبانی تەنها فەرەنسە[٥] بووە خۆراکی ئاگری شەڕی یەکەمی جیهان کە بە لایەنی کەمەوە (٣٦٠) ملیار دۆلاری زێڕی تیٚچوو ، واتە گەلێك لەو پارەیە زیاتر کە هەموو شەڕەکانی پێشووی جیهان بەسەر یەکەوە هەلیان لووشی .

ئەم ڕاستی‌یە ترسناکە دەبوو دەروونی هەموان بهەژێنیٚ‌و لە گۆڕەپانی سیاسەتدا گەلێك سەرنج‌و هەلسەنگاندنی نویٚ بهێنێتە ئاراو کایەوە کە دامەزراندنی «کۆمەلەی گەلان» یەکێك لە ئەنجامە سەرەکی‌یەکانیان بوو .

**دامەزراندنی «کۆمەلەی گەلان» :**

بەر لەوەی شەڕی یەکەمی جیهان تەواو بێت بە ماوەیەك کاربەدەستانی ژمارەیەك لە دەولەتە گەورەکان کەوتنە سۆراخی دامەزراندنی ڕێکخراو یا دەزگایەکی بالای نێودەولەتی بۆ جیهانی دوای شەڕ . بۆ ئەو مەبەستە فەرەنسی‌یەکان لیژنەیەکی تایبەتی‌یان بە سەرۆکایەتی وەزیری کار دامەزراند . فەرمانڕەوایانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە هەموان زیاتر بایەخیان دایە ئەو باسە . ئەوان کە شەڕ بووە خێرو بەسەریاندا ڕژاو گەلێك لە جاران دەولەمەندو بەتواناتر بوون دەیانویست لە جیهانی سیاسەتی پاش شەڕدا ئەو ڕێکخراوە بکەنە داردەستی خۆیان .

---

(٥) بەدرێژایی هەر چوار سال‌و سیٚ مانگەو دە ڕۆژەی تەمەنی شەڕی یەکەمی جیهان جەنگ بۆ ئاوێك لەناو خاکی فەرەنسەدا نەوەستا .

هەرچۆن بێ لەگەڵ تەواو بوونی شەڕدا دامەزراندنی «کۆمەڵەی گەلان» (عصبة الامم – League of Nations) ببووە دروشمێکی ڕەخسیو ، بۆیە «کۆنگرەی ئاشتیی پاریس» کە ڕۆژی (١٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٩) کرایەوە بەتایبەتی بایەخی پێ‌داو ڕۆژی (٢٥)ی کانوونی دووەمی هەر ئەو ساڵە جێ‌بەجێ کردنی سپاردە لیژنەیەکی بەرز بە سەرۆکایەتی ویدرۆ ویلسنی سەرەك کۆماری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا .

دیارە دەوڵەتە سەرکەوتووەکان هەر یەکەیان دەیویست پرۆگرامی «کۆمەڵەی گەلان» بە جۆرێك بێ کە لە هەموو سەرێکەوە لەگەڵ ئامانجو پلانو بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بگونجێ . فەرەنسەییەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی کۆمەڵە ببێتە چقڵی چاوی ئەڵەمانەکانی هاوسێیان کە بە چاوی دوژمنی باوەکوشتە سەیریان دەکردن . ئەوان داوای دامەزراندنی هێزێکی سەربەخۆیان بۆ کۆمەڵە دەکرد چونکە دەیانزانی لەبەر ئەوەی لەشکری سوارەو پیادەی ئەوسای فەرەنسە گەورەترین هێزی چەکداری جیهان بوو ئەو هێزە دەبێتە دەسکەلای خۆیان ، بەلام بە ناوی گشت دەوڵەتە گەورە سەرکەوتووەکانەوە .

پرۆگرامی ئینگلیزەکان دامەزراندنی ڕێکخراوێکی فراوانی ڕەچاو نەدەکرد ، ئەوان دەیانویست کۆڕێکی تایبەتی بۆ نوێنەرانی ولاتە گەورەکان دابمەزرێنن کە دەبوو کاری بەرودوای بریتی بێ لە پاراستنی دۆخی نوێی جیهان . ئینگلیزەکان لەبەر ئەوەی هەرچییەکیان ویستبوو بەهۆی شەڕەوە دەستیان کەوتبوو بە «بەشی خۆیان» قایل بوونو دژی ئەوەبوون کەس دەست بخاتە ناو کاروباری خۆیانو ولاتە ژێردەستەکانیانەوە کە ئەوساکە پێوانەیان خۆی دەدا لە (٣٥) ملیۆن کیلۆمەتری چوار گۆشەو ژمارەی دانیشتوانیان دەگەیشتە (٤٥٠) ملیۆن کەس .

لە باسی دامەزراندنو پرۆگرامی «کۆمەڵەی گەلان»دا ئەمەریکاییەکان بە جۆرێکی تر هاتنە دەست . واشنگتۆن دەیویست ڕێکخراوێکی جیهانی فراوان دابمەزرێنرێو هەموان ببنە ئەندامی تاوەکو ببێتە شوێنی توژینەوەی باری ولاتان ، تەنانەت دژی ئەوەش بوو ئەڵەمانیای بەزیو نەبێتە یەکێك لە ئەندامانی چونکە دەیویست لەو ڕێگەیەوە لە سەرکێشی ئینگیلتەرەو تایبەت لە سەرکێشی فەرەنسە

کەم بکاتەوە . لەوەیش زیاتر ، نوێنەرانی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەو ڕۆژانەدا تا ڕادەیەکی زۆر «لایەنگری» دیارکردنی مافی چارەنووسی گەلان بوون . دەیانویست «کۆمەڵەی گەلان» ئەو مافە بکاتە دروشمێکی سەرەکیی خۆی . هەروەها لەگەڵ بازرگانیی سەربەست‌و بێ قۆرتدا بوون ، لەو بارەیەوە دروشمی «دەروازەی کراوە» یان[٦] هەڵکرد . مەبەست لە «دەروازەی کراوە» ڕێگەدانی دامەرزاندنی پێوەندیی ئابووریی ئازاد بوو بۆ هەموان بێ‌جیاوازی . بەو دروشمەیان فەرمانڕەوایانی واشنگتۆن قایم لە دەرگا داخراوەکانیان دەدا .

ئەو ویست‌و داخوازییانەی ئەمەریکایەکان کە تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ چاکەو بەرژەوەندیی نەتەوە بچوکەکانی جیهاندا دەگونجان لە خۆڕا نەبوون ، هەموویان دەستکردی سیاسەتێکی وردو دووربین بوون کە خزمەتی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئامانجی سەرەکیی‌و یەکەمی بوو . سامانی نەتەوەیی ئەو ولاٌتە بەهۆی شەڕەوە لە ئەندازە دەرچوو ، بازاڕی نیوەی ڕۆژئاوای جیهان بە تەنها ئیتر دادی بەرهەمی پیشەسازیی‌و بەروبوومی کشتوکاڵ‌و پارەی کۆبۆوەی زۆری ئەوی نەئەدا . ڕەنگیێ هێندە بەس بێ گەر بڵێین لەگەڵ تەواو بوونی شەڕی یەکەمدا لە ٤٠٪ی هەموو پاشەکەوتی زێڕی جیهان کەوتە بانکەکانی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە . کە قەرزی ئەو ولاٌتە بەسەر ئینگیلتەرەو فەرەنسەو ژمارەیەك ولاٌتی سەرمایەداری ترەوە گەیشتە (١٤) ملیار دۆلار ، لە کاتێکدا بەر لەوەی شەڕ هەڵگیرسێ ئەو ساڵی (٢٠٠) ملیۆن دۆلار قەرزانەی دەدایە ئەو ولاٌتانە . کەچی ئەو ولاٌتە یەکجار دەوڵەمەندە لە بەروبوومی ولاٌتە ژێردەستەکان بێ‌بەری بوو . پێوانەی ئەو مەڵبەندو ناوچانەی کەوتبوونە ژێر ڕکێفی ئەوەوە کەمێك لە چارەکە ملیۆنێك کیلۆمەتری چوار گۆشە زیاتر بوون . بەرامبەر بەوە فەرەنسەییەکان نزیکەی دوازدە ملیۆن کیلۆمەتری چوار گۆشەی خاکی گەلانیان بە ئارەزووی خۆیان دەرووتاندەوە . هەر ئەوساکە پێوانەی ولاٌتە ژێردەستەکانی ئینگلتەرە لە (٣٥) ملیۆن کیلۆمەتری چوار گۆشە

---

(٦) «دەروازەی کراوە» واتە (الباب المفتوح) . کاربەدەستانی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ساڵی (١٨٩٩) ئەو زاراوەیان بۆ یەکەم جار بەکار هێنا . ئەوساکە دەیانویست بەو بیانووەوە خۆیان بگەیێننە بازاڕە فراوانەکانی چین کە بەدەست دەوڵەتە گەورەکانی ترەوە بوو .

تێلەپەڕی کە ژمارەی دانیشتوانیان ، وەك گوتمان ، خۆیدەدا لە (٤٥٠) ملیۆن کەس ، واتە ئەو خاکەی بەدەست فەرەنسەوە بوو نزیکەی (٤٥) هێندو ئەوەی بەدەست ئینگلتەرەوە بوو نزیکەی (١٣٥ - ١٤٠) هێندی ئەو خاکە بوون کە بەدەست ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە بوو . کەوابێ دەبوو واشینگتۆن هەوڵ بدات هەرچۆن بێ درزێك بکاتە دیواری ئەو قەلاً سەختەی هاوپەیمانەکانی دوێنێیەوە . بەپێی پرۆگرامی ئەمەریکایی‌یەکان «کۆمەڵەی گەلان» دەیتوانی لەو کارەدا دەورێك ببینێ .

بەلاّم نە تەرازووی هێزی چەكو نە تەرازووی توانای ئابووری‌ی ئەو ڕۆژگارە بواریان نەئەدا هیچ کامێك لەو پرۆگرامانە بەتەواوەتی پارسەنگ بێت ، بۆیەکا ئارەزووی هەموان لە دامەزراندنی «کۆمەڵەی گەلان»دا تێکەڵ بەیەك بوو ، ئەوەش بۆ خۆی بووە هۆی یەکەمی بە لاوازی لە دایك بوونی کۆمەڵە .

لیژنە تایبەتی‌یەکەی ویدرۆ ویلسن کارەکانی خۆی تەواو کردو لە (٢٦) خاڵی سەرەکیدا پێڕەوی بۆ «کۆمەڵەی گەلان» دانا . ئەو (٢٦) خاڵە بوونە بەشی یەکەمی هەموو ئەو پەیمانانەی لە کۆنگرەی ئاشتی‌ی پاریس مۆر کرانو کە «پەیمانی ڤێرسای» نێوان ئەڵەمانیاو هاوپەیمانەکان لە هەموویان گرنگتر بوو .

## ئەندامەتی‌و دامودەزگاکانی «کۆمەڵەی گەلان»

بەو جۆرە ساڵی (١٩١٩) لە کۆنگرەی ئاشتی‌ی پاریس «کۆمەڵەی گەلان» دامەزرێنراو جنێڤی پایتەختی سویسرە کرایە بارەگای‌و ئینگلیزی‌و فەرەنسی بوونە زمانی گفتوگۆو تۆماری بەڵگەکانی . ئەندامانی کۆمەڵە دوو جۆر بوون - دامەزرێن‌و هەڵبژێردراو . ئەندامانی دامەزرێن بریتی بوون لەو دەوڵەتە هاوپەیمانانەی پێڕەوی «کۆمەڵەی گەلان» یان لە پاریس مۆرکرد ، هەروەها ئەو دەوڵەتانەش کە لە ساڵانی شەڕی یەکەمدا بێ لایەن بوون‌و بێ هیچ مەرجێك لە ماوەی دوو مانگدا ئەوانیش هەمان پێڕەویان مۆرکرد . ژمارەی ئەندامانی دامەزرێنی کۆمەڵە بریتی بوو لە (٤٤)

دەوڵەت کە (٣١) یان دەوڵەتە هاوپەیمانەکانو (١٣) یان دەوڵەتە بێ لایەنەکانی وەك سویسرەو سویدو نەرویجو دانیمارکو ئیسپانیاو ئێرانو ئەرجەنتین بوون .

ژمارەیەك :دەوڵەتی‌تر یەك لە دوای یەك بۆ ئەندامەتی کۆمەڵە هەڵبژێردران ، وەك ئەڵەمانیا کە ساڵی (١٩٢٦)و عیراق کە ساڵی (١٩٣٢)و یەکیەتی سۆڤیەت کە ساڵی (١٩٣٤) ومیسر کە ساڵی (١٩٣٧) هەڵبژێردران . تا هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی دووەمی جیهان ژمارەی ئەندامانی «کۆمەڵەی گەلان» گەیشتە (٥٨) دەوڵەت .

دەزگاکانی کۆمەڵە بریتی بوون لە کۆمیتەی گشتی کە هەموو دەوڵەتە بەشدارەکانی کۆمەڵە ئەندامی بوونو دەبوو بەلایەنی کەمەوە ساڵی جارێك لە مانگی ئەیلولدا کۆببێتەوە .

وەفدی هەر دەوڵەتە یەك دەنگی هەبوو ، هەرچەندە دەشیا ژمارەی بەشدارانی وەفدەکە بگاتە سێ کەس . لەسەر داوای زۆرینەی ئەندامان لە کاتی پێویستدا دەبوو کۆمیتەی گشتی کۆببێتەوە . هەموو بڕیارە گرنگەکانی دەزگاکانی‌تری کۆمەڵە دەخرانە بەردەمی کۆمیتەی گشتی کە دوا بڕیاری وەرگرتنی ئەندامی نوێو هەڵبژاردنی سکرتێری گشتی‌ی کۆمەڵەش لە مافە سەرەکی‌یەکانی بوون .

هەرچەندە بەپێی پلە ئەنجومەن دووەم دەزگای «کۆمەڵەی گەلان» بوو ، بەلام کاروباری لە هەموان زۆرو بایەخدارتر بوو . ئەنجومەن لە ڕاستیدا هێزی بزوێنی کۆمەڵە بوو .

سەرەتا بڕیار وابوو ئەنجومەن لە (٩) ئەندام پێکبێ ، پێنجیان نەگۆڕو چوارەکەی تریان کاتی بن . ئەندامە نەگۆڕەکان نوێنەری دەوڵەتە گەورە هاوپەیمانە سەرکەوتووەکان بوون ، واتە ئینگلتەرەو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو فەرەنساو ئیتالیاو ژاپۆن . چوار ئەندامەکەی‌تر بە نۆرە هەڵدەبژێردران .

ئەو بڕیارە وەك خۆی نەچووە سەرو چەند ئاڵو گۆڕێکی بەسەردا هات . لەبەر گەلێك هۆ ، کە دوایی بە کورتی باسیان دەکەین ، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەبووە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» ، بۆیەکا شوێنی لە ئەنجومەنو کۆمیتەی گشتیدا بە بەتاڵی مایەوە . بەر لە شەڕی دووەمی جیهان بە چەند ساڵێك ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی کۆمەڵە بووە پازدە کە نۆیان ئەندامی کاتیو شەشەکەی‌تریان نەگۆڕ بوون .

ئەمانەی دوایی‌یان بریتی بوون لە فەرەنسەو ئینگلتەرەو شورەوی‌و ئیتالیاو ئەڵەمانیاو ژاپۆن[7] . دەبوو ئەنجومەن بە لایەنی کەمەوە ساڵی جارێك کۆببێتەوە . کاتی‌تر لەسەر داوای زۆرینەی ئەندامان چەند کەرەتی‌تر پێویست بوایە دەبوو هێندە ئەنجومەن بۆلێدوان کۆبێتەوە .

سکرتێری گشتی‌و یاریدەرەکانی دەزگای سەرپەرشتی‌و بەرێوەبردنی کاروباری رۆژانەی «کۆمەڵەی گەلان» یان پێك دەهێنا . سکرتێری گشتی لە لایەن ئەنجومەنەوە هەڵدەبژێردراو دەبوو دەنگی هەموو ئەندامانی وەربگرێ . دوای ئەوە دەبوو لە کۆمیتەی گشتیدا هەموو ، یا زوربەی ئەندامان دەنگی بۆ بدەن .

جگە لەوانەی باسمان کردن ژمارەیەکی‌تر کۆمیتەو لیژنەی کاتی‌و هەمیشەیی جی‌بەجی‌کردنی بەشێك لە ئەرکەکانی کۆمەڵەیان کەوتبووە ئەستۆ کە دوایی باسیان دەکەین .

## ئامانجەکانی «کۆمەڵەی گەلان»

بەپێی دەستوورو پێرەوی دەبوو ئامانجی یەکەمی «کۆمەڵەی گەلان» پاراستنی ئاشتی بێت تاوەکو جیهان گیرۆدەی کارەساتێکی تۆقێنی‌تری وەك شەری یەکەم نەبێتەوە . یەکێك لە خاڵە سەرەکی‌یەکانی پێرەوی کۆمەڵە دەیگوت پێویستە پەنا ببرێتە بەر هەر کارو فەرمانێك بۆی هەبێ «ئاشتی‌ی گەلان بە جۆرێکی کاریگەر دژی شەرو هەرەشەی شەر بپارێزێ» .

خاڵێکی‌تری هەمان پێرەو هۆی دامەزراندنی «کۆمەڵەی گەلان»ی گێراوەتەوە بۆ پێویستی «بەرەوپێش بردنی هاریکاری نێوان گەلان‌و مسۆگەر کردنی بی‌وەیی‌و ئاسایشیان» . پێویستی کەم‌کردنەوەی هێزی چەکداری دەوڵەتان خاڵێکی‌تری پێرەوی «کۆمەڵەی گەلان» بوو .

---

(۷) هەرچەندە . وەك دوایش باسی دەکەین . ژاپۆن‌و ئەڵمانیا یەك لە دوای یەك ساڵی ۱۹۳۳ ، ئیتالیا دوای ئەوان ساڵی ۱۹۳۷ لە «کۆمەڵەی گەلان» کشانەوە ، بەڵام شوێنەکانیان مابەوە بەو هیوایەی گوایە لەگەل شەیتان بێنە خواری‌و بگەرێنەوە ناو کۆمەڵە .

بەپێی پێڕەوی کۆمەڵە دەبوو بەهۆی تەحکیمەوە ، یا لە ڕێگەی ئەنجومەنەوە چارەسەری کێشە نێو دەوڵەتی یەکان بکرێ . بهاتایەو ئەنجومەن نەگەیشتایە ئەنجامێکی قایل‌کەر ئەوسا کە ئەندامانی بۆیان هەبوو هەر یەکەیان بەپێی بۆچوونی خۆی ڕەفتار لەگەڵ مەسەلەکەدا بکات . هەروەها پێڕەوی کۆمەڵە ئابلووقەی ئابووری‌و بەکارهێنانی هێزی کردبووە سزای تاوانبارانو تەنانەت دەبوو ئەنجومەن بڕیاری ڕادەی بەشداری‌ی هێزی ئەندامانی کۆمەڵە بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەرك‌و بڕیارەکانی بدات . بەڵام ساڵی (١٩٣١) بەپێی بڕیارێکی تایبەتی بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەست درێژکەران سزای ئابووری کرایە «چەکی سەرەکی‌ی» کۆمەڵە .

بەشێکی بایەخداری ناوەرۆکی پێڕەوی «کۆمەڵەی گەلان» بەجۆرێك دارێژرابوو کە مەودای یاری‌کردنو دزەی دەدایە دەست دەوڵەتە گەورەکان . بەوێنە ئەو خاڵەی باسی کەم‌کردنەوەی هێزە چەکدارەکانی جیهانی کردووە بەوە پوچ بۆتەوە کە دەڵێ هەموو دەوڵەتێك بۆی هەیە چەند پێویستە بۆ پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی خۆی‌و جێ‌بەجێ‌کردنی ئەرکەکانی سەرشانی هێندە هێزی چەکداری هەبێ .

دارشتنی بەوجۆرەی ناوەرۆکی پێڕەوی کۆمەڵەو چەند ڕاستی‌یەکی‌تر بوونە هۆی کەم‌و کورتی‌یە زۆرەکانی ئەو دەزگا جیهانی‌یە گرنگە .

## کەم‌و کورتی‌یەکانی «کۆمەڵەی گەلان»

وەك دیمان لە ڕۆژگاری کۆنگرەی ئاشتی‌ی پاریسەوە هەموو لایەنە دەسەلاتدارەکان لە تەقەلادا بوون «کۆمەڵەی گەلان» بکەنە داردەستی خۆیان . کە ئەو کارە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەچووە سەر واشنگتۆن بڕیاری‌دا نەبێتە ئەندامی [٨] . بەو بڕیارە یەکەم کەلێنی گەورە کەوتە بناغەی «کۆمەڵەی گەلان»ەوە ، چونکە ئەوسا کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەورەترین هێزی ئابووری‌و یەکێك لە هێزە سیاسی‌یە کاریگەرەکانی جیهان بوو .

---

(٨) لەو کاتەدا «پارتی کۆماری» دەسەلاتی گرتەوە دەست‌و ئەوەش بووە هۆیەکی‌تر بۆ ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەبێتە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» کە بە دەستکردی ویدرۆ ویلسنی سەرۆك کۆماری ڕابوردوویان دادەنا . ویلسن نوێنەری «پارتی دیموکراتی» بوو کە لەگەڵ «پارتی کۆماری»دا دوو بەرەی سیاسی‌ی سەرەکی‌ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوون .

سەرەتا ڕێگەی ئەڵەمانیاو وڵاتە بەزیوەکانی تر نەدرا ببنە ئەندامی کۆمەڵە . هەروەها یەکیەتی سۆڤیەتیش لەو مافە بێبەری کرا . بەڵکو لەوەیش زیاتر ، زۆر جار ئەنجومەن و کۆمیتەی گشتی بەتایبەتی و زۆر گەرم دەکەوتنە باسی چۆنیەتی لەناوبردنی شورەوی . لە کەم باسی‌تردا زوربەی ئەندامانی کۆمەڵە وا هاودەنگ‌و بەپەرۆش بوون .

وڵاتە پچوك‌و ژێردەستەکان زۆر زەحمەت دەبوونە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» . یاریدەی فەرەنسە نەبوایە حەبەشە وەرنەدەگیرا . عیراق دوای دە دوازدەو میسر دوای نزیکەی حەفدە ساڵ کۆشش ئینجا وەرگیران[9] . ئەو ناتەواوی‌یەو گەلێك کەم‌و کورتی‌تری «کۆمەڵەی گەلان» ئەنجامی ئەوە بوون کە فەرەنسەو ئینگیلتەرە بووبوونە ئاغا گەورەی ئەو دەزگا جیهانی‌یە ، دیارە ئەوانیش بەپێی بەرژەوەندی‌ی خۆیان چۆنیان بویستایە وا هەڵیاندەسوڕاند . کە لەوان وابوو دەتوانن ئەڵەمانیا بکەنە قەڵغانێکی پتەوی پاراستنی ڕژێمی سەرمایەداری دژی بزوتنەوە شۆڕشگێڕی‌یەکان‌و شورەوی بێ سێ‌و دوو ڕێگەیان دا ڕۆژی یەکی ئەیلوولی ساڵی (١٩٢٦) نەك هەر ببێتە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» ، بەڵکو دیسان وەك دەوڵەتێکی گەورە بشبێتە یەکێك لە ئەندامە نەگۆڕەکانی ئەنجومەن .

دەوڵەتە گەورەکان لە ڕاستیدا زۆر بۆ «کۆمەڵەی گەلان» بەپەرۆش نەبوون ، هەموویان باش لەوە گەیشتبوون کە کۆمەڵە ناتوانێ دەزگایەکی جیهانی‌ی تەواو کاریگەر بێ . ڕۆژی (٢٧)ی مارتی ساڵی (١٩٣٣) تۆکیۆ بێپەروا لە کۆمەڵە کشایەوە تەنها لەسەر ئەو نەرمە گلەیی‌یەی لە ئەنجامی هێرشی لەشکری ژاپۆاندا بۆ سەر باکووری چین لێی کرا . ساڵێ وەرنەچەرخا دوای ئەوەی هێتلەرو نازی‌یەکان دەسەڵاتیان وەرگرت کاتێك ئەڵەمانیاش ڕۆژی (١٤)ی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵی (١٩٣٣) لە «کۆمەڵەی گەلان» کشایەوە . کشانەوەی ئەمیان لەسەر ئەوەبوو چونکە ئەنجومەن بڕیاری لابردنی ئەو مەشانەی «پەیمانی ڤێرسای» نەدا کە پێوەندی‌یان بە

(٩) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە «تاريخ الوزارات العراقية»ی عبدالرزاق الحسني . هەروەها : الدكتور يونان لبيب رزق ، الدبلوماسية الوفدية وعصبة الامم ، – «السياسة الدولية» (مجلة) ، القاهرة ، العدد ٣٤ ، يناير ١٩٧٦ ، ص ١١٨–١٣٧ .

کاروباری سەربازی‌ی ئەڵەمانیاوە هەبوو . لەوەیش زیاتر . سیاسەت‌و نیازەکانی هێتلەری‌یەکان هەرچۆن‌بێ لەگەڵ بوونی ئەڵەمانیادا لە دەزگایەکی وەك «کۆمەڵەی گەلان»دا نەدەگونجا .

پاش کشانەوەی ئەڵەمانیاو ژاپۆن‌و ئاڵۆزبوونی باری سیاسی‌ی جیهان بەهۆی نازی‌یەکانی ئەلەمانیاو فاشی‌یەکانی ئیتالیاو عەسکەرتاری‌یەکانی ژاپۆنەوە ئینجا لەندەن‌و پاریس شورەوی‌یان بیرکەوتەوەو بە هاندانی فەرەنسە رۆژی پازدەی ئەیلوولی ساڵی (١٩٣٤) سی (٣٠) ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» پێکەوە داوایان لێ‌کرد ببێتە ئەندام . پاش سێ رۆژ مۆسکۆ رەزامەندی‌ی خۆی راگەیاندو شورەوی لەوساوە بووە یەکێك لە ئەندامە نەگۆڕەکانی ئەنجومەن . بەڵام لە سەرەتای شەڕی دووەمی جیهانداو دوای بەرپابوونی شەڕی نێوان فینلەندەو شورەوی (١٩٣٩–١٩٤٠) دیسان ئەو وڵاتە لە «کۆمەڵەی گەلان» دوور خرایەوە .

بەو جۆرە وەك دەبینین‌ئەو تۆووەی‌لەپاریس بۆ «کۆمەڵەی گەلان» وەشێنراو ئەو خاك‌و خۆڵەی تێیدا پەروەردە بوو هێندە لەبار نەبوون بەری چاکیان لێ‌چاوەڕوان بکرێ . ئەم راستی‌یە ، لەگەڵ یاری‌ی بێ‌وچانی دەوڵەتە گەورەکاندا بوونە هۆی سەرنەکەوتنی کۆمەڵە وەك دەزگایەکی جیهانی . لێرەدا تەنها ئەوەندە بەسە گەر بڵێین هەمووی بەسەریەکەوە (٢١) ساڵ بەسەر تەواو بوونی شەڕی یەکەمی جیهاندا تێنەپەڕی کاتێك لەژێر سایەی «کۆمەڵەی گەلان»دا کڵپەی ئاگری شەڕێکی گەلێك لەو بەربلاوتر بەربۆوە . جا با بە کورتی جارێکا بێینە سەر باسی ئەو لایەنە بایەخدارانەی ژیانی گەلان‌و جیهان کە کۆمەڵە نەیتوانی رۆڵێکی ئەوتۆیان تێدا ببینێ‌و کە هەر یەکەشیان بەجۆرێك رێگەیان بۆ شەڕی نوێی جیهان خۆش کرد ، ئەو شەڕەی دەبوو «کۆمەڵەی گەلان» بەهیچ جۆرێکەی بەرپابوونی نەدا .

## ئەو کارانەی «کۆمەڵەی گەلان» بۆی چارەسەر نەکران

لە سەرەتای کاری‌یەوە ساڵی (١٩٢٠) ، تاوەکو پێچانەوەی دامودەزگای لە نیسانی ساڵی (١٩٤٦)دا ، واتە لە ماوەی چارەکە سەدەیەکی تەمەنیدا (٦٦) کێشەو

مەسەلەی نێودەوڵەتی خرایە بەردەمی «کۆمەڵەی گەلان» کە بەداخەوە نەیتوانی چارەسەری هەرە بایەخدارو گرنگەکانیان بکات کە ئەمانەی لای خوارەوە نموونە سەرەکی یەکانیانن .

**یەکەم - شەڕی ژاپۆن‌و چین :**

لەو ڕۆژەوەی ژاپۆن بەخۆدا هات‌و ژیانی ئابووری‌و توانای سەربازی‌ی هەنگاوی باشی بەرەوپێشەوە ناو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە وەك دەوڵەتێکی گەورە ناسرا ، لەو ڕۆژەوە تۆکیۆ چاوی بڕی‌یە خاك‌و سامانی چین‌و ماچینی دراوسێ .

شەڕی یەکەمی جیهان هێندەی تر ژاپۆنی دەوڵەمەندکرد . وەك بەڵگە لێرەدا تەنها دوو نموونە دەخەینە بەرچاو . لە ساڵی (١٩١٤) وە تاوەکو ساڵی (١٩١٩) نرخی بەرهەمی کەلوپەلی پیشەسازی‌ی ژاپۆن لە (١٣) ملیاریەنەوە[10] گەیشتە (٦٥) ملیار ، واتە پێنج هێند ، یا ٥٠٠٪ زیاتر بوو . لە ماوەی چوار ساڵی شەڕی یەکەمدا ، واتە لە ساڵی (١٩١٤)وە تاوەکو ساڵی (١٩١٨) بارستی بازرگانی ژاپۆن لەگەڵ دەرەوەدا دوو هێندو نیو زیادی کردو زیوو زێڕێکی بێ‌شومار لە بانقەکانی تۆکیۆدا کۆبۆوە ، بە ڕادەیەك زوربەی دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا کەوتنە قەرزکردن لە ژاپۆن[11] .

لەوساوە ژاپۆن چاوچنۆکانەتر دەیڕوانی‌یە چینی دەوڵەمەندی یەکجار دواکەوتوو . فەرمانڕەوایانی ئەو وڵاتە چونکە دڵنیا بوون ئیمپریالی‌یەکان دەست ناهێنە ڕێگەیان ، هێزە چەکدارەکانیان لە ڕۆژی (١٨)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٣٢)وە کەوتنە پەلاماردانی باکووری - ڕۆژهەلاتی چین . لە سەرەتاوە پەکین پشتی بە دەوڵەتە گەورەکان بەست‌و ویستی لە ڕێگەی «کۆمەڵەی گەلان»ەوە ڕادە بۆ دەستدرێژی‌ی ژاپۆنەکان دابنێ . بەلام کۆمەڵە هیچی بۆ نەکراو بڕیارەکانی لەو بارەیەوە کە بێ پەلەو لە سەرخۆ دەری‌دەکردن هەروا مانەوەو ژاپۆن بێ‌ئەوەی گوێ بداتێ بۆ ساڵی داهاتوو لە ناوچە داگیرکراوەکاندا حوکمەتێکی سەربەخۆی دامەزراند .

---

(١٠) یەن پارەی ژاپۆنە . نرخی لە گۆڕیندایە . هەر ٣٠٠ یەن دۆلارێك دەبێت . ئیمڕۆکە یەن یەکێکە لەپارە هەرە بەهێزەکانی جیهان . بە قسەی بانقی مەرکەزی دینارێك نزیکەی ٧٥٠ یەنە .

(١١) دوای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ژاپۆن دووەم دەوڵەتی جیهان بوو کەڵکی زۆری لەو بارو دۆخە وەرگرت کە شەڕی یەکەمی جیهان هێنانی‌یە کایەوە .

## دووەم - هێرشی ئیتالیا بۆ سەر حەبەشە :

فاشی‌یەکان کە کۆتایی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٢٢) دەسەڵاتی ئیتالیایان گرتەدەست دەیانویست گوایە ڕابوردووی ڕۆمانە دەسەڵاتدارەکان زیندوو بکەنەوەو ئیمپراتۆری‌یەتێکی فراوان‌و بەدەسەڵات دابمەزرێنن‌و بۆ ئەو مەبەستەیان بە هەر چوار لادا دروشمی «ئیتالیای گەورە»یان بەرزکردەوە . فاشی‌یەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی دەست بەسەر دەریای سپی‌ی ناوەڕاست‌و دەریای سوورو بەشێکی زۆری ئەفەریقادا بگرن‌و تەنانەت لە نەخشەکانی خۆیاندا بی‌کەم‌و زیاد ناوی دەریای سپی‌ی ناوەڕاستیان کردبووە «دەریاکەی خۆمان» .

بۆ جێ‌بەجی‌کردنی ئامانجە فراوانەکانی لە ئەفەریقادا ئیتالیای فاشی بەر لە هەر شوێنێکی تر ڕووی کردە حەبەشەو لە سەرەتای ساڵی (١٩٣٥) وەکەوتە ناردنی هێز بۆ سەر سنووری ئەو وڵاتە بەناو سەربەخۆیەی ئەفەریقا . تاوەکو مانگی ئابی ئەو ساڵە مۆسۆلینی بۆ شەڕی حەبەشە (٢٥٠) هەزار سەربازی ئیتالیایی‌و (٧٥٠) هەزار سەربازی وڵاتە ژێردەستەکانی لەو ناوچەیەدا کۆکردەوە .

لە ساڵی (١٩٢٣) وە حەبەشە یەکێك بوو لە ئەندامانی «کۆمەڵەی گەلان» . نەك هەر ئەوە ، بەڵکو وەك گومان بە پشتگیری‌ی فەرەنسە دەزگای ناوبراو حەبەشەی وەرگرت .

کەچی لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا تاوەکو ڕۆژی چواری ئەیلولی ساڵی (١٩٣٥) کۆمەڵە نەبڕوانی‌یە سکاڵای حەبەشە کە لە ڕۆژی (٣)ی کانوونی دووەمی هەمان ساڵەوە دژی ئیتالیا پێشکەشی کردبوو ، واتە پاش هەشت مانگ‌و ڕۆژێك ئینجا کۆمەڵە بەخەبەر هات .

ڕاستە لەسەر حەبەشە «کۆمەڵەی گەلان» درەنگانێ بڕیاری ئابلووقەدانی ئابووری‌ی ئیتالیای فاشی‌ی‌دا ، بەڵام بەهۆی یاری‌ی ئینگلیزو فەرەنسەیی‌یەکانەوە نەوت‌و بەنزین لە لیستەی ئەو کەلوپەلانە دوورخرانەوە کە دەبوو دەستی ئیتالیایان پێ نەگات ، ئەوساکەش ئیتالیاو ، بەتایبەت ڕەورەوەی شەڕی فاشی لە نەوت‌و بەنزین بەولاوە شتێکی تری ئەوتۆی پێویست نەبوو . لەبەر ئەوە بڕیارەکانی «کۆمەڵەی

گەلان» دەربارەی دەستدرێژیی ئیتالیا بۆ سەر حەبەشە هیچ دادێکیان نەداو فاشی‌یەکان دەستیان هەڵنەگرت تابە جۆرێکی زۆر درندانە وڵاتی فراوانی حەبەشەیان داگیرکرد . تەنها ئەوانەی بەهۆی گازی کوشندەوە لەو شەڕەدا کوژران ژمارەیان خۆی دەدا لە (٢٧٥) هەزار کەس ! . کەچی زۆری نەخایاند کاتێك لەسەر داوای لەندەن‌و پاریس «کۆمەڵەی گەلان» بڕیاری ئابلۆوقەدانی ئابووری‌یە ناتەواوەکەشی بەرامبەر ئیتالیا لابرد .

**سێیەم – دەست‌تێوەردانی نازی‌و**
**فاشی‌یەکان لە کاروباری**
**ناوخۆی ئیسپانیادا :**

لە پێناوی سەربەخۆیی ڕاستەقینەو مافە دیموکراتی‌یەکانیدا لە نیسانی ساڵی (١٩٣١) وە گەلی ئیسپانی شۆڕشێکی گەورەی بەرپا کرد کە نزیکەی هەشت ساڵی خایاند . شۆڕشگێران سەرەتا دەسکەوتی گەورەیان وەدی هێناو توانی‌یان کۆمارێکی سەربەخۆو دیموکراتی پەروەر دابمەزرێنن ، ئەو کارەی خورپەی لە دڵی کۆنەپەرستانی ناوەوەو دەرەوەی وڵات هەڵساند . زۆری نەبرد دوژمنان پیلانێکیان بۆ ڕوخاندنی کۆماری کۆرپەی ئیسپانی سازکرد . لە تەمموزی ساڵی (١٩٣٦) وە ئاگری شەڕی براکوژی لەو وڵاتەدا هەڵگیرسا . هەرچەندە بەر لەوە (٢٧) دەوڵەتی ئەوروپایی بڕیاریان دابوو کەس دەست نەخاتە ناو کاروباری ناوخۆی ئیسپانیاوە ، بەڵام نازی‌یەکانی ئەڵەمانیاو فاشی‌یەکانی ئیتالیا وەك پیشەی هەمیشەیی‌یان خۆیان پێ‌نەگیراو لە تەمموزی هەمان ساڵەوە کەوتنە ناردنی چەك‌و تفاقی هەمەجۆر[11] بۆ کۆنەپەرستە یاخی‌بووەکانی ئیسپانیا . فاشی‌و نازی‌یەکان بەوەوە نەوەستان ، بەڵکو دەستیان کردە ناردنی هێزە چەکدارەکانی خۆیشیان بەنیازی ڕیشەکێش کردنی هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئیسپانیا . ژمارەی ئەو چەکدارانەی ئەڵەمانیاو ئیتالیا ناردیانە ئیسپانیا گەیشتە نزیکەی (٣٠٠) هەزار کەس کە لە ماوەی (٣٢) مانگدا چەك نەما دژی شۆڕشگێڕانی ئیسپانیا بەکاری نەهێنن .

---

(١١) تەنانەت تانك‌و فڕۆکەشیان بۆ ناردن .

بەپێی ناوەرۆکی پێڕەوی دەبوو «کۆمەڵەی گەلان» یەکەم دەزگا بێت لەسەر ئیسپانیا بێتە دەنگ . کەچی تەنانەت بڕیاری ئابلۆقەدانی ئابووریی ئەڵمانیاو ئیتالیاشی نەداکە بە بەرچاوی هەموانەوە کەوتبوونە دروێنەی گیانی کۆمەڵانی خەڵکی ئیسپانیا.کە مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی (١٩٣٦) کۆماری ئیسپانیا سکاڵای پێشکەش بە «کۆمەڵەی گەلان» کرد فەرەنسەو ئینگلتەرەو عەلقە لە گوێکانیان کارێکی ئەوتۆیان کرد نە ئەنجومەنو نە کۆمیتەی گشتی توخنی باسی ئیسپانیا نەکەوتنو لەبریتی ئەوە لیژنەیەکی سەربەخۆیان دامەزراندو ئەویش تەنها بڕیاری دەوڵەتە ئەورووپاییەکانی دووپات کردەوە کە گوایە نابێ کەس دەست بخاتە ناو کاروباری ناوخۆی ئیسپانیاوە . لە ڕاستیدا ئەو بڕیارە تەنها لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا چووە سەر بەوەی بەرەی ئەوان لە پەیدا کردنی چەك بێبەری بوو ، لە کاتێکدا فاشییەکان بە ئارەزووی خۆیان گاڵەیان دەکرد .

**چوارەم – دەستدرێژییەکانی**
**ئەڵەمانیای هیتلەری :**

ئەو جۆرە هەڵوەستانەی «کۆمەڵەی گەلان» یەکێك بوو لەو هۆیانەی پاڵیان بە هیتلەرو مۆسۆلینییەوە نا زیاتر شووڵی لێهەڵکێشن . زۆری نەبرد نازییەکان ژمارەیەك هەنگاوی ترسناکیان نا کە هەموویان دەرچوونی ئاشکرا بوون چ لە پێڕەوی «کۆمەڵەی گەلان» و چ لە ناوەرۆکی بڕیارو پەیمانەکانی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس . ئەڵەمانیای نازی بەجۆرێکی بەر لەوە نەبینراو کەوتەوە دروست کردنی چەكو تفاق شەڕو پەرەپێدانی هێزە جوراوجۆرەکانی . تەنها لە ماوەی یەکەم سێ ساڵی دەسەڵاتی نازییەکاندا خەرجی ئەڵەمانیا بۆ کاروباری سەربازی لە یەك ملیار مارکەوە گەیشتە دە ملیار ، واتە دەهێند زیادی کرد . ژمارەی یەکەمیان لە ٢٪ و ژمارەی دووەمیان لە ١٧٪ی داهاتی نەتەوەیی ئەڵەمانیایان پێك دەهێنا . هەر لەو ماوەیەدا ژمارەی تیپە چەکدارەکانی لەشکری ئەڵەمانیا لە (١٠)وە گەیشتە (٣٠) تیپو دواییش هەموو ئەو ژمارانە زۆر لەوە زیاتر بوون . ئەمە لە کاتێکدا بەپێی «پەیمانی ڤێرسای» نەدەبوو ئەڵەمانیا هەرگیز لە (١٠٠) هەزار سەرباز زیاتری هەبێ .

کە کارگەیشت بەوە ئیتر هیتلەر هێند سڵی لەوە نەکردەوە دیسان هێزی چەکدار بنێرێتە ناوچەکانی ڕاینی سەر سنووری فەرەنسە کە بەپێی ڤێرسای چەك کرابوون . ڕۆژی (٧)ی مارتی ساڵی (١٩٣٦) هێتلەر فەرمانی دایە لەشکری ڕایخی سێیەم[١٢] بچنەوە ناو خاکی ڕاین . شایانی باسە ئەوساکە هێشتا لەشکری فەرەنسە لە لەشکری ئەڵەمانیا بەهێزتر بوو ، هەروەها لە ڕووی یاساشەوە بۆی هەبوو بەرەنگاری ئەو هەنگاوەی ئەڵەمانیا بێتەوە ، دوایش دەرکەوت هیتلەر فەرمانی دابووە سەرکردایەتی لەشکر کە ئەگەر هاتو فەرەنسە بزوا ئەوا یەکسەر هێزەکانی خۆیان بێ شەڕ بکێشنە دواوە . کەچی نە فەرەنسەو نە ئینگیلتەرە لەوە زیاتر کە ئەو هەنگاوەی هیتلەریان بە لادان لە ناوەرۆکی «پەیمانی ڤێرسای» دانا ئیتر شتێکی تریان نەکرد ، بەڵکو وەك کارێکی مەترسیداریشیان بۆ سەر ئاشتیی جیهان لە قەڵەم نەدا .

هەڵوەستی دەوڵەتە گەورەکان ، بەر لە هەموان ئینگیلتەرەو فەرەنسە ، هێندەی تر هیتلەری لەخۆ بایی کرد . هەموو بەسەر یەکەوە ساڵی نەبرد ئەدوڵف[١٣] هیتلەر لە هەمان مانگی ساڵی داهاتودا ، واتە مارتی (١٩٣٧) وڵاتی نەمسەی هەڵلوشیو[١٤] خستیە سەر ڕایخی سێیەم . سەیر ئەوەیە لەندەنو پاریسو هاوپەیمانەکانیان داگیرکردنی نەمسەیان بە مەسەلەیەکی ئەوتۆ دانەنا هەڵبگرێ بخرێتە بەردەمی «کۆمەڵەی گەلان» .

---

(١٢) ڕایخ لە وشەی ڕایخشتاغ (Reichstag)ی ئەڵمانییەوە وەرگیراوە کە بریتییە لە دوو وشەی لێکدراو : (Reich) واتە دەوڵەت ، یا ئیمپراتۆرییەت ، لەگەڵ (Tag) ، واتە کۆبوونەوە ، یا ئەنجومەن . وەك زاراوێکی سیاسی لە سەدەی دوازدەمینەوە بەکار هێنراوە . زیاتر مانای پەرلەمان دەبەخشێ . ڕایخی یەکەمو دووەم دوو قۆناغی نێوان سەدەی دوازدەمینو کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهان دەگرنەوە . ڕایخی سێیەم ساڵی ١٩١٩ دەستی پێکردو بە تەواو بوونی شەڕی دووەمی جیهان لەناو چوو . هەرچەندە ڕایخشتاغ لەژێر سایەی هیتلەردا ، وەك زوربەی دەزگا دیموکراسییەکانی تری ئەڵمانیا چووە خانەی نەبوانەوە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆر مێژوونووس ڕۆژگاری ئەڵمانیای نازییان ناو ناوە «ڕایخی سێیەم» ، ناوی کتێبە بەناوبانگەکەی ولیەم شیرەر دەربارەی ئەڵمانیای نازی بەم جۆرەیە : «مێژووی ئەڵمانیای هیتلەری . دامەزراندنی ڕایخی سێیەمو کەوتنی» .

(١٣) ئەدۆلف ناوی خۆیو هیتلەر نازناوی هەڵبژاردەیەتی . لە ڕاستیدا خۆی ناوی ئەدۆلف شیکلگروبەرە (Adolf Schicklgruber)

(١٤) لە مێژوودا بەو کارە دەگوترێ ئەنشلیوس کە وشەیەکی ئەڵمانییەو مانای خستنەسەر دەگەیەنێ . هەڵلووشینی کوردی لەبارترین وشەیە بۆ ئەو کارە .

دیسان سالێ زیاتری نەخایاند کە لە هەمان مانگی سالّی داهاتودا ، واتە مارتی (١٩٣٩) ، هیتلەر فەرمانی دایە لەشکری ئەڵەمانیا چیکۆسلۆڤاکیای سەربەخۆش داگیر بکات‌و بیخاتە سەر «رایخی سێیەم» . شایانی باسە ئەیلوولی سالّی (١٩٣٨) کۆمیتەی گشتی‌ی کۆمەڵە لە کۆبوونەوەدا بوو ، ئەوساکەش ئەڵەمانیا هێزەکانی خۆی لەسەر سنووری چیکۆسلۆڤاکیا ئامادە کردبوو ، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ئەو باسە نەهێنرایە گۆڕێ . با ئەوەیش بڵێین کە چیکۆسلۆڤاکیا یەکێك بوو لە دۆستە هەرە نزیکەکانی فەرەنسە .

**پێنجەم – داگیرکردنی ئەلبانیا**
**لەلایەن ئیتالیای فاشی‌یەوە :**

بنیتۆ مۆسۆلینی وەك هیتلەری هاوبیری دەستی نەدەرۆی ئەگینا لەو کەمتری نەدەکرد ، هەرچەندە ، خوا هەڵناگرێ ، ئەویش کەمی نەکرد . تێپەڕبوونی کارەساتەکەی حەبەشە بەو جۆرەی دیمان‌و دەستدرێژی‌یەکانی هیتلەر مۆسۆلینیان شێتگیرتر کرد . بۆ ئەو ئەلبانیای سەربەخۆ عەڵقەی لاوازی ئەورووپا بوو کە لە دەمێکەوە چاوی تێ‌بڕیبوو .

فاشی‌یەکانی ئیتالیا بەوەوە نەوەستان کە لە بیستەکانەوە ئەلبانیایان کردبووە ولاتێکی نیمچە ژێردەستەی خۆیان ، بەڵکو هەر لەوساوە خولیای داگیرکردنی لە کەللەی دابوون . لەوەدا فاشی‌یەکان هیچ بایەخێکیان نە بەرای گشتی‌و نە بە «کۆمەڵەی گەلان» نەئەدا . بەدەستووری ژاپۆن‌و ئەڵەمانیا ئیتالیاش سالّی (١٩٣٧) لە «کۆمەڵەی گەلان» کشایەوە . زۆری نەبرد لەشکری فاشی بێ‌پەروا بە بەر چاوی هەموانەوە نیسانی سالّی (١٩٣٩) ئەلبانیای داگیرکردو مۆسۆلینی ڕای‌گەیاند کە ئەو ولاتە هەمیشە بەشێکی مێژوویی ئیتالیای دێرین بووە !

بێ‌دەنگی «کۆمەڵەی گەلان» و دەوڵەتە گەورەکان لە عاستی گشت ئەو دەستدرێژی‌یانەدا جۆرە پشی پشی‌یەکی ئەوان بوو بۆ ژاپۆن‌و ئیتالیای فاشی‌و لە هەمویشیان زیاتر بۆ ئەڵەمانیای نازی . لەوان وابوو بەو جۆرە هیتلەر لە ڕۆژئاوا دوور

دەخەنەوەو بەرەو ڕۆژهەڵات پاڵی پێوە دەنێن[١٥] ، بەڵام زۆری نەبرد ڕۆژگار دەری‌خست تا چ ڕادەیەك ئەوان بەهەڵەدا چوبوون . بەو جۆرە هەڵوەستانە هیتلەر بێ ئەندازە لە خۆبایی بوو ، وای دەزانی کەس نی‌یە بتوانێ شان لە شانی بدا . هەر بەو جۆرەش ڕێگە بۆ هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی دووەمی جیهان خۆش بوو ، ئەو شەڕەی ، وەك گوتمان ، دەبوو «کۆمەڵەی گەلان» ڕێگەی بەرپابوونی نەدا .

گەر وابێ‌و ، هەرواش بوو ، «کۆمەڵەی گەلان» دەزگایەکی جیهانی‌ی سەرنەکەوتوو بوو . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها دامەزراندنی ئەو دەزگایە جۆرە هەنگاوێك بوو بۆ پێشەوە لەژیانی گشتی‌ی مرۆڤدا . جگە لەوە «کۆمەڵەی گەلان» هەرچۆن بێ توانیشی چارەسەری ژمارەیەك کێشەی نێودەوڵەتی بکات ، تایبەت لە بیستەکاندا ، واتە لە پلەی یەکەمی ژیانیدا .

## ئەو کارانەی «کۆمەڵەی گەلان» چارەسەری کردن

کۆنگرەی ئاشتی‌ی پاریس ئەو کێشانەی خۆی فریا نەکەوت تەواویان بکات سپاردنی بە «کۆمەڵەی گەلان» . بەشی هەرە زۆری ئەو کێشانە گەلاڵە بووبوون ، یا ڕێبازی چارکردنیان دیار کرابوو بۆیەکا کۆمەڵە تا ڕادەیەکی زۆر بەخێرایی‌و ئاسانی تەواوی‌کردن . بەشێکی‌تریان بێنەو بەرەی دەوڵەتە ئیمپریالی‌یەکانی لەسەر نەبوو ، بۆیەکا ئەوانیشی زوو ڕاپەڕاند .

لەنیوەی یەکەمی بیستەکاندا «کۆمەڵەی گەلان» توانی کێشەی سنووری نێوان ئەلبانیاو یوگۆسلاڤیاو یۆنان‌و نێوان بەلگاریاو یۆنان‌و نێوان لاتڤیاو پۆڵۆنیاو نێوان عیراق‌و تورکیا ببڕێنێتەوە . هەروەها چارەنووسی سایلیزیای باکوورو ، دوایی چارەنووسی ناوچەی ساری ئەلەمانیای لە ڕێگای دەنگدانەوە دیارکرد . دوورگەی کۆرفۆش کە ئیتالیا زەوتی کردبوو ، دایەوە دەست یۆنان . بەهەمان دەستوور داوای سویدی ڕەت‌کردەوە کە دەیویست دوورگەی ئالاندی ناو دەریای بەڵتیك لە فینلەندە زەوت بکات .

---

(١٥) مەبەست ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای ئەوروپایە .

ژمارەیەکیش لە دەزگا سەربەخۆکانی «کۆمەڵەی گەلان» کەمو زۆر خزمەتی کرد . یەکیك لەو دەزگایانە «رێکخراوی جیهانیی کار»[١٦] بوو . بەپێی پێڕەوی رێکخراوی ناوبراو دەبوو هەوڵ بدات بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی کرێکاران لە رێگەی سەرپەرشتیکردنی کاتی کارەوەو تەقللادان بۆ نەهێشتنی بێکارەوە دیارکردنی رادەیەکی ماقوڵ بۆ کرێو پاراستنی کاری منداڵو ئافرەتو دانانی بە مافی دامەزراندنی جڤاتی سەربەخۆی کرێکاراندا .

«رێکخراوی جیهانیی کار» شتێکی ئەوتۆی بۆ کرێکاران پێنەکرا ، بەتایبەتی بۆ کرێکارانی وڵاتە دواکەوتووەکان . جاری وا هەبوو لە دەزگا یا کۆبوونەوە گشتییەکانی ئەو رێکخراوەدا سێ کەس دەبوونە وەفدی هەر یەکێك لە وڵاتە ئەندامەکانی «کۆمەڵەی گەلان» ، کە دەبوو یەکێکیان نوێنەری کرێکارانو یەکێکی تریان نوێنەری سەرمایەدارانو سێیەمیان نوێنەری حوکمەتی ئەو وڵاتە بێت .

بۆ روونکردنەوەی هەمان مەبەست رەنگبێ ئەوەندە بەس بێ گەر بڵێین زۆر جار کەسانی وەك جەعفەر عەسکەری دەبوونە «نوێنەری» کرێکاری ئەو جۆرە وڵاتانە لەو کۆنگرانەدا کە رێکخراوی کار بۆ لێکدانەوەی کێشەی کرێکاران دەیبەستن[١٧] . لەگەڵ ئەوەشدا تەنها دامەزراندنی «رێکخراوی جیهانیی کار» بۆ خۆی دەسکەوتێکی بایەخدار بوو ، چونکە رادەی تەشەنەسەندنو فراوانیی بزوتنەوەی کرێکارانی جیهانی رادەگەیاند ، ئەو بزوتنەوەیەی هیچ لایەنێك بۆی نەبوو ئیتر چاو لە ئاستیا بنوقێنێ .

«رێکخراوی تەندروستی جیهانی» و «دادگەی داوەری نێودەوڵەتی» لە لاهایو «لیژنەی کەمینەکان»[١٨] لە دەزگاکانی تری «کۆمەڵەی گەلان» بوون کە هەموویان ناوی خۆیان وا بەخۆیانەوە .

---

(١٦) واتە «منظمة العمل الدولية» .

(١٧) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە : الدكتور كمال مظهر احمد ، الطبقة العاملة العراقية . التكون وبدايات التحرك . بيروت ، ١٩٨١ .

(١٨) «منظمة الصحة العالمية» و «محكمة العدل الدولية» و «لجنة الاقليات» .

## سەرئەنجامی «کۆمەڵەی گەلان»

ڕۆژ بەڕۆژ سەنگی «کۆمەڵەی گەلان» ڕوو لە کزی بوو . بەر لەوەی شەڕی دووەمی جیهان دەست پی‌بکات بە ماوەیەك کۆمەڵە دەنگی کپ‌و تەنها ڕەنگی مابوو ، وای‌لێهاتبوو ئیتر کەس هیچی بە کڵاوی ئەو نەدەپێوا . لە دوای مانگی تەمموزی ساڵی (١٩٣٩) وە هیچ کامێك لە دەزگاکانی کۆنەبوونەوە ، هەرچەندە بەپێی یاسا «کۆمەڵەی گەلان» تاوەکو ڕۆژی (١٨)ی نیسانی ساڵی (١٩٤٦) هەر مابوو . ئەو ڕۆژە ئەندامانی کۆمەڵە بۆ دواجار لە جنیف کۆبوونەوەو دامودەزگایان پێچایەوەو ئەرکی خۆیان سپاردە «کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان» کە لەوساوە ئیتر وەك دەزگایەکی جیهانی جێگەی «کۆمەڵەی گەلان»ی گرتەوە .

## کوردو «کۆمەڵەی گەلان»

گەلێك جار ناوی کوردو کوردستان خراوەتە بەردەمی «کۆمەڵەی گەلان» و دەزگاکانی . بەدرخانی‌یەکان‌و شێخی بەردە قارەمان‌و حەپسەخان‌و[19] ژمارەیەکی تر لە نیشتمانپەروەران جارەهای جار یادداشت‌و نامەی تایبەتی‌یان پێشکەشی ئەو دەزگا جیهانی‌یە کردووە . ڕۆژانی داسەپاندنی پەیمانی ساڵی (١٩٣٠) بەسەر عیراقدا لەلایەن ئینگلیزی داگیرکەرەوەو ، دوای تەقینەوەی هەرا گەورەو جەرگبڕەکەی ڕۆژی شەشی ڕەشی ئەیلول نیشتمانپەروەرانی کورد زنجیرەیەك بروسکەو نامەی نارەزایی‌یان ناردە جنێف . بەهەمان دەستوور بەدرخانی‌یەکانیش زوو زوو دەنگی کوردیان دەدایەوە بەگوێی داخراوی بەڕێوەبەرانی «کۆمەڵەی گەلان»دا . بەڵام لەکاتی لێدوانی کێشەی موسڵدا لەوەیش زیاتر ناوی کورد کەوتە سەر زاری ئەندامانی «کۆمەڵەی گەلان» و دەزگاکانی .

کوردستانی باشوور ، وەك هەموو ئەو ناوچەیەی بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان بە «ویلایەتی مووسل» ناسرابوو ، بەشێك لە ئیمپراتۆری فراوانی عوسمانی بوو . لە

---

(١٩) مەبەست خوالێخۆشبوو حەپسەخانی نەقیبە .

ناوەندی ساڵی (١٩١٧) وە لەشکری بەریتانیا بە نیازی داگیرکردنی مەڵبەندی ناوبراو لەچەند قۆڵێکەوە بەرەو باکووری بەغدا کەوتە ڕێ[٢٠] . کە ڕۆژی (٣٠)ی تەشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨) ئاگربەسی مۆدرۆس[٢١] کۆتایی بە شەڕی نێوان هاوپەیمانەکانو ئیمپراتۆریی عوسمانی هێنا هێشتا لەشکری ئینگلیز دوازدە میلی مابوو بگاتە ناو شاری مووسڵ خۆیەوە . دوای شەڕو لەگەڵ سەرکەوتنی کەمالییەکانی تورکیا ئەوەی کردە بیانوو بۆ «داواکردنەوەی» ویلایەتی مووسڵ . بەو جۆرە کێشەیەکی نێودەوڵەتی دروست بوو کە بە ناوی «کێشەی مووسڵ»ەوە چۆتە ناو تۆماری مێژووەوە[٢٢] .

«کێشەی مووسڵ» بووە یەکێك لەو باسە سەرەکییانەی خرایە بەردەمی کۆنگرەی لۆزان کە دەوروبەری کۆتایی تەشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢) لەنێوان کەمالییەکانی تورکیاو هاوپەیمانەکاندا بەنیازی مۆرکردنی پەیمانێکی نوێ لەبریتی «پەیمانی سیڤەر» بەسترا . لەوێ لۆرد کیرزنی نوێنەری بەریتانیاو عیصمەت ئینۆنۆی نوێنەری تورکیا بە دوو قۆڵی کەوتنە باسی چارەنووسی «ویلایەتی مووسڵ» و هەریەکەیان هەوڵی ئەدا کورد بکاتە جوکەری بردنەوەی یارێکە . کە ئەوە دادی نەداو نەگەیشتنە ئەنجام ، لۆرد کیرزن[٢٣] کە ئاوساکە وەزیری هەندەرانی بەریتانیا

---

(٢٠) لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕی یەکەمی جیهاندا لەشکری ئینگلیز لە باشوورەوە کەوتە داگیرکردنی خاکی عیراقو ئاڕۆژی یازدەی مارتی ساڵی ١٩١٧ گەیشتە بەغداو دوای ئەوە ئینجا بەرەو کوردستان کەوتە ڕێ .

(٢١) ئاگربەس واتە «هدنة» .

(٢٢) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە : الدكتور فاضل حسين ، مشكلة الموصل . دراسة في الدبلوماسية العراقية – الانكليزية – التركية وفي الراي العام ، الطبعة الاولى ، بغداد ، ١٩٥٥ (٣٣٦ ص) . نامەی دوکتۆراکەیەتی کە ساڵی ١٩٥٢ پێشکەشی زانکۆی ئەندیاناى وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کردووە . چەند ساڵێك لەمەوبەر چاپی دووەمیشی دەرچوو . سەرچاوەیەکی بایەخدارە بۆ لێکدانەوەی چەند لایەنێکی گرنگی مێژووی هاوچەرخی گەلی کورد .

(٢٣) جۆرج ئەناتێل کیرزن (Curzon) (١٨٥٩–١٩٢٥) یەکێك بوو لەپیاوە سیاسییە بەناوبانگەکانی ئینگلتەرەی کۆتایی سەدەی نۆزدەمینو تا سەرەتای ١٩٢٤ ،واتە لە کاتێکی زۆر ناسکی مێژووی ئینگلتەرەو جیهاندا ، وەزیری هەندەران بوو ، بەو جۆرە دەوری لە «کێشەی مووسڵ» و چارەنووسی کوردا گەورەو دیاربوو .

جو رۆژی (٢٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) نامەیەکی تایبەتی ی نارد بۆ سکرتێری گشتی ی «کۆمەڵەی گەلان» و داوای لیکرد باسی مووسڵ بخاتە ناو لیستەی کاری ئەنجومەنەوە . پاش ئەوەی ئینۆنۆ ناچار بوو تا رادەیەك مل بدات ، هەردوولا ڕیككەوتن هەول بدەن لە ماوەی نۆ مانگدا خۆیان چارەسەری ئەو کێشەیە بکەن ، خۆ ئەگەر هاتو لەو ماوەیەدا نەگەیشتنە ئەنجام ئەوساکە بیدەنە دەست «کۆمەڵەی گەلان» .

رۆژی پێنجی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٤) ماوەی نۆ مانگەکە تەواو بوو بێ ئەوەی تورکیاو بەریتانیای گەورە بگەنە هیچ ئەنجامێك ، هەرچەندە نوێنەرانیان چەند جارێك کۆبوونەوەو گەلێك گفتوگۆیان لەو بارەیەوە کرد . کە کار گەیشت بەوە رۆژی (٦)ی ئابی ساڵی (١٩٢٤) لەندەن داوای لە سکرتێری گشتی ی «کۆمەڵەی گەلان» کردەوە بێ دواخستن «کێشەی مووسڵ» بخاتە بەردەمی ئەنجومەن . یازدەی ئابی هەمان ساڵ ، واتە پاش تەنها پێنج رۆژ ، بەرێوەبەرانی کارگێری کۆمەڵە «کێشەی مووسڵ» یان خستە ناو لیستەی کاری ئەنجومەنەوەو ئەندامانی کۆمەڵەو تورکیایان لەو بارەیەوە ئاگادارکرد .

لە کۆبوونەوەی رۆژی (٣٠)ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٤یدا «کۆمەڵەی گەلان» بڕیاری سپاردنی «کێشەی مووسڵ»ی بە لیژنەیەکی تایبەتی ی سێ قۆڵی دا کە پاش مانگێك ناویانی بەم جۆرە دیار کرد :

**یەکەم – کاربەدەستی وەزارەتی هەندەرانی سوید**

**ف – ڤێرسن کە باڵیۆز بوو لە ڕۆمانیا .**

**دووەم – سیاسی و زانای جوگرافی کۆنت پۆل تێلکی کە کاتی خۆی سەرۆك وەزیرانی هەنگاریا بووە .**

**سێیەم – ئەفسەری خانەنشینی بەلجیکی أ . پۆلس .**

یەکەمیان ، واتە ڤێرسن ، کرایە سەرۆکی لیژنەکە کە ژمارەیەکیش سکرتێرو یاریدەری شارەزای بۆ دانرا .

دەبوو ئەم لیژنەیەی «کۆمەڵەی گەلان» لە هەموو ئەو بەڵگانە بکۆڵێتەوە کە پێوەندییان بە لایەنی جیاوازی ژیانی نەتەوەیی و کۆمەلایەتی و ئابووری ی ویلایەتی مووسڵەوە هەبوو . هەروەها دەبوو ئەندامانی بێنە ناوچەی جیاوازی «ویلایەتی

مووسلّ» ەوەو لە نزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ نوێنەرانی دەستەو چینی جۆراوجۆری دانیشتوانیدا بکەن‌و ئینجا پوختەی ئەنجامی کارو پێشنیاری خۆیان لە ڕاپۆرتێکی سەربەخودا پێشکەش بە کۆمەڵە بکەن .

بۆ جێبەجێکردنی مەبەست ئەندامانی لیژنە سەریان لە لەندەن‌و بەغدو ئەستەموول‌و ئەنقەرە[٢٤] داو دوای ئەوە لە کۆتایی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥)وە بەتایبەتی چوونە ناوچەکانی «ویلیەتی مووسلّ» . ڕۆژی (٢٧)ی ئەو مانگە گەیشتنە شاری مووسلّ خۆی . پاش چەند ڕۆژێك ئەندامانی لیژنەو یاریدەرانیان بەجیا چوونە شارو شارۆچکەکانی تری ناوچەکەو لە هەولێرو کەرکوك‌و سلێمانی بەتایبەتی مانەوەو پێوەندییان بە زۆر کەسەوە کردو مانگی نیسان گەڕانەوە جنێڤ‌و لەوێ کەوتنە دانانی ڕاپۆرتی خۆیان کە ڕۆژی (١٦)ی تەمموزی ساڵی (١٩٢٥) تەواویان کردو بەسەر ئەندامانی «کۆمەڵەی گەلان»و ژمارەیەك ڕۆژنامەنووسدا دابەشیان کرد .

شایانی باسە نوێنەرانی تورکیاو بەریتانیاش لەگەڵ ئەندامانی لیژنەکەدا هاتبوون . تورکەکان ، دیارە بو مەبەستی خۆیان‌و بەر لە هەر شت بۆ خۆ نزیك خستنەوە لە کورد ، فەتاح بەگی خزمی شێخ مەحمودیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو .

لێدوان‌و بڕیارو مەرجەکانی «کۆمەڵەی گەلان» بۆ دیارکردنی چارەنووسی «ویلایەتی مووسلّ» تا ڕادەیەك ئاشکراو زانراون . ئەوەی دەمانەوێ لەم وتارەدا سەرنجی تایبەتیی بدەینێ ڕاپۆرتەکە خۆیەتی کە دەقی ناونیشانی بەم جۆرەیە :

**«کۆمەڵەی گەلان . مەسەلەی سنووری نێوان تورکیاو عیراق . ڕاپۆرتی پێشکەش کراو بە ئەنجومەن لە لایەن ئەو لیژنەیەوە کە بەپێی بڕیاری ڕۆژی (٣٠)ی ئەیلولی (١٩٢٤)ی ئەنجومەن دامزرێنرا»**[٢٥] .

ڕاپۆرتی لیژنەی تۆژینەوەی کێشەی مووسل پڕییە لە زانیاریی سیاسی‌و

---

(٢٤) ڕۆژی ١٦ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٥ ئەندامانی لیژنە گەیشتنە بەغداو پاش دە ڕۆژ لەوێوە چوونە مووسلّ‌و ئینجا کەوتنە گەڕان بە ناوچەکانی کوردستاندا .

(٢٥) ئەمەش دەقی ناوەکەیەتی بە ئینگلیزی :

(League of Nations. Question of the Frontier between Turkev and iraq. Report submitted to the Council by the Commission instituted by the Council resolution of September 30, 1924), Geneva, 1925.

ئابووری‌و کۆمەلاّیەتی‌و جوگرافی‌ی گرنگ کە بەشێکیان لە سەرچاوەی باوەرپێکراوەوە وەرگیراون‌و بەشێکیشیان ئەندامانی لیژنەکە بۆ خۆیان کۆیانکردوونەوە . زانیاری‌یەکانی ئەم بەشەی دوایی‌یان ئەندامانی لیژنە یا بە چاوی خۆیان بینیویانن‌و تۆماریان کردوون ، یا لە ڕێگەی ژمارەیەك مامۆستای شارەزاری زانکۆ بەناوبانگەکانی جیهانەوە پێیان زانیون . لەبەر ئەوە ڕاپۆرتی ناوبراو لە یەکەم ڕۆژی بلاّوکردنەوەیەوە بۆتە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی لێکدانەوەی گەلێك لایەنی ژیانی کوردەواری‌ی نوی‌و هاوچەرخ . کوردناسان زۆر جار لە بەرهەمەکانیاندا پەنایان بردۆتە بەر زانیاری‌یەکانی‌و کەلّکی باشیان لێیان وەرگرتووە .

هەرکەسێك بیەوێت باسی ژیانی دەرەبەگی‌و کۆچەری‌و هۆزایەتی‌و پێوەندی‌ی ئابووری‌و داب‌و نەریتی دانیشتوانی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان بکات پێویستە بگەڕێتەوە ناوەرۆکی ڕاپۆرتی لیژنەی تۆژینەوەی کێشەی موسل کە ژمارەیەك بۆچوونی سیاسی‌ی وردیشی تێدایە . . . شایانی باسە دانەرانی ڕاپۆرتەکە چەند جارێك باسی پێوەندی‌ی برایانەی نێوان کوردو عیسایی‌یەکانیان کردووەو دانیان بەوەدا ناوەکە لەو بارەیەوە هیچ گەلێکی تری موسلّمان نی‌یە بتوانێ شان لە شانی کورد بدات[٢٦] .

دیسان گەلێك جار ناوی کوردو کوردستان لەو ڕاپۆرتە تایبەتی‌یە گەورانەدا هاتووە کە ئینگلیزەکان لە ماوەی نێوان سالاّنی ١٩٢٠ و ١٩٣٢دا چەند جارێك بە چاپ کراوی دەربارەی کاروباری کارگێڕی عیراق پێشکەشی «کۆمەلّەی گەلان» یان کردوون . ئەو ڕاپۆرتانەش کە ئیمڕۆکە بوونەتە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی لێکدانەوەی مێژووی هاوچەرخی هەموو عیراق ، پڕن لە زانیاری‌ی زۆر بەکەلّك‌و گرنگ دەربارەی لایەنی جیاوازی ژیانی کوردەواری .

یەکێك لە بەشە سەرەکی‌یەکانی هەر یەکێك لەو ڕاپۆرتانە بۆ کورد تەرخان کراوە . بە وێنە لە یەکەم ڕاپۆرتیاندا کە دەربارەی کاروباری بەڕێوەبردنی عیراقە لە مانگی ئۆکتۆبەری سالّی (١٩٢٠) وە تاوەکو مانگی مارتی سالّی (١٩٢٢)[٢٧] باسی

---

(٢٦) Ibid , PP. 46 — 47

(٢٧) (Report on Iraq administration, October 1920 — March 1922), London, 1923.

کوشتنی میستەر بێل و کاپتەن سکۆتی تێدایە کە هەردووکیان مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩١٩) لەلایەن شۆڕشگێڕانی کوردی ناوچە شاخاویێکانی هەولێرەوە پێکراون . هەروەها باسی کوشتنی کاپتەن سالمۆنیشی تێدایە کە ئەفسەری سیاسیی کفری بوو ، لە لایەن شۆڕشگێڕانی کوردەوە سەرەتا بەدیل گیراو دوایی کوژرا[٢٨] .

هەمان ڕاپۆرت بەکورتی، باسی کۆنگرەی قاهیرەو سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بەکوردو ، بەشدار نەبوونی دانیشتوانی ناوچەی سلێمانیی لە «هەڵبژاردنی» فەیسەڵی یەکەمدا کردووە . یەکەمیان ، واتە کۆنگرەی قاهیرە ، مانگی مایسی ساڵی (١٩٢١) لەژێر چاودێریی چەرچلدا بەسترا کە ئەوساکە وەزیری موستەعمەرات بوو . دەربارەی عیراق ئەندامانی «کۆنگرەی قاهیرە» لە چوار باسی سەرەکیی کۆڵینەوە :-

**یەکەم - کەمکردنەوەی خەرجی بەریتانیای گەورە لە عیراق .**
**دووەم - باسی ئەوانەی خۆیان بۆ تەختی پاشایی عیراق پاڵاوتبوو .**
**سێیەم - مەسەلەی کورد .**
**چوارەم - لەشکری داهاتووی عیراق .**

هەرچەندە «کۆنگرەی قاهیرە» بایەخی زۆریدا بە مەسەلەی کورد ، بەڵام ئاڵو گۆڕێکی ئەوتۆ لە سیاسەتی ئینگلیزدا بەرامبەری ڕووینەدا .

لاپەرە ٦٨ و ٦٩ی ڕاپۆرتی ١٩٢٠-١٩٢٢ بۆ باسی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینێکی هۆزی سورچی دژی ئینگلیزی داگیرکەر تەرخان کراون . ئەو ڕاپەڕینە دەوروبەری کۆتایی ساڵی (١٩٢١) بەرپا بوو ، ئینگلیزەکان تا سەرەتای ساڵی داهاتوو بە تەواوی بۆیان دانەمرکایەوە . بەپێی زانیارییەکانی ناو ڕاپۆرتەکە ژمارەی شۆڕشگێڕانی سورچی خۆی دەدا لە (٦٠٠) کەسێك کە ، وەك دەڵێ ، نزیکەی (٢٠٠) سەربازی تورك بە تۆپێکەوە یاریدەیان دەدان . ئەو هێزەی ئینگلیزەکان کردیانە گیانی شۆڕشگێڕانی کورد لە هەزار سەربازی لێی پێکهاتبوو کە جگە لە دوو

(٢٨) ڕۆژانی «شۆڕشی بیست . کاپتەن سالمۆن لەلایەن پیاوەکانی برایم خانی دەلۆوە کوژرا .

ئەفسەریان هیچ کامێکیان ئینگلیز نەبوون . وا دیارە شەڕ لە نێوان هەردوو لادا دوو ڕۆژی خایاندووەو تورکەکان تەنها لە ڕۆژی یەکەمیدا بەشداربوون‌و دوایی پشتی شۆڕشگێڕانیان بەرداوە . پاش ئەوەی سورچی‌یەکان ، بەپێی قسەی ڕاپۆرتەکە خۆی ، بەرگری‌یەکی چاکیان کردووە ناچار بوون بکشێنەوە . زیانیان ، وەك نووسیوی‌یە ، (٢٠) کوژراوو (٧٠) بریندارو کاول کردنی ژمارەیەك گوندو گرتنی دوو سێ ڕانە مەڕو بزنیان بووە .

دوابەدوای ئەو باسە ڕاپۆرتی ١٩٢٠-١٩٢٢ ڕاستی‌یەکی مێژوویی بایەخداری تۆمار کردووە . دەڵێ ئەیلوولی ساڵی (١٩٢١) ژمارەیەك شارەزای سەربازی‌ی ئینگلیز گەیشتنە عیراق‌و دەست‌کرا بە گواستنەوەی بەشی زۆری هێزی لیڤی لە ناوچەکانی فوراتەوە بۆ کوردستان ، بەڵام « بەداخەوە تا نووسینی ئەم ڕاپۆرتە نەتوانراوە هیچ سەربازێکی لیڤی لە دیوانیەو سەماوەو ناصریەوە بگوێزرێتەوە» چونکە ، وەك دەڵێ ، هەموو مەڵبەندی فورات بە لەشکر دابین نەدەکرا . ئەم قسانە ڕادەی پەرەسەندنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوای کورد دژی ئینگلیزو بایەخی خەباتی هاوبەش‌و یەك کات لەناو سنووری یەك وڵاتدا بە وردی ڕوون دەکەنەوە . ڕاستە تا ڕۆژی دانانی ڕاپۆرتی ناوبراو داگیرکەر توانیبووی «شۆڕشی بیست» لەناوەندو باشووری وڵاتدا دابمرکێنێتەوە ، بەڵام ئەو سێ شارەی ناویان هاتووە هێشتا لە «بزێوی» خۆیان نەکەوتبوون ، بۆیەکا ئینگلیزەکان نەیانتوانی هەموو سەگە هارەکانیان بەردەنە گیانی نیشتمانپەروەرانی کورد .

لە هەمان ڕاپۆرتدا ناوی شێخ مەحمودو سمایل ئاغای شوکاك (سمکۆ) و مەحمود خانی دزڵی‌و ئەورەحمان ئاغای سەرۆکی هۆزی شرناخی کوردستانی تورکیاو ژمارەیەك ناوداری تری کورد هاتووە[٢٩] . بەوێنە دەربارەی شێخ مەحمودو مەحمود خانی دزڵی گەورەی هەورامان نووسیوی‌یە دەڵێ :

«لە ناوچەی سلێمانی پڕۆپاگەندەیەکی زۆر دژی بەریتانیا کراوە . . ساڵی (١٩١٩) مەحمود خانی سەرداری گوندی دزڵی بەشداری‌ی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمودی کردو ساڵی (١٩٢٠) لەلایەن حوکمەتی ئێرانەوە دیل‌کراو درایە دەست کاربەدەستانی

---

(Report on Iraq administration, October 1920 — March 1922), PP. 103. (٢٩)

بەریتانیا (لە عیراق –ك.م.) . دوای ئەوەی لە هندستان ماوەیەك بە بەندی مایەوە ، ئەیلولی سالّی (١٩٢١) ریّگەی درانیّ بگەریّتەوە سلیّمانی بەو مەرجەی ، وەك بەڵیّنی‌دا ، نەچیّتەوە دیوی ئیّران . بەلاّم مەحمود خان بەڵیّنەکەی شکاندو گەرایەوە دزلّی‌و لەویّوە نامەی بۆ مستەفا کەمال ناردو داوای چەکی لی‌کرد بۆ دەرکردنی ئینگلیز لە ناوچەی سلیّمانی . کانوونی یەکەم ژمارەیەك وردە سەرداری هەورامان ، کە بی‌گومان پیّوەندی‌یان پیّوەی هەبوو ، هاتنە دەشتی هەڵەبجەو کەوتنە کۆکردنەوەی باج . ناوەندی کانوونی دووەمی (سالّی ١٩٢٢ – ك.م.) هیّزیّکی لیڤی کەوتە ناو بۆسەیەکەوەو ژمارەیەکیان پیّکران ، کە یەکیّکیان ئەفسەری بەریتانی کاپتەن ڤیتزگیبۆنی(٣٠) فەرماندەی هیّزەکە بوو . دوای ئەوە لەبریتی پیادە بە فرۆکە هیّرش کرایە سەر هەڵەبجە . ئەنجامی ئەو هیّرشە زۆر سەرکەوتوو بوو . مەحمود خان بە ناچاری گەرایەوە گوندی دزلّی ، بەلاّم پیاوەکانی لە پەلامارداتی دەشتی هەڵەبجە نەکەوتن . مانگی مارت فشاری فرۆکە مەحموود خانی ناچار کرد پیّوەندی بەکاربەدەستانی ئینگلیزەوە بکات .

سەرئەنجامی ئەوانەش کە لە شۆرشەکەی سالّی ١٩١٩ی شیّخ مەحمودا بەشدار بوون بەم جۆرە بوو : شیّخ قادری برای‌و غەریبی شیّخ عارف خزمی وشیّخ ئەحمەدی پیاوی مانگی مایس لە هەنجام بەردران . یەکەم‌و دووەمیان ئیّستە وان لە بەغدا . هەرچی شیّخ ئەحمەدە ریّگەی پی‌ درا یەکسەر بگەریّتەوە سلیّمانی . شیّخ مەحمودو شیّخ غەریبی کوری شیّخ مارف کانوونی دووەم لە هندستان بەرەلاّ کران‌و ئیّستە وەك دوورخراوەی سیاسی وان لە کویّت‌و چاوەروانی گەرانەوەن بۆ سلیّمانی»(٣١) .

لە شویّنیّکی تردا هەمان راپۆرت دەربارەی باری خویّندەواری‌ی ئەوسای کوردستان ئەم راستی‌یەی داوە بەدەستەوە کە دەلّیّ ئەیلولی سالّی (١٩٢١) پۆلیّکی ناوەندی لە شاری سلیّمانی کرایەوە ، بەلاّم لەبەر ئەوەی تەنها سیّ قوتابی خۆیان ناونووس کرد پیّشنیار کرا بگویّزریّنەوە شاری کەرکووك(٣٢) . وەك دواییش روونی

(٣٠) Captain Fitzgibbon

(٣١) (Report on Iraq administration, October 1920 — March 1922), PP. 116 — 117.

(٣٢) Ibid

ئەکەینەوە خوێندنی کوردی لەژێر سایەی ئینگلیزدا لەوەیش کەمتر پێشکەوت کە چاوەڕوان دەکرا .

لە ڕاپۆرتی داهاتوودا کە ئینگلیزەکان دەربارەی کاروباری عیراق لە ماوەی نێوان نیسانی ۱۹۲۲ و مارتی ۱۹۲۳ دا داویانەتە «کۆمەڵەی گەلان»(۳۳) بەدرێژی باسی هەڵوەستی کورد بەرامبەر «هەڵبژاردنی» فەیصەلی یەکەم و ، هەراوبگری ناوچەی هەڵەب : ەو هەوراماناو ، کوشتنی م . مۆت و(۳٤) ، هەڵوەستی جیاوازی سەردارانی جاف و پشدەر دەربارەی گەڕانەوەی شێخ مەحمودو ، چالاکیی کەمالییەکان لەناو کوردی عیراقداو ، ڕاپەڕینی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو ، کوشتنی کاپتەن بۆندو(۳۵) کاپتەن ماکانت(۳٦) لەلایەن شۆڕشگێڕانی هەمەوەندەوەو گەلێك باسی بایەخداریتری وەك ئەوان دەخوێنییەوە(۳۷) .

هەمان ڕاپۆرت بە درێژی باسی ئەوەی کردووە چۆن لەژێر فشاری شۆڕشگێڕان و نارەزایی جەماوەردا ئینگلیزەکان ناچار بوون ڕۆژی (٥)ی ئەیلوولی ساڵی (۱۹۲۲) شاری سلێمانی و هەموو ئەو ناوچەو مەڵبەندانە بەجێ بهێڵن کە کەوتوونەتە باکووری هەولێر - کەرکوك - کفرییەوە . ئینگلیزەکان ئەو ڕۆژە (٦٧) کاربەدەستی خۆیانیان لە سلێمانییەوە بە فڕۆکە گواستەوە کەرکوك و ، بەڕێوەبردنی کاروباری شاریان سپاردە ئەو ئەنجومەنەی بەر لەماوەیەك نوێنەرانی دانیشتوانی شار هەڵیانبژاردبوو(۳۸) .

دیسان هەمان ڕاپۆرت بە وردی چەند لایەنێکی گرنگی دەربارەی گەڕانەوەکەی شێخ لە هندستانەوە بۆ تۆمار کردووین . لەو شوێنەیدا ڕاپۆرتەکە بە ناونیشانی «وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن شێخ مەحمودەوەو پیلانی ئەو لەگەڵ

---

(۳۳) (Report on Iraq administration, April 1922 — March 1923), London, 1924.

(۳٤) Lieutenant M. Mott.

(۳۵) Captain Bond

(۳٦) Captain Makkant

(۳۷) ((Report on Iraq administration, April 1922 — March 1923)). PP. 33—34

(۳۸) Ibid , P. 35

تورکاندا، باسی پێوەندەی نهێنی شێخی لە ڕێگەی ئۆزدەمیر پاشاوە[٣٩] لەگەڵ کەمالییەکاندا کردووە . لەو بارەیەوە دەڵێ و ، ڕاستیش دەکات ، کەمالییەکان لەگەڵ شێخ دەست پاك نەبوون ، بەڵکو دەیانویست بیکەنە داشی دامەی جێبەجێکردنی مەبەستی خۆیان[٤٠] . ڕاپۆرتی ناوبراو گەلێك زانیاریی دەگەمەنی دەربارەی ئەو باسەو چالاکیی بەرفراوانی کەمالییەکانی لەناو کوردی عیراقدا بۆ پاراستووین .

لەچەند شوێنێکیدا ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٣ بە ئاشکرا باسی ئەو بەزمەی کردووە کە فڕۆکە شەڕکەرەکانی بەریتانیا لە ڕقی شێخ مەحمودو کەمالییەکان بە دانیشتوانی بێ‌وەیی کوردستانیان دەکرد . بڕوا ناکەم ئەو ڕۆژگارە لە هیچ شوێنێکی ولاتە ژێردەستە فراوانەکانیانا ئینگلیز بە ڕادەی کوردستان چەکی هەمەجۆرو ، بەتایبەتی فڕۆکەیان بەکار هێنابێت ، ئەو کارەی لەندەن وەك ڕوداوێکی ئاسایی لە ڕاپۆرتە تایبەتییەکانی خۆیدا دەیخستە بەردەمی دەزگاکانی «کۆمەڵەی گەلان»و ئەندامانی .

بەهەمان دەستوور خەباتی گەلی کوردو ، تایبەت بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود گەلێك لاپەڕەی ڕاپۆرتی داهاتوویان پڕکردۆتەوە کە بۆ باسی کاروباری عیراق لە نیسانی ساڵی ١٩٢٣وە تاوەکو کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٤ تەرخان کراوە[٤١]

---

(٣٩) ئۆزدەمیر پاشا ئەفسەرێکی گەورەو لێهاتووی تورك و لایەنگری مستەفا کەمال بوو . ئۆزدەمیر نازناوی بوو . ئەگینا خۆی ناوی عەلی شەفیق و بە ڕەگەز میسری بوو . لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢ وە کەمالییەکان لەگەڵ هێزێکی سەربازیدا ناردیانە ڕەواندوز . ئۆزدەمیر توانی لە نزیکەوە پێوەندی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەردارانی کورد دابمەزرێنێ ، هەزارو یەك گفتی شیرینی درۆی داتێ . چالاکییەکانی ئۆزدەمیرو هاریکاریی لەگەڵ سەردارانی کورداو بەتایبەتی لەگەڵ شێخ مەحمود ، تەواو ئینگلیزیان بێزار کردبوو . پاش ماوەیەك ئۆزدەمیر ناچار بوو بکشێتەوە ، هەرچەندە لە باروو دۆخی ئەو ڕۆژگارەدا کەمالییەکان بەهاکی لەگەڵ کوردا بهاتنایە پێشەوە دەیانتوانی جێ‌پێی ئینگلیز تەواو شلۆق بکەن .

(٤٠) ((Report on Iraq administration, April 1922 — March 1923)), P. 39.

(٤١) ((Report by His Britannic Majesty's Government on the administration of Iraq for the Period April 1922 — December, 1924)), London, 1925.

لەو لاپەڕانەدا چەند جارێك باسی بۆمبابارانی سلێمانی‌و هەڵەبجەو شوێنی تری کوردستان لەلایەن فڕۆکەکانی بەریتانیای گەورەوە کراوە. بەپێی دەقی قسەی ڕاپۆرتەکە خوی بۆمبابارانی ڕۆژی (٢٥)ی مایسی ساڵی (١٩٢٤) دانیشتوانی سلێمانی ناچارکرد شار بەجێ بهێڵن‌و، وەك دەڵێت کاتێك ئینگلیزەکان داگیریان کردەوە لە (٢٠) هەزار ژمارەی دانیشتووی تەنها (٧٠٠) کەسی تێدا مابوو. پاش دوو مانگ ئێنجا نیوەی خەڵکی شار زاتیان کرد بگەڕێنەوە سەر ماڵ‌و حاڵی خۆیان، بەلام تا مانگی تەشرینی دووەم ژمارەی نەگەیشتەوە دۆخەکەی جارانی[٤٢].

جگە لە باسی ڕووی جیاوازی کوردەواری‌ی عیراق ڕاپۆرتی ساڵی (١٩٢٦)[٤٣] بەتایبەتی باسی سمکۆشی کردووە. لەو بارەیەوە نووسیوی‌یە دەڵێ:

«سمایل ئاغای سمکۆ: دەوروبەری کۆتایی مانگی تەشرینی یەکەم سمایل ئاغای سەرەك هۆزی شوکاك کە بە سمکۆ ناسراوە دژی حوکمەتی ئێران شۆڕشی بەرپا کرد، بەلام لەو شەڕەی نزیك دیلمان قەوما شکاو بە ناچاری خۆی‌و صەد کەس لە پیاوەکانی پەنایان هێنایە بەر عیراق دوای ئەوەی لە ڕێگەی تورکیاوە نزیك نەهری سنووری بڕی‌و هاتە ناوچەی ڕەواندزی سەر بەهەولێر.

ئێران داوای لە عیراق کرد سمکۆی بەیەخسیری بداتەوە، بەلام عیراق ملی نەدا، چونکە یاسای پەناهەندەی سیاسی عیراق ڕێگەی دانەوەی پەنابەران نادات. لەگەڵ ئەوەش حوکمەتی عیراق ڕێگەی دایە ئێرانی‌یەکان ئەفسەرێکی خۆیان بنێرنە ناو خاکی عیراق بۆ گفتوگۆ لەگەڵ سمکۆ دەربارەی ئەو مەرجانەی ئێران بۆ لێخۆشبوونی دایناون»[٤٤].

بۆ باسی کوردو، گەلێك باسی تری ئەوسای عیراق ڕاپۆرتی ساڵی (١٩٢٧)[٤٥]

---

(٤٢) Ibid, PP. 32 – 33

(٤٣) ((Report by His Brittanic Majesty's Government to the Council of The League of Nations on the administration of Iraq for the year 1926)), London, 1927.

(٤٤) Ibid, P. 27.

(٤٥) ((Report by His Britanic Majesty's Government to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1927)), London, 1928.

هیچی لەوانی‌تر کەم نی‌یە . ئەمجاریان باسی گفتوگۆی ئینگلیزەکان لەگەڵ شێخ مەحمودا هاتۆتە پێشەوە . بۆ جی‌بەجی‌ کردنی ئەو مەبەستە شێخ مەحمود سەید ئەحمەدی بەرزنجی ی کردۆتە نوێنەری خۆی‌و ناردوویەتە بەغدا . نووسەرانی ئەو راپۆرتە سەید ئەحمەدی بەرزنجی‌یان ناو ناوە «ئاژاوەچی ی کوردستانی باشوور»[٤٦] . دیارە دەبێ نیشتمانپەروەرو پیاوی دڵسۆز لای هەموو زۆردارو داگیرکەرێك هەر ئاژاوەچی‌و یاخی‌گەرو پیاوخراپ بێ ! . هەر بەو جۆرەش راپۆرتەکە ناوی سابیرو عەبدوڵلای کوڕانی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند دەبات . ئەوانیش لەو رۆژانەدا ، بەپیشەی باووباپیرانیان ، دلێرانە بەرەنگاری داگیرکەر هاتبوون ، بەڵکۆ ئەوساکە ، وەك راپۆرتەکە بۆ خۆی دەڵێ ، تەنها ئەوان لە کۆری خەباتدا مابوونەوەو ئینگلیزەکان کوناوکون بە فرۆکەو سوارەو سەربازی لیڤی دوویان کەوتبوون .

راپۆرتی ساڵی (١٩٢٧) بە کورتی چەند لایەنێکی باری ژیانی ئەو کوردانەی خستۆتە بەردەمی «کۆمەڵەی گەلان» کە لە ئەنجامی راپەرینە گەورەکەی شێخ سەعیدی پیراندا پەنایان هێنابووە بەر عیراق‌و وەك دەڵێ ناوچەی مووسڵ بەهۆی لێشاوی ئەوانەوە بەجارێك شڵۆقابوو . بەپێی قسەی راپۆرتەکە تاوەکو ساڵی (١٩٢٧) تەنها (٤٥٠) کەس لەو پەناهێنەرانە لە ناو خاکی عیراقدا مابوونەوە . ئەوانی تریان هەموویان گەڕاونەتەوە گوندەکانی خۆیان . لەو (٤٥٠) کەسەش نزیکەی (١٥٠) یان لە ناوچەی زاخۆو (٢٥٠) یان لە ناوچەی دهۆك‌و نزیکەی (١٠٠) یان لە ناو مووسڵ خۆی‌و دەوروبەریدا نیشتەجی‌بوون[٤٧] .

---

(٤٦)

Ibid, P. 24

دەقی قسەکە وەهایە

(The stormy Petrel of Southern Kurdistan)

«پێترێل» بەتەنها مەلێکی گچکەی دەریایی زۆر دوورەفرە ، بەڵام کە وشەی (storm)ی دەچێتە پاڵ دەبێتە زاراوو بەیەکێك دەگوترێ زۆر بزێوو بەگژبەند بێ .

(٤٧) ((Report... on the administration of Iraq for the year 1927)), PP . 24 — 25

له ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٣١دا[٤٨] ژمارەیەك هۆزی ناوچەی بادینان دەبنە گاوررو بەرازخۆرو لەسەر ئەوە (!) فرۆکەکانی بەریتانیای گەورە زۆر «دڵسۆزانە» دێنە دەستو بەردەبنە گیانیان . دوای یەك لاپەرە باسی گرتنی مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ناوەندی نیسانەوە تاوەکو (٣٠)ی مایسی ساڵی (١٩٣١) دەخوێنیەوە[٤٩] .

هەروەها چ ئەم ڕاپۆرتەو چ ڕاپۆرتی ساڵی (١٩٣٠)[٥٠] چەند جارێك باسی شەشی ڕەشی ئەیلوولو تازەبوونەوەی ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحمود تا بەدیل گرتنیو ڕەوانە کردنی بۆ ناصریە دەگێڕنەوە . کاتێك ڕاپۆرتی ساڵی (١٩٣١) دێتە سەر باسی شەڕی ئاوباریك ، کە ڕۆژی پێنجی نیسانی ساڵی (١٩٣١) قەوما ، دەڵێ کوردەکان «ئازایانە جەنگین ، هەرچەندە هێرشی فرۆکەو پیادە بەردەوام بوو ، بەڵام ئەوان تا تاریکیداهات بەرگرییان کردو ئینجا کشانەوە» . دانەرانی ڕاپۆرتەکە بێ پێچو پەنا باسی ئەوەیان نووسیوە چۆن فرۆکەکانی ئینگلیز لە ماوەی دوو حەفتەی داهاتودا تاقیبی شێخیان کردووەو دەستیان لێهەڵنەگرتووە تا ڕۆژی (٢٠)ی نیسان کردوویانە بەودیودا . شێخ لەوێ گوندی پیرانی کردۆتە بنکەی نوێی[٥١] .

دوای چەند لاپەرەیەك ڕاپۆرتی ساڵی (١٩٣١) باسی ئەوە دەکات چۆن ئینگلیزەکان لەسەر داوای ڕەزا شا هێزی تایبەتییان کردۆتە سەر مەحمود خانی دزلیو دەست بەرداری نەبوون تا ڕۆژی (٣١)ی مایسی ئەو ساڵە بە دیلی گرتوویانەو ڕەوانەی بەغدایان کردووە[٥٢] .

---

(٤٨) ((Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1931)) .

(٤٩) Ibid, PP. 15 – 16

(٥٠) ((Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1930).

(٥١) ((Report.... for the year 1931)), PP. 16 – 17.

(٥٢) Ibid, P. 31

ڕاپۆرتی داهاتوو کە بۆ ماوەی نێوان کانوونی دووەم و ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٣٢ تەرخانکراوە[٥٣] وەك ئەوانی تر بێ پەروا کۆڵێك باسی «جوامێری»ی فڕۆکە شەڕکەرەکانی بەریتانیای گەورەی دژی شۆڕشگێڕانی کورد بۆ «کۆمەڵەی گەلان» کردووە (!!) . ئەو «داستانە» خۆشە (!!) ئەمجاریان بۆتە گوڵی سەردەستەی باس و یەکەم شەش لاپەڕەی ڕاپۆرتەکەی «ڕازاندۆتەوە» . دیسان زۆر بێ پەروا ڕاپۆرتەکە باسی ئەوە دەکات چۆن بۆ ماوەیەك هێرشی فڕۆکەکانی ئینگلیز بۆ سەر کورد لەبەر خاتری چاوی شینی فڕۆکەوانێك و یاریدەرێکی ، کە «چەتە» کوردەکان بەدیلیان گرتبوون ، وەستێنرا . بەڵام کاری دانەرانی ڕاست ئەوەیشیان بۆ مێژوو تۆمار کردووە چۆن ئەو «چەتانە» پیاوانە ڕەفتاری دیلەکانیان کردووەو پاش ماوەیەك ئازادیان کردوون[٥٤] .

هیچ کامێك لە ڕاپۆرتەکانی تری ئینگلیز کە دەربارەی عیراق لە بیستەکانو سەرەتای سییەکاندا پێشکەشی «کۆمەڵەی گەلان» یان کردوون لە باسی کورد بێ بەش نین . دوا ڕاپۆرتیان کە بەر لە کۆتایی ساڵی (١٩٣٢) بە بۆنەی وەرگرتنی عیراق بەئەندام لەلایەن «کۆمەڵەی گەلان»ەوە پێشکەشیان کردووە بریتییە لە پوختەی هەموو ڕاپۆرتەکانی تر ، بۆیەکا بایەخی ئەمیان زۆر تایبەتییە[٥٥] . ئێمە لەو ڕاپۆرتە تەنها یەك نموونە دەهێنینەوە کە ، خوا هەڵناگرێ ، بێ پێچ و پەنا باسی باری خوێندنو خوێندەواریی کورد تاوەکو سەرەتای سییەکان دەکات ، واتە تا ئەو کاتەی عیراق تێیدا بووە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» . لەو ماوەیەدا کە گوایە بەریتانیای گەورە بە «ناوی» «کۆمەڵەی گەلان»ەوە عیراقی دەبرد بەڕێوە ژیانی ڕووناکبیریی کورد زۆر

---

(٥٣)

((Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the period January to October 1932)).

(٥٤) Ibid , P. 3

(٥٥)

((Special Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the progress of Iraq during period 1920 — 1931)), London, 1931.

هێدیو لەسەر خۆ هەنگاوی دەنا . هەرچۆن بێ هەنگاوی ناوچەکانی تر لە هەنگاوی ئەو خێراتر بوو . بە داخەوە جاری وا هەبوو ئەو هەنگاوە بۆ دواوە بوو ، نەك بۆپێشەوە . بەوێنە بەر لەوەی شەری یەکەمی جیهان دەست پێبکات ژمارەی قوتابیی ناوەندی[٥٦] لە شاری سلێمانی خۆی دەدا لە نزیکەی (١٦٥) کەس ، کەچی بەر لەوەی عیراق ببێتە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان»و دوای (١٤) ساڵی رەبەق لە قەیمومەتی بەریتانیای پێشکەوتوو ئەو ژمارەیە هاتە سەر تەنها (١٠) کەس . ئەوەیش خراپتر : دیسان بەر لەوەی عیراق ببێتە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» ، لە ژێر سایەی بەریتانیای گەورەدا ژمارەی هەموو ئەوانەی لە قوتابخانە کوردییەکاندا دەیانخوێند ، بەپێی سەرژمێری ئینگلیزەکان خۆیان ، بریتی بوو تەنها لە (١٥٤٥) کەس . کەچی بەرامبەر بەوان (٦٣٠٠) کەس لە قوتابخانە عیسایییەکانو (٨٤٠٠) کەس لە قوتابخانە جووەکان دەیانخوێند ! ![٥٧] ، واتە ئەو جووانەی عیراق کە ژمارەیان نەدەگەیشتە لە صەدا سێو چواری کورد پتر لە پێنج ئەوەندەی ئەوان مافی خوێندنیان هەبوو ! !

بەو جۆرە هەر بەڵگەیەك دەربارەی کورد چوێتە بەردەمی «کۆمەڵەی گەلان» بە دروستی وێنەی باری نالەباری سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووری کوردی بۆ ئەندامانی کێشاوە ، باسی ئەو جەورو ستەمو بێمافییەی کوردی بۆکردوون کە بەهۆی ئینگلیزو عەلقە لە گوێکانیانەوە دووچاریان هاتبوو . راستە جاروبار دەزگاکانی «کۆمەڵەی گەلان» ئاوریان لە کورد داوەتەوەو تەنانەت ئەو نامانەشیان بێ وەڵام نەکردووە کە نیشتمانپەروەرانی کورد بۆیانیان ناردوون[٥٨] ، بەڵام ، بێگومان ، هەڵوەستی کۆمەڵە بەرامبەر بە کورد هیچ رۆژێك نەگەیشتۆتە نیوەی ئەو ئاستەش کە بەپێی ناوەرۆکی پێرەوی خۆی دەبوو بیگاتێ . ئەوەش دیسان رووی راستەقینەی «کۆمەڵەی گەلان» وەك داشی دامەی دەستی دەوڵەتە گەورەکان نیشان دەدات .

---

(٥٧) ((Special Report...)), PP. 232—234 هەروەها بڕوانە : عبدالرزاق الهلالي ، تاريخ التعليم في العراق في العهد العثماني ١٦٣٨-١٩١٧ ، بغداد ، ١٩٥٩ ، ص ١٨١ ، محمد امين زكي ، تاريخ السليمانية وانحائها ، ترجمة محمد جميل بندى الروژبياني . بغداد ، ١٩٥١ ، ص ٢٠٥ - ٢١٠ ، «العالم العربي» (جريدة) ، بغداد ، ٢٠ كانون الثاني ١٩٣١ .

(٥٨) بڕوانە : ((Report... on the administration of Iraq for the year 1931)) PP. 18—19.

کەوابێ نیشتمانپەروەرانی کورد حەقیان بوو بە چاوی گومانو رقەوە سەیری «کۆمەڵەی گەلان» یان دەکرد . لەخۆوە نەبوو سەلام لە پارچە هەڵبەستێکی خۆیدا کە ساڵی ۱۹۳۳ بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری «هاوار»ی شامدا بڵاوی کردەوە[٥٩] «کۆمەڵەی گەلان»ی ناونا «کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن»ی وەزیری هەندمرانی ئەوسای بەریتانیای گەورە[٦٠] .

لەهەمان هەڵبەستیدا سەلام دەربارەی «کومەڵەی گەلان» بە داخو زوخاوێکی زۆرەوە گوتوویە :

**«عصـــــــبـــــــة الامم» ، کۆمـــــــەڵی گەورە**
**بـــــەپێچو پـــــەنـــــا بـــــەفـــــێڵو دەورە[٦١]**
**بـــــەجۆشو کوڵێ بووی بۆ کوردی هـــــەژار**
**ئـــــەتگوت ئـــــەم قـــــەومـــــە ئـــــەکـــــەم ڕستگار**
**ئـــــەگەر ڕاست ئـــــەکـــــەی هـــــەڵی سوورێنـــــە**
**بـــــەس بۆ سیـــــاسەت هـــــەڵپـــــەرێنـــــە**
**تـــــەریق نـــــابیـــــتۆ تۆ چیت پێ ئـــــەکـــــەن**
**(کوتـــــەکی دەستی مـــــیســـــتـــــەر هـــــەنـــــدرسن)**

دوای ئەوەی سەلام پیلانو یارێکانی «کۆمەڵەی گەلان» ڕیسوا دەکات دیسان ڕووی دەمی تێدەکاتەوەو پێی دەڵێ :

**لـــــە عـــــەدالـــــەتـــــاکـــــەی ئـــــەمـــــە دەئـــــبـــــە**
**یـــــاخو هـــــەر شێوەو ئوسوڵی غـــــەربـــــە**

---

(٥٩) بڕوانە :
«هاوار» . ساڵی دوو . ژمارە ۲۲ ، یەکی تەمموزی ۱۹۳۳ ،ل ۷ . هەمان پارچە یەکەم شیعری سەلامە لە دیوانەکەیدا (بڕوانە : «دیوانی سەلام» . بەغدا . ۱۹٥۸ . ل ۹ ٤) . لە دیوانەکەدا چەند شوێنێکی شیعرەکە پەڕێنراوە . بەڵام «هاوار» دەق وەك خۆی بڵاو کردۆتەوە .

(٦٠) مەبەست ئارثەر هێندرسنە (A. Henderson) (۱۸٦۳–۱۹۳٥) کە لە ساڵی ۱۹۱۱ وە تاوەکو ساڵی ۱۹۳٤ سکرتێری «پارتی کرێکاران» بوو . ساڵی ۱۹۲۹ بووە وەزیری هەندەران ، ساڵی ۱۹۳۱ وازی هێنا . واتە کە سەلام شیعرەکەی گوتووە ئەو هێشتا هەر وەزیر بووە .

(٦١) چەند بەیتێکی هەڵبژاردەن لە شیعرەکەی سەلام . نەك هەمووی .

کۆمەڵی درۆ ، جێگەی مەکروفەن
(کوتەکی دەس سەبەتەر هەندەرسن)
خۆ تۆ وەصی بووی ئەقوام بوون قەتیو
دەمی کوردت گرد بە تەڵەی تەلەسیو

سەلام لەوەیش زیاتر پێی پیا دەنێو «کۆمەڵەی گەلان»ی لا دەبێتە بارەگای «فیتنەو تەزویر» و کارخانەی «فەسادو میحەن» چونکە :

لە سلێمانی جەسادەی بەرسەرا
بە خوێناوی کورد ئاوڕشێن کرا[٦٢]

دوای هێنانەوەی باسەکە بەو جۆرە سەلامی داخ لەدڵ ڕوودەکاتەوە «کۆمەڵەی گەلان»و پڕ بەدەم لێی دەپرسێ :

چۆن عاجز نابی لەم خوێن ڕشتنە
لەلای تۆ هەڵبەت حقوق کوشتنە[٦٣]
ناترسی مێژوو لەعنەت بکەن
(کوتەکی دەس سەبەتەر هەندەرسن)

شایانی باسە هەر زوو ئەم پارچە هەڵبەستەی سەلام سەرنجی ڕوناکبیرانی کوردو ئەو بێگانانەی ڕاکێشاوە کە هەر یەکەیان لەبەر مەبەستێك بایەخ بە مەسەلەی کورد دەدەن ، کراوەتە فەرەنسیو گەرمێنی ئەرمەنی وێنەی لێ ناردووە بۆ بارەگای «کۆمەڵەی گەلان» لە جنێف . کە مینۆرسکی ساڵی (١٩٣٤) هاتۆتە سلێمانی ئەویش ڕوونووسی کردووەو لەگەڵ خۆی بردوویە . هەروەها شابەندەری ئێران لە سلێمانی وێنەی لێ ناردۆتە وەزارەتی هەندەران لە تاران ، بەتایبەتی لەبەر ئەوەش کە شیعرەکە هێرشێکی زۆری تێدایە بۆ سەر عەجەمو ئێران[٦٤] .

---

(٦٢) سەلام ئەم شیعرەی لە یەکەم یادی شەڕی ڕەشی ئەیلولدا داناوە ، واتە ئەیلولی ساڵی ١٩٣١ .
(٦٣) خزرگە دەبگوت : «لەلای تۆ هەڵبەت ماف‌ماف کوشتنە» .
(٦٤) ئەم بەشەی لە دیوانەکەیدا چاپ نەکراوە .

«کۆمەڵەی گەلان» لە زمانی کوردیشدا ڕەنگی داوەتەوە. نووسەرانی سۆران «عصبة الامم» و «کۆمەڵی ئەقوام»و نووسەرانی «هاوار» و«ڕوناهی»«چڤاتی‌میللەتان»یان پێ‌گوتووە[٦٥].

بەدرخانی‌یەکان لەو دوو گۆڤارەو نووسینەکانی تریاندا زۆر جار «جڤات» یان لە بریتی کۆمەڵ‌و کۆمەڵەو یەکیەتی بەکار هێناوە[٦٦]. کاتی خۆی «کۆڕی زانیاری کورد» (جڤات)ی بۆ «نقابە»ش پێشنیارکرد[٦٧]. پێم وایە پێشنیارەکەشی بەجێ‌بە چونکە خانی (جڤین)ی بۆ «کۆبوونەوەو خرۆشانی خەڵکی بەکارهێناوە» و جگەرخوێن‌و کوردۆیێفیش هەمان وشەیان کردۆتە زاراو.

دڵنیام لەوەی گەڕانێکی ورد بەناو پاشماوەی تۆمارو بەڵگەکانی «کۆمەڵەی گەلان»دا بۆی هەیە ڕووی تری بایەخداری مێژووی کوردمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

---

(٦٥) شیعرەکەی شێخ سەلام لە «هاوار»دا بە ناونیشانی «لەبۆ جڤاتی میللەتان»، و لە دیوانەکەیدا بەناونیشانی «بۆ کۆمەڵی ئەقوام» بلاوکراوەتەوە.

(٦٦) بەوێنە بڕوانە:

«هاوار»، ساڵی یەك، ژمارە دوو، یەکی حوزەیرانی ١٩٣٢، ل ١، ساڵی یەك، ژمارە چواردە. ٣١ ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٢. ل ١.

(٦٧) بڕوانە:

«گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل ٥٢١.

کاتی خۆی لە ژمارە یەکی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»ا ئەم کورتە وتارانەی خوارەوەم بێ ناوی خۆم بڵاوکردەوە[1] . لەبەر نرخی باسەکانیان بۆ مێژووی ڕووناکبیری‌ی کورد لێرەدا بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە دیسان بڵاویان دەکەمەوە .

**یەکەم – وەقفنامەی ئەوڕەحمان پاشای بابان :**

ئەوڕەحمان پاشای کوڕی مەحمەد پاشای کوڕی خالید پاشا یەکێکە لە فەرمانڕەوا ناودارەکانی میرنشینی بابان ، ساڵی ١٢٠٤ی کۆچی (١٧٨٩ – ١٧٩٠ی عیسایی) دەسەڵاتی گرتە دەست‌و بۆ ماوەی نزیکەی چارەکە سەدەیەك دەوری گەورەی لە ژیانی سیاسی‌ی نەك تەنها کوردستان ، بەڵکو عیراق‌و ئێران‌و تورکیادا گێڕا . هەروەها یەکێکە لەو سەردارە کوردانەی سەرەتای هەستی نەتەوەیی‌یان تێدا بەدی دەکرێت .

بەپێی قسەی ڕیچ ئەو کاتەی سولەیمانی پچوکی پاشای بەغدا لە دەوڵەت یاخی بوو ، سوڵتان داوای لە ئەوڕەحمان پاشا کرد جێگەی بگرێتەوە ، بەڵام پاشای بابان قبوڵی نەکرد لە کوردستان‌و بنکەی میرنشینی باوو باپیرانی دوور بکەوێتەوە .

دەقی قسەکانی کلۆدیۆس جێمس ڕیچ لەم بارەیەوە بەم جۆرەیە :

«کاتێك کوچك سلێمانی پاشای بەغدا لە دەروازەی باڵا[2] یاخی بوو ، ڕەئیس ئەفەندی کە لە ئەستەمووڵەوە بۆ لابردنی هاتبوو ، حوکمەتی بەغدای بۆ ئەوڕەحمان

---

(١) «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی» ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٣ ، ل ٣٨١ – ٤١٨ .

(٢) دەروازی باڵا لە هەموو ڕوویەکەوە ڕێ بە پێستی (Porte) ، واتە «الباب العالی»یە کە ناوەکو کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهان بە دەوڵەتی عوسمانی دەگوترا .

پاشا پێشنیار کرد . بەلاّم پیری گەورە زۆر ژیرانە ئەو شەرەفەی رەت کردەوەو وتی :
راستە بەو کارە من دەبمە وەزیرێکی لەپێش ، بەلاّم تنۆکێ بەفراوی شاخەکانم
هەموو رێزی ئیمپراتۆری‌یەت دێنێت .

جگە لەوە بە چوونم بۆ بەغدا سەروەت‌و سامانی خۆم زۆر دەبێت ، بەلاّم ئەو کارەم دەبێتە هۆی هەرەس هێنانی یەکجاری‌ی بنەماڵەی بەبە»[3] .

یەکێك لە بەڵگەکانی‌تری هەستی زانستی‌و نەتەوەیی ئەورەحمان پاشا ئەوەبوو کە تاوەکو دوارۆژی ژیانی[4] بە چاوی رێزو خۆشەویستی‌یەوە دەیڕوانی‌یە زانایانی کوردستان . لێرەدا بەڵگەیەکی مێژوویی نەزانراو لەم بارەیەوە دەخەینە بەر چاو .

یەکێك لەو دەستنووسە نایابانەی بۆ کتێبخانەی ئەورەحمان پاشا نووسراوەتەوە «صحیحی بوخارا»یە . ئەم دەستنووسە کۆتایی مانگی رەمەزانی ساڵی ١٢١١ی کۆچی ، نیسانی ١٧٩٧ی عیسایی[5] لە لایەن محەمەد کوری شێخ یوسف کوری شێخ مەولان کوری شێخ عومەرەوە ، کە لە نەوەی وەیسی قەرەنی‌یە ، بە خەتێکی نایاب نووسراوەتەوەو لە دوو شوێنیدا مۆری ئەورەحمان پاشای بەسەرەوەیە . پاشای بابان ئەم دەستنووسەی لەسەر بنەماڵەی جەلی لە کۆیەو پاش ئەوان لەسەر زانایانی « کوردستان ، لە موسڵەوە تا بەغداو سنە» وەقف کردووە[6] . لەسەر مۆرەکەی ئەورەحمان پاشا ئەمە هەڵکەندراوە :

«وافوض امری الی الله . عبده عبدالرحمن»[7]

---

(٣)

C. J. Rich, Narrative of a Residence in Koordistan, and on the site of Ancient Nineveh, with Journal of a voyage down the Tigris to Bagdad, and an account of a visit to Shirauz and Persepolis, Vol. 1, London , 1836, PP. 96 — 97.

(٤) ئەورەحمان پاشای بابان ساڵی ١٢٢٨ی کۆچی ، ١٨١٣ی عیسایی کۆچی دوایی کردووە .

(٥) بە داخەوە رۆژی تەواوبوونی نووسینەوەی دەستنووسەکە دیار نەکراوە . بۆیەکا نەمانتوانی لە گۆڕینی ساڵی نووسینەوەیدا بۆ سەر ساڵی عیسایی رۆژەکەشی دابنێین .

(٦) دەقی عەرەبی‌یەکەی بەم جۆرەیە : « . . . ثم علی العلماء الذین کانوا فی ناحیة کردستان من الموصل الی بغداد وسنندج . . .» .

(٧) بڕوانە وێنەی وەقفنامەکەی ئەورەحمان پاشای بابان لە لاپەرە ٣٨٣و ٣٨٥ی ژمارە یەکی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» .

**دووەم – دوو نامەی حاجی کاك ئەحمەدی شێخو ڕاستکردنەوەیەك :**

حاجی کاك ئەحمەدی کوڕی شێخ مارف نۆدێی کوڕی شێخ مستەفای کوڕی شێخ ئەحمەد یەکێکە لە گەورە پیاوو زانا پایە بڵندەکانی کوردستانی سەدەی نۆزدەمین . حاجی کاك ئەحمەد ساڵی ۱۲۰۷ی کۆچی ، ۱۷۹۳ی عیسایی لە شاری سلێمانی لە دایك بووەو ساڵی ۱۳۰۵ی کۆچی ، ۱۸۸۷ی عیسایی هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە . جا با سەرەتا هەڵەیەکی پچوك دەربارەی تەمەنی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ ڕاست بکەینەوە .

بەپێی ئەو ساڵانەی سەرەوە حاجی کاك ئەحمەدی شێخ لە تەمەنی ۹٤ ساڵیدا وەفاتی کردووە . کەچی مامۆستایان ئەمین زەکیو شێخ محەمەدی خاڵ نووسیویانە گوایە ئەو زانایەمان کە کۆچی کردووە تەمەنی ۹۸ ساڵ بووە[8] .

ئەم هەڵەیە لەوەوە هاتووە کە مێژوونووسی گەورەمان مامۆستا ئەمین زەکی تەمەنی حاجی کاك ئەحمەدی بە ساڵی هیجری لێكداوەتەوە بێ ئەوەی جیاوازیی دە ڕۆژی ساڵەکان بگرێتە بەر چاو . مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵیش هەرچەندە ساڵی لە دایك بوونو وەفاتی حاجی کاك ئەحمەدی گۆڕیوەتە سەر ساڵی عیساییو دروست ۱۷۹۳ی بۆ یەکەمو ۱۸۸۷ی بۆ دووەم داناوە ، کەچی ، لەگەڵ ئەوەش تەمەنی هەر بە ۹۸ ساڵ لە قەڵەم داوە .

حاجی کاك ئەحمەدی شێخ دەستێکی باڵای لە زانستە ئایینیەکاندا هەبووەو گەلێك نووسراوی لەم بارەیەوە بە زمانی فارسی بەجێ هێشتووە . هەمان کات حاجی کاك ئەحمەد لە نزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ زانایانی کوردستاندا دامەزراندووە . یەکێك لەوانە زانای گەورە حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادەی کۆیە بووە . وا دیارە بەردەوام نامە لە نێوان ئەو دوو گەورە پیاوەدا هەبووە . بنەماڵەی جەلی زادە دوان لەو نامانەیان پاراستووە کە کاتی خۆی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ ناردوونی بۆ مەلا عەبدوڵلا .

---

(۸) بڕوانە :

محمد أمين زكي ، مشاهير الكرد وكردستان ، الجزء الثاني ، القاهرة ، ۱۹٤۷ ، ص ۱۱۹ ، محمد أمين زكي ، تأريخ السليمانية وانحائها ، بغداد ، ۱۹٥۱ ، ص ۲۲٤ ، محمد الخال ، الشيخ معروف النودهي البرزنجي ، بغداد ، ۱۹٦۱ ، ص ۱۹۹ .

به داخه‌وه له‌سه‌ر هیچ کامێك له‌و دوو نامه‌یه ڕۆژو ساڵی ناردنیان نه‌نووسراوه[٩] . به‌ڵام وا دیاره یه‌که‌میان ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی ، ١٨٨٢ی عیسایی له سلێمانی‌یه‌وه نێردراوه بۆ کۆیه . دووه‌میشیان به ناوه‌رۆك و لاوازی‌ی خه‌ته‌که‌یدا له‌وه ده‌چێت به‌ر له کۆچی دوایی حاجی کاك ئه‌حمه‌دی شێخ به ماوه‌یه‌کی که‌م نێردرابێت[١٠] . له سه‌ره‌تای ئه‌میاندا حاجی کاك ئه‌حمه‌د فه‌رموویه‌تی :

«یا حبیبي و یا قریبي ویا محیي ابتلیت بما خرج من طاقتي وبما لا صبر لي فیه واتمنی موتي مع حسن خاتمي فاعذرني . اجزتکم بالتدریس لاسیما کل عبادة لسانیة جزئیة کلیة ، وکل عبادة فعلیة . . . » .

### سێیه‌م - چه‌ند ڕاستی‌یه‌ك ده‌رباره‌ی شاعیری به‌ناوبانگ شێخ ڕه‌زای تاڵه‌بانی :

شاعیری گه‌وره‌و لێهاتووی کوردستانی نیوه‌ی دووه‌می سه‌ده‌ی نۆزده‌مین‌و سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی بیست شێخ ڕه‌زای تاڵه‌بانی له ئه‌ده‌بی گه‌لی کوردا جێگه‌ی به‌رزو شیاوه . که‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش جیاوازی‌ی له دیار کردنی ساڵی له دایك بوون‌و وه‌فاتیدا هه‌یه . مامۆستا ئه‌مین زه‌کی باسی له دایك بوونی نه‌کردووه[١١] . هه‌رچی مامۆستا عه‌لائه‌ددین سه‌جادی‌یه ١٨٣٥ی به ساڵی له دایك بوونی داناوه[١٢] . دوکتۆر مارف خه‌زنه‌دار ساڵی ١٨٤٢ی داناوه[١٣] .

کوردناسانی ده‌ره‌وه‌ش ئه‌و ساڵه‌یان به ته‌واوی بۆ دیار نه‌کراوه . به وێنه

---

(٩) بڕوانه وێنه‌ی ئه‌و دوو نامه‌یه له لاپه‌ڕه ٣٨٨و لاپه‌ڕه‌یه‌کی‌تری بێ ژماره‌ی ژماره یه‌کی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» .

(١٠) مامۆستا مه‌سعود محه‌مه‌دیش له‌و باوه‌ڕه‌دایه .

(١١) بڕوانه :

محمد امین زکي ، مشاهیر الکرد وکردستان ، الجزء الاول ، بغداد ، ١٩٤٥ ، ص ٢٢٤ - ٢٢٥ .

(١٢) علاءالدین سجادی ، مێژووی ئه‌ده‌بی کوردی ، به‌غدا ، ١٩٥٢ ، ل ٣٤١ . چاپی دووه‌م ، به‌غدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٧٤ .

(١٣) د . مارف خه‌زنه‌دار ، کورته‌ی مێژووی ئه‌ده‌بی کوردی‌ی نوێ ، به زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ ، ل ٨١ .

ئەدمۆنس لە یەکەم نووسینیدا دەربارەی شێخ ڕەزا دوو ساڵی بۆ لە دایك بوونی داناوە : ١٨٤١ یا ١٨٤٣ (١٤) . کەچی پاش ماوەیەك ناوەندی ئەو دوو ساڵەی هەڵبژاردووەو ١٨٤٢ی کردۆتە ساڵی لە دایك بوونی (١٥) .

دوکتۆر کەمال فوئاد بە دروستی ١٢٥٣ی کۆچی ی بە ساڵی لە دایك بوونی شێخ ڕەزای تاڵەبانی داناوە (١٦) ، بەلاّم وا دیارە ڕۆژو مانگەکەی بۆ نەدۆزراوەتەوە تا بە تەواوی ئەو ساڵە بەپێی ڕۆژژمێری ی عیسایش دیار بکرێت ، چونکە ساڵی ١٢٥٣ی کۆچی بەر ساڵی ١٨٣٧و ١٨٣٨ی عیسایی دەکەوێت . دوکتۆر کەمال فوئاد لەو دوانە یەکەمیانی هەڵبژاردووە ، وا دیارە بەو جۆرە ویستویە کەمێك لە تەمەنی ئەو شاعیرە گەورەیەمان درێژ بکاتەوە . منیش بومایە هەر وام دەکرد .

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ١٢٥٣ی کۆچی ی وەك ساڵی لە دایك بوونی شێخ ڕەزا تەواو چەسپاند . ئەمیان بۆ دۆزینەوەی ئەو ساڵە پەنای بردۆتە بەر شێخەکانی تاڵەبان (١٧) .

شێخی گەورەی تاڵەبان لە گوندی قرخی نزیك چەمچەماڵ (١٨) لە دایك بووەو لە کەرکوك گەورە بووەو لەوێو لە کۆیەو سلێمانی خوێندوویەو عەرەبی و فارسی و تورکیشی بە باشی زانیوەو شیعری پێ گوتونو چۆتە ئەستەمولو بەشی دوایی ژیانی لە بەغدا بردۆتە سەر .

بە داخەوە لە تۆمار کردنی ساڵی وەفاتی شێخ ڕەزادا دیسان هەڵەکراوە . مامۆستا

---

(١٤)

C. J. Edmonds, A Kurdish Lampoonist Shaikh Riza Talabani, — ( Journal of the Royal Central Asian Society) , London, Vol XX11, January 1935, P. 116.

(١٥)

C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, London, 1957, P. 57.

(١٦)

Kamal Fuad, Kurdische Handschriften , Wiesbaden, 1970, P. 101.

(١٧) بڕیار وابوو مامۆستا مەلا عەبدولکەریم ئەو ڕاستی یەمان لە «یادی مەردان»دا بۆ تۆمار بکات .

(١٨) قرخ و تاڵەبان دوو دێن کەوتوونەتە ناوچەی چەمچەماڵی نێوان کەرکوك و سلێمانی یەوە .

عەلائەدین سەجادی ۱۹۰۹ی کردۆتە ساڵی وەفاتی[۱۹] . دوکتۆر کەمال فوئادیش هەمان ساڵی داناوە[۲۰] .

گۆڕەکەی شێخ ڕەزا ، پڕ لە نوورو گوڵاو بێت ، وا لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا[۲۱] . لەسەر کێلی گۆڕەکەی شێخ ڕەزا نووسراوە :

«قد توفي الفاضل المرحوم في ليلة الجمعة المباركة من محرم الحرام سنة ۱۳۲۸» .

واتە ئەو بەڵگە گرنگەش تەنها مانگ‌و شەوی ئەو حەفتەیەی بۆ دیار کردووین کە شێخ کۆچی دوایی تێدا کردووە . بەڵام مامۆستا ئەمین زەکی ئەو ڕۆژەی بە یەکی موحەڕەم داناوە[۲۲] . لەبەر ئەوەش کە یەکی موحەڕەم پێنج شەممەدەگرێتەوە . لەسەر کێلەکەش نووسراوە شێخ شەوی هەینی کۆچی کردووە ، لەبەر ئەوە لەو بڕوایەداین یەکی موحەڕەمەکەی مامۆستا ئەمین زەکی دروست بێت . بەو جۆرەش ڕۆژی وەفاتی شێخ ڕەزای تاڵەبانی وای لێ دێت :

(یەکی موحەڕەمی ساڵی ۱۳۲۸ی کۆچی ، کە دەکاتە ئێوارەی پێنج شەممە لەسەر هەینی (جومعە)ی سیازدەی کانونی دووەمی ساڵی ۱۹۱۰) .

لەسەر کێلی گۆڕەکەی شێخ ڕەزا بە فارسی ئەم چەند دێڕە هەڵکەندراوە :

یا رسول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف
داخل جنت شوم در زمرۀ أصحاب تو
او رود در جنت‌و من در جهنم کي رواست
او سگ اصحاب کهف ومن سگ اصحاب تو

شێخ ڕەزای دونیا دیدەو ژیان پەرست زۆر حەزی لە تێکەڵ بوون‌و دانیشتنی زاناو شاعیران دەکردو پێوەندیی لەگەڵ گەلێکیان هەبوو . یەکێك لە هاوەڵ‌و دۆستە نزیکەکانی شێخی شاعیر حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە بووە کە پێکرا لە کۆیە

(۱۹) علاءالدین سجادی . سەرچاوەی ناوبراو . چاپی یەکەم ، ل ۳٤۱ ، ۳٤۳ . چاپی دووەم ، ل ۳۷٤ . ۳۷٦ .

(۲۰) Kamal Fuad, Op. Cit. , P. 101

(۲۱) محەممەدی کوڕی شێخ ڕەزا ، کە ئەویش شاعیر بووەو نازناوی (خالص) بووە ، لە تەنیشت باوکی‌یەوە لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادر نێژراوە .

(۲۲) محمد امین زکی ، مشاهیر الکرد وکردستان ، الجزء الاول ، ص ۲۲٥ .

لای حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی حاجی مەلا عەبدوڵلا خوێندوویانەو دوای ئەوەش لە ڕێگەی نامەوە پێوەندی‌یان بەردەوام بووە . یەکێك لە نامەکانی شێخ ڕەزا تا ئیستەش ماوە[23] کە بریتی‌یە لەنووسینێکی دۆستانەی . شێخ ڕەزا ئەو نامەیەی ساڵی ١٣١٣ی کۆچی (١٨٩٥-١٨٩٦ی عیسایی) نووسیوە[24] . شێخ نامەکەی بەم چوار دێڕە شیعرە فارسی‌یە دەست پێ‌کردووە :

عـــیب در ذات تو ای کـــان هنر مـــعـــدومست[25]
مگر این عـــیب کـــه لحم عـــلما مســـمومست
شعـــــــــــــر من از همه سو در همه کشور ساری
عـــلم تو در همه جـــابـــر همه کس مـــعـــلومست
میرود شعـــــر من عـــلم جـــهـــان گیر شما
هـــردو بـــیـــفـــائـــده تـــا جـــای اقـــامت رومست
نـــامـــه بـــنویس بهر طـــرز دلت مـــیـــخواهـــد
همه سحـــــراست اگر نثرو اگر مـــــنـــــظومست

ڕۆژی ٦ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٤ کاك چالاك تاڵەبانی ئەم باسەی لای خوارەوەی بۆ گێڕامەوە :

«وێنەکێشێکی بەغدایی دەنگو باوی شێخی بیستبو ، هەر لە دوورەوە شەیدای عەقڵ و زیرەکی بوبو . داوای لە نەوەی کرد هەر تاڵەبانی‌یەك ئەندامێکی دەموچاوی لەو بکات کە هاتە بەغدا بیبەنە لای . پاش ماوەیەك ئەو هونەرمەندە وێنەیەکی جەنابی شێخی دروست‌کرد . کە داپیرەم کتوپڕ چاوی پێی‌کەوت سەری سوڕماو یەکسەر پرسی ئەم وێنەیەی مامە ڕەزاتان لەکوێ بوو ، کتومت خۆیەتی !» .

**چوارەم – دیسان ڕۆژنامەی «کوردستان» :**

چەند دەربارەی «کوردستان»ی ڕۆژنامەی کوردی بنووسرێت هێشتا کەمە ،

---

(٢٣) بڕوانە وێنەی ئەو نامەیە لە لاپەڕە ٣٩٢ی ژمارە یەکی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»ا .
(٢٤) بەداخەوە لە نامەکەدا تەنها ساڵی ناردنی نووسراوە .
(٢٥) شێوەی نووسینەکەی شێخ ڕەزا وەك خۆی هێڵراوەتەوە .

چونکە ئەو ڕۆژنامەیە سەرەتایەکی مێژوویی گرنگ‌و پڕ لە شانازی‌یە لە سەرانسەری ژیانی ڕووناکبیری‌ی گەلی کوردا[٢٦]

وەك ئاشکرایە ڕووناکبیرانی کورد لە دەوروبەری کۆتایی سەدەی نۆزدەمینەوە بە گەرمی تێکەڵی خەباتی نەتەوەیی گەلەکەیان بوون‌و هەر لەو ڕۆژگارەشەوە لە بایەخ‌و نرخی ڕۆژنامەنووسی تێگەیشتن ، بە تایبەتی ئەوانەیان کە لە ئەستەموول ژیابوون ، یـ خوێندبوویان‌و بە چاوی خۆیان دیبوویان ڕۆژنامەنووسی‌ی تورك‌و گەلانی‌تری ئەو دەوڵەتی عوسمانی چ دەورێك لە ژیانی کۆمەڵدا دەبینن[٢٧] . ئەمە نزیك کۆتایی سەدەی ڕابوردوو پاڵی بە خوێندەوارە دووربینەکانی کوردستانەوە[٢٨] نا بکەونە خۆ بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤار بە زمانی زگماکی خۆیان .

جێ‌بەجێ کردنی ئەم ئەرکە پێویستە نە لە ناو خاکی کوردستان خۆی‌و نە لە ئەستەمووڵی پایتەخت بەهۆی ڕژێمی خوێناوی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە (١٨٧٦-١٩٠٩) کارێکی ئاسان نەبوو ، بە تایبەتی لەو ڕۆژگارەدا کە هەر ئەوەندەت دەزانی لە یەکێك لە قوژبنەکانی کوردستاندا ڕاپەڕینێك بەرپا دەبوو . لەبەر ئەوە ڕووناکبیرانی کورد ناچار بوون هەوڵ بدەن لە دەرەوەی نیشتمان ڕۆژنامەیەکی کوردی چاپ بکەن‌و لەوێوە بە دزی‌یەوە بینێرنە کوردستان . باشترین شوێنیش لەو سەردەمەدا بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی لەو بابەتە میسر بوو ، چونکە

---

(٢٦) لەو کتێبەمدا کە بە ناوی «تێگەیشتنی ڕاستی‌و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردیدا» ساڵی ١٩٧٨ بلاوم کردەوە کەڵکم لە بەشێکی ئەم باسەم وەرگرتووە .

(٢٧) یەکەم ڕۆژنامە لە مێژووی تورکیادا ساڵی ١٨٢٥ بە زمانی فەرەنسی لە ئەزمیر چاپ‌کرا ، یەکەم ڕۆژنامەش بە زمانی تورکی بە ناوی «تقویم وقائع»ەوە ساڵی ١٨٣٢ چاپ‌کرا کە ئۆرگانی دەروازەی بالا «الباب العالی» بوو .

حەفتاکانی سەدەی نۆزدەمین ڕۆژنامە نووسی‌ی عوسمانی بە جارێك پەرەی سەند‌و ژمارەی هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو وڵاتە گەیشتە ٤٧ کە سیازدەیان تورکی‌و ئەوانی‌تریان عەرەبی‌و یۆنانی ، یا بە زمانی‌تر بوون .

ژمارەیەك ڕۆژنامەی تورکی‌ی وەك «ترجمان احوال» و «تصویر أفکار»و هی‌تر لە ناو خوێندەوارانی کوردیشدا بلاودەبوونەوە .

(٢٨) بە تایبەتی ڕووناکبیرانی سەر بە بنەماڵەی بەدرخان کە ژمارەیان زۆرو ، پلەی خوێندنیان بەرزو ، توانای ئابووری‌و دەرامەتیان باش بوو .

ئەم وڵاتە لە سەردەمی محەمەد عەلی‌ی گەورەوە (١٨٠٥-١٨٤٩) لە چنگ دەسەڵاتی سوڵتانە عوسمانی‌یەکان رزگاری بوبو. سەرەرای ئەوە ئینگلیزەکان بەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمین بە تەواوی جی‌پێی خۆیان لە میسر قایم کردبوو، حەزیشیان دەکرد ناحەزانی دەوڵەتی عوسمانی لەوێ کۆبینەوە. نابێت ئەوەیش لەبیر بکەین کە رۆژنامەنووسی‌ی میسری‌ی ئەو رۆژگارە دەنگی دابۆوەو ژمارەیەك چاپخانەی گەورە بۆ ئەو کاتە لە قاهیرە کاریان دەکردو ناحەزانی دەروازی باڵای عوسمانی‌و تەختی طاووسی قاجاری لەوێ چاپەمەنی‌ی خۆیانیان دەردەکرد.

هەموو ئەم هۆیانە پاڵیان نا بە بەدرخانی‌یەکانەوە روو بکەنە میسر بە نیازی دەرکردنی رۆژنامەیەکی کوردی‌ی. بەم جۆرە رۆژی پێنج شەممەی ٣٠ی (ذو القعدە)ی ساڵی ١٣١٥ی کۆچی، ٩ی نیسانی ساڵی ١٣١٤ی رۆمی کە دەکاتە ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨ی عیسایی لە شاری قاهیرە یەکەم ژمارەی یەکەم رۆژنامە لە مێژووی گەلی کوردا لە چاپخانەی (الهلال) بە ناوی «کردستان»ەوە لە لایەن میقداد مەدحەت بەدرخانەوە چاپ‌کرا.

شایانی باسە بەپێی ئەو جەدوەلە باوەر پی‌کراوانەی لەبەر دەستدان، بە تایبەتی جەدوەلەکەی ئەکادیمی ئوربیللی[٢٩]، رۆژی ٣٠ی (ذوالقعدە)ی ساڵی ١٣١٥ی کۆچی دەکاتە هەینی، نەك پێنج شەممە وەك لە دوو شوێندا لەسەر ژمارە یەکی «کوردستان» چاپ کراوە. بەپێی هەمان جەدوەل رۆژی ٣٠ی (ذوالقعدە)ی ساڵی ١٣١٥ی کۆچی دەکاتە ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨ی عیسایی. لەبەر ئەوەش کە لە راستی‌ی گۆرینەکەی ئوربیللی دڵنیاین[٣٠]، بە تایبەتی چونکە لەو هەڵەکەمانەدا کە پرۆفیسۆر تسیبولسکی لەو جەدوەلەی گرتوون باسی نە ساڵی ١٣١٥و نە ساڵی ١٣١٦یان تێدا نی‌یە[٣١]، ناچار بووین بکەوینە سۆراخی ئەوەی ئایا ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨ی عیسایی دەکاتە رۆژی پێنج شەممە یا هەینی. دوای لێکۆڵینەوەیەکی

---

(٢٩) ساڵی ١٩٦١ لە مۆسکۆ چاپ‌کراوە.

(٣٠) بروانە ل ٢٦٩ی جەدوەلەکە.

(٣١) بروانە گۆڤاری «گەلانی ئاسیاو ئەفەریقا»، بە زمانی رووسی، مۆسکۆ، ژمارە ٣ی ساڵی ١٩٦٢، ل ٢٤٥.

ورد دەرکەوت ئەو ڕۆژە دەق پێنج شەممەیە . کەوابێت ئەبێت هەڵە لە دیارکردنی سەرەتاو کۆتایی مانگە هیجری یەکانی ئەو ساڵە خۆیدا کرابێت ، کە ئەوەش ڕێی تێ دەچێت ، چونکە ، وەك ئاشکرایە ، دیارکردنی سەرەتاو کۆتایی مانگەکانی ساڵنامەی هیجری لەسەر بینینی مانگ وەستاوەو زۆر جار هەڵەی تێدا دەکرێت . کەواتە ئەو ڕۆژی (٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨)ەی لە میسر بە ٣٠ی (ذوالقعدە) دانراوە وا دیارە لە ڕاستیدا ٢٩ بووە . هەمان هەڵەش لە ژمارە سیّ و پێنجی «کوردستان»دا ڕووی داوە ، زۆر لەوانەیە ٢٨ی (ذو الحجە)ی یەکەمیان ٢٧و ٢٧ی (محرم)ی دووەمیان ٢٦ بووبن .

ڕۆژنامەی سەربەرزو تاقانەی «کوردستان» ماوەی چەند ساڵێك بە ئاوارەیی ژیاو هەر ڕۆژەی لە شارێك چاپ دەکرا ، ژمارەیەکی لە جنێڤی پایتەختی سویسرەو ، هەندێکی لە لەندەن و ، بەشێکی تری لە شاری فولکستۆن کە کەوتۆتە باشووری بەریتانیاوە ، چاپکراون . دوای شەڕی یەکەمی جیهانیش «کوردستان» بووە ناوی گۆڤارێکی نوێ کە لە ئەستەمۆل چاپ دەکرا[٣٢] .

بەشێك لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی «کوردستان» لە کتێبخانە گەورەکانی دەرەوە پارێزراون . ژمارە یەکی لە کتێبخانەی لقی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ی سۆڤێت لە لێنینگراد هەیە . ژمارە یەك تا سییەکی ، تەنها ژمارە دەو دوازدەو حەڤدەو هەژدەو نۆزدەی نەبێت ، لە کتێبخانەی ماربۆرگی ئەڵەمانیای ڕۆژئاوا پارێزراون[٣٣] . ١٨ ژمارەش لەوانەی ساڵی ١٨٩٩ چاپ کراون لە کتێبخانەی نیشتمانی ی ئەنقەرە هەڵگیراون[٣٤] .

---

(٣٢) ئەمیان تەنها لە ڕووی ناوەوە نەبێت ئیتر هیچ پێوەندی یەکی بە «کوردستانی» یەکەم ڕۆژنامەی کوردی یەوە نی یە . لەوەدا مامۆستایان ئەمین زەکی و محمد علی عونی بە هەڵەدا چوون (بڕوانە : محمد أمين زكي ، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان ، القاهرة ، ١٩٣٦ ، ص ٣٧٠) .

(٣٣) «کوردستان – یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ – ١٩٠٢» ، کۆکردنەوەو پێشەکی ی دوکتۆر کەمال فوئاد . بەغدا . ١٩٧٢ . «ڕووناکی» (گۆڤار) ، بەغدا ، ژمارە ١٨٠ ، ٢٣ی مایسی ١٩٦٩ ، ل ٤ .

(٣٤) بڕوانە :

(Eski harfli Turkce sureli yayinlar toplu Katalogu)., Ankara, 1963.

سالّی ١٩٧٢ له دیمەشق له ڕێگەی ڕەوشەن بەدرخانەوە ژمارە پێنجی «کوردستان»و لاپەڕە سیّو چواری ژمارە سێیم دەست‌کەوت‌و لەگەلّ وێنەی ژمارە یەکیدا پێشکەشی کتێبخانەی «کوڕی ڕزانیاری کورد»م کردن .

له ژێر ناوی ژمارە یەکی ڕۆژنامەی «کوردستان»دا ئەم ڕستە تورکی‌یە نووسراوە : «کردلری ایقاظ و تحصیل صنایعه تشویق ایچون شمدیلك . اون بش گونده بر نشر اولنور کردجه غزتەدر» . بەلاّم له ژێر ناوی ژمارە پێنجیدا بە کوردی نووسراوە : «پازده روژا ده جارکی تیت نفیساندن جریدەیا کردی‌یە»[٣٥] .

جێگەی شانازی‌یە بۆ مێژووی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی کە لە سەرەوەی لای ڕاستی یەکەم ژمارەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ئەم بڕیارە پڕبەهاو مانەیە تۆمار کراوە :

«هر جار دو هزار جریندەیا بی پره ازی ریکم کردستانی دەبدەن خەلکی»[٣٦] .

زۆربەی هەرە زۆری ژمارە یەکی «کوردستان» بۆ باسی نرخ‌و بایەخی خوێندن‌و خوێندەواری تەرخان کراوەو هەموو دێڕێکی پاڕانەوەی دلّسۆزانەیە بۆ ئەوەی گەلی کوردیش وەك گەلانی‌تر دەست بداتە خوێندن . بۆ بزواندنی هەستی خەلّکی لەم بارەیەوە گەلێك فەرمایشتی پێغەمبەری موسلّمانانی دەربارەی پێویستی فێربوون‌و خوێندن هێناوەتەوە ، جگە له چەند نمونەیەکی بەجێ سەبارەت بەوەی چۆن بە یاریدەی زانست ژاپۆن بەسەر چین‌و ، میسر بەسەر سوداندا زالّ بوون .

ژمارە پێنجی «کوردستان» کە لە کتێبخانەی کۆڕ پارێزراوە ڕۆژی پێنج شەممەی ٢٧ی (محرم)ی[٣٧] سالّی ١٣١٦ کە دەکاتە ١٨ی حوزەیرانی سالّی ١٨٩٨ چاپ کراوە . بەم جۆرە میقداد مەدحەت بەدرخان له ماوەی نزیکەی دوو مانگدا پێنج ژمارەی «کوردستان»ی له قاهیرە چاپ کردووە .

---

(٣٥) وەرگیراوەکان له «کوردستان» بێ دەستکاری‌کردنی ڕێنووسیان لەم وتارەدا بلاّوکراونەتەوە .

(٣٦) له ژمارە چواری «کوردستان»ەوە کەمێك دەستکاری ئەو ڕستەیە کراوەو وەهای لێهاتووە : «هر جار دو هزار جریدەیا ازی ریکم کردستانی ده بلاش بدەن خلکی» .

(٣٧) وەك له شوێنی خۆیدا گوتمان لەوانەیە ئەو ٢٧ی موحەڕەمە له ڕاستیدا ٢٦ بوبێت .

ژمارە پێنجی ڕۆژنامەی «کوردستان» لەسەر کاغەزێکی ڕەنگ سەوزی تەنك چاپکراوە . درێژی ئەم ژمارەیە ، لەگەڵ ئەو پەڕەیەی ژمارە سێ کە لەبەر دەستماندایە ٣٣٫٨و پانی ٢٦ سانتیمە . سەروتاری ژمارە پێنج نامەیەکی کراوەیە بە تورکی بۆ سوڵتان عەبدولحەمید بەم ناوەوە : «شوکتلو عظمتلو سلطان عبدالحمید خان ثانی حضرتلرینە» واتە «بۆ سوڵتان عەبدولحەمید خانی دووەمی خاوەن شکۆو پایە» . کۆتایی نامەکە ، کە سەرانسەری لاپەڕەی یەکەمو دووەمی گرتۆتەوە ، بە ئیمزای «بدرخان پاشا زادە مقداد مدحت قوللری»ی هاتووە . میقداد مەدحەت بەگ لەم نامەیەدا ، کە دووەم نامەیەتی لە ڕێگەی «کوردستان»ەوە ئاراستەی سوڵتانی بکات ، بە شێوازێکی زۆر لەسەر خۆ ئامانجەکانی ڕۆژنامەی «کوردستان»ی خستۆتە بەر چاوو داوای لێکردووە ڕێگەی بلاوبوونەوەی بدات . هەر بەم بۆنەیەوە لە لاپەڕە سێی هەمان ژمارەدا پێشنیاری بۆ زاناو میرو ئاغایانی کورد کردووە بە بروسکە داوا لە سوڵتان عەبدولحەمید بکەن ڕێگە بدات «کوردستان» بە ئاشکرا بنێردرێتە خاکی نیشتمان . ئەمەش بێ گومان دەچێتە خانەی خەباتی ڕووناکبیرانی کوردی ئەو ڕۆژگارەوەو شێوەو ڕێبازی ئەو خەباتە نیشان دەدات .

شایانی باسە لە کۆتایی ژمارە یەکەوە تا ژمارە سێی «کوردستان» نووسراوە «المصری مطبعة (الهلال)دە طبع بیە» ، کەچی لە کۆتایی ژمارە چوارو پێنجیدا نووسراوە «لمصری جریدەیا کردستانی طبع بیە»و لە کۆتایی ژمارە شەشەوە نووسراوە «مطبعا جمعیتا تفاق و قنجیا مسلمانا طبع بیە»و لە کۆتایی ژمارە بیستیشدا نووسراوە «لمصری مطبعا جریدەیا کردستانی طبع بیە»و لە کۆتایی ژمارە بیستودوویدا بە تورکی نووسراوە «هندیە مطبعە سندە طبع اولنمشدر»و لە کۆتایی ژمارە بیستو هەشتییەوە تا کۆتایی ژمارە سیویەکی بە تورکی نووسراوە «إنتقام مطبعە سندە طبع اولونمشدر» . بێ گومان ئەم هەموو چاپخانەو جێگۆڕییەش نیشانەیەکی تری ئاوارەیی «کوردستان»ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیو باری یەکجار قورسی سەر شانی ڕووناکبیرانی ئەو قۆناغەی کوردن .

دیارە دەرچونی یەکەم ڕۆژنامە لە مێژووی گەلی کوردا هەنگاوێکی گەورەو سەرتایەکی بایەخدار بوو . دەرچونی «کوردستان» بایەخی سیاسیو زانستیی

هەبوو . هیچ دوور نەڕۆین ئەگەر ئەم ڕۆژنامەیە نەبوایە لەوانە بو تاوەکو ئەمڕۆکەش ساڵی وەفاتی شاعیری گەورەی کورد حاجی قادری کۆییان نەزانیایە . بەهۆی «کوردستان»ەوە بەوە زانرا کە زۆربەی نووسەرانمان لە دیار کردنی ساڵی کۆچی دوایی حاجی قادردا بە هەڵەدا چوون . مامۆستا ئەورەحمان سەعید ساڵی ١٣١٢ی کۆچی بۆ داناوە کە دەکاتە (١٨٩٤ – ١٨٩٥)ی عیسایی[٣٨] . مامۆستایان عەلائەدین سەجادیو گیو موکریانیو محەممەدی مەلا کەریم ساڵی ١٨٩٢یان بۆ داناوە[٣٩] . دوکتۆر مارف خەزنەدارو دوکتۆر ئیحسان فوئادیش وەك ئەدمۆنس ساڵی ١٨٩٤یان بۆ وەفاتی حاجی داناوە[٤٠] . مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە «شیعرو ئەدەبیات»ەکەیدا تەنها باسی ساڵی لە دایك بوونی حاجی ی کردووە[٤١] . هەرچی مامۆستا ئەمین زەکیشە ساڵی ١٣١٤ی کۆچی داناوە کە ١٨٩٦ – ١٨٩٧ی عیسایی دەگرێتەوە[٤٢] . هەرەگوڵ ئاز یزان کە نازناوی جەلادەت بەدرخانە ساڵی ١٣١٢ی کۆچی داناوە کە ١٨٩٤ – ١٨٩٥ی عیسایی دەگرێتەوە[٤٣] .

دوای ئەم هەموو جیاوازییە گۆڤاری «ڕووناکی» ساڵی ١٩٦٩ لە وتارێکیدا کە

---

(٣٨) «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی» . چاپو بلاوکەر عبدالرحمن سعید ، بغداد ، ١٩٢٥ ، ل ٦ .

(٣٩) بڕوانە

علاءالدین سجادی . سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٠٩ ، ٣١٢ . چاپی دووەم ل ٣٤١ ، ٣٤٣ ، «دیوانی حاجی قادری کۆیی» ، هەولێر ، ١٩٦٩ ، ل ٥ . محمدی مەلاکریم ، حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد . بەغدا ، بێ ، ل ٩ .

(٤٠) بڕوانە :

دوکتۆر مارف خەزنەدار ، سەرچاوەی ناوبراو . ل ٤٠ ، دوکتۆر ئیحسان فوئاد ، هونەرمەندیی حاجی قادری کۆییو شوێنی لە وێژەی کوردیدا ، کورتەی نامەی دوکتۆراکەی ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٩ ،

C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, P. 58

(٤١) ڕەفیق حیلمی ، شیعرو ادبیاتی کوردی ، بەغدا ، ١٩٤١ ، ل ٩٩ – ١١٨ .

(٤٢) محمد امین زکی ، مشاهیر الکرد وکردستان ، الجزء الثاني ، ص ١١٠ .

(٤٣) بڕوانە :

(Hawar), Sham, Sal 9 , Hejmar 33, 1941, L. 13

بێ ناوی نووسەرەکەی بڵاوکراوەتەوە بە یاریدەی ڕۆژنامەی «کوردستان» ساڵی کۆچی دوایی حاجی قادری کۆیی بە دروستی داناوە(٤٤) . وا پێ‌دەچێت ئەو وتارە هی دوکتۆر کەمال فوئاد بێت .

«کوردستان» لە لاپەڕە سێی ژمارە سێیدا وەك هەواڵ ساڵی کۆچی دوایی حاجی قادری کۆیی بەم جۆرەی لای خوارەوە بڵاوکردۆتەوە :

«عالملك ژ سوار هی سالا دی وفات‌کر رحمتا خدی لیه گنهین وی بغفرینه ناڤ وی حاجی عبدالقادر بی اف مروف صاغیا خوەوە گلك خیتی درحقا علماندنا علمو معرفتیره گلك بیت‌و اشعارین کرمانجی دنفیسی ریدکر ولات خوە سورا عزمان سورایه لوماکرد حمی ڤی عزمانی نظانن . پشتا کتیبا مەو زینیده بخط دست خوە هن بیت نفیسینه تبرکاً من او ابیات لێ جریدەییدە بنفیسین وکی بدقت بی خوندن معن وان خوش تیت فهم‌کرن»(٤٥) .

دوا بەدوای ئەم قسانە «کوردستان» ئەو بەیتانەی چاپ‌کردووە کە حاجی قادر بە خەتی پیرۆزی لەسەر بەرگی پشتەوەی دیوانێکی «مەم‌و زین»ی خانی نووسیونی‌و بەیتی یەکەمیان دەڵێت :

زەمـــانـــە ڕەسمی جـــارانی نـــەمـــاوە چـــرای نـــاظـــم‌و مـــنشی کوژاوە

دوا بەیتیشیان دەڵێت :

لـــە کـوردان غـــەیـــری حـــاجی‌و شێخی خـــانی
ئـــەساسی نـــظـــمی کوردی‌ی دانـــەنـــاوە

وا دیارە ژمارەکانی «کوردستان» زوو بە زوو گەیشتوونەتە دەست زۆر کەس‌و لە هەموو لایەك هەستی خەڵکەکەی بزواندووەو چاوی ڕوون کردوونەتەوە . هەر لەم ژمارەیەشدا نامەیەکی تێدایە کە (ن . ح .) ناوێك لە شامەوە ناردوویە بۆ میقداد مەدحەت بەدرخان‌و بە ئەوپەڕی بەختیاری‌یەوە باسی گرنگی‌و بایەخی«کوردستان»ی کردووەو بەم جۆرە هەستی خۆی بەرامبەر خاوەنەکەی دەربڕیوە :

« . . رحمت لباب ته بت خدی دولتا ته مظن بکت او عدل‌و کرما باب ته

---

(٤٤) «ڕووناکی» . هەبێ . ٢٣ی مایسی ١٩٦٩ . ل ٤١ .

(٤٥) دەق قسەکانی «کوردستان»ە بێ دەستکاری‌ی شێوازو ڕێنوسی .

کری نهو ژی دبت سببا رحمتی او جریده ته سر قنجیا کردا دریخستی اڤ ژی نیزك وی‌یه زمانی قنجی هوقاس دبت . . .» .

هەر دوا بەدوای ئەم نامەیە هەڵبەستی لاوێکی کوردی شام بە ناوی شێخ أ . فەتاحەوە بڵاوکراوەتەوە کە ئەمیش بە ئاشکرا نیشانی دەدات ڕۆژنامەی «کوردستان» چ دەنگێکی لە ناو کوردا داوەتەوە . لە ژمارەکانی تریشدا گەلێك نمونەی لەو جۆرە بەر چاو دەکەون .

هیچ گومانێك لەوەدا نی‌یە کە ڕۆژنامەی «کوردستان» چرایەکی پرشنگداری نوێ بوو لە ئاسۆی ژیانی ڕووناکبیری‌ی کوردا هەڵکرا . ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونوس‌و نووسەرانی خۆو بێگانە ئەم ڕاستی‌یەیان تۆمار کردووە . دوکتۆر شاکیر خەصباك‌و دوکتۆر بلەچ شێرکوە «کوردستان»یان بە سەرەتای گۆڕین لە ژیانی کوردا داناوە[٤٦] . دیارە هەر ئەم هۆیانەش مەترسی‌یان خستە ناو دڵی کاربەدەستانی تورکیاوەو وای لی‌کردن هەر لە سەرەتاوە بڵاوبوونەوەی «کوردستان» لە ناو وڵاتی عوسمانیدا قەدەغە بکەن ، ئەو ڕاستی‌یەی لە ناوەرۆکی ڕۆژنامەکە خۆیەوە بە ڕوونی دیارە . «دەروازەی باڵا» بەوەشەوە نەوەستا ، بەو نامەیەی میقداد مەدحەت بەدرخاندا کە بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی ناردووەو وەك سەروتار لە ژمارە پێنجی «کوردستان»دا بڵاوی کردۆتەوە ئاشکرا دیارە چۆن پیاوانی سوڵتان کەوتوونەتە بیانووگرتن‌و شەڕ فرۆشتن بە خاوەنی ڕۆژنامەی «کوردستان» ، بە ڕادەیەك داوایان لە کاربەدەستانی میسر کردووە ئەو نیشتمانپەروەرەی کورد وەك «تاوانبارێك» بینێرنەوە ئەستەموول . وا دیارە ئەو فشارە زۆرەی چەتەوڵەکانی سوڵتان میقداد مەدحەت بەدرخانی ناچارکرد لە دوای ژمارە پێنجی‌یەوە ئیتر دەست لە دەرکردنی «کوردستان» هەڵبگرێت‌و بەدرخانی‌یەکان ناچار بوون ڕۆژنامەکە بگوێزنەوە شاری جنێڤ‌و لێرە بەدواوە عەبدوڕڕەحمان بەدرخانی برای میقداد مەدحەت[٤٧] چاپ‌کردنی گرتە ئەستۆی خۆی .

---

(٤٦) بروانە :

الدکتور شاکر خصباك ، الکرد والمسألة الکردیة ، بغداد ، ١٩٥٩ ، ص ٢٩ ، الدکتور بلەچ شیرکوە . القضیة الکردیة . ماضي الکرد وحاضرهم ، القاهرة ، ١٩٣٠ ، ص ٥١ .

(٤٧) میقداد مەدحەت ناوێکی لێکدراوی وەك ئیسماعیل حەقی‌و مستەفا کەمال‌وگەلێکی‌ترە کە بەپێی دەستووری ئەو ڕۆژگارە لە وڵاتی عوسمانیدا باو بووە .

بەم جۆرە لە ڕێگەی «کوردستا»ەوە دەتوانرێت گەلێك لایەنی بایەخداری ویژەو مێژووی نوێی گەلی کورد ڕوون بکرێتەوە . «کوردستان» لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازیی گەلی کوردو سامانێکی بەهاداری‌یەتی .

**پێنجەم – مۆرو ئۆرگانی «کۆمەڵەی کوردستان» :**

لە سەرەتای سەدەی بیستەوەو بە تایبەتی دوا بە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ساڵی ۱۹۰۸ی تورکە لاوەکان کە تەختو تاراجی سوڵتان عەبدولحەمیدی زۆرداری نە بندا هەڵتەکاند ، ڕوونا کبیرانی کورد لە ئەستەموڵو دیاربەکر کەوتنە دامەزراندنی کۆمەڵو ڕێکخراوی سەربەخۆی وەك «کردستان جمعیتی»و «کورد تعمیم معارف و نشریات جمعیتی» و «کردستان تعالی جمعیتی» و «کورد قادینلری تعالی جمعیتی» و هی‌تر . لەو کاتەدا تەنانەت ئافرەتی کوردیش کەوتە خۆو دەستەیەکی پێشڕەویان «کۆمەڵی بەرزی ئافرەتانی کورد»یان دامەزراند(۴۸) . ئەم ڕێکخراوانە دەورێکی بالآیان لە بزوتنەوەی نەتەوەیی‌و ژیانی ڕووناکبیری‌ی گەلی کوردا بینی .

لە کوردستانی عیراق تا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهان هیچ کۆمەڵو ڕێکخراوێك دروست نەبوو . لەوساوە ، وەك ئاشکرایە ، گەلی کورد هاتە کۆڕی خەباتێکی سەختو درێژخایەنەوە دژی ئینگلیزی داگیرکەرو لە مەیانی ئەم خەباتەدا بەشێك نە ڕووناکبیرانی ئەم بەشەی کوردستان کەوتنە ئەوەی لە بایەخی کۆمەڵو ڕێکخراوو جێگەیان لە ژیانی گەلدا تێبگەن . بەم جۆرە لە بیستەکانەوە لێرەش دەستکرا بە دامەزراندنی چەند کۆمەڵو ڕێکخراوێك . مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەم بارەیەوە نووسیوی‌یە دەڵێت :

«لاوە نیشتمانپەروەرەکانی کورد . . . هەر ڕۆژە کۆمەڵێکیان دائەمەزراند»(۴۹) .

کۆمەڵە سیاسی‌یەکانی کوردستانی عیراق ئەو ڕۆژگارە کەڵکی زۆریان لە تاقی‌کردنەوەکانی کۆمەڵو ڕێکخراوە سیاسی‌یەکانی کوردستانی تورکیا وەرگرت ، بە تایبەتی چونکە بەشێك لە دامەزرێنەرانو ئەندامە چالاکەکانیان بەر لە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهان لە ئەستەموڵ خوێندبوویانو کاریان کردبوو .

---

(۴۸) «کورد قادینلری جمعیتی» .

(۴۹) بروانە :

رفیق حلمی : یادداشت ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ۱۹۵٦ ، ل ۲۸ .

یەکێك لەو کۆمەڵانەی سەرەتای بیستەکان لە کوردستانی عیراق دامەزرێنرا «جەمعیەتی کوردستان» بوو . ئەم کۆمەڵە یەکەم رێکخراوی ئاشکرا بوو لە مێژووی کوردستانی عیراقدا کە کاربەدەستانی ئینگلیز لەبەر گەلێك هۆ ناچار بوون رێگەی کارکردنی پیٚ بدەن .

«جەمعیەتی کوردستان» رۆژی هەینیی ۲۱ی تەممووزی ساڵی ۱۹۲۲ لە کۆبونەوەیەکی گەورەدا لە مزگەوتی سەید حەسەنی موفتی لە شاری سلێمانی بە سەرۆکایەتی مستەفا پاشا یامولکی دامەزرێنراو لە رێگەی دەنگدانی نهێنییەوە مامۆستایان رەفیق حیلمیو ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگو صالح قەفتانو فایق بەگی مارف بەگو حاجی ئاغای فەتحوڵلاو عیزەت بەگی عوسمان پاشاو ئەدهەم ئەفەندیو ئەحمەد بەهجەتو شێخ محەمەدی گولانیو شێخ عەلی‌ی سەرکارو عەلی‌ی باپیر ئاغاو عەبدوڵلا ئەفەندی‌ی محەمەد ئەفەندیو شوکری عەلەکە بۆ بەرێوە بردنی کۆمەڵەو ئۆرگانی کۆمەڵە هەڵبژێردران[٥٠] .

«جەمعیەتی کوردستان» مۆری تایبەتی‌ی خۆی هەبوو کە ناوی بەم جۆرە لە سەر هەڵکەندراوە : «جمعیت کردستان» . لەسەروو ناوەکەشی‌یەوە وێنەی رۆژ هەڵکەندراوە[٥١] . ئەم مۆرە لە لایەن خوالێخۆشبوو عەبدولعەزیز یامولکی‌ی کوری مستەفا پاشاوە پارێزراوە .

هەمان کات رێگە بە «جەمعیەتی کوردستان» درا ئۆرگانێکی حەفتانە بە ناوی «بانگی کوردستان»ەوە[٥٢] دەربکات کە یەکەمین ژمارەی رۆژی چوار شەممەی ۸ی (ذوالحجە)ی ۱۳٤٠ی کۆچی ، ۲ی ئابی ساڵی ۱۹۲۲ی عیسایی لە سلێمانی

---

(٥٠) بروانە :

«بانك كردستان» ، سلێمانی ، ژمارە یەك ، دووی ئاغستۆسی ۱۹۲۲ ، ل ۱-۲ .

شایانی باسە مامۆستا رەفیق حیلمی لە یادداشتەکانیدا تەنها ناوی حەوت لەو ئەندامە هەڵبژێرراوانەی نووسیوە (رفیق حلمي . یادداشت . جزمی پێنجەم ، بەغدا ، ۱۹٥۷ ، ل ٤٨٦ ٤٨٧) .

(٥١) بروانە وێنەی ئەو مۆرەی «جەمعیەتی کوردستان» لە لاپەرە ٤١٤ی ژمارە یەکی «گۆڤاری کۆری زانیاری کورد»ا .

(٥٢) «بانك كردستان» .

چاپ‌کراوە . لە لای سەرەوەی یەکەم ژمارەی «بانگی کوردستان» نووسراوە :

«صاحب امتیازو مدیر مسئول مصطفی پاشا ، محرر کوردی‌و فارسی علی‌کمال‌و م.نوری ، محرر تورکی رفیق حلمی» .

لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەشدا ئەمە نووسراوە :

«زمـــان گورزو رابوردو ایســتـــا پـــالوان عــلـــمــه
سلاح دستــه صــنــعت بــارقـۀ تـیـغ‌و سنـان عـلـمـه

علمی ، اجتماعي ، ادبی ، غزته‌یه‌کی حرو سربست ملی‌یه ، هفتۀ جاریك دردچی» (٥٣) .

هەموو لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی‌ی جێگەی شانازین . تەنانەت زۆر دەگمەن هەڵدەکەوێت ڕۆژنامەیەك ، یا گۆڤارێکی کوردی‌ی ، بەوانەشیانەوە کە بۆ مەبەستی تایبەتی‌ی دەرکراون ، دەورێکی کۆنەپەرستانەی دیبێت . وەك بەڵگە لێرەدا بێ دەستکاری‌ی نمونەیەکی پچوك لە «بانگی کوردستان»ەوە دەهێنینەوە . لەسەر لاپەڕە سێی ئەو ڕۆژنامەیە ئەمە نووسراوە :

«مصرف چاپ‌کردن‌و سایرەء اول نسخۀ ام غزته‌یه له طرف اعضایان دائمی جمعیت کردستانەوە تأمین کراو و ام اول نسخه‌یه‌ی تبرکا ومجانا توزیع و تقدیم بردران وطن دکری» .

لە هەمان ژمارەشدا بە ناوی «صاحب امتیاز میر لوا مصطفی»وە ئەمە بلاوکراوەتەوە ، کە لەبەر بایەخی بە دەستکاری‌ی شێوازی نووسینەکەیەوە دەیخەینە بەر چاوی خوێندەوان :

«السلام علیکم ئەی کوردان ، ئەی قەومی قەدیمی پەهلەوی ، گوێ بگرن لە «بانگی کوردستان» . ئەم بانگە بۆ خەبەرداری‌ی هەموو کوردانە ، بۆ هوشیاری‌ی شێرانە . بۆ بیستنی باوك‌و دایکانە . گوێ بگرن ئەم بانگە چیی تێدایە ، ئەم هاوارە بۆچی‌یە . قسەی پڕوپوچی کۆلانان . درۆ هەڵبەستنی ڕێگاوان بەسی‌یە ، تەماشای عالەم بکەن لە صنعەت‌و مەعریفەتدا لە ئێمە پاشکەوتوتر کێ هەیە ؟ ، کالایەکان نی‌یە بۆ سەتری عەورەتمان کافی بێ ، دەرزی‌و دەزویەکان نی‌یە کە دەستکردی

(٥٣) دەستکاری‌ی شێوازی ڕێنووسەکەی نەکراوە .

ولاتمان بێ ، نیشانەی عەزەمەتو خانەدانیش کە ئیستە عیبارەتە لە شەکرو چا ، ئەوانەیش هی کوردستان نین ، لە جێگایانی دوور دێتن . پارچە کاغەزێك کە بۆ نوشتەی چەورو شیرین بێ ئەویش لە فرەنکستانەوە[٥٤] دێت ، لە صەدا چوارمان تێدا نی‌یە کە کاغەزێك بۆ کەسوکاریو سرێکی مەحرەمانە بۆ عائیلەی خۆی بنووسێ . مشکیو مێزەرمان لە ئێرانو فرنکستانو گوروونی گولێ حۆقەیمان لە هندوستانو عەبای گەورە گەورەی نازدارانمان لە عەرەبستانو کفنی مردوانمان لە ئەوروپاو مەلۆتکەی مندالانمان لە ئەمەریکاوە بۆ دێت» .

ژمارەکانی «بانگی کوردستان» پڕیانە لە هەوالو باسو وتاری گرنگ کە ، بێ‌گومان ، کەرەستەیەکی بەنرخن بۆ ڕوون کردنەوەی گەلێك لایەنی مێژووی نوێو هاوچەرخی نەتەوەی کورد[٥٥] .

«بانگی کوردستان» لە سلێمانی چواردە ژمارەی لێ‌دەرچوو کە هەموویان ، وەك لە دوا لاپەڕەی ڕۆژنامەکە خۆیدا نووسراوە ، «لە چاپخانەی حکومەت لە سلێمانی» چاپ‌کراون .

ڕۆژی دەرچونی ژمارە چواردەی «بانگی کوردستان» ٨ی حوزەیرانی سالی ١٩٢٣یە ، بارستی هەموو ژمارەکانیشی ٢ر٢١×٣٤ سانتیمەو ژمارە چواردەی نەبێت کە چوار لاپەڕەیە هەموو ژمارەکانی‌تری شەش لاپەڕەیین .

شایانی باسە مستەفا پاشا یامولکی سەرەتای سالی ١٩٢٦ هەر بە ناوی «بانگی کوردستان»ەوە سێ ژمارەی‌تری دەرکرد کە لەسەریان نووسراوە (١٤-١ ، ١٤-٢ ، ١٤-٣) . ئەمیان مستەفا شەوقی نووسەرو کەریم ڕۆستەم کارگێڕی بوون .

---

(٥٤) «فرنکستان» واتە ولاتی فەرەنکان . لە ناوی ئەو دەستە هۆزە ئەوروپایی‌یە دێرینەوە هاتووە کە بە لاتینی (Franci) و بە فەرەنسی (Francs) یان پێ دەلێن . ئەو هۆزانە لە کۆنەوە خاوەن دەسەلاتو دەولەت بوون . لە زمانە ڕۆژهەلاتی‌یەکاندا بۆتە ئەفرەنجیو زۆر جار لە بریتی ئەوروپایی بەکار هێنراوەو وەك زاراو لە ناو چینو دەستەکانی سەرەوەی کۆمەلدا باوبوو . تا ئەم دوایانەش بەکاز دەهێنرا . وا دیارە لە ڕێگەی زمانی تورکی‌یەوە تێکەلێ بە کوردی‌ی خۆمان بووە .

(٥٥) کاك جەمال خەزنەدار کارێکی چاکی کرد کە وێنەی ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی بلاوکردەوەو بەو جۆرە بووە سەرچاوەیەکی بەردەستی خۆو بێگانە (بڕوانە : «بانگی کوردستان» ، کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ١٩٧٤) .

## شەشەم – یەکەم گۆڤاری منداڵان بە کوردی :

تەمەنی تاقە ساڵانەی «کۆماری مەهاباد» ، کە ڕۆژی ٢٢ی کانونی دووەمی ١٩٤٦ دامەزراو کانونی یەکەمی هەمان ساڵ ڕوخا ، بووە ڕۆژی گەشە کردنو برەوی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی‌ی . لەو ماوە کەمەدا بە پێوانەی کوردستان ژمارەیەکی یەکجار زۆر ڕۆژنامەو گۆڤار بە زمانی کوردی چاپ کرا ، وەك «کوردستان» و «هەڵاڵە»و «هاوار» و «هاواری نیشتمان» و «هاواری کورد»و هی‌تر . هەر لەو ڕۆژانەشدا یەکەم گۆڤاری منداڵان لە مێژووی گەلی کوردا بە ناوی «گڕوگاڵی منداڵانی کورد»ەوە چاپکرا .

«گڕوگاڵی منداڵانی کورد» لە «چاپخانەی کوردستان»ی شاری مەهاباد چاپ دەکراو لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا نووسراوە : «بیری کارگەرانی چاپخانەی کوردستان»ە . دەوروبەری کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩٤٦ ژمارەی یەکەمی لێ دەرچو . ژمارەی دووەمی ڕۆژی یەکی جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٥ ، ٢١ی مایسی ١٩٤٦و ژمارە سێی ڕۆژی یەکی پوشپەڕی ١٣٢٥ ، ٢١ی حوزەیرانی ١٩٤٦ دەرچوون . وا دیارە هەر ئەو سێ ژمارەیەشی لێ چاپکراوە[٥٦] .

بارستی ژمارە دوو و سێی «گڕوگاڵی منداڵانی کورد» (٥ر٢٢ ×١٥) سانتیمە . قادری مودەڕیسی سەرپەرشتی بڵاوکردنەوەی دەکرد . لە هەردووك ئەو دوو ژمارەیەدا چەند دەرسێکی زمانو جوگرافیاو باسی‌تریان تێدا بڵاوکراونەوە . بەرگی ژمارە سێی «گڕوگاڵی منداڵانی کورد» بە وێنەی صەلاحەددینی ئەیوبی ڕازێنراوەتەوە .

---

(٥٦) ژمارە ٢و ٣ی «گڕوگاڵی منداڵانی کورد» لای خۆم هەن ، هەر کەسێك بیەوێت دەتوانێت کەڵکیان لێ وەربگرێت . هەروەها وێنەیان لە کتێبخانەی کۆڕ هەیە .

ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی ئاوێنەی بێ‌غەل‌و غەشی لاپەڕەی پڕ بەسەرهاتی مێژووی گەلەکەمانە (٭) . شەونخونی‌و هەوڵ‌و تەقەلای بێ‌وچانی سەربازە ونەکانی ئەم مەیدانە گرنگەی ژیانی ڕوناکبیریمان شایانی نرخاندنی بەرزو لێکۆڵینەوەی وردە . بەداخەوە کەسمان کاتی خۆی نەکەوتینە عەودالی یادداشتی ئەو نەمرانەی بناخەی مێژووی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی‌یان دارشت ، بۆیەکا نهێنی‌و داستانی دانسقەی زۆرمان لەکیس‌چوو ، لەگەڵ پیرەمێردو حسەین حوزنی موکریانی‌و صالح قەفتان‌و زۆر ڕۆڵەی‌تری بەوەفای گەلەکەماندا بە داخەوە چوونە ژێر گڵەوە . ئەمیشیان ، وەك زۆر شتی‌ترمان ، دەبو وابێت ! ! .

لە دانیشتنێکدا مامۆستا ئەحمەد خواجام گێڕایەوە دەورووبەری ٦٠ ساڵ لەمەوبەر . کەوتینە باسی یەکەم چاپخانەی کوردی‌ی کە ئینگلیزەکان لە سلێمانی دایانمەزراند . هەندێك ڕاستی‌ی نەزانراوو بەنرخی نوێم دەسکەوت کە شایانی تۆمارن .

دوای دامرکاندنەوەی قۆناغی یەکەمی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحموود (کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩١٩) ئینگلیزەکان مێجەر سۆنیان کردە حاکمی سیاسی‌ی هەرێمی سلێمانی بەو نیازەی زیاتر چاوی خەڵکەکەی پێ بترسێنن‌و زیرەکانەش دڵیان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن . سۆن بۆ ئەم فەرمانە لە هەموو ئینگلیزەکانی ئەو سەردەمە زیاتر دەستی دەدا . کوردی‌یەکی باشی دەزانی‌و چاك شارەزای کون‌و کەلەبەری ئەو بەشەی کوردستان بوو ، وەك هەموو داگیرکەرێك ژەهرو شەکری تێکەڵ دەکرد .

(٭) لە «ڕۆشنبیری نوێ» ، ژمارە ٧٧ ، تشرینی یەکەمی ١٩٧٩ ، ل ٣١ -٣٤دا بڵاوکراوەتەوە .

زۆر جار پەنای دەبردە بەر ستەم‌و زۆرداری ، جاری‌واش هەبوو دەستی یاریدەی بۆ دەستەیەك دریژ دەکردو ئەم‌و ئەوی دەکرپی . بەلاّم وەك ئەورووپایی‌یەکی پیشکەوتوو بیری دەکردەوەو بۆ خۆشی کوردناسێکی گەورە بوو ، بۆیەکا دامەزراندنی چاپخانەیەکی کوردی‌ی بە پێویست زانی . هەر ئەو سەردەمەش ئینگلیزەکان ژمارەیەك چاپخانەی کۆنیان هێنایە عیراق بۆ ئەوەی کاری میری‌و مەبەستی پرۆپاگەندەی خۆیان باشتر بەرنەسەر . لەسەر پێشنیاری مێجەر سۆن یەکێك لەو چاپخانانە بەر شاری سلێمانی‌و یەکێکی تریان بەر شاری کەرکووك کەوت .

مێجەر سۆن خۆی سەرپەرشتی‌ی کاری چاپخانەکەی سلێمانی‌ی دەکردو ری‌و شوێنێکی باشی بۆ دانا . بەرامبەر ماڵی حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغا خانووی فارس ئەفەندی‌ی بۆ گرت‌و کردی‌یە مەڵبەندی . گەورەترین کۆسپی ئەوە بوو چۆن‌و لەکوێ تیپکار پەیدا بکات . ئەو سەردەمە کرێکاری خوێندەوار قاتی بوو . هەرچۆن بوو سۆن توانی سێ لاوی خوێندەوار قایل بکات کە کاری چاپخانەکە بگرنە ئەستۆ – شێخ مەجیدی شێخ عارف‌و ئەدیب عەزیزو محەمەد زوهدی . ئەو سێ پێشرەوەی رۆژنامەنووسی‌و چاپخانەگەری‌ی کوردی‌ی عیراق بە هەرسێکیان تیپەکانیان ریك‌دەخست‌و پرۆڤەی نووسینەکانیان راست‌دەکردەوەو ئینجا بە مەکینەیەکی دەست لە چاپیان دەدا . ئەم کارە هەرچەندە زۆر گران نەبوو ، بەلاّم ئاسانیش نەبوو .

یەکەم کاری چاپخانەی سلێمانی ئامادەکردنی کاغەزو تۆماری تایبەتی بوو بۆ بەریوەبردنی کاروباری میری . بەلاّم گەورەترین کاری دەرکردنی یەکەم رۆژنامەی کوردی بوو لە کوردستانی عیراق . دوای کۆششێکی زۆر مێجەر سۆن رۆژی ٢٩ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ یەکەم ژمارەی رۆژنامەی «پێشکەوتن»ی خستە بازارەوە . «پێشکەوتن» (٣٢×٢٠سم) حەفتەی جارێك ، سەرەتا بە چوارو دوایی‌ی شەش لاپەرە دەورووبەری دوو ساڵ بە ریکوپێکی دەرچوو . مێجەر سۆن خۆی سەرپەرشتی دەکردو جاروباریش نووسینی تێدا بلاّودەکردەوە ، ئەمە نموونەی یەکێك لە نووسینەکانی یەتی :

«بۆ زانینی هەموو :
مەجید کوری عەلی‌ی هەمەوەندی ٢٧ ساڵەیە ، دەستە پیاوە ، سمێلی پرو

درێژە ، ڕیشی تۆپە ، مووی سوورە ، پیاوی کوشتووەو هەڵاتووە ، هەچ کەسێ هەواڵی ئەو مەجیدە بدا کە بۆ کوێ چووە یا بیگرێو بیگەیێنێتە حوکمەت سێ صەد ڕوپیەی ئەدرێتێ .

حاکمی سیاسی مێجەر سۆن»[1] .

«پێشکەوتن» بۆ کاتو شوێنی خۆی ڕۆژنامەیەکی دەوڵەمەندو پێشکەوتوو بوو . دەستەیەك ڕووناکبیری ناوداری وەك جەمال عیرفانو شێخ نوری شێخ صالحو جەمیل صائیبو زەکی صائیب بەرهەمی خۆیان تێدا بلاّودەکردەوەو بەو جۆرە «پێشکەوتن» شوێنی دیاری لە مێژووی رۆژنامەنووسی‌ی کوردیدا بۆ خۆی کردەوەو ئیمرۆ ژمارەکانی یەکێکن لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی لێکۆڵینەوەی زۆر لایەنی ژیانی گەلەکەمان .

لەگەڵ ئەوەش ناوەرۆکی ژمارەکانی «پێشکەوتن» لە هەڵەی گەورەو نیشانەی دواکەوتوی بێ‌بەش نەبوون . لێرەدا ئەم نموونە سەیرە دەخەینە بەرچاو کە ئەو ڕۆژنامەیە دەربارەی ڕەگەزی کورد بلاّوی کردۆتەوە . لە یەکێك لە ژمارەکانیدا «پێشکەوتن» نووسیویە دەڵێت :

«کە دەنگوبانگی[2] پێغەمبەرێتی‌ی محمد المصطفى (صلعم) گەیشت بە هەموو لایەكو غەلغەلەی خستە دونیاوە وای لێ هات کە خاقانو سەلاطین حەڵقەی بەندەیەتی‌ی ئەو سەروەرە بخەنە گوێ . ئۆغوز خان کە لەو وەختەدا گەورەترین سەلاطینی تورکستان بوو لە پیاوماقوڵی کورد بەغدوز ناوی سەروسەکوت ناشرینی ناردە خزمەت پێغەمبەر (صلعم) . . پێغمبەر (صلعم) کە چاوی پی‌کەوت لە سەرو گوێلاکی قیزی کردەوە . عەشایرو قەبایلی پرسی ، بەغدوز وتی لە ئەکرادم ، ئەو حەزرەتەیش فەرمووی خوای تەبارەکەن تەعالا ئەم تایەفەیە موەفەق بە ئیتفاق نەکات ئەگینا عالەمێك لەدەست ئەوان بەتەنگ دێن . ئیتر لەو ڕۆژەوە دەوڵەتو سەڵتەنەتی گەورە بۆ ئەمانە ڕێك‌نەکەوتووە پێنج تایەفە نەبێت . .»[3] .

مێجەر سۆن نە بە ڕۆژنامەی «پێشکەوتن»و نە بە هیچ کارێکی‌تری نەیتوانی گەلی

---

(١) «پێشکەوتن» ، سلێمانی ، ٣ی مارتی ١٩٢١ .

(٢) تەنها دەستکاری‌ی ڕێنووسەکەی کراوە .

(٣) «پێشکەوتن» ، ١٤ی ئوکتۆبەری ١٩٢٠ .

کورد فریو بدات . نیشتمانپەروەرانی کوردستان سەریان بۆ ئینگلیز شۆڕ نەکردو سوور بوون لەسەر ئەوەی داگیرکەر ناچار بکەن ڕێگە بدات شێخی پێشەوا لە هەندەران ، لە دوورگەی ئەندامانەوە بگەڕێتەوە خاکی نیشتمان[٤] . لە یەکێك لە دەکومێنتە تایبەتی‌یەکانیاندا ئینگلیزەکان بێ‌پێچ‌وپەنا دانیان بەوەدا ناوە کە ئەو سەردەمە «هەموو هەستی نەتەوەیی‌ی خەڵکی کوردستان ئاراستە کرابو بۆ گێڕانەوەی شێخ مەحموود»[٥] . ئینگلیزەکان ناچار بوون سەر بۆ ویستی گەل شۆڕ بکەن‌و پیلانی لەناوبردنی شێخ لەبیر خۆیان بەرنەوە[٦] و ڕێگەی بدەن بگەڕێتەوە بەو هیوایەی «دەرسی» لە دەردو ئازاری دەربەدەری‌ی چەند ساڵەی وەرگرتبێت[٧] . بەڵام شێخ وەك نیشتمانپەروەرێکی ڕەسەن هەر دەرسەکەی جارانی دەور دەکردەوە ، بۆیە کە گەڕایەوە لەوسا زیاتر سوور بوو لەسەر ئەوەی پێی بێگانە لە خاکی نیشتمان ببڕێت . چەند دەکومەنتێکی گرنگی‌تری ئینگلیزەکان باسی ئەوە دەکەن چۆن شێخ بەر لەوەی بگاتەوە سلێمانی هەر لە ڕێگەوە پەیوەندی نهێنی‌ی لەگەڵ هێزە نیشتمانی‌یەکاندا بەست‌و ویستی کەڵك لە دوژمنایەتی‌ی کەمالی‌یەکانی تورکیا وەربگرێت کە ئەو ڕۆژانە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەوان گەورەترین ناحەزی ئینگلیز بوون[٨] .

---

(٤) دوای دامرکاندنەوەی قۆناغی یەکەمی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحموودو بریندار بوون‌و بەدیل گرتنی خۆی‌و دوای بڕیاردانی خنکاندنی دوورخرایەوە دوورگەی ئەندامان

(٥) بڕوانە

(Iraq . Report on Iraq administration April 1922 — March 1923), London, 1924, P.33.

(٦) کە لە شەڕی دەربەندی بازیاندا (١٧ ی حوزەیرانی ١٩١٩) شێخ مەحموود بریندار بوو و ئینگلیزەکان لە ژێر بەردە قارەماندا بە دیل گرتیان ، فەرمانبەری سیاسی‌ی گشتی‌ی ئەوسای عیراق ئارنۆلد ولسن لەناوبردنی شێخی بە پێویست زانی بۆ ئەوەی گوایە «ئاسایش بگەڕێتەوە کوردستان» .

بڕوانە :

A. T. Wilson, Mesopotamia 1917 — 1920. A clash of loyalities. A personal and historical record, London, 1930, P. 139.

(The letters of Gertrude Bell), London, eleventh printing , April 1930 , P. 433.

(٨) بڕوانە :

(Special Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the progress of Iraq during the period 1920 — 1931) , London , 1931 , P . 255. (Report on Iraq Administration April 1922 Marth 1923) , P . 36.

رۆژی ۳۰ی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۲۲ شێخ گەیشتەوە سلێمانی . زۆری نەخایاند تەنگی بە ئینگلیز هەڵچنیو ناچاری کردن دەست لە ناوچەی سلێمانی هەڵبگرن کە دیسان بانگی ئازادی‌ی تێدا درا . ئینگلیزەکان نەیانتوانی چاپخانەکەیان لەگەڵ خۆیان بەرن چونکە هەر زوو شۆڕشگێرانی کورد دەستیان بەسەردا گرت . ئەو چاپخانەیە دەورێکی گەورەی لە ژیانی سیاسیو ڕووناکبیری‌ی ئەو ڕۆژە ناسکانەی کوردا بینی . لە هەمووی گرنگتر ئەو دوو ڕۆژنامەیە بوو کە وەك ئۆرگانی ڕژێمەکەی شێخی نەمر بە ناوی «بانگی کوردستان»و «ڕۆژی کوردستان» ەوە بلاوی کردنەوەو هەر زوو بوونە لاپەڕەیەکی زۆر دیاری ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی .

چالاکی‌ی ڕووناکبیرانی کورد لەو ڕۆژانەدا ئەوەندەی‌تر رقی ئینگلیزی هەڵساندو زیاتر پاڵی پێوەنان کە ڕۆژێك زووتر ڕژێمە ساواکەی شێخ مەحموود زیندەبەچاڵ بکەن . تۆپو فڕۆکەو پارەو هەموو کردارێکی نزم تێکەڵ بوونو شێخیان ناچارکرد بەرەبەیانی ۲٤ی مارتی ۱۹۲۳ جارێکی‌تر شار بەجێ بهێڵێتو لەگەڵ لایەنگرەکانیدا بگوێزێتەوە ناوچە شاخاوی‌یەکانی دەوروبەری سووروداش . ئەمجاریان شۆڕشگێرانی کورد لە جاران زیاتر شوێنی چاپو چاپەمەنی‌یان لە خەباتی گەلدا دەنرخاند ، بۆیەکا لەو ڕۆژە سەختەدا بە هەوڵو تەقەلایەکی زۆرو پیاوانە چاپخانەکەیان لەگەڵ خۆیان گواستەوە ئەشکەوتی جاسەنەو ڕۆژنامەی «بانگی حەق» یان پێ چاپ‌کردو لەوێوە ژمارەیان لێ دەگایاندە زۆر هەرێمی کوردستان .

دیارە ئینگلیز بەوە قایل نەدەبوون بنکەی شۆڕش لە بن دەستیانەوە بێتو لەوێوە تەنگیان پێ هەڵچنن . لەبەر ئەوە دەوروبەری کۆتایی مایسی ۱۹۲۳ هێزەکانیان بەرەو ناوچە شاخاوێکانی سووروداش ناردو شۆڕشگێرانی کوردیان ناچارکرد ڕووبکەنە پێنجوێنو پیران . وا دیارە ئەمجاریان نەیانتوانی چاپخانەکە لەگەڵ خۆیان بەرنو بەوجۆرە کەوتەوە دەست ئینگلیزەکان[۹] کە دەستوبرد لە ئەشکەوتی جاسەنەوە گواستیانەوە شوێنەکەی جارانی لە سلێمانی .

---

(۹)

C. J. Edmonds , Kurds , Turks and Arabs . Politics travel and research in North — Eastern Iraq , London , 1957 , P . 332.

ئەم هەنگاوانەش دادی ئینگلیزیان نەدا ، هەر ڕۆژە لە لایەکەوە مۆتەکەی شۆڕشی کورد خۆی نیشان دەدان تا ناچاری کردن دیسان دەست لە سلێمانی هەڵبگرن . ڕۆژی ١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٣ هێزە چەکدارەکانی ئینگلیز شاریان بەجێ‌هێشت ، ژمارەیەك سەرشۆڕی نیشتمان‌و ڕوورەشی مێژووش کە زراوەترەکی تۆڵەی گەل بوون لەگەڵیان شاربەدەر بوون[١٠] . شۆڕشگێڕانی کورد بە سەرکردایەتی‌ی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند بە ناوی شێخەوە کاروباری شاریان گرتەوە دەست تا خۆی ڕۆژی ١١ی تەمووز بە سەربەرزی گەڕایەوە .

ینگلیزەکان دیسان فریا نەکەوتن چاپخانەکەیان لەگەڵ خۆیان بەرن ، بەڵام وەك جاری پێشوو بەجێ‌یان نەهێشت ، بۆ ئەوەی پەکی بخەن میلێکیان لێ دەرهێناو لەگەڵ خۆیان بردیان . شێخ فەرمانی‌دا هەرچۆن بێت چاپخانەکە بخرێتەوە کار . وەستا صالحی سلێمانی جەژنێ کە چەخماخچی‌یەکی زیرەك‌و شارەزا بوو بە دوو ڕۆژ میلێکی‌تری بۆ دروست‌کردەوەو بەو جۆرە چاپخانەکە کەوتەوە کار . دەستوبرد نامەیەك بۆ شێخ مەحموود چاپ دەکـــــەن‌و وەك مژدە بۆی دەبەن ، ئەویش لە خۆشیدا لەبریتی ٦٠ ڕوپیەی حەق دەستی میلەکە ٢٠٠ ڕوپیە دەداتە وەستا صالحی جەژنێ . دوای ئەوە لیژنەیەکی تایبەتی‌ی دانا بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی کاری دەرکردنی ڕۆژنامەیەك . ئەندامانی لیژنە ئەحمەد خواجاو ماجید مستەفاو عادلی شێخ سەلام‌و سەید ئەحمەدی بەرزنجی‌و صەبری‌ی کاکە ڕەش بوون کە لە ماڵی عیزەت بەگ کۆبونەوەو دوای گفتوگۆ چەند ناوێکیان بۆ ڕۆژنامەکە پێشنیار کرد : «کوردستان» ، «ئومێدی ئیستیقلال» ، «گۆیژە» ، «وەتەن» ، «سەرکەوتن» ، «یەکیەتی» و چەند ناوێکی‌تر . ناوەکان بەجیا لەسەر پارچە کاغەز دەنووسن‌و دەیانپێچنەوەو دەچنە بەردەرگا ، لەوێ تووشی کابرایەکی پشدەری دێن بە ناوی قادر ئاغاوە کە ٣ جار لەسەر یەك پارچەیەك لە کاغەزەکانی پێ هەڵدەگرن‌و هەر سێ جارەکە ناوی «ئومێدی ئیستقلال» دەردەچێ کە بەو جۆرە دەبێتە ناوی ڕۆژنامەکە .

بەم جۆرە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٣ دا ڕۆژنامەی «ئومێدی ئیستقلال» بووە

(١٠) لەناو ئەوانەدا کە شاریان بەجێ هێشت ئینسانی پاك‌و ڕێکوپێك هەبوو کە بە قسەی ئینگلیز هەڵخەڵەتابوون .

لاپەڕەیەکی پڕشنگداری‌تری تۆماری ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی‌ی. محەمەد زوهدی[11] بە تەنها ئەم ڕۆژنامەیەی چاپ دەکرد. پیتەکانی هەر ژمارەیەکی بە چەند ڕۆژێك ڕێك‌دەخست‌و بە ڕۆژێکیش چاپی دەکرد.. دوای دەرچوونی ژمارە یەك شێخ ۱۵۰ ڕوپیەی خەلاَت کردو مووچەکەی لە ٤٥وە بۆ کردە ۱۰۰ ڕوپیە.

لە ژمارە یەکی «ئومێدی ئیستقلال» هەزار دانە چاپ کراو لە ماوەیەکی کەمدا هەمووی بلاَوبۆوە، چەند ژمارەیەکیشی لە ڕێگەی کفری‌یەوە لێ نێردرایە بەغدا. هی وا هەبوو دوو قات‌و سێ قاتی نرخی هەر ژمارەیەکی پارەی دەدا. بە داهاتی ئەو ژمارەیە دەستەی نووسەران کاغەزو مەرەکەبیان کری. هەمان کات چاپخانەکە کەوتە چاپ‌کردنی سێ جۆر پوولی تایبەتی لە سێ ڕەنگی جیا: یەك عانەیی‌و هەشت عانەیی‌و یەك ڕوپیەیی. شێخ لەتیفی سەعاتچی نیوان پوولەکانی کون دەکردو بەوجۆرە قەراغی بۆ دروست‌دەکردن.

دەنگ‌دانەوەی «ئومێدی ئیستقلال» وای لە شێخ مەحموود کرد بڕیار بدات چاپخانەیەکی گەورەتر لە ئەلەمانیاوە بهێنێت. بەلاَم پیلان‌و فشاری ئینگلیزی داگیرکەر ڕێگەیان نەدا ئاواتێکی گەورەی ئەوسای دەستەی ڕوناکبیری کورد بێتە دی. زۆری نەخایاند کە دیسان فڕۆکە تەنگی بە دانیشتوانی سلێمانی‌و دەوروبەری هەڵچنی‌و کۆتایی مایسی ۱۹۲٤ شێخ‌و لایەنگرەکانی‌و بە هەزاران پیرو ئافرەت‌و منداڵ ناچار بوون جارێکی‌تر شار بەجێ‌بهێڵن. کە ئینگلیزەکان دوای دەوروبەری مانگێك سلێمانی‌یان داگیر کردەوە لە ۲۰ هەزار کەس تەنها نزیکەی ۷۰۰ کەسی تێدا مابوو. ئەوی‌تری هەمووی هەڵهاتبوو[13].

بە هەمان دەستوور «ئومێدی ئیستقلال»یش لە دەرچوون وەستا. ئەمجاریان شۆڕشگێڕانی کورد فریا نەکەوتن چاپخانەکە لەگەڵ خۆیان بگوێزنەوە. مانگێ وەرنەچەرخا کاتێك دەزگای نوێی میری کەوتە بلاَوکردنەوەی ڕۆژنامەی «ژیانەوە» کە ژمارە یەکی ڕۆژی ۱۸ ی ئابی ۱۹۲٤ کەوتە بازارەوە.

---

(۱۱) پاش داگیرکردنەوەی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە محەمەد زوهدی بەیەکجاری چوو بۆ تورکیا.

شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ جێگەیەکی زۆر دیاری لە مێژووی هاوچەرخی عیراقدا هەیە(٭) . بەسەرهاتەکانی ئەم شۆڕشە بە دوورو درێژی لە لایەن مێژوونووسانی خۆمانو دەرەوە باس کراون تەنها لایەنێکی گرنگی نەبێت کە تاوەکو ئیستەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەو نووسینە ، ئەویش دەوری گەلی کوردە لەم شۆڕشەدا کە شتێکی ئەوتۆی دەربارە نەنووسراوە[1] . تەنانەت بەشێك لە مێژوونووسانی هەندەران لەو بڕوایەدان کە گوایە کورد هیچ دەورێکی لەم شۆڕشەدا نەبووە[2] . هی ئەوتۆشیان هەیە ، وەك ئایرلەندو لۆنگریگ ، بایەخێکی ئەوتۆیان بە دەوری کورد نەداوە . ئەمە لە کاتێکدا ڕوونکردنەوەو دەرخستنی دەوری کورد لە شۆڕشی بیستدا بایەخی مێژوویی تایبەتی ی خۆی هەیە ، هیچ نەبێت لەبەر ئەوەی ئەم شۆڕشە بۆ خۆی یەکەم بزوتنەوەی ڕزگاریخوای هاوبەشی هەردووك گەلی گەورەی عیراق عەرەبو کوردە .

---

(٭) لە «برایەتی» ، بەغدا ، ژمارە ٤ ، خولی دووەم ، سەرەتای ئەیلولی ١٩٧٠ ، ل ٢٢-٢٦دا بلاوکراوەتەوە .

(١) ئەم وتارەم بە چەند ساڵێك بەر لەو کتێبەم چاپکراوە کە بە عەرەبی دەربارەی شوێنی کورد لە شۆڕشی بیستدا بەم ناوەوە بلاوم کردەوە : «دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية» ، بغداد ، ١٩٧٨ .

(٢) ڕۆژهەلاتناسی سۆڤیتی پرۆفیسۆر ن . لۆهانیسیان لەو وتارەیدا کە لە کتێبی «ولاتانو گەلانی ڕۆژهەلاتی نزیكو ناوەڕاست»دا بە ناوی «خەباتی هێزە دیموکراسیەکانی عیراق لە پێناوی لابردنی ئینتدابی بەریتانیدا» بلاوی کردۆتەوە نووسیویە دەڵێت گوایە کورد لە شۆڕشی بیستدا بەشدار نەبوون .

دیارە ناشێت بە تاقە وتارێك بە درێژیو وەك پێویستە دەوری گەلی کورد لە شۆڕشی بیستدا دیار بکرێت ، بۆیەکا هەولْ دەدەین لێرەدا تەنها چەند لایەنێکی بایەخداری ئەو دەورە بخەینە بەر چاو .

بەر لە هەر شتێك پێویستە ئەو ڕاستییە دەربخرێت کە کوردی عیراق دەوریان گەورە بووە لە خۆش‌کردنی ڕێگەی بەرپابوونی شۆڕشی بیستدا . بە ماوەیەکی زۆر پێش تەقینەوەی ئەو شۆڕشە لە گەلێك ناوچەی کوردستاندا خەباتێکی سەختی چەکدارانە دژی ئینگلیزی داگیرکەر دەستی پێ‌کردبوو . هەمووی بەسەر یەکەوە شەش مانگ بە سەر هاتنی ئینگلیزەکاندا تێنەپەری کاتێك جوتیارانی گۆیان بە چەکەوە پەلاماریان دان . هەر لەو دەروبەرەدا لە چەند ناوچەیەکی‌تری بادینان ژمارەیەك ئەفسەری بەریتانی پێکرانو هێزی دوژمن ڕاوودوو نران . کۆتایی بەهاری سالْی ۱۹۱۹یش کلْپەی ئاگری خەبات هەموو ناوچەی نێوان کەرکوكو سلێمانیی گرتەوەو ئینگلیزەکان چەند جارێك شکێنران . تەنها لەو شەڕەدا کە لە نزیکی تاسلۆجەوە ڕۆژی ۲۳ی مایسی سالْی ۱۹۱۹ قەوما شۆڕشگێڕانی کورد ، بەپێی سەرچاوە بەریتانیایی‌یەکان خۆیان ، توانی‌یان ژمارەیەك سەربازی ئینگلیز بکوژنو ٤ زریْپۆشو ۱۹ ئوتومبیلی فۆردیان بشکێنن[۳] .

دەنگوباسی ئەم ڕاپەڕینو هەراوبگرانەی کوردستان زۆر ناوچەی عیراقی گرتبۆوەو کەوتبووە سەر زاری پیاوە سیاسی‌یەکانی بەغداو کەربەلاو نەجەفو شارەکانی‌تر . ئەمە لە لایەکەوە بووە هۆیەکی‌تری دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەی داگیرکەری نوێو لە لایەکی‌تریشەوە نیشانی دا ئیستعمار ئەو قەلاْ نەبەزیوە سەختە نی‌یە کەس پێی نەوێرێ ، بەلْکو ئیرادەی گەل بۆی هەیە سەر بە چەكو تفاقە نەبینراوەکانی ئەمیش شۆڕ بکات . ئەمەش ، بێ‌گومان ، چاوی خەلْکەکەی زیاتر کردەوەو زاتی شکاندنو بەو جۆرە ڕێگەی بۆ شۆڕشی بیست تەخت‌تر کرد . ڕۆژهەلاْتناسی بەناوبانگی سۆڤیێتی ل .ن . کاتلۆڤ لەو کتێبەیدا کە لە سەر شۆڕشی

(۳) بڕوانە :

A. T. Wilson , Mesopotamia 1917 — 1920 . A clash of loyalities . A personal and historical record , London, 1930 , P. 137.

بیست دایناوە[٤] بەشێکی بۆ ئەم باسە تەرخان کردووە چونکە بەلایەوە ڕاپەڕینەکانی کوردستان ڕێخۆشکەرێکی بایەخداری ئەو شۆڕشەن .

وێڕای ئەوە ژمارەیەك کوردی ناسراو ئەندامی ئەو کۆمەڵو ڕێکخراوانە بوون کە دەستیان لە ئامادەکردنو هەڵکردنی ئاگری شۆڕشدا باڵا بوو ، وەك «حرس الاستقلال» کە جەلال بابان یەکێك لە ئەندامە دیارەکانی بوو .

سەرەڕای ئەمانە کاتێك شۆڕش دەستی پێ‌کرد کوردەکە دوورەپەرێز نەوەستا . لەو ڕۆژانەدا چەند مەڵبەندو ناوچەیەکی کوردستان چالاکانە هاتنە دەستو دانیشتوانی ئەوانیش دژی ئینگلیزی داگیرکەر ڕاپەڕین . هەر لەسەرەتاشەوە بەشێك لە سەردارانی شۆڕش بە پێویستیان زانی جگە لە هۆزانی عەرەب هۆزە کوردەکانیش ڕاکێشنە ناو کۆڕی خەباتەوە[٥] . ئەو کوردانەی لە بەغدا دەژیان لە هەموو خۆنیشاندانو کۆبوونەوەکانی دانیشتوانی ئەم شارەدا بەشداری‌یان کرد .

لە سەرەتای مانگی ئابەوە کوردستان بۆخۆیشی شڵەقا ، ئەوەی باری سەرشانی ئینگلیزی قورستر کرد چونکە ناچاری‌کردن بەشێك لە هێزەکانیان لە بریتی فوراتی ناوەند ئاراستەی ئەوێ بکەن .

لە کوردستان ئاگری شۆڕش لە پێش هەموو شوێنێکدا لە ناوچە کوردی‌یەکانی باقوبەدا تەشەنەی سەند . ڕۆژی چواردەی ئابی ١٩٢٠ کوردەکان توانی‌یان قزرابات ئازاد بکەن . ئەمە دانیشتوانی خانەقینیشی بە جارێك بزواند . پێشمەرگەکانی ئەم ناوچەیە هێرشێکی سەرکەوتوویان کردە سەر کۆمپانیای نەوتی بەریتانی – ئێرانیّ لە ناوچەی نەفتخانە . لە لایەکی‌تریشەوە توانی‌یان خەتی شەمەنەفەری نێوان خانەقینو بەغداو ، بەغدا – کنگرەبان – کەرکوك تێك‌بدەنو بەو جۆرە پێوەندی‌ی نێوان

(٤) ل . ن . کاتلوف ، ڕاپەڕینی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی ساڵی ١٩٢٠ لە عیراق ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٨ ، ل ٩٨ – ٩٩ ، ١٠٤ – ١٠٥ . ئەم کتێبە نامەی دوکتورای لیف نیکەلایێڤیچ کاتلۆفە . دوکتۆر عەبدولواحید کەرەم کردوویەتی بە عەرەبی‌و لە بەغداو بێروت چەند جارێك چاپی کردۆتەوە ، بەڵام بە داخەوە وەرگێڕانەکەی پڕی‌یە لە هەڵەی زەقو شێواندنی گەورە گەورە کە کارێکی زۆر گەورەیان کردۆتە سەر ناوەرۆکی ئەو کتێبە نایابە .

(٥) بڕوانە

عادل غنیمە ، الحرکة الوطنیة في العراق ، القاهرة ، ١٩٦٠ ، ص ٩ .

هێزەکانی ئینگلیز لە کوردستانو ناوەڕاستو خوارووی عیراقدا بپچڕنو سەر لەو هێزانەش تێك بدەن کە ئینگلیز لە ئێرانەوە ئاراستەی گیانی شۆڕشگێڕانیان دەکردن .

ئەم بزوتنەوانە ئینگلیزەکانیان تەواو شپرزە کردو ناچاریان کردن دەستوبرد هێزێکی چەکدار بە سەرکردایەتی ئەفسەرێکی شارەزای خۆیان بە ناوی ب . ئەدواردەوە بنێرنە ناوچەی خانەقین . ڕۆژی ١٦ی ئاب دەوروبەری دوو صەد پێشمەرگەیەکی کورد پەلاماری ئەم هێزەیان داو لە ئەنجامی شەڕێکی دوو سەعاتو نیویدا ڕێگەی پێشکەوتنیان لیٚ گرتن . ئەوساکە ئینگلیزەکان ناچار بوون هێزیٚتریان بۆ بنێرن[٦] . ئەمە بووە هۆی تێکچوونی تەرازووی هێزو مەودای ئەوەیان دایە دوژمن کە ڕۆژی ١٩ی ئاب چەند گوندێکی ناوچەی خانەقین بگرنەوەو بۆ ڕۆژی داهاتوش بچنەوە ناو شاری خانەقین خۆیەوە . لێرە داگیرکەران باجێکی زۆریان خستە سەر دانیشتوانی شار کە بە «تاوان»ی پشتگیریٚی شۆڕش گوناهباریان کردن .

داگیرکردنەوەی خانەقین نەیتوانی تەشەنە کردنی ئاگری شۆڕش بۆ ناوچەکانیٚتری کوردستان بووەستێنێت . دانیشتوانی مەندەلی بە عەرەبو کوردەوە دایانە پالٚ شۆڕشو کاروباری شاریان بە سەرۆکایەتی موسا ئەفەندیٚیەوە گرتە دەست .

لەو لاشەوە هۆزی دەلۆو بەشێك لە جافەکان بە سەرکردایەتی برایم خانو وەیس بەگ ڕۆژی ٢٤ی ئاب دوای شەڕێکی کەم شاری کفریٚیان ئازاد کردو هەموو ئەو هێزانەی دوژمن کە لەویٚ بوون بە دیلیان گرتنو کاپتەن سالمۆنیان بردو ئالاٚی بەریتانیٚیان داگرت[٧] .

هەر زوو دەنگوباسی ڕاپەڕینی کفری بە ولاٚتدا بلاٚوبۆوە ، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئینگلیزەکان لە بەغدا بەیاننامەیەکی سەربەخۆیان دەربارەی بلاٚوکردەوە . ئینگلیزەکان کە مەترسیٚی ئەوەیان لیٚنیشت ئاگری شۆڕش شوێنەکانیٚتری کوردستان بگرێتەوە هەر زوو هێزێکی گەورەیان بە سەرکردایەتی ئەفسەری سیاسیٚی

---

(٦) بڕوانە :
A.L.Haldane, The Insurrection Mesopotamia, Edinburgh , 1922, PP. 158 – 161.

(٧) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە :
مكرم الطالباني ، ابراهيم خان ثائر من كردستان ، بغداد ، ١٩٧١ .

کەرکوك لۆنگریك ناردە کفری . بەشێك لە زەنگەنەو تاڵەبانی‌یەکان دایانە پاڵ ئەم هێزە . .

سەرەتا لۆنگریگ هەوڵی دا لە ڕێگەی گفتوگۆوە سەردارانی ڕاپەڕینەکەی کفری قایل بکات خۆیدەن بە دەستەوە . بەڵام ئەوە دادی نەدا چونکە شۆڕشگێڕانی ناوچەکە سوور بوون لەسەر بەرگری . ئەوساکە هێرشی ئینگلیز دەستی پی‌کردو شۆڕشگێڕان ناچار بوون بکشێنەوە ناوچە سەختەکانی دەوروبەری شار . کە لەوێوە بە کوشتنی کوری سەردارێکی کوردیان زانی لە وەڵامدا کاپتەن سالمۆنیان کوشت کە تا ئەو کاتە وەك بارمتە گلیان دابۆوە . کوشتنی سالمۆن لۆنگریگی ئەواو شێتگیر کردو ئەویش لە وەڵامدا ١٠ هەزار ڕوپیەو ٥٠٠ تفەنگ سزای خستە سەر دانیشتوانی کفری[٨] .

ڕاپەڕینە بەجەرگەکەی کفری هۆزەکانی ئەو ناوچەیەیان بزواند . بەیاتی‌یەکان توزخورماتویان ئازاد کرد . لە ناو شاری کەرکوکیشدا کۆمەڵێکی سیاسی‌ی نهێنی کەوتە خۆ . ژمارەیەك لە نیشتمانپەروەران هەوڵیان دا بە یاریدەی شێخ قادری سیامەنصوری ڕێ بە هێزەکەی لۆنگریگ بگرن‌و ڕێگەی نەدەنێ بگاتە کفری . بەڵام لۆنگریگ کە بەمەی زانیبوو بەر لەوەی بچێتە کفری هێرشی بردە سەر دێکانی شێخ قادرو دوای شەڕێکی چەند سەعاتی‌و بە یاریدەی فڕۆکە کاولی‌کردن‌و بەو جۆرە نەخشەی شۆڕشگێڕانی ئەم ناوچەیەی پوچ‌کردەوە .

هەرچی ناوچەی سلێمانی بوو لەبەر چەند هۆیەکی تێکەڵ نەیتوانی لە ڕۆژانی شۆڕشی بیستدا دەورێکی ئەوتۆ ببینێت ، بە تایبەتی چونکە هەمووی چەند مانگێك لەوەبەر ئینگلیزەکان توانیبوویان دەست لە نیشتمانپەروەرانی بووەشێن‌و سەردارانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوای دوور بخەنەوە . وێڕای ئەوە مێجەر سۆنی حاکمی شاریش توانی‌ی ژمارەیەك سەرەك هۆزی ناوچەکە بکڕێت‌و تەنانەت دەستەیەك ئاغای پشدەری هێزی تایبەتی‌ی خۆیانیان بۆی نارد کە ویستی بەهۆیانەوە خەڵکی ناوچەکە چاوترسێن بکات[٩] . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند وردە ڕاپەڕینێکی ناوچەیی لەو

---

(٨) عبدالرزاق الحسني ، الثورة العراقية الكبرى ، صيدا - بيروت ، ١٩٥٢ ، ص ١٧٠أ - ١٧٠ب .

(٩) بڕوانە :

ل . ن . کاتلۆف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٣٩ .

ڕۆژانەدا تەقینەوە ، وەك لە سەنگاوو لە ناو پیاوەکانی مەحمود خانی دزلیدا .
وەزعی هەولێرو دەوروبەری گەلێك لەوە ئاڵۆزتر بوو . هێشتا لە ناوچەی فوراتی ناوەندا شەڕ دەستی پێ نەکردبوو کاتێك دانیشتوانی هەولێر چەند جارێك کۆبوونەوەو پشتگیری‌ی داخوازی‌یەکانی شۆڕشیان نیشان دا . خەڵکی دەرەوەی شاریش باری سیاسی‌ی ئاڵۆزاوی ئەو ڕۆژانەیان بە هەل زانی‌و ئەوانیش کەوتنە خۆ . ڕۆژی ١٢ی ئابی ١٩٢٠ لە نزیك ڕەواندزەوە دەستەیەك چەکداری کورد دەستڕێژیان لە کاپتەن هێەی (Hay) کردو چەند جارێکیش پەلاماری یەکێك لە باریدەرەکانیان دا کە سەیر لە مەرگ ڕزگاری بوو .
باری سیاسی‌ی هەولێر وا ئاڵۆز بوو کە جێگری حاکمی سیاسی گشتی‌ی ئەوسای عیراق ئارنۆلد ویلسنی ناچار کرد ڕۆژی ٨ی ئەیلول بۆ خۆی بە فڕۆکەیەکی تایبەتی بچێتە ئەوێ . لە هەولێر ویلسن لەگەڵ ئەفسەرو کاربەدەستانی ئینگلیزو ژمارەیەك سەرەك هۆزی کوردو گەورە پیاوانی شار کۆبۆوەو باسی «سەرکەوتنە گەورەکانی» ئینگلیزی لە ناوچەی فوراتی ناوەندا بۆ کردن‌و داشی بە گوێیاندا کە گوایە «وەزعی سلێمانی هێمنە»[١٠] .

بەڵام نە هاتنی ئارنۆلد ویلسن‌و نە هەڕەشەو گوڕەشەکانی دانیشتوانی هەولێرو دەوروبەری چاوترسێن نەکرد . هەر پاش گەڕانەوەی ئەو بۆ بەغدا بە ماوەیەکی زۆر کەم ئینگلیزەکان بەو پیلانەیان زانی کە نیشتمانپەروەرانی هەولێر بۆ دەرکردنیان‌و دامەزراندنی حوکمێکی خۆبەخۆ دایاننابوو ، بۆیەکا ناچار بوون لە دوو قۆڵەوە ، یەکێکیان لە کەرکوکەوەو ئەوی‌تریان لە موسڵەوە ، دوو هێزی نوێ بنێرنە سەر هەولێر . ژمارەیەك ئاغای دزەییش بە دەنگیانەوە هاتن‌و بەو جۆرە توانی‌یا هەولێر دابین بکەن[١١] . بەڵام ئەمە کارێکی ئەوتۆی نەکردە سەر باری ئاڵۆزاوی ناوچەکانی سەر بە هەولێر . سورچی‌یەکان ئەو ڕۆژانەیان بە هەل زانی‌و ڕۆژی یەکی ئەیلول باتاسیان ئازاد کردو دوای ئەوە ڕوویان کردە ڕەواندزو هێزێکی لیوی‌یان لەوێ

---

(١٠) A.T.Wilson , Op. Cit , P. 288

(١١) A.L.Haldane, Op Cit., PP. 246 – 247

تابلۆقه دا . سورچی‌یەکان لە شەڕێکی قورسدا لە ڕەواندز ١٨ سەربازی لیوی‌یان کوشت[١٢] .

دوای ئەوە ئەو هێزەی لە ڕەواندز بوو خۆی پێ نەگیراو ناچار کشایەوە هەولێر . دوا بەدوای ڕەواندز کۆیەش شلۆقاو ڕۆژی ٨ی ئەیلول ئەفسەری سیاسی‌ی شار هەڵهات .

باری هەرێمی بادینان زۆر لەوە باشتر نەبوو . ڕوداوەکانی کوردستان خۆی‌و کوشتنی کاپتەن لیچمەن لە لایەن شۆڕشگێڕانی هۆزی زەوبەعی ناوچەی ڕومادی‌یەوە تەواو هەستی دانیشتوانی بادینانیان دژی داگیرکەر بزواندبوو . لیچمەن ، بەپێی بەڵگەیەکی نهێنی فەرەنسی بۆ ڕەقیبی لە وێنەی نەبوو[١٣] . هەمووی ساڵێك لەوەپێش کاتێك ئەفسەری سیاسی‌ی موسڵ بوو ویستی نزیکەی هەزار خێزانی بادینی دەربەدەر بکات‌و زەوی‌ی باووباپیرانیان لێ زەوت بکات بەو نیازەی خەڵکی‌تر لە جێگەیان نیشتەجێ بکات ، بۆیەکا دانیشتوانی ناوچەکە زۆر لێی داخ لەدڵ بوون : هەواڵی کوشتنی هێندەی‌تر خەڵکەکەی بزواند . عەقرە لەو کاتەدا شلۆقا . کوردە بەزیدی‌یەکانیش هەر لە سەرەتاوە پشتگیری‌ی شۆڕشیان کردو یاریدەی ئەو هێزەیان دا کە هێرشی بردە سەر تەلەعفەر . بەلام دوو دڵی‌ی کۆمەڵی عەهدی عیراقی کە کاروباری شۆڕشی لە ناوچەی موسڵدا دەبرد بەڕێوەو کەمتەرخەمی جەعفەر عەسکەری کە سەرۆکێکی ناسراوی عەهدبوو ، بوونە هۆی ساردبوونەوەی شۆڕشگێڕانی ئەم ناوچەیە کە لەبەر ئەوە نەیانتوانی دەورێکی ئەوتۆ ببینن .

تا دەوروبەری کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٢٠ هێزەکانی ئینگلیز توانی‌یان ئاگری شۆڕش لە زۆربەی ناوچەکانی باشووری عیراقدا دابمرکێننەوە . دیارە ئەمە لە کوردستانیشدا ڕەنگی دایەوەو ترسی خستە دڵی سەرەك هۆزانی . خۆشناوەتی‌و گەردی‌یەکان کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ ئینگلیزەکانداو پەیمانیان دانێ دژیان نەوەستن‌و هەر زیانێکیان لەو ناوچانەدا لێ‌کەوتووە بۆیانیان بژمێرن . سورچی‌یەکان‌و ژمارەیەکی

---

(١٢) Ibid , P. 246

(١٣) بروانە :

«تۆمارەکانی وەزارەتی هەندەرانی فەرەنسە» ، Direction Politique et Commercial ,
Mesopotamia, E — 314, Armee , No 348 , 24. VIII , 1920.

زۆر لە سەرەك هۆزانی کەرکوكو سلێمانیش کەوتنە خۆ نزیکخستنەوە لە ئینگلیزەکان[١٤] .

هەرچەندە گەلی کورد توانی کەڵك لەو بارو دۆخە وەربگرێ کە شۆڕشی بیست هێنایە کایەوەو بە خوێنی ڕۆڵەکانی لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازیی بۆ خۆی تۆمار کرد . بەڵام ، بێگومان ، دەیتوانی دەورێکی لەوەیش گەورەتر ببینێت . دیارە ئەوە لە خۆڕا نەبو ، بەڵکو ئەنجامی گەلێك هۆی پێکەوە بەستراو بوو . بەر لە بەرپا بوونی شۆڕشی بیست بە ماوەیەك ئینگلیزەکان توانیبوویان بە توندی دەست لە هێزە نیشتمانییەکانی کوردستان بووەشێنن . کەمتەرخەمیی سەرکردایەتی شۆڕش دەورێکی لەوەیش زیاتری بینی . «مکتب الثورة» ، کە بەڕێوەبردنی شۆڕشی کەوتبووە ئەستۆ ، نەیتوانی تەنانەت تاقە لقێکیش بۆ خۆی لە کوردستان دابمەزرێنێت . سەردارانی شۆڕش لە مەسەلەی کورد نەدەگەیشتن ، بۆیەکا هیچ کامێکیان نە لە وتارێکداو نە لە بەیاننامەیەکداو نە لەسەر لاپەڕەی یەکێك لە دوو ڕۆژنامەکەی شۆڕش «الفرات»و «الاستقلال» نە لە دوورەوەو نە لە نزیکەوە توخنی نەکەوتنو هیچ ڕێگەیەکیشیان سەبارەت سیاسەتی نەتەوەیی ئەو حوکمەتە سەربەخۆیەی دەیانویست دایمەزرێنن ، دیار نەکرد ، هەرچەندە بەپێی نەخشەی خۆیان دەبوو کوردستانی باشووریش بگرێتەوە . ئەم کەمتەرخەمییەی سەرکردایەتی شۆڕش لەوەدا زیاتر خۆ دەنوێنێت گەر بێتو بزانین ژمارەیەك نیشتمانپەروەری وەك ڕەفیق حیلمیو فایق تاپۆ لە گەرمەی شۆڕشدا هەوڵیان دا لە ڕێگەی مستەفا بەگەوە ، کە یەکێك بوو لە کوردە شۆڕشگێڕەکانی بەغدا ، پێوەندیی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش ببەستن[١٥] .

لە لایەکیترەوە ئینگلیزەکان بە هەر چوار لادا هەڵپەی ئەوەیان بوو ئاگری ناکۆکیی نەتەوەییو ئایینی خۆش بکەن . لەم ڕێگە ناهەموارەوە توانییان بەشێك لە خەڵکی ساکاری کوردستان هەڵبخەڵەتێننو بیانکەنە گیانی ئەو شۆڕشگێڕە کوردانەی گوایە بەپێی قسەی ئەوان «کەوتبوونە ژێر تاسیری عەرەبە شیعەکانەوە» .

---

(١٤) ل .ن . کاتلۆف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٦٧ .

(١٥) بڕوانە :

ڕەفیق حیلمی ، یادداشت . بەرگی دووەم . بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٥٦ ، ل ٧٦ – ٧٧ .

کەین‌و بەینی ئینگلیز بێ بەر نەبوو . کۆنسوڵی بەریتانی لە کرمانشا توانی بەشێك لە هۆزی سنجاوی فریو بدات‌و بە چەکەوە بیانکاتە سەر شۆڕشگێڕانی خانەقین‌و کفری[16] . بەشێکیش لە هۆزی کەڵهور بە دەنگ ئینگلیزەوە هاتن‌و بۆیان بوونە پاسەوانی پاراستنی کانە نەوتەکانی نزیك خانەقین[17] . لەو لاشەوە ئینگلیزەکان توانی‌یان چەند دەستەیەکی فەلە هەڵخەڵەتێنن‌و بیانکەنە گیانی شۆڕشگێڕانی کوردستان . ناوەندی ئەیلولی ١٩٢٠ شەڕێکی قورس لە نێوان ئەوان‌و شۆڕشگێڕانی کوردا لە سەروو موسڵەوە قەوما . بەپێی سەرچاوە ئینگلیزی‌یەکان کوردەکان لەو شەڕەدا نزیکەی ٦٠ کەسێکیان لێ کوژراو ١٤٠یشیان لە ئاوی زێی گەورەدا خنکان[18] .

هەرچەندە شۆڕشی بیست سەرنەکەوت ، بەڵام گەلێك دەرسی گەورەی دایە گەلی عیراق بە عەرەب‌و کوردی‌یەوە . یەکێك لەو دەرسانەی دەرخستنی بایەخی خەباتی هاوبەش بوو ، ئەو خەباتەی دەبوو ببێتە بەردی بناغەی هەموو بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوای سەرکەوتووی گەلی عیراق .

---

(١٦) بڕوانە :

P. W. Ireland , Iraq . A study in political development , London, 1937 , P. 270, A . L. Haldane, Op. cit., PP. 158 — 160.

(١٧) ل . کاتلۆڤ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٥٦ .

(١٨)

A . L . Haldane , Op . Cit ., P. 247

**یەکەم : هۆکانی «شۆڕشی بیست» :**

کەسێکی بێلایەن نی یە گومان لە گەورەیی «شۆڕشی بیست» بکات(*) . دیارە هەر ڕوداوڕێك یا بزوتنەوەیەکی سەربەخۆ پاڵ بنێ بە دەیان هەزار جوتیارو پاڵەو کرێکارو ڕووناکبیرو «گەجەرو گوجەرەوە» لە پێناوی ماف ڕەوای گەلدا بچنە ناو کۆڕی خەباتەوەو چەك بەدەست بکەونە پەلاماردانی گەورەترین هێزی ئیمپریالی لە جیهاندا دەبێ ڕوداوێکی ئازادیخواو بزوتنەوەیەکی پێشکەوتنخواز بێ . ئەمە تاکە سەنگە بۆ تەرازوی کێشانی بەوردوای بەسەرهاتو ئەنجامی ئەو تەقینەوە گەورەیەی ساڵی ١٩٢٠ زۆر ناوچەو مەڵبەندی عیراقی گرتەوەو سەرانسەری بزواندو لە هەموو ڕۆژهەڵاتی نزیكو ناوەڕاستو ئەوروپاشدا دەنگی دایەوە .

تاقیکردنەوە زۆرەکانی مێژوو ئەوەیان سەلماندووە کە ڕووداوێکی وا گەورە لەخۆوە دروست نابێ ، دەبێ گەلێك هۆی سەرەکیو وردە تێکەڵ بەیەك بنو نارەزاییەکی ئەوتۆ بهێننە کایەوە وا لە هەزاران بکات ئامادە بن گیانیان بەخت بکەن ، گیان بەختکردنیش لە پێناوی نیشتماندا ، وەك لە هەموان ئاشکرایە ، بەرزترین پلەی خەباتە . جا کەوابێ پەر لە هەر باسێکیتر جارێکا با چاوێك بەو هۆیانەدا بخشێنین کە ئاگری شۆڕشی بیستیان بەرپاکرد .

بەر لە دەستپێکردنی سەدەی بیستەمین هەستی نەتەوەییو ئارەزوی سەربەخۆیی لەناو سەرتاپای گەلانی ژێردەستەی عوسمانییاندا تەواو سەری دەرهێنابوو ، گەر هەستی ئایینیو ڕێزی «خەلیفەی موسڵمانان» نەبونایە هەر ئەوسا کە

---

(*) لە گۆڤاری «کاروان» ، ژمارە ١٠ ، تەمموزی ١٩٨٣ ، ل ٢١ - ٣١دا بلاوکراوەتەوە .

جیابونەوەی ڕەوا دەبووە دروشمی سەرەکیی خەباتی ڕۆژانەی کوردو عەرەب‌و هیچ دوور نەبوو ئەو کارە ئیمپراتۆریی لە پەل‌وپۆ کەوتوی عوسمانی بڕمێنێ.

لەگەڵ تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهان‌و کەوتنی ڕژێمی عوسمانیدا هیوای گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە جێ‌بەجێ‌بوونی مافی چارەنووسی‌یان تەواو پتەو بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵانی شەڕدا کاربەدەستانی دەوڵەتە گەورەکان جارەهای جار بەڵێنی دانی ئەو مافەیان بە ڕاست‌و چەپدا بڵاودەکردەوە، دەیانگوت هەر کە شەڕ تەواو بوو گشت گەلانی ناوچەکە سەربەخۆیی وەردەگرن[1].

عیراقی‌یەکان یەکێك بوون لەو گەلانەی دەمێ ساڵ بوو خولیای سەربەخۆیی دابووی لەکەلەیان. لەوان وابوو لەگەڵ کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهاندا ئینگلیز کەل‌وپەل دەدەن بەکۆڵداو گوڵی ڕازاوەی ئازادی‌و سەرفرازی دەکەن بە یەخەیاندا. تێگەیشتنو یەك نەبوو ئەو قسەیەی جەنەراڵ مۆدی لەیاد نەبێ کە ڕۆژی یازدەی مانگی مارتی ساڵی ۱۹۱۷ لەگەڵ داگیرکردنی شاری بەغدادا گوتی «ئێمە ئازادکەرین نەك داگیرکەر». کەچی هەر لەوساوە ئینگلیزەکان بەهەر چوارلادا کەوتنە ڕەگ‌و پەل‌هاویشتن‌و دامەزراندنی دامودەزگای کارگێڕیی خۆیان. کاتێك شەڕیش بڕایەوە ئیتر کەسێکیان جارێکی‌تر توخنی باسی سەربەخۆیی نەکەوتەوە. لەوەیش خراپتر ئەوەبوو کە ژمارەیەك کاربەدەستی گەورەی ئینگلیز ئاشکرا داوایان دەکرد عیراق بەسترێت بە هندستانەوەو بکرێتە بەشێکی ئەو. هی واشیان هەبوو دەیویست تاجی پاشایی بەغدا بنرێتە سەر سەری پیاوێکی ئینگلیزی وەك سێر پێرسی سایکس.

پاشگەزبوونەوەی ئینگلیزەکان لە گفتەکانی جارانیان دەربارەی سەربەخۆیی عیراق بووە هۆی تەقینەوەی هەستی نارەزایی لە قوڵایی دەروونی زۆربەی دەستەو چینەکانی کۆمەڵدا. دەکومێنتە تایبەتی‌یەکانی شۆڕش پڕن لە بەڵگەی سەلمێنەری ئەم ڕاستی‌یە. یەکێك لەو دوو ڕۆژنامەیەی شۆڕشگێڕان لە نەجەفی ئازادکراو چاپیان کردن ناوی «الاستقلال» واتە سەربەخۆیی یا خۆبیون بوو. هەر ئەو ڕۆژنامەیە لەژێر ناوی هەموو ژمارەکانیدا ئەم دروشمەی چاپ دەکرد:

---

(۱) بەشێکی زۆری ناوەرۆکی ئەم وتارەم لەو کتێبەم وەرگرتووە کە ساڵی ۱۹۷۸ بە عەرەبی دەربارەی شوێنی کورد لە شۆڕشی بیستدا بڵاوم‌کردەوە، بۆیەکا بەپێویستم نەزانی هەموو پەراوێزەکانی دووبارە بکەمەوە (بڕوانە: «دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية»، بغداد، ۱۹۷۸).

«ژیان بێ سەربەخۆیی مەحاڵە !»

لە ژمارەی پێنجەمیدا «الاستقلال» نووسیوی‌یە دەڵێ «سەربەخۆیی‌و ئازادی . . . مەرجی سەرکەوتن‌و بنەمای پێشکەوتنی ولاتن»[2] .

«الفرات» کە یەکەم ڕۆژنامەی شۆڕش بوو چەند جارێك بێ پێچ‌وپەنا دانی بەوەدا ناوە کە مەبەستی سەرەکیی شۆڕشگێڕان جێ‌بەجێ‌کردنی مافی چارەنووسی‌و وەدەست‌هێنانی سەربەخۆیی‌یە . لە سەروتاری ژمارە دوویدا فورات نووسیوی‌یە دەڵێ :

«عیراقی‌یەکان باش لەوە گەیشتوون کە داوای یاسایی‌و خوێنیشاندانی ئاشتی‌یانە نە سوود دەبەخشن‌و نە ماف دەگێڕنەوە . بەتایبەتی لەبەر ئەوەش کە دەنگی نارەزایی ڕەوا ناگاتە هیچ دەزگایەکی سیاسیی دەرەوە چونکە ئینگلیزەکان دەستیان گرتووە بەسەر هەموو هۆکانی پەیوەندیی ولاتدا»[3] .

کەوابێ دەبوو لە ڕێگەی لولەی تفەنگەوە داخوازیی ڕەوای سەربەخۆیی گەل‌و نیشتمان بچەسپێنرێ .

ڕاستە هەموان وەك یەك لە باسی خۆیبون نەدەگەیشتن ، بەڵکو هەزاران هەبون بیریان ڕاستەوخۆ بۆی نەدەچو ، بەتایبەتی جوتیاران کە بەهۆی چەوساندنەوەی دەرەبەگی‌و ڕەتاندنەوەی صەدان ساڵەی عوسمانی‌یانەوە لە زۆر ڕووەوە وەك بەردی بن گۆمیان لێهاتبوو . بەلام ئەو تاقانەی لە هەموان باشتر لە بایەخی سەربەخۆیی دەگەیشتن مەبەستیان بوو بەپێی توانا ئەو داخوازی‌یە بۆ ئەندامانی دەستەکانی خوارەوەی کۆمەڵ ڕوون بکەنەوە . لە یەکێك لە پەخشەکانی سەرکردایەتی شۆڕشدا کە تا ئێستەش ماوە ڕەهبەرانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوای ئەو ڕۆژگارەی عیراق داوایان لە سەرەك هۆزانی سەر بە بەرەی نیشتمانیی کردووە مەبەستی دروشمی سەربەخۆیی بۆ پیاوەکانیان لێك بدەنەوە . دەشبو هەموان لە شەرگەکاندا هاوار بکەن «سەربەخۆییمان دەوێ !» .

یاسای ژیان کارێکی ئەوتۆی کردووە گەلێك جار نەبوونی سەربەخۆیی‌و فشاری

(٢) «الاستقلال» ، النجف ، العدد الخامس ، ٢٥ محرم ١٣٣٩ ، ٨ تشرين الاول ١٩٢٠ .

(٣) «الفرات» ، النجف ، العدد الثاني ، ٢٨ ذي القعدة ١٣٣٨ ، ١٤ آب ١٩٢٠ .

ئابووری پێکرا برژێنە ناو یەك ڕێچکەوە . ئەم دیاردەیە ئاشکرا لە ڕوداوەکانی شۆڕشی بیستدا خۆی نواندووە . لە ڕێگەی نانەوە نەدارانی عیراق لەوە گەیشتن جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ لە نێوان داگیرکەری ئیمڕۆو دوێنێدا نی‌یە . بەڵکو چەند هۆیەکی کاریگەریش لە ئارادا بوون وایان لی‌بکەن ڕۆژی هەزار جار ڕەحمەت بۆ کفن‌دز بنێرن .

بەداخەوە گەلێك لە مێژوونووسانی لای خۆمان بایەخێکی ئەوتۆ نادەن بە لایەنی ئابووری وەك هۆی بزوێنی ڕوداوی مێژوویی ، چونکە مرۆ بەلای ئەو جۆرە کەسانەوە داشی دامەی بی‌هەست‌و گیانە . ڕاستە جوتیاری کەم‌فام لە جوتیاری نەفام باشتر بۆ هۆکانی برسێتی‌و ڕێگەی چارەسەرکردنیان دەچی . بەڵام ڕاستیشە برسێتی ناخی دەروونی هەردوکیان وەك یەك دەهەژێنی‌و برسی لە تێر زیاتر ئامادەی خەبات‌و فیداکاری‌یە . برسێتی یەکێکە لەو ڕوانەی ژیان کە هەرگیز لەبیر ناچنەوە . لە کۆمەڵگای دواکەوتودا دەبێتە نیشانەو مێژوو . بیستومانە دەڵێن فلانە کەس ساڵی گرانێکە لەدایك‌بوو ، یا ژنی هێنا ، یا کۆچی دوایی کرد . کە ڕۆژنامەنووسێك چەند ساڵێك لەمەوبەر داوای لە ئافرەتێکی تەمەن درێژی شاری کوفە کرد یادی ڕابوردووی بۆ بگێڕێتەوە بەر لە هەر شتێکی‌تری ژیان باسی خۆشەویستی ئامۆزاکەی‌و ئەوەی بۆ گێڕایەوە چۆن جارێکیان لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی مەدحەت پاشا کە باجگرانی میری هاتوونەتە گوندەکەیان دوای ئەوەی بەفەرمانی براکانی بەدزی‌یەوە وڵاخەکانیانی بەلەسە کردووە کەس‌وکاری بەربوونەتە گیانیان‌و پاش دارکارییەکی چاك شاربەدەریان کردوون[٤] .

بەهۆی گەلێك هۆوە لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکاندا باری ژیانی زۆربەی دەستەو چینەکانی گەل بەرەو خراپی ڕۆیی ، لە کاتێکدا هەموان پی‌یان وابوو نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی برسێتی‌و نەبوونی بن‌بڕ دەکات . بەشێك لەو هۆیانە لە دەسەڵات‌و ویستی ئینگلیزەکان بەدەر بوو . بەسەرهات‌و ئەنجامەکانی شەری یەکەمی جیهان باری ئابووریی سەرشانی هەموانی لە جاران قورستر کرد . ئەوساکە ئینگلیزەکان بۆ خۆیان دووچاری گەلێك کێشەی ئابووریی قورس هاتبون . بەهۆی

(٤) بروانە گۆڤاری «الف باء» ، بەغدا ، ژمارە ٤٧٩ ، ٢٣ی تەشرینی دووەمی ١٩٧٧ ، ل ٢٤–٢٥ .

شەڕەوە نزیکەی سێ یەکی سامانی نەتەوەیی‌یان لەکیس چوبو . لەبەر ئەوە لە وڵاتە ژێردەستەکانیاندا لە جاران ڕەقتر بوون ، دەیانویست بەشی زۆری زیانەکانیان لە دانیشتوانیان دەربهێننەوە ، یا هیچ نەبێ بەشێك لە ئەرکی هێزە داگیرکەرەکانیان بخەنە ئەستۆی ئەوانەوە ، چونکە باجدەری ئینگلیزی بۆ خۆی لە وەرسیا نزیك تەقینەوە کەوتبۆوە ، لەبەر ئەوە کەس لە فەرمانڕەوایان زاتی نەدەکرد بەهۆی باجی نوێوە بیورووژێنێ .

بەو جۆرە لەگەڵ تەواوبوونی شەڕی یەکەمدا فشاری ئابووریی داگیرکەر خۆی نواند . چ بەڵگەکانی ئینگلیزو چ بەڵگەکانی شۆڕش پڕن لە نموونەی سەلمێنەری ئەو ڕاستی‌یە . بەپێی یەکەمیان ئەو باجەی عیراقی‌یەکان ساڵی ١٩١٩–١٩٢٠ دایانە ئینگلیزەکان دوو هێندی ئەو باجە بوو کە ساڵی ١٩١١–١٩١٢ دایانە عوسمانی‌یەکان . بەر لەبەرپابوونی ئاگری شۆڕشی بیست ئەو باجەی عیراقیك دەیدایە داگیرکەرانی نیشتمانی دەهێندی ئەو باجە بوو کە هندۆسێکی پەنجابی دەیدانێ . ڕۆژنامەی «دێلی مێل»ی لەندەنی ڕۆژی دوازدەی تەمموزی ساڵی ١٩٢٠ ، واتە لە گەرمەی شۆڕشدا ، لەبارەی مەسەلەی باجەوە نووسیوی‌یە دەڵێ :

«بەپێی بودجەی ساڵی ١٩١٩ – ١٩٢٠ ئەو باجەی لە عیراق کۆکراوەتەوە پێنج ملیۆن‌و ٥٠٠ هەزار پاوەنە ، واتە هەر کەسەی دوو پاوەنی بەرکەوتووە ، ئەوەی تا ئیمرۆکە لە هیچ وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتیدا لە وێنەی نەبینراوە . لە بەریتانیای گەورە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکجار دەوڵەمەند بوو کاتی شەڕی یەکەمی جیهان هەر کەسەی تەنها سێ پاوەن‌و نیو باجی بەردەکەوت» .

لەم بارەیەوە گەر کەمێك لە ناوچە کوردەواری‌یەکانی عیراق نزیك‌بکەوینەوە تووشی گەلێك نموونەی سەیر دێین . لەوێ مەڵبەندی وا هەبوو ئەو باجەی دەیدا لە صەدا شازدە لەوە زیاتر بوو کە بەپێی یاسا دەبوو لە مەڵبەندە باراناوی‌یەکاندا کۆبکرێتەوە .

هیچ وەك ئەو ئەرکە زۆرەی بەهۆی ئینگلیزەکانەوە کەوتە ئەستۆی توتنەوانانی کوردستانەوە بۆی نی‌یە ئەم لایەنەی باسەکەمانمان بۆ ڕوون بکاتەوە . ئینگلیزەکان بایەخی زۆریان بە توتنی کوردەواری دا . بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیەك شارەزایان لە

دەرەوە هاتی کە یەکێکیان شتراوسی پسپۆری ئەمەریکایی بوو . ئەنجامی ئەو بایەخ پێدانە بەر لە هەر شتێکی تر لەو باجە زۆرەدا خۆی نواند کە کەوتە ئەستۆی توتنەوانانی کوردستانەوە کە هەر یەکەیان دەبوو پازدە هێندی ئەو باجە بدات کە باووباپیرانی رۆژانی عوسمانی یان دەیاندا .

بەهەمان دەستوور ئینگلیزەکان بایەخیان دا بە هەموو بەرهەمێکی کشتوکاڵ و لێرو دارستان و ئاژەڵی سەرتاپای وڵات . تەنانەت یەکێك لە فایلەکانی دەزگای پاراستنی بەڵگە کۆنەکان تەنها بۆ باسی بەرهەمی ترشی ناوچەی هەولێر تەرخان کراوە[٥] . بێ گومان کەس لاری لەوە نی یە کە ئەو جۆرە بایەخ پێدانە نیشانەی پێشکەوتنە ، بەڵام مەبەستی سەرەکی ئەوسای ئینگلیزەکان باج و باجگری بوو .

ژمارەیەك لە کاربەدەستانی ناوچەکانی کوردستان بۆ خۆیان لیستەی باجی تایبەتی یان دادەنا . لیستەکەی مێجەر سۆنی بەناوبانگ کە بۆ سلێمانی و دەوروبەری داینا و وەك پاشکۆی رۆژنامەی «پێشکەوتن» بلاوی کردەوە لە ٢٣ خاڵ پێکهاتبوو[٦] . بەپێی ئەو لیستەیە هەر جوتیارێك زەوی میری بەکار دەهێنا دەبوو لە ٤٠٪ی پوختەی بەرهەمی بهێنێتە قشلە . خاوەن رەزو بێستان پێویست بوو ساڵی روپی یەك[٧] بۆ هەر درەختێك لە درەختە پێنج ساڵانەکانی و روپی و نیوێك بۆ ئەو درەختانەی بدات کە تەمەنیان حەوت ساڵ یا زیاتر بوو . ئەو پارەیە بەلایەنی کەمەوە پێنج هێندی ئەو پارەیە بوو کە خاوەن دارخورمایەك لە باشوور دەیدا ، وە بەلایەنی کەمەوە دوازدە هێندی ئەو پارەیە بوو کە خاوەن دارخورمایەك لە رۆژگاری فەرمانرەوایی عوسمانی یەکاندا دەیدا .

وێڕای ئەوە لیستەکەی مێجەر سۆن دەرفەتی قوتاربوونی بۆ کەس نەهێشتبۆوە . هەر بەو جۆرەش سۆن توانی ئەرکی کارگێری و سەربازیی سەرتاپای ناوچەی سلێمانی

---

(٥) بروانە :

المركز الوطني للوثائق ، بغداد ، رقم الملف :

21/D , Sub Agriculture — Arbil Division , 1920

(٦) «پێشکەوتن» ، سلێمانی ، ١٧ی حوزەیرانی ١٩٢٠ .

(٧) لەگەڵ داگیرکردنی عیراقدا ئینگلیزەکان روپیی هندی یان لەبریتی لیرەو قرشی عوسمانی خستە بازارەوە . روپی یەك ٧٥ فلس بوو .

بخاته سەر شانی دانیشتوانی . لەو ساڵەداکە شۆڕشی بیستی تێدا تەقی‌یەوە مێجەر سۆن نزیکەی ٣ ملێون‌و ٢٠٠ هەزار ڕوپیێ باجی کۆکردەوەو هەر بەو پارەیەش ناوچەکەی بەڕێوە بردو خەڵکەکەی سەرکوت کرد ، دەوروبەری دوو ملێونی بۆ کاری سەربازی‌و دروست‌کردنی ڕێگەو بان‌و پرد خەرج کردو ئەوی مایەوە کردی‌بە موچەی خۆی‌و پیاوەکانی[٨] .

ئینگلیزەکان زۆر جار بە دەستووری عوسمانی‌یان بە هەزاران جوتیاریان لە کاری ڕۆژانەیان دەکردو بە سوخرە ڕێگەو بان‌و بەندو بنکەیان پێ دروست دەکردن . بۆ خۆیان دانیان بەوەدا ناوە چۆن جاروبار بەزەبری چەك ملی کاریان بەو جوتیارانە دەدا . لە کاری‌خۆکردنی جوتیارو ، بەو شێوازە ، هەم بۆتە هۆی وەڕس‌بوونی چ خۆی‌و چ ئاغای . بەڵام سەرباری ئەوەش گەلێك جار بەری ڕەنجی بەفیڕۆچووی کاری سوخرەی جوتیاران دەبوە هۆی ماڵ‌وێرانی بۆ خۆیان . یەکێك لەو ڕاپۆرتانەی کاتی خۆی دراوەتە پەرلەمانی بەریتانی باسی ئەوە دەکات چۆن ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی ئاوی ناو ڕوباری دیجلە وا بەرزبکەنەوە کە پاپۆڕەکانیان بتوانن بەکاری بهێنن ، چەند جۆگەو بەندێکیان دروست‌کردووە کە بوونەتە هۆی بڕینی ئاوی مەرەزەی ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە نیشتەجێکانی عەمارەو سوق الشیوخ .

باری قورسی باجی نوێی ئینگلیزەکان بە گوندو لادێ‌یەوە نەوەستا ، وێڕای ئەوان هەناسەی دانیشتوانی شارانیشی سوار کرد . کار گەیشت بەوەی جەنابی حاکمی نەجەف «مردوانە» دابنێ ، کەسوکاری هەر مردوویەك دەبوو بەر لە ناشتنی تەرمەکەی «باجی خۆشی»(!) بدەن . ساڵی ١٩١٨ داهاتی ئەو باجە سەیرە گەیشتە ٤٨ هەزار ڕوپیێ‌و بڕیار وابوو لە ماوەی ساڵێکدا خۆی بدات لە ملیۆنێك‌و ٢٠٠ هەزار ڕوپیێ .

لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عوسمانی‌یەکاندا باجدەر لە هەزار ڕێگەو فروفێڵەوە خۆی لە بەشی زۆری ئەو باجەی دەکەوتە سەری ڕزگار دەکرد . ناوچەو مەڵبەندی ئەوتۆ هەبوون دەستی میری‌یان نەدەگەیشتێ . صدیق الدملوجی کە باسی مێژووی بادینان دەکات دەڵێ بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان ژمارەی جەندرمەی گەلێك

---

(٨) «پێشکەوتن» ، ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٠ .

ناوچەی لە سێ چوارێك تێپەڕی نەدەکرد ، ئەوانیش هەمیشە قۆرەی سکیان دەهات ، جاری وا هەبوو بە دوو سێ مانگ کەرەتێك موچەیان وەرنەدەگرت ، گەر دەستی یاریدەی خەڵکەکە نەبوایە لەبرسانا دەمردن[٩] . جا هەرکەس بیەوێ بە ئاسانی دەتوانێ لە ڕادەی دەسەلاتو بەرەڵلایی بێئەندازەی ئەو ڕۆژگارە بگات ، ئەوەی لە ژێر سایەی دەسەلاتی بەهێزی ئینگلیزدا زەحمەت بوو بۆ کەس بلوێ . داگیرکەری نوێ ئەفسەرو کاربەدەستی دلسۆزو شارەزاو لێهاتووی هەبوو ، مەترەلۆزو تۆپو فڕۆکەی بەکار دەهێنا . گۆڤاری لەندەنیی بەناوبانگ «ڕۆژهەلاتی نزیكو ناوەڕاست» بێ هیچ پێچو پەنایەك باسی ئەوەی کردووە چۆن ئینگلیزەکان تەنانەت فڕۆکەشیان دژی باجدەران بەکار دەهێنا[١٠] . لە زۆر ناوچە ئینگلیزەکان پەنایان دەبردە بەر جووە حسابزانەکان بۆ کۆکردنەوەی باجو سەرانە نەبا کەسێك پۆلێکی بەسەرەوە بمێنێ . پیرانی شاری سەماوە تا ئێستەش ناوی ساسۆن ئەفەندییان لە یادە کە ، وەك دەڵێن ، خەرمانیانی بە دەنك دەبژارد . بۆ عیبرەت جاری وا هەبوو ئەفسەرە سیاسییەکان ئەوانەی لە دانی باج خۆیان دەدزییەوە بەپەنگیان دەکردن ، بە بەرگی سوورەوە خۆلو دۆیان دەکرد بەسەریاناو بەناو شاردا دەیانگێڕان .

بێ گومان نەدەبوو ئەو هەموو فشارە ڕقی دانیشتوانی عیراق لە داگیرکەری نوێی خاکی نیشتمانی هەڵنەسێنێ . ژمارەیەك لە بەڵگەکانی شۆڕش ڕاستەوخۆ توخنی ئەو باسە گرنگە کەوتوون . ڕۆژنامەی «الفرات» لە یەکێك لە ژمارەکانیدا ڕووی دەمی کردۆتە ئارنۆلد ویلسنی جێگری حاکمی سیاسیی گشتیو پێی دەڵێ :

«خاکی هەموو ناوچەیەك شایەتە چۆن تەنانەت دەنکە جۆی ناو دەنوکی مەلیشیتان لێزەوت کردوینو مۆخی ئێسقانتان دەرهێناوینو باجی سەرشانی جوتیارانتان چەند هێندێك بۆ زیاد کردووین . . . ئا ئەمەیە عەدالەتتان»[١١] .

---

(٩) صديق الدملوجي ، امارة بهدينان الكردية أو امارة العمادية ، موصل ، ١٩٥٢ ، ص ٨١ ، ١٤٩ – ١٥٠ .

(١٠) (The Near East and India), November 23, 1922, PP. 194–150

(١١) «الفرات» ، العدد الخامس ، ٢ محرم ١٣٣٩ .

تێکەڵبوونی عیراق بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهانەوە دەمێك ساڵ بوو مەینەتیی بۆ پیشەگەرانی وڵات هێنابوو . دوای ئەوەی لە ئەنجامی شەڕی یەکەمی جیهاندا ئینگلیزەکان دەسەڵاتی خۆیان لە سەرانسەری عیراقدا دامەزراند هێندەی‌تر دەرگەیان بۆ بەرهەمی کارگەکانیان ئاواڵەکرد . هەر بەو پێیەش هێندەی‌تر گلۆڵەی پیشەگەران کەوتە لێژی . بە دەیان کەس لە جۆلاّیانی بەغداو شوێنی‌تر نابوتیان کرد . لای خۆشیان ئەو دیاردەیە سەری دەرهێنا . جۆلاّگەریی شارە گەورەکانمان تەواو ڕووی لەکزی کرد . ساڵی ١٩٠٢ مارك سایکس لە کاتی گەشتە بەناوبانگەکەیدا لە شاری سلێمانی ١٥٠ دوکانی چەکسازیی ژماردووە[١٢] ، دوای شەڕی یەکەم لە هەموو بازاڕو قەیسەری‌یەکانی شاردا دوان سیانێکیان مابونەوەو داهاتی ئەوانیش بەشی ژیانی کولەمەرگیی خاوەنەکانیانی نەدەکرد ، کاری سەرەکیشیان هاتبووە سەر فیشەك پڕکردنەوە .

شەڕی یەکەمی جیهان‌و ئەنجامەکانی گرانی‌و کاولی‌یان بۆ زۆربەی هەرە زۆری ناوچەو مەڵبەندەکانی عیراق هێنا . هەرچەندە تۆباڵی ئەو کارە بەر لە ئینگلیزەکان دەکەوتە ئەستۆی عوسمانی‌یەکانەوە ، بەڵام خەڵکی لەوانی دەناسی . بەهۆی سەفەربەرلك‌و نەمانی بەشی زۆری ئاژەڵی کارەوە بەرهەمی کشتوکاڵی عیراق لەگەڵ تەواوبوونی شەڕدا هاتە سەر چوار یەکی بەرهەمی پێشوی . لەبەر ئەوە نرخی دەغڵ‌و دان جارو نیوێك تا دوو جارو نیو زیادی کرد . چا سێ هێندو شەکر پێنج هێندی جاران گرانتر بوون . لەو ناوچانەدا کە بەر لە شەڕ ماسی‌یان وەك تۆڵەکە وابوو ، دوای شەڕ لەتاو گرانیی ماسی هاوار لە دانیشتوانیان هەڵسا[١٣] .

---

(١٢) بڕوانە :

c. J. Edmonds , Kurds , Turks and Arabs. Politics travel and research in North – Eastern Iraq, London , 1957 , P . 80

(١٣) المركز الوطني لحفظ الوثائق ، الملف :

125/514 (Fish Tax , 1915 – 1918).

شاری سلێمانی [١٤] باشترین نموونەی ئەو کاولکارییەیە کە سەرانسەری ناوچەکە بەهۆی بەسەرهاتەکانی شەڕی یەکەمی جیهانەوە تووشی هات . بەپێی بەڵگەکانی ئینگلیز تا شەڕ تەواو بوو لە ٢٩ مزگەوتی شار تەنها دەیان بەپێوە مابوون . هەر لەو ساڵانەدا ٣ تەکیێو ٥ گەرماوو ٥ ئاشی ئاوو ٩ خانو ١٣ بێستانو ١٦ چایخانەو ٤ قەیسەریو ٦٨٧ دوکانو ١٨١٣ خانوی سلێمانی بەتەواوەتی ڕوخان . بەشێك لەو ژمارانە زۆر لە نیوە زیاترن . بەر لە شەڕ سلێمانی ٢٩ مزگەوتو ٣ تەکیێو ٣١ چایخانەو ١١ گەرماوو ٢٤ ئاشی ئاوو ١٨ بێستانو ٦ قەیسەریو ٣٢٠٥ خانوی تێدا بوو . واتە بەهۆی شەڕەوە نزیکەی لە ٢١٪ی ئاشەکانیو لە ٤٥٪ی خانەکانیو نزیکەی لە ٤٦٪ی گەرماوەکانیو نزیکەی لە ٥٢٪ چایخانەکانی و نزیکەی لە ٥٦٪ دوکانی ناوبازارەکانیو نزیکەی لە ٥٧٪ی خانوکانیو نزیکەی لە ٦٦٪ی مزگەوتەکانیو نزیکەی لە ٦٧٪ی قەیسەرییەکانیو نزیکەی لە ٧٣٪ی بێستانەکانیو لە ١٠٠٪ تەکیێکانی بەجارێك کاول بوون . بۆیەکا هیچ سەیر نییە نووسەرانی ئەو ڕاپۆرتە پێشنیاریان کردووە واز لە خودی شارەکە بهێنرێو لە تەنیشتییەوە شارێکی نوێ دروست بکرێ [١٥] .

بەڵگەیەکی تری هەر ئەو ڕۆژگارە باسی ئەوە دەکات چۆن لە سەدا هەشتای دانیشتوانی سلێمانی بەهۆی شەڕەوە یا نەماون ، یا کۆچیان کردووەو چۆن بەرهەمی کشتوکاڵی پێنج یەکی بەرهەمی جارانییەو نرخی تەنێك گەنمی گەیشتۆتە ١٦٠٠ ڕوپیێو هی تەنێك برنجیشی گەیشتۆتە ٢٤٠٠ ڕوپی [١٦] . بەپێی قسەکانی ڕۆژنامەی

---

(١٤) لەبەر دوو هۆی سەرەکی وامان بەپێویست زانی زۆربەی ئەو بەڵگانەی دەیانهێنینەوە پێوەندییان بە ناوچە کوردەوارییەکانەوە هەبێ ، یەکەمیان چونکە دەربارەی ناوچەکانیتری عیراق شتی زۆرو دەربارەی ناوچەکانی لای خۆمان شتی کەم بڵاوکراوەتەوە . دووەمیشیان لەبەر ئەوەیە کە دەمانەوێ لە ڕێگەی ڕاستییەکانی ناو ئەم وتارەوە هۆکانی خۆش‌کردنی ئاگری بزوتنەوەی ڕزگاریخوای ئەو قۆناغەی کوردستان دەست‌نیشان بکەین .

(١٥) المركز الوطني لحفظ الوثائق ، الملف :

20/01 (Sulaimaniyah Municipality , 1920).

(١٦) المركز الوطني لحفظ الوثائق ، الملف :

67/17 (Sulaimaniyah , Scarcity).

«العرب» کە ئینگلیزەکان ئەوسا لە بەغدا دەریان دەکرد لە هیچ شارێکی تری عیراقدا گرانی نەگەیوەتە ئەو رادەیە[17] .

گەلێك لە ئینگلیزە ئەوروپایی‌یە پێشکەوتووەکان کە هاتنە عیراق ویستیان ، بێ ئەوەی گوێبدەنە دابو نەریتی ئایینیو نەتەوەییو تەنانەت هۆزایەتی ناوچەکە ، وەك لای خۆیان رەفتار بکەن ، ئەو کارەی بووە هۆی تەقینەوەی نارەزاییەکی بێ‌ئەندازە لە ناخی دەرونی ساکارانی ولاَتدا . ئەو مێژوونووسانەی باسی شۆڕشی بیستیان کردووە[18] لەو بارەیەوە گەلێك نمونەو بەلَگەیان دەربارەی ناوەندو باشووری عیراق هێناوەتەوە . بۆیەکا لێرەشدا تەنها چەند نمونەیەکی لای خۆمان دەهێنینەوە . ئینگلیزەکان لە شارەکانی کوردستاندا ئاشکرا رێگەیان دا بە زۆر کەس نەك تەنها مەی ، بەلَکو تەنانەت بەنگیش بفرۆشن . شاری واش هەبوو نەك تەنها تیاترۆیان تیا دانا ، بەلَکو کارخانەشیان تێدا کردەوە . تیاترۆکەی هەولێر شەری قورسی بەخۆیەوە بینی[19] . «لاوی چیا»[20] ئەنوەر مانی دەلَێ هاتنی ئینگلیزەکان کاری کردە سەر رەوشتی بەشێك لە بادینی‌یەکان[21] .

ئەو ئینگلیزانەی لە ولاَتی خۆیاندا نمونەی نەرمو نیانیو رەوشتی زۆر جارکە دەبنە کاربەدەستی ولاَتە ژێردەستەکانیان بە لوت بەرزیو دلَرەقی لەگەلَ دانیشتوانیان دەجولَێنەوە . زۆربەی ئەو نووسەرانەی باسی بیستەکانیان کردووە چەند نمونەیەکیان لەو بارەیەوە هێناوەتەوە . یەکێکیان لە یادداشتەکانیدا باسی ئەوە دەکات چۆن جارێکیان شێخێکی باقوبە لای حاکمی سیاسیی شار دەبێ ، لەو کاتەدا سەگەکەی

(١٧) «العرب» ، بغداد ، ٣ ايار ١٩١٩ .

(١٨) بەتایبەتی مامۆستایان حەسەنیو وەردیو فەیاز (بڕوانە : عبدالرزاق الحسني ، الثورة العراقية الكبرى ، الطبعة الثالثة الموسعة ، بيروت – صيدا ، ١٩٧٢ . الدكتور علي الوردي ، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ، الجزء الخامس ، القسم الاول ، بغداد ، ١٩٧٧ ، القسم الثاني ، بغداد ، ١٩٧٨ . الدكتور عبدالله الفياض ، الثورة العراقية الكبرى سنة ١٩٢٠ ، الطبعة الثانية ، بغداد ، ١٩٧٤) .

(١٩) بڕوانە :

«صدى الاحرار» (جريدة) ، الموصل ، ٢٠ شباط ١٩٥٣ .

(٢٠) لاوی چیا نازناوی ئەنوەر مانی‌یە .

(٢١) انور المائي ، الاكراد في بهدينان ، الموصل ١٩٦٠ ، ص ١٨٤ – ١٨٥ .

جەنابی حاکم توخنی دەکەوی‌و ئەویش کە سەگ بەلایەوە گلاوە کەمێك خۆی لێ‌دوور دەخاتەوە . حاکم لە پیرەشێخ دەخوڕی‌و بە مۆنی‌یەوە پێی دەڵێ : یا شێخ سەگەکەم زۆر لەتۆ خاوێن‌ترە[٢٢] . دیارە ئەو قسەیە ئەگەر ڕاستیش بێ گوتنی ڕەوا نی‌یە .

ئەفسەرانی ئینگلیز بەهەمان دەستوور لەگەڵ دانیشتوانی ناوچە کوردەواری‌یەکاندا ڕەفتاریان دەکرد . مێجەر سۆن کەی بهاتایە ناوبازاڕ دەبوو هەموان بەرزە پێ لەبەری هەڵسن . ڕاستە ئەو وەك گرینهاوسی ئەفسەری نەجەف قامچی بەکار نەدەهێنا ، مەرایی‌کەران خۆیان ملیان بۆ دەداو بە شانوباهویاندا هەڵدەدا ، بەلاّم خۆیشی ئەوەی دەویست . مێجەر سۆن پیاوەکانیشی بەردابووە گیانی خەڵکی شار . عەزیز خان کە یەکێکیان بوو کابرایەکی نەخوێندەواری چاوچنۆكو دڵڕەق بوو . ئەو پیانۆی هێنایە سلێمانی[٢٣] .

پریشکی ڕەفتاری ناهەمواری ئەفسەرانی ئینگلیز گەلێك لە پیاوماقوڵانی کوردستانی گرتەوە کە یەکێکیان شێخی بەردەقارەمانی نەمر بوو . مەحمود جەودەتی نیشتمانپەروەری بەناوبانگ لەتاو سۆن ناچار بوو سەری خۆی هەڵگرێ .

بەڵگەکانی لقی موسڵی «کۆمەڵەی عەهد»[٢٤] گەلێك ڕاستی بایەخداری لەم بارەیەوە بۆ پاراستووین ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە پێوەندی‌یان بە ڕەفتاری ناشرینی ئەفسەرانی ئینگلیزەوە لەگەڵ شێخانی بادیناندا هەیە . ڕۆژی چواردەی مانگی ئابی ساڵی ١٩١٩ لقی موسڵی کۆمەڵەی عەهد نامەیەکی ناردە بارەگای بەرزی کۆمەڵە لە شام دەربارەی ئازاردانی نەقشەبەندی‌یەکان . ڕابەرانی لقی موسڵ لە نامەکەیاندا دەڵێن :

---

(٢٢) بڕوانە :
طالب مشتاق ، اوراق أيامي ، الجزء الاول ، بيروت ، ١٩٦٨ ، ص ٩١ .

(٢٣) بڕوانە :
«پێشکەوتن» ، ٦ی مایسی ١٩٢٠ .

(٢٤) «جمعية العهد» یەکێك بوو لەو کۆمەڵە سیاسی‌یانەی ڕووناکبیرانی عەرەب دایانمەزراندن . دوای شەڕ بارەگای بەرزی عەهد لە شام بوو . لقی مووسڵی عەهد یەکێك بوو لە لقە هەرە چالاکو دڵسۆزەکانی کە زۆربەی ئەندامانی تا سەر بە خاوێنی مانەوە .

«ئێمە تەواو دڵتەنگین بەهۆی ئەو شێخانەوە . . . ئینگلیزەکان بێپەروا دەیانەوێ سەر بە هەموو سەربەرزێك شۆڕ بکەن‌و ئازاری هەموو سەردارێك بدەن گەر کوێرانە دوویان نەکەون ، یا وەك دەیانەوێ مل بۆ فەرمانەکانیان نەدەن . هەمان کات ئەوان چاویان بەرایی نایەت کەسێکی خاوەن دەسەڵاتی وەك جەنابی شێخ بەهاددین ئەفەندی نەقشەبەندی ببینن گەر نەتوانن بیکەنە داردەستی خۆیان»[٢٥] .

هەمووی بەسەر یەکەوە دوو حەفتەی نەخایاند کاتێك لقی موسڵی کۆمەڵەی عەهد نامەیەکی تایبەتیی‌تری نارده شام‌و ئەم هەواڵەی خوارەوەی بە بارەگای بەرزی کۆمەڵە ڕاگەیاند :

«بەر لە چەند ڕۆژێك ئینگلیزەکان لە هەولێر سەعید ئاغاو کورەکەی‌و ژمارەیەك هاوڕێیانیان بە تۆمەتی کوشتنی چاوەشێکی ئینگلیزو برینداركردنی دوو پۆلیس‌و دوو جەندرمە گرت . یەکێك لە پۆلیسەکانیش ئینگلیزو ئەوی‌تریان عیراقی‌یە . هەروەها ژمارەیەك لە پیاوەکانی سەعید ئاغاش بریندار بوون . ئەو هەرایە لەسەر ئەوەبوو کە ڕۆژێك لەوەپێش چاوەشەکە لە تیاترۆ لە کوڕی سەعید ئاغای داوەو گەلێك جنێوی ناشرینی پێ‌داوە»[٢٦] .

زەبرو زۆری ئینگلیز بێ جیاوازیی چین‌و دەستە هەموانی گرتەوە . لقی موسڵی «کۆمەڵەی عەهد» لە نامەیەکی‌تریدا ڕۆژی ٨ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٩ نووسیوی‌یە دەڵێ :

«داگیر کەران هیچ زۆرداری‌یەك لە باریاندا نەماوە لەگەڵ خەڵکیدا بەکاری نەهێنن . کەمترین هەڵەی هەر کەسێك دەبێتە هۆی دارکاری‌کردنی بە ڕوتو قوتی‌و زۆر جار تەنی ئەو کەسە دەهێننە خوێن‌و جی‌قامچێکانیان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دەبێتە دوومەڵ‌و هەو بە لەشی‌یەوە . خەڵکی وایان لێهاتووە سزای پارە

---

(٢٥) «صدى الاحرار» ، ١٣ شباط ١٩٥٣ .

(٢٦) «صدى الاحرار» ، ٢٠ شباط ١٩٥٣ .

که بۆته گەورەترین داهاتی داگیرکەر بە نیعمەتی دابنێن لە عاستی لێدانو دارکاریو پێ‌کردنی کاری نزمدا . خۆزگا ئەوانەی ئینگلیز بە تاوانباریان دادەنێن وابونایە ! گەلێك کەس ئاخنراونەتە زیندانەکانەوە بێ‌ئەوەی تاوانێکیان لەسەر کرابێتە مالّ ، یا دادگەیەك بریاری گرتنیانی دابێ . بەوێنە ١٨ گۆیانی‌یان[٢٧] گرتووە بێ ئەوەی هیچ پێوەندی‌یەکیان بەو رووداوانەوە هەبێ کە لەناو چیاکاندا قەومان ، ئەوان دەمێکە لە موسلّ بە حەمماڵی دەژین . ئەو گۆیانی‌یانە تاوەکو کۆلۆنێل لێچمەن نەگوێزرایەوە دلێمو کاپتەن بێل نەهاتە جێگەی بەرنەدران»[٢٨] .

کاربەدەستانی ئەوسای ئینگلیز چەند جارێك دانیان بەوەدا ناوە کە جۆری رەفتاری بەشێك لە ئەفسەرانیان بۆتە هۆی دروست‌بوونی رقێکی زۆر لە ناخی دەروونی زۆرینەی دانیشتوانی عیراقدا . خاتو بێلی بەناوبانگ[٢٩] هەرچەندە گەلێك پاکانەی بۆ زۆربەی هاوکارەکانی کردووە ، بەلاّم چەند جارێکیش لە نووسینەکانیدا پەنجەی بۆ ئەو راستی‌یە راکێشاوە . لەوەیش گرنگتر رای جەنەرال هالدەینە کە بۆ خۆی فەرماندەی ئەو لەشکرە بوو کە دامرکاندنەوەی شۆرشی بیستی کەوتە ئەستۆ . هالدەین رەفتاری ناهەمواری ئەفسەرانی ئینگلیز بە یەکێك لە هۆ سەرەکی‌یەکانی شۆرش دادەنێ[٣٠] .

هەمان راستی لە بەلّگەکانی شۆرشیشدا بەدی دەکرێ . رۆژنامەی «الفرات»ی داخ لەدلّ وای لێهاتووە ئۆبالّی هەموو خراپەکاریو زەوت کردنێکی کۆنو نوێ لە مێژوودا بخاتە ئەستۆی ئینگلیزەکانەوە . وای لێهاتووە سلاّوی رێز بنێرێ بۆ تاریکستانی سەدە ناونجی‌یەکانو فەرعەونەکانو چەنگیز خانو تەیموری لەنگو هۆنە

---

(٢٧) مەبەست لەئەندامانی هۆزی گۆیانی نیشتەجێی باکووری زاخۆیە . گۆیان یەکەم هۆز بوو لە عیراق چەکی دژی ئینگلیز هەلّگرت .

(٢٨) «صدى الاحرار» ، ٣ نیسان ١٩٥٤ .

(٢٩) مەبەست میس بێلە کە کاربەدەستێکی گەورەی ئینگلیز بوو لە عیراق . جاروبار بە «شاژنی بێ تاج» ناو دەبرێ .

(٣٠) A.L. Haldane, The Insurrection Mesopotamia, Edinburgh, 1922. PP. 20 — 21.

خوێنرێژەکانی ئەوروپا ، چونکە ، وەك دەڵێ «خوایە خۆت ئاگاداری ئەوان هەستیان ناسکترو دڵیان چاکتر بوو لە ئینگلیزە زۆردارە بەربەرەکان»[31] .

عیراقیەکان بە عەرەب‌و کوردیانەوە پێیان وابو لەگەڵ نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی‌و هاتنی ئینگلیزدا تیشکی ژیاری‌و نیعمەتی خوێندەواری دەگاتە هەموو قوژنێکی وڵات . بێگومان هەرچۆن بێ‌و لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا ژێردەستەیی ئینگلیز خەڵکی لە ژیانی شارستانەتی نزیکتر دەخاتەوە وەك لە ژێردەستەیی عوسمانی . بەڵام بەهۆی ئەو بارە یەکجار گرانەوە کە شەڕی یەکەمی جیهان خستیە ئەستۆی هەموانەوە قۆرت کەوتە ڕێگەی ئەو دیاردەیەوە . ئینگلیزەکان دەستوبرد شتێکی ئەوتۆیان بۆ نەکرا ، خەڵکیش پەلەیان بوو . لەبەر گەلێك هۆی تێکهەڵکێش باری خوێندەواریی وڵات لە ساڵانی یەکەمی دوای شەڕدا دایە دواوە . هەموو ئەو پارەیەی ئینگلیزەکان ساڵی ١٩١٩ – ١٩٢٠ بۆ کاروباری خوێندنیان دانا بریتی بوو لە ٧٠ هەزار لیرەی عوسمانی ، واتە دوو هێندی ئەو پارەیەش نەدەبوو کە عوسمانیەکان ساڵی ١٩١١ – ١٩١٢ تەنها بۆ ویلایەتی بەغدایان دانا . لەبەر ئەوە هیچ سەیر نییە ژمارەی قوتابخانەکانی هەموو عیراق هاتە سەر نیوەی ژمارەیان لە ساڵی ١٩١٤دا . کار گەیشت بەوەی ئینگلیزەکان لە شارێکی وەك موسڵدا ژمارەیەك قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و فێرگەیەکی ئامادەکردنی مامۆستایان دابخەن[32] .

کاروباری خوێندن لە ناوچە کوردەوارییەکاندا لەوەیش خراپتر بوو . مێجەر سۆن لە پتر لە ٣ ملیۆن ڕوپیێ داهاتی ناوچەی سلێمانی خۆی تەنها ٦٣ هەزار ڕوپیی بۆ کاروباری خوێندنی تەرخانکرد ، واتە نزیکەی لە ٢٪ی داهاتی ناوچەکەو ٢٠ هێند لەو پارەیە کەمتر کە بۆ پۆلیس‌و پاسەوانە تایبەتییەکانی خەرجکرد[33] .

ئەو جۆرە هەڵوەستە کارێکی ئەوتۆی کرد لە سەرەتای فەرمانڕەوایی ئینگلیزەکاندا خوێندنی کوردی ، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە چاوەڕوان دەکرا ، بداتە

---

(٣١) «الفرات» ، العدد الرابع . ١٣ ذی الحجة ١٣٣٨ .

(٣٢) «العرب» ، ١٣ ایار ١٩١٩ ، «صدی الاحرار» ، ٣ نیسان ١٩٥٣ .

(٣٣) بەپێی ئەو ژمارانە لێکدراوەتەوە کە مێجەر سۆن بۆ خۆی لە ڕۆژنامەی «پێشکەوتن»دا بلاوی‌کردوونەوە (بڕوانە : «پێشکەوتن» ، ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٠) .

دواوه . دوای تەواوبوونی شەڕ ئینگلیزەکان تەنها قوتابخانەیەکی سەرەتایی‌یان لە سلێمانی کردەوە ، لە کاتێکدا بەر لە شەڕ لە هەمان شار دوو قوتابخانەی سەرەتایی‌و یەکێکی ناوەندی‌و فێرگەیەکی سەربازیی هەبوو کە ژمارەی قوتابیانیان بەسەر یەکەوە ۳۳۰ کەس‌و ژمارەی مامۆستایانیان ۲۰ کەس بوو . لە کۆتایی بیستەکاندا دیسان لە سلێمانی تەنها ۱۰ قوتابی ناوەندیی هەبوون ، واتە شازدە جار کەمتر بوون لە ژمارەی ساڵی ۱۹۱٤یان . هەر ئەو دەوروبەرە ژمارەی شاگردانی قوتابخانە کوردی‌یەکانی سەرانسەری کوردستانی عیراق ١٥٤٥ کەس بوو ، بەرامبەر ٦٣٠٠ کەس کە لە قوتابخانە گاورەکان‌و ٨٤٠٠ کەس کە لە قوتابخانە جووەکان دەیانخوێند[٣٤] .

ڕاستە ئەوانەی حسابێکی ئەوتۆیان بۆ ئەم لایەنەی ژیانی ڕۆشنبیریی ئەوساکە دەکرد کەم بوون ، بەڵام ئەوانەی بایەخیان پێ دەدا ، واتە ڕووناکبیران یا ئینتیلیگێنسیا (ئینتلیجێنسیا) ، دەستەیەکی کاریگەری کۆمەڵیان پێك‌دەهێنا کە هی وایان تێدا بوو سەرەتا بەدڵ هاتنی ئینگلیزیان پێ‌خۆش بوو .

هۆکانی کۆبوونەوەی نارەزایی لە ناخی دەروونی عەرەب‌و کوردی عیراقدا لەوانە زیاترن کە تاوەکو ئیستە باسمان‌کردن . لەناو ئەو هۆیانەدا شوێنی هەستی ئایینی یەکجار گەورەو دیارە ، بە ڕادەیەك مێژوونووسی عیراقی ئەوتۆ هەیە دەیکاتە هۆی یەکەمی بەرپابوونی ئاگری «شۆڕشی بیست» . زۆر کەس بە چاوی کافرو زەندیق سەیری ئینگلیزیان دەکرد ، تەنانەت ئەوانەشیان کە بەدەورو خولیاندا دەهاتن دوای خۆیان قاپەکانیان بسمیل دەکردن ، گەلێکی ئەوتۆش هەبوون هێشتا مەیلی سوڵتان رەشادی « خەلیفەی موسڵمانان » دەبیزواندن . لەوەدا دەوری جۆری رەفتاری ئینگلیزەکان خۆیان کەم نەبوو . ئەوان تا عوسمانی‌یەکان لە بەغدا بوون بەرگی یەکە پشتیوانی موسوڵمانەتی‌یان پۆشیبو[٣٥] ، کەچی هەر ئەوەندە شەڕ تەواو بوو و بە مەرامی خۆیان گەیشتن کەوتنەوە خاچ‌پەرستی‌یەکەی جارانیان ، گەلێك گاورو جویان لەخۆیان نزیك‌خستەوە . ڕاستە گاورو جوی ئەوسای عیراق ، لەبەر گەلێك

---

(٣٤) دەربارەی سەرچاوەکانی لێکدانەوەی ئەو ژمارانە بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٦٣ی بەشی یەکەمی کتێبی «دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية» (ل ٤٤-٤٥) .

(٣٥) ژمارەکانی «العرب» و «تێگەیشتنی ڕاستی» پڕن لە نمونەی سەلمێنەری ئەو بۆچوونە .

هۆ ، له موسڵمانی خوێندەوارتر بوون ، بەڵام ئەوە تاکە هۆ نەبوو کە زۆربەی ئەفسەرانی ئینگلیزی هان دەدا پشت تەنها بەوان ببەستن .

وێرای ئەو کارەی بۆ پیاوی ژیر پاکانەی بۆ نی یە ئینجا زۆربەی کاربەدەستانی ئینگلیز نەیاندەزانی چۆن ڕەفتاری شێخ و مەلا بکەن . دەستی ژمارەیەکیان گەیشتە داهاتی ئەوانیش . ئەفسەری خوێن گەرمی ئەوتۆ هەبوو ئاشکرا گاورچێتی دەکرد . هی واشیان هەبوو ، وەك لۆنگریك[٣٦] ، پێی وابوو ئەو هەڵگری «ئالای ژیاری سپی پێستانی ئەوروپایە» . ئەوانە صەلاحەددینی ئەیوبی و شێردڵی[٣٧] خۆیان لەیاد کردبوو .

بۆ ئەوەی باشتر ئەم لایەنەی باسەکە ڕوون بکەینەوە پەنا دەبەینە بەر بەشێك لەو قسانەی ڕۆژنامەی «الفرات» لەم بارەیەوە کردوویە . لە ژمارە چواریدا «الفرات» ئاشکرا خوێن لە دڵی دەتکێ کە دەڵێ :

«پێمان بڵێن کام دەوڵەتی ئازاد بەر لە ئینگیلتەرە بەربەستی مەولوی کردووە ، کام کاربەدەستی کارگێڕی یا سیاسی یا سەربازی بەر لە ڕابەرانی ئینگلیز زاتی کردووە دەستوەرداتە ناوکاری ئەم ڕێبازە چەسپاوەوە . یا بڵێن پیاوێکی سیاسی یا کارگێری یا سەربازی دڕندەی ئەوتۆ هەیە کە حەز دەکات گاڵە بە مافی ئازادی گشتی بکات ، بەڵام ئاخۆ بێئابڕویی نی یە لەگەڵ ئەوەشدا ئیدیعای شارستانەتی بکات ؟»[٣٨] .

---

(٣٦) لۆنگریك یەکێك بوو لە ئەفسەرە سیاسی یەکانی ئینگلیز . چەند ساڵێك کەرکوکی بەدەستەوە بوو . لە نووسینەکانیدا بە ئاسانی هەست بەو جۆرە بیرکردنەوە ڕەگەزپەرستانەیە دەکرێ ، بەتایبەتی لەو کتێبەیدا کە ناوی ناوە « عیراق لە ساڵی ١٩٠٠ وە تاوەکو ساڵی ١٩٥٠» (بڕوانە :
S. H. Longrigg , Iraq 1900 to 1950. A political, social and economic history, London, 1953).

(٣٧) مەبەست ڕیچاردی یەکەمی پاشای ئینگلتەرەیە (١١٨٩–١١٩٩) کە لە سێیەم هێرشی خاچداراندا بەشداری کردو لە نزیکەوە لەگەڵ صەلاحەددینی ئەیوبیدا پێوەندی پەیدا کرد .

(٣٨) «الفرات» ، العدد الرابع ، ذی الحجة ١٣٣٨ . شایانی باسە نیوەی سەرتاپای لاپەڕەکانی ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «الفرات» بۆ ئەو باسە تەرخان کراوە .

بڕوا ناکەم ڕاو فەرمانەکانی پیاوە ئایینی‌یەکانی باشوور دەنگێکی ئەوتۆیان لای خۆمان دابێتەوە . بەڵام بڕواش ناکەم فەقێ‌و مەلای کوردستان هاتن‌و فەرمانڕەوایی گاورانیان بەدڵ بوبێ . جاروبار ڕۆژنامەی «پێشکەوتن»یش هەڕەشەو گوڕەشەی کاربەدەستانی ئینگلیزو بڕیارەکانیانی دەربارەی قەدەغەکردنی کۆبونەوەو مەولوی ناو مزگەوتەکانی بەغدای بڵاودەکردەوە . لە یەکێك لە ژمارەکانیدا «پێشکەوتن» دوای بڵاوکردونەوەی هەڕەشەیەکی زۆری لەو بابەتەی ویلسن لە بەغدا زوو زوو دوپاتی دەکردەوە ، هەواڵی خنکاندنی «چوار مفسید»یشی چاپکردووە[39] .

شۆڕشی بیست لەو جۆرە ڕوداوانە نەبوو بتوانرێ لە هیچ ناوچەیەکی ناوەوەی وڵات یا لە دەرەوە دابڕێ[40] . ئەو کەسەی هەوڵێکی وا بدات نە لە نرخی شۆڕشی بیست‌و نە لە نرخی هیچ بزوتنەوەیەکی ئازادیخوای‌تر بەرز یا نزم دەکاتەوە ، ڕای ئەو جۆرە کەسانە نە سەنگی هەیە نە بایەخ تا ئەوە بهێنێ کەس خۆی بە وڵام‌دانەوەیانەوە ماندو بکات ، ڕەنجی بەفیرۆچوویان بۆی نی‌یە تەنانەت شان لە شانی ڕەنجی ئەوانەش بدات کە دەیانەوێ بە بێژنگ بەری ڕۆژمان لێ‌بگرن .

بەپێی یاسایەکی مێژوویی چاسپاو هیچ ڕوداوێك نی‌یە لە قەوارەو قاوغێکی تەسکدا بمێنێتەوەو لە دەوروبەر دابڕێ . چ بەڵگەکانی شۆڕش‌و چ بەڵگەکانی ئینگلیزو چ لێکدانەوەی گەلێك مێژوونوس دەمێکە ئەوەیان سەلماندووە کە :

١ – ڕاپەڕینە بەجەرگەکانی کوردەواریی لای خۆمان یەکێکن لەو هۆ گرنگانەی ڕێگەیان بۆ تەقینەوەی «شۆڕشی بیست» خۆش کرد .

٢ – « شۆڕشی بیست » لە زۆر ناوچەی کوردەواریدا دەنگ‌و ڕەنگی دایەوە . تەنانەت هۆزی ئەوتۆ هەبوو کە هێشتا هەستی نەتەوەیی سەردارانی نەهەژاندبوو ، بەڵام ئەو سەردارانەو پیاوەکانیان لەبەر گەلێك هۆ لە ئینگلیز داخ لەدڵ بوون‌و ساڵی

---

(٣٩) بڕوانە : «پێشکەوتن» ، ١٩ی ئابی ١٩٢٠ .

(٤٠) ژمارەیەك نووسەر دەیانەوێ بەزۆر شۆڕشی بیست بئاخنتە ناو قاوغێکی تەسك‌و تەنگەبەرەوە (بڕوانە : ستار جبر ناصر ، هوامش علی کتاب علي الوردي لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ، الجزء الخامس ، بغداد ، ١٩٧٨ ، ص ٧٤–٨٥ . الراصد التقدمي ، ثورة العشرين . البعد القومي والاهداف الوطنية . – «العراق» ، ٢٩ حزيران ١٩٧٨) .

۱۹۲۰ باری شلەژاویان بە هەل زانی‌و ئەوانیش لای خۆیانەوە بەربوونە گیانی داگیرکەر .

۳ - بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەب لە میسرو شام‌و حیجازو دوابەدوای ئەو بزوتنەوەی ڕزگاریخوای کەمالی‌یەکانی تورکیاو سەرکەوتنی یەکەم شۆڕشی سۆشیالیزمی لە جیهاندا دەوریان لە وریابوونەوەی ڕوناکبیرانی عیراق‌و ڕیسواکردنی دەوڵەتە ئیمپریالی‌یەکاندا زۆر بوو نەك کەم .

ئەو نموونەو بەڵگانەی باسمان کردن هەرچەندە چمکێکن لە خەرمانێك ، بەڵام پێم وایە بەسن بۆ ڕوون‌کردنەوەی مێژووی هۆکانی شۆڕشی بیست . دیارە هەر ڕوداوێك بەرهەمی ئەو جۆرە هۆیانە بێ دەبێ ئەنجامیشی وەك خۆی گەورەو دیار بێ .

## (۲) ئەنجامەکانی شۆڕشی بیست

نەك ڕۆژی ۳۰ی حوزەیران وەك باوە ، واتە ئەو ڕۆژەی شەعلان ئەبولچۆنی سەرەك هۆزی زەوالمی تێدا گیراو پیاوەکانی ئازادیان‌کرد ، بەڵکو لە سەرەتای بەهاری ساڵی ۱۹۲۰وە شۆڕشی گەلی عیراق دژی ئینگلیزی داگیرکەر لە بەغداو نەجەف‌و کەربەلاو شوێنی‌تر سەری دەرهێنا . لە هەموو لاوە کۆبونەوەو خۆنیشاندان دەستی پێ‌کرد ، سەربەخۆیی بووە دروشمی ڕۆژانەی خەباتی جەماوەر . تا دەوروبەری کۆتایی مانگی حوزەیران ڕاپەڕینی گەل لە شارەوە گەیشتە لادێ‌و مەڵبەندی هۆزە چەکدارەکانی فوراتی ناوەندو لەوێدا قۆناغێکی نوێ لە شێوازی خەباتی کۆمەلانی خەڵکی ولاتدا دەستی‌پی‌کردو چەند مانگێکی خایاند . بەپێی گەلێك سەرچاوە ژمارەی ئەوانەی لە پێناوی ڕزگاری نیشتماندا پەلاماری چەکیان دا لە ۱۳۰ هەزار کەس زیاتر بوو .

شۆڕشگێران توانی‌یان ژمارەیەك شارو بەشی هەرە زۆری مەڵبەندەکانی فوراتی ناوەند ئازاد بکەن . نەجەف بووە بارەگای سەرکردایەتی شۆڕش . تا سەرەتای ئابی ساڵی ۱۹۲۰ کلپەی ئاگری شۆڕش گەیشتە باقوبەو دێلتاوەو شارەبان‌و دەلی عەبباس‌و لەوێوە ئیتر بەرەو لای خۆشمان تەشەنەی کرد . هۆزی دەلۆی ناوچەی

خانەقین و کفری بە سەرکردایەتی کەریمی خەسرەو بەگ و برایم خان دەستی باشیان لە دوژمن وەشاند. هەر لەو ڕۆژانەشدا ژمارەیەك ناوچەو هۆزی‌تری کوردەواری وەك لەیلان و زەنگەنەو داودەو سورچی ڕاپەڕین. هەولێر وا شلەقا کە ئارنۆلد ویلسن ناچار بوو لەو کاتە ناسکەدا بەغدا بەجێ بهێڵێ و بە فڕۆکەی تایبەتی بچێتە ئەوێ[41].

ڕاستە لەبەرگەلێك هۆ ئینگلیز توانی بە زەبری چەکی کوشندەی نوێ «شۆڕشی بیست» دابمرکێنێتەوە، بەڵام هەر ئەو دامرکاندنەوەیە بۆ خۆی زۆر کەوت لەسەری. ئەو سەربازو ئەفسەرانەی ئینگلیز کە لە شەڕگەکاندا کوژران یا بێ سەروشوێن مانەوە ژمارەیان ١٠٤١ کەس و بریندارەیشیان ١٢٢٨ کەس بوو[42].

لەو کاتەدا کە لەندەن بۆ پولێك دەچو بە ئاسانا دامرکاندنەوەی «شۆڕشی بیست» نزیکەی ١٠٠ ملیۆن پاوەن لەسەری کەوت[43] کە بۆ سەرەتای بیستەکان و باری ئابووری دوای شەڕ پارەیەکی یەکجار زۆر بوو. بەڵام دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشیش ئینگلیزەکان لەترسی بەرپابوونەوەی ناچار بوون لەشکرێکی گەورە لەناو خاکی عیراقدا بهێڵنەوە کە خەرجی زۆرو باری گران بوو. تەنها لە یەکەم ساڵی دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشدا خەرجی ئەو لەشکرە گەیشتە نزیکەی ٢١ ملیۆن پاوەنی زێڕ[44].

گەورەیی «شۆڕشی بیست» لەوەدا خۆی نواند کە داگیرکەری ناچار کرد لە سیاسەتیدا بەرامبەر عیراق چەند هەنگاوێك بکشێتە دواوە. ئینگلیز چاك لەوە

---

(٤١) محەمەد مەهدی بەسیرو حەسەنی و فەیازو وەردی و کاتلۆفو هالدەین و ژمارەیەکی‌تر لە نووسەرانی خۆو بێگانە بە درێژی باسی بەسەرهاتەکانی شۆڕشیان کردووە. منیش بەپێی توانا لە کێیەکەی خۆمدا ڕوداوەکانی کوردستانم ڕوون کردۆتەوە.

(٤٢) سەرچاوە ئینگلیزی‌یەکان ١٠٤١ کوژراوو ونبووەکان دەکەن بە دوو بەشەوە: ٤٢٦ کوژراوو ٦١٥ ونبوو.

(٤٣)

. P. W. Ireland, Iraq. A study in political development, London, 1937, p. 273

(٤٤) بڕوانە:

ب.م. دانتسیگ، عیراق دوێنێ و ئیمڕۆ، بە زمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٦٠، ل ٢٤.

گەیشت کە ناتوانێ سەربەخۆیی گەلی عیراق پێ‌شێل بکات . هەر زوو هاوار لە ئەسکویثی سەرەك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا هەڵساو لە هۆڵی پەرلەماندا بە ئاشکرا داوای کشانەوەی قشونی ولاتەکەی لە ویلایەتی موسڵ‌و بەغدا کرد . ڕۆژنامەی «ئۆبزێرڤەر»ی بەناوبانگ ڕۆژی ۲۳ی ئابی ساڵی ۱۹۲۰ دەربارەی هەمان باس نووسیویە دەڵێ :

«بیرکردنەوە لەوەی ئەرکی سەرەکیی سەر شانی ئێمە داسەپاندنی یاسا کانمانە بەسەر گەلێکدا کە بێ پێچ‌و پەنا تێی گەیاندووین پێویستی پێ‌یان نی‌یە کارێکە تەنها بۆ پێکەنین دەشێ» .

هەمان ڕۆژ «سەندێی تایمس» کە ئەویش ڕۆژنامەیەکی بەناوبانگی‌تری لەندەنی‌یە ، داوای لە کاربەدەستان کرد دان بنێن بە ژێرکەوتنی سیاسەتیاندا لە عیراق‌و دەست لە یەخەی دانیشتوانی بەردەن .

هەر ڕوداوێك ئەنجامەکانی بگەنە ئەو پلەو ڕادەیە بێ‌گومان دەبێ بایەخی مێژوویشی گەورەبێ !

## (۳) بایەخی «شۆڕشی بیست»

ئەوەی تاوەکو ئێستە دەربارەی هۆو ئەنجامەکانی «شۆڕشی بیست» باسمان کرد سەنگی یەکەمی کێشانی بایەخی زۆری ئەو ڕوداوە گەورەیەیە لە تۆماری مێژوودا . هەر بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە پاڵ بنێ بە دەیان هەزار کەسەوە بچنە ناو کۆڕی خەباتەوەو بە هەزارانیان سەریانی بۆ بکەنە قوربانی دەبێ بەسەرهاتێکی مێژوویی بایەخدار بێ . زۆربەی سەرچاوەکان لەو باوەڕەدان زیانی شۆڕشگێڕان خۆی دەدا لە نزیکەی ۸٤٥۰ کوژراوو بریندار . دوور نی‌یە لێکدانەوەیەکی ورد ژمارەیەکی گەورەتر بسەلمێنێ .

بەڵگەو نیشانەکانی بایەخی زۆری «شۆڕشی بیست» لەوێدا نابڕێنەوە . «شۆڕشی بیست» یەکەم ڕوداوی گەورەی مێژووی نوێی عیراقە کە عەرەب‌و کوردو کەمینەکان‌و موسڵمانی شیعەو سونی مەزهەب‌و گاوری لە سەنگەرێکدا کۆکردەوە .

ئینگلیز لەو ڕۆژەوەی پێی نایە ناو خاکی عیراقەوە کەوتە وەشاندنی تۆوی دووبەرەکی‌و ناحەزی ، لەگەڵ ئەوەشدا ساڵی ۱۹۲۰ ئەو تۆوە بەرێکی ئەوتۆی

نەدانێ . بە پێچەوانەی ئارەزووی ئەفسەرانی ئینگلیزو پیلانەکانیانەوە ڕۆژی چواردەی مایسی ئەو ساڵە یەکەم کۆبونەوەی پێکەوەی ئازادیخوایانی سوننەو شیعەی بەغدایی لە مزگەوتی قوبلانیەی ناو بازاری بەزازەکاندا دەستی پێ‌کرد . ئەو کۆبونەوەیە ئاوی سەرەتایەکی بایەخداری لە مێژووی عیراقدا ڕشت کە ئەوسا هەموو دڵسۆزێکی تێگەیشتوو تینوی بوو . ئیتر هەر ئەوەندەت دەزانی دانیشتوانی ئەمبەرو ئەوبەری بەغدا لە کۆبونەوەیەکی گەورەدا تێکەڵ دەبوون‌و هەمویان بە یەك دەنگ داوای خۆبیون‌و ئازادی‌یان دەکرد .

لەوەیش زیاتر . لەو ڕۆژانەدا هەر ئەوەندە نیشتمانپەروەرانی بەغدا هەستیان کرد کاربەدەستان پیلانێکیان بەدەستەوەیە بۆ لێدانی ئاهەنگێکی ئایینی گاوران لە ڕێگەی دوو سێ کرێگرتەی موسڵمانەوە یەکسەر ژمارەیەکی زۆریان کۆبونەوەو بە ئاڵای سەوزو گوڵاوەوە ڕوویان کردە کڵێسەی کلدانەکان‌و لەوێ تێکەڵی برا گاورەکانیان بوون‌و وەك یەك کەوتنە زیکرو تەهلیلە بۆ عیساو محەمەدو هاوار بۆ سەرفرازی گەل‌و نیشتمان .

دیسان لەوەیش زیاتر . یەکێك لە ڕاپۆرتە نهێنی‌یەکانی ئەوسای پۆلیسی بەغدا باسی ئەوە دەکات چۆن «گوتەبێژی شۆڕش» محەمەد مەهدی بەسیر[٤٥] لە کاتی کۆبونەوەی شەوی شازدەی حوزەیراندا لە مزگەوتی سەید سوڵتان عەلی خەڵکی بەغدای هان دەدا «جووەکان لەوە دڵنیا بکەن کە کەس توخنی دوکانەکانیان ناکەوێ !» .

«شۆڕشی بیست» یەکەم بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی ڕێکخراوی هەموو گەلی عیراق بوو لە پێناوی سەربەخۆییدا کە سەرکردایەتی‌و دەزگای کارگێڕی‌و سەربازی‌و ئۆرگان‌و چاپەمەنیی تایبەتی خۆی هەبو . «الفرات» و «الاستقلال» لاپەڕەیەکی یەکجار دیارو پرشنگدارن لە هەموو مێژووی ڕۆژنامەنووسیی عیراقدا[٤٦] .

---

(٤٥) «گوتەبێژی شۆڕش» بووە نازناوی محەمەد مەهدی بەسیر کە یەکێك بوو لە ڕابەرە خوێن گەرمەکانی جەماوەری شۆڕش لە بەغدا . مامۆستا ٠ەفیق حیلمی لە «یادداشت»دا بەرز نرخاندویە .

(٤٦) بۆ درێژەی ئەوباسەبڕوانە ئەو وتارەی بە ناوی «من تأريخ صحافة ثورة العشرين» موە لە لاپەڕە ٣٥–٧٠ی گۆڤاری «دراسات في التأريخ والآثار» (بغداد ، العدد الثاني ، ١٩٨٢)دا بلاوم کردۆتەوە .

وێرای هەموو ئەوانەی باسمان کردن مێژوونووسە پێشکەوتنخوازەکان لەو باوەڕەدان کە «شۆڕشی بیست» بووە بەردی بناغەی یەکیەتی خەباتی هاوبەشی کوردو عەرەب دژی داگیرکەرو بەو جۆوە ڕێگەی بۆ بەرزبونەوەی دەرکی سیاسی جەماوەری هەردوو لایان خۆش کرد بەوەی باشتر تێگەیشتن کە دوژمنیان یەکە [٤٧] .

هەرچەندە دوژمن توانیی «شۆڕشی بیست» لە خوێندا بگەوزێنێ ، بەڵام هەمان کات ناچاریش بوو لە ئەنجامی فشاری ئەوو ترسی هەڵدانەوەی مل بۆ ژمارەیەك لە داخوازییەکانی ئەوسای گەلی عیراق بدات . گۆڕینی ئانۆلد ویلسن کە عیراقییەکان لە هەموو کاربەدەستێکی ئینگلیز زیاتر لێی داخ لەدڵ بوونو ناردنی پێرسی کۆکس بۆ بەغدا لە گەرمەی شۆڕشدا جۆرە کشانەوەیەکی تەکتیکی بوو کە ئینگلیزەکان بەر لە بەرپابونی ئاگری «شۆڕشی بیست» بە بیریاندا نەدەهات . دوور نی یە درەنگ‌و زوو یەکێك لە کوڕانی حسەینی شەریفی مەککە ببوایەتە پاشای عیراق ، بەڵام گومان لەوەش ناکرێ کە ئینگلیزەکان بەهۆی شۆڕشی بیستەوە بە پەلە تاج‌و تەختی شاهییان پێشکەش بە فەیسەڵی یەکەم کرد ، چونکە ئەوان هاتنە سەر ئەو بیرەی دەبێ عیراق لە ڕێگەی «پاشایەك‌و هەزار شێخەوە» ببرێ بەڕێوە نەك بەهۆی لەشکرێکی گەورەوە کە ئەرکی لەسەر باجدەری بەریتانیایی زۆر دەکەوت .

لە ڕۆژانی یەکەمی بەرپابونییەوە «شۆڕشی بیست» لە سەرانسەری عیراق‌و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و کۆڕە سیاسییەکانی ئەوروپاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دەنگی دایەوە . وەك دیمان هەواڵەکانی شۆڕش زۆر بە خێرایی گەیشتنە ناو هۆڵە سیاسییەکان‌و سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکانی لەندەن . ئارشیفە تایبەتییەکانی ئینگلیتەرەو فەرەنسەو هندستان بە سەدان بەڵگەو ڕاپۆرتی نهێنییان دەربارەی زۆر لایەنی شۆڕش تێدایە کە بە داخەوە تاوەکو ئێستەش بە دەگمەن دەستی مێژوونووسانیان گەیشتۆتێ .

---

(٤٧) بڕوانە :

«عیراق هاوچەرخ» ، نووسینی دەستەیەك ڕۆژهەڵاتناس ، بە زمانی ڕووسی ، موسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ١٣٥ ،

(Iraqi Review), Vol. 1, No 6, July 2, 1959 P.3.

پێم وایە بەپێی تەرازوی شوێن سەنگی «شۆڕشی بیست» بۆ مێژووی هاوچەرخی عیراق لە سەنگی شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ بۆ مێژووی نوێی فەرەنسە کەمتر نی‌یە، بۆیەکا بە دڵنیایی‌یەوە دەڵێم ئەوی ئێمە تاوەکو ئیستە بۆ «شۆڕشی بیست» مان کردووە زۆر لە بایەخی ڕاستەقینەی خۆی کەمترە .

## باسی یازدەمین

## دەربارەی ڕاپەڕینە گەورەکەی کانوونی دووەمی ١٩٤٨و شوێنی گەلی کورد لەو ڕاپەڕینەدا

مێژووی نوێو هاوچەرخی عیراق پڕیە لە لاپەڕەی خەباتی خوێناوی دژی داگیرکەری بێگانەو کۆنەپەرستیی ناوخۆ(*) . یەکێك لەو لاپەڕە پیرۆزانە ڕاپەڕینە گەورەکەی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨)ە کە ئیمڕۆکە ، لە هەر کاتێك زیاتر ، پێویستمان بەوەیە کەڵك لە دەرسە مێژوویی یە گەورەکانی وەربگرینو بە شێوەیەکی زانستی یانەی قووڵ لێیان بکۆڵینەوە .

بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەکی دروست چوارچێوەی ڕاپەڕینی کانوون دیار بکەین پێویستە چاوێك بەو ئاڵوگۆڕە گەورانەدا بخشێنین کە ڕۆژگاری شەڕی دووەمی جیهانو ساڵەکانی دوای ئەو شێوازو ناوەڕۆکی خەباتی ڕزگاریخواو ژیانی کۆمەڵایەتیی عیراقی یەکانیان گرتەوە .

بە ماوەیەکی زۆر بەر لە شەڕی یەکەم دەرەبەگی وەك ڕژێمێکی ئابووریو کۆمەڵایەتی کەوتبووە هەرەس هێنانو ببووەوە کۆسپ لەبەر دەم پێشکەوتنی هێزو ئەمرازی بەرهەم هێناندا ، هیچ نەبێت بەهۆی کەمتەرخەمیو بیرتەسکی ی نوێنەرانی یەوە لە لایەکەوەو ، لە لایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی شێوازی پێوەندیی بەرهەمهێنانی ئەم ڕژێمە کارێکی وای نەکردبوو ئەوەندە لە دەست جوتیارو خاوەن زەوی یە پچوکەکاندا بمێنێتەوە کە لە ژیانی کولەمەرگی خۆیان زیاد بێتو بتوانن ئەو زیادی یە بۆ پەرەپێدانو پێشخستنی ئەمرازی کاریان تەرخان بکەن . لەگەڵ ئەوەش عوسمانی یەکانو دوای ئەوان ئینگلیزەکان لەبەر خۆیان گەلێك لایەنی ئەو ڕژێمەیان

---

(*) لە گۆڤاری «برایەتی» ، ژمارە ١١ ، ساڵی ١ ، خولی دووەم ، ناوەڕاستی شوباتی ١٩٧١ ، ل ٤–١٥دا بلاوکراوەتەوە .

ڕاگرت ، جێ‌پێی قایم‌و دەسەڵاتیان زیاتر کرد . ئەمە دەمێك ساڵ بوو جۆرە ناکۆکی‌یەکی لە نێوان ئاغاو جوتیاردا ، دروست کردبوو .

لەبەر چەند هۆیەك لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان‌و دوای ئەو شەڕە چەوساندنەوەی دەرەبەگی لە جاران زیاتر بوو ، ئەمەش بووە هۆی قووڵ‌بوونەوەی ناکۆکی نێوان زەویدارو جوتیار، ئەمیان کەوتە ئەوەی دوژمنی ڕاستەقینەی خۆی تەنها لە داگیرکەری بێگانەدا نەبینێت ، بەڵکو هەمان کات لە چەوسێنەرەکەی خۆشیدا ببینێت . ئەنجامی سیاسی‌ی ئەم دیاردەیەش بۆ دوارۆژ کەم نەبوو .

بەڵام لەوەیش گەورەتر ئەو ئاڵ‌و گۆڕە گرنگانە بوون کە لە شارەکاندا هەمان کات ڕوویان داو بوونە هۆی ئەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و خەباتی نەتەوەیی عیراقی‌یەکان بچنە ناو چوارچێوەیەکی نوێوە . دوای شەڕی یەکەم‌و بە تایبەتی لە کۆتایی بیستەکانەوە پیشەسازی‌ی نیشتمانی کەوتە گەشەکردن . هەنگاوی گەورەی داهاتووی بەرەوپێش چوونی پیشەسازی‌ی نیشتمانی بەر ساڵەکانی شەڕی دووەمی جیهان کەوت ، ئەو کاتەی دابڕینی عیراق لە بازارە سەرمایەداری‌یەکان بەهۆی بارو دۆخی شەڕەوە بووە مەرجێکی لەبار بۆ ئەوەی پارەدارانی شارە گەورەکان بە دڵنیایی‌یەوە بێنە مەیدانی بەرهەم‌هێنانی پیشەسازی‌یەوە . ئەنجامیش سەنگی بۆرجوازی‌ی نیشتمانی چ لە ژیانی ئابووری‌و چ لە ژیانی سیاسی‌ی وڵاتدا لە جاران زۆرتر بوو .

هەر ئەو دیاردەیەش لە لایەکی‌ترەوە بووە هۆی پەرەسەندنی چینی کرێکار . وێڕای ئەوە چەند هۆیەکی تایبەتی‌ی کارێکی ئەوتۆیان کرد سەنگی ئەم چینە لە چەند ڕوویەکەوە تەنانەت لە سەنگی چینی بۆرجوازی‌ی نیشتمانیش زیاتر بێت . بە وێنە لە ساڵەکانی شەڕی دووەمی جیهاندا ژمارەی تەنها ئەو کرێکارانەی لە بنکە سوپایی‌یەکانی ئینگلیزەکاندا کاریان دەکرد خۆی دەدا لە ٧٠ هەزار کەسێك کە لە ٣٥٪ی هەموو ئەو کرێکارانەیان پێك‌دەهێنا کە بە کاری پیشەسازی‌ی هەمەجۆرەوە خەریك بوون[١] .

---

(١) بڕوانە :

(Kingdom of Iraq) , by a committee of Officials , Baltimore , 1946 , P . 108.

هەروەها بڕوانە :

«الشرارة» ، العدد الثامن ، حزيران ١٩٤٤ ، ص ٢ .

بەلاّم لەوەیش گرنگتر ئەو ئالّ‌و گۆڕە قووڵە بوو کە لە سەرەتای سی‌یەکانەوە لە ناوەرۆك‌و جۆری بیرکردنەوەو بزوتنەوەی ئەم چینە گەورەیەی کۆمەڵدا دەستی پێ‌کردبوو . لە سەرەتای دروست‌بوونی‌یەوە تاوەکو ناوەندی سی‌یەکان ئەم بەشەی کۆمەڵ بریتی بوو تەنها لە «چینێك لە خۆیدا» (Class in itself) ، واتە چینێکی پێك‌دەهێناو بەس ، ئەگینا جڵەوی کاری لە ڕووی سیاسی‌و کۆمەلاّیەتی‌یەوە بە دەست چینە نیشتمانی‌یەکانی‌ترەوە بوو . بگرە تەنانەت فەرمانڕەوایانی ئەو ڕۆژگارەش دەیانویست کەڵکی لی‌وەربگرن‌و گەر بتوانن بیکەنە داردەستی خۆیان . لە خۆوە نەبوو لە کۆتایی بیستەکاندا یەکێکی وەك جەعفەر عەسکەری چەند جارێك بووە «نوێنەر»ی کرێکارانی عیراق لەبەر دەمی دەزگاکانی کۆمەڵەی گەلاندا . لە ناوەندی سی‌یەکانەوە ئەمە بە جارێك گۆڕرا ، ئەوەبوو وردە وردە کرێکارانی عیراق چوونە قاڵبی چینێکەوە بۆ خۆیان (Class for itself)[۲] .

ئەنجامی ئەم ئالّ‌وگۆڕە لە ساڵەکانی شەڕی دووەمی جیهاندا بە ڕوونی دەرکەوت‌و خۆی لە زنجیرەیەك مانگرتن‌و دروشمەکانیاندا نواند . دوای شەڕیش بە ماوەیەکی کەم مانگرتنە گەورەکەی گاورباغی کە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٤٦ قەوما بە تەواوی نیشانی دا چۆن کرێکارانی عیراق بە یەکجاری بوونەتە چینێك بۆ خۆیان .

ئەم جۆرە گۆڕرانە هەمیشە ئەنجامی گەورەی بەدەمەوە بووە ، بەتایبەتی بە نیسبەت بزوتنەوەی ڕزگاریخوای هەر کۆمەڵێکەوە بێت . بە نیسبەت ئەو

---

(۲) «چین لە خۆدا»و «چین بۆ خۆ» دوو زاراوی زانستین کە تاوەکو ئێستە لە زمانی کوردی‌و پێم وایە لە زمانی عەرەبیشدا بەکار نەهێنراون . هەموو چینێکی کرێکار لە سەرەتای دروست‌بوونی‌یەوە بۆ ماوەیەکی زۆر ئەندامانی پەرش‌و بلاّو دەبن ، هەست بە ئەرکە کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی‌یەکانی سەر شانیان ناکەن ، یەك سەرنج بەرامبەر چینی سەرمایەدارو ڕژێمی سەرمایەداری کۆیان ناکاتەوە بزوتنەوەو ڕابەرینەکانیان عەفەوی دەبێت‌و تەنانەت زۆر جار جڵەوی کارو چالاکی‌یان بە دەست دەستەو چینەکانی‌ترەوە دەبێت . لەو قۆناغەدا چینی کرێکار بریتی‌یە تەنها لە «چینێك لە خۆیدا» . بەلاّم دوای ئەوەی ئەمانە هەموو دەگۆڕرێن‌و کرێکاران وایان لی‌دێت هەست بە ئەرکە کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی‌یەکانی سەر شانیان‌و سەنگی تەواوی خۆیان لە ناو کۆمەڵدا بکەن ، ئەوسا کە چینەکەیان دەگۆڕێت‌و دەبێتە «چینێك بۆ خۆی» ، واتە لەوە قۆناغی دەبێت کە داردەستی کەس بێت‌و ئیتر بۆ خۆی دەجەنگێ .

کۆمەڵانەشەوە کە لە نەتەوەیەك زیاتر پێکهاتوون ئەم گۆڕانە بۆیان دەبێتە مایەی کزبوونی دووبەرەکی‌و ناکۆکی نەتەوەیی لە ناویاندا ، بە تایبەتی لە ناو چینە چەوساوەکانیاندا .

بەم جۆرە ئەو کاتەی شەڕی دووەمی جیهان تەواو بوو سەنگ‌و تەرازووی پێوەندی چینایەتی لە ناو کۆمەڵگای عیراقیدا گەیشتبووە ڕادەی گەیاندنی مەرجی ئاڵ‌و گۆڕی سیاسی‌ی گەورە . ئەو بارو دۆخەش کە ڕوخاندنی بەرەی فاشیزم لەگەڵ خۆی بۆ سەرانسەری جیهانی هێنا بووە هۆیەکی یاریدەری گرنگ بۆی . کاربەدەستان ناچار بوون تا ڕادەیەك مل بۆ داخوازی‌یە دیموکراتی‌یەکانی گەل بدەن . ڕۆژی ٢٣ی شوباتی ساڵی ١٩٤٦ تۆفیق سوێدی یەکەم وەزارەتی دوای شەڕی دامەزراند کە دوو نوێنەری بۆرجوازی نیشتمانی تێیدا بەشدار بوون ، یەکەمیان سەعد ساڵح کە بووە وەزیری ناوخۆو دووەمیان عەبدولوەهاب مەحمود کە بووە وەزیری دارایی .

لەو بەرنامەیەدا کە سەرەك وەزیران ڕۆژی پێنجی مارت بڵاوی‌کردەوە میری گەلێك گفتی سیاسی‌و ئابووری‌ی دایە کۆمەڵانی خەڵك ، کە یەکێکیان دەستکاری‌ی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ی نێوان عیراق‌و بەریتانیا بوو بە جۆرێك لەگەڵ «بارودۆخی نوێی جیهان‌و پێڕەوی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا» بگونجێت . گفتێکی‌تری بەرنامەکە دابەش‌کردنی زەوی‌وزاری میری بوو بەسەر وەرزێرو جوتیارانی وڵاتدا . کابینەی نوێ بەر لەوەی مانگێك بەسەر دامەزرانیدا تێپەڕێت بڕیاری لابردنی حوکمی عورفی‌ی دا کە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١وە دانرابوو . هەمان کات ڕەقابەی سەر چاپەمەنی‌و پۆستەش لابرا .

گەورەترین دەسکەوتی ئەو ڕۆژگارە بڕیاری ڕێگە دانی دامەزراندنی پێنج پارتی ئاشکرا بوو بەم ناوانەوە : «الشعب» (گەل) ، «الاتحاد الوطني» (یەکیەتی نیشتمانی) ، «الوطني الدیمقراطي» (نیشتمانی دیموکراسی) ، «الاحرار» (ئازادیخواهان) ، «الاستقلال» ، (خۆبوون) . دوای ئەوەی ڕۆژی دووی نیسانی ١٩٤٦ بە ڕەسمی ڕێگەی ئەم پارتی‌یانە درا ئیتر خوێن ڕژایە ژیانی سیاسی‌ی وڵاتەوە . هەر یەکەیان مافی ئەوەی پێ درا ئۆرگان‌و چاپەمەنی‌ی تایبەتی‌ی خۆی هەبێت‌و

هەموویشیان بەپێی بۆچوونیان بوونە دەربڕی خواستەکانی گەل کە لەو سەردەمەدا لە هەر شت زیاتر داوای لابردنی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ی دەکرد . داوای بێوچانو فراوانی کۆمەڵانی خەڵك حوکمەتی ناچار کرد لیژنەیەکی تایبەتی ی بۆ لێدوانی ئەم باسە دابنێت .

کەواتە یەکسەر دوای تەواو بوونی شەڕی دووەمی جیهان سەرەتای ئەوە دەرکەوت چۆن خەباتی بێ وچانی گەل خەریکە رێڕەوێکی نوێ لە سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی عیراقدا بهێنێتە ئاراوە ، لە کاتێکدا ئینگلیزەکان عیراقیان بۆ شتێکی تر بنیات نابوو ، ئەوان دەیانویست لە جیهانی دوای شەڕدا عیراق بە یەکجاری بکەنە بنکەی قایمی بلاوکردنەوەی دەسەلاتیانو پاراستنی بەرژەوەندی یە ئابووری یەکانیان لە سەرانسەری رۆژهەلاتی نزیكو ناوەڕاستدا ، بۆیەکا چ خۆیانو چ کۆنەپەرستانی ناوخۆ بە چاوی گومانو ترسەوە سەیری ئاسۆی سیاسی ی نوێی عیراقیان دەکردو سوور بوون لەسەر ئەوەی پێویستە بە زووترین کات دەرگای قەفەسەکان داخەنەوە . دوای ئەو زنجیرە کۆبوونەوەیەی سەرۆکانی دەولەتە عەرەبەکان بەهارو سەرەتای هاوینی ١٩٤٦ کردیان ئەو کارە بووە ئەرکێکی پەلەی سەر شانی کۆنەپەرستانی عیراق .

باری ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو رۆژگارەی عیراقو بەر لە هەر شتێك پێوەندی ی نێوان هێزو چینە نیشتمانی یەکان ، تا رادەیەکی زۆر ئەرکی سەر شانی کۆنەپەرستانی عیراق ئاسان کرد . جارێکا هەر ولاتێك لە نەتەوەیەك زیاتر پێکهاتبێت پێویستە نیشتمانپەروەرانی دلسۆزانە هەولێ بدەن یەکیەتی نیشتمانی بکەنە بناغەی هەموو ئالۆگۆڕێکی سیاسی ی قوول . کەچی کاتێك شەڕی دووەمی جیهان تەواو بوو بە هۆی سیاسەتی دووربینی ئینگلیزەکانەوە هێشتا یەکیەتی یەکی وا لە زەمینەی عیراقدا لە ئارادا نەبوو . سەرەڕای ئەوە هەموو هێزە نیشتمانی یەکانی ئەو سەردەمە بە قوولی لە بایەخی یەکیەتی یەکی لەو جۆرە تێنەگەیشتبوون . وەك بەلگە دەلێین هەرچەندە کارەبەدەستانی ئەوسای عیراق بە دەستی ئەنقەست گەلی کوردیان لە مافە سیاسی یە رەواکانی بێبەری ی کردبوو ، کەچی هیچ کامێك لەو پێنج پارتی یەی ناومان هێنان نە لە پرۆگرامو نە لە کاری رۆژانەیاندا بایەخێکی ئەوتۆیان نە ئەدا بە

مەسەلەی کورد ، ڕاستیکەشی نەیاندەتوانی چوارچێوەی پێویستی ئەو مەسەلەیە دیار بکەن . پارتی ئازادیخواهان (الاحرار) کە نیشتمانپەروەرێکی ناسراوی لیبرالی‌ی ئەو ڕۆژگارە سەرۆکی بوو بە جارێك گەلی کوردی خستبووە پشت گوێ . لەوەیش خراپتر ئەوە بوو کە پارتی خۆیبون (الاستقلال) گەلی کوردی کردبووە یەکێك لە «کۆسپ»ەکانی جێ بەجێ‌کردنی یەکیەتی عەرەب[3] . ئەم جۆرە هەڵوەستەو سەرنجە کورتبینە کارێکی ئەوتۆی کرد هیچ کامێك لە پارتی‌یە ئاشکراکانی دوای شەڕ نەتوانێت بنکەیەك بۆ خۆی لە ناو کوردا دابمەزرێنێت ، ئەوەی کاری کردە سەر سەنگ‌و توانای سیاسی‌یان .

لەولاشەوە پێوەندی‌ی نێوان هێزو چینە نیشتمانی‌یەکان لەوە باشتر نەبوو . بێبەری کردنی بەشێك لەو چینانە لە مافی سیاسی بە لای بۆرجوازی نیشتمانی‌یەوە کارێکی ڕەواو بەجێ بوو ، بۆیەکا لەو بارەیەوە ورتەی لە دەم نەهاتە دەرەوە . ئەمانە ، لەگەڵ چەند هۆیەکی‌تردا ، کارێکی ئەوتۆیان کرد فەرمانڕەوایان بتوانن زۆر زوو دەست لە دەسکەوتە سەرەتایی‌یەکانی گەل بووەشێنن . بۆ ئەوەی هیچ نەبێت خۆیان لە وەزیرە نیشتمانپەروەرەکان قوتار بکەن ڕۆژی ٣٠ی مایسی ساڵی ١٩٤٦ تۆفیق سویدی‌یان ناچار کرد واز لە حوکم بهێنێت . پاش دوو ڕۆژ دامەزراندنی کابینەی نوێ بە ئەرشەد عومەری سپێردرا کە یەکێك بوو لە پیاوە سیاسی‌یە نەویستەکان‌و دوژمنێکی ناسراوی هێزە دیموکراسی‌یەکان . دامەزراندنی وەزارەتی نوێ سەرەتای هێرشی گەورەی کۆنەپەرستی بوو بۆ سەر گەل . هەمووی بەسەر یەکەوە چوار حەفتەی پێ نەچوو کاتێك پۆلیس گولله بارانی خۆنیشاندانێکی گەورەی لە بەغدا کرد[4] ، ٥ کەس کوژران‌و ژمارەیەکی زۆریش بریندار بوون . دوابەدوای ئەمەش بە دوو حەفتە کارەساتە خوێناوی‌یەکەی گاورباغی قەوماو ئەمیش بووە هۆی کوشتن‌و بریندارکردنی ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارانی نەوتی کەرکوك .

---

(٣) بڕوانە :

محمد مهدي كبه . مذكراتي في صميم الاحداث (١٩١٨– ١٩٥٨) ، بيروت ١٩٦٥ ، ص ١٩٩ .

(٤) نیشتمانپەروەرانی پایتەخت ڕۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٤٦ ئەو خۆنیشاندانەیان ڕێکخست .

ئەم لێدانانە کاری مەبەستدارو لێ‌کۆڵراوە بوون . دەبوو ئەو چرۆی ئاڵ‌وگۆڕەی لەپڕ سەری دەرهێنا زیندەبەچاڵ بکرێت‌و عیراق لە جاران توندتر بە ڕەوڕەوەی نیازەکانی لەندەنەوە ببەسترێتەوەو بکرێتە بنکەی سەرەکی‌ی هێرش بۆ سەر هەموو بزوتنەوەی ڕزگاریخوای نەتەوەیی گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست . جێ بەجێ‌کردنی ئەم مەبەستە وێڕای لێدانی هێزە دیموکراس خوازەکان پێویستیشی به پەیمانێکی نوێ بوو بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێن‌و کەلەبەرانەی لە پەیمانی ١٩٣٠دا دەرکەوتن ، بە تایبەتی دوای بەرپابوونی ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١ . جێ بەجێ‌کردنی ئەم ئەرکە ، وەك چاوەڕوان دەکرا ، کەوتە ئەستۆی نوری سەعیدی شارەزا کە ڕۆژی ٢١ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ دامەزراندنی وەزارەتێکی نوێی پێ سپێردرا . نوری سەعیدیش کە کەم زۆرزانی وەك خۆی لە هەموو ڕۆژهەڵاتدا هەبوو ، ویستی هەموو زروفێکی پێویست بۆ بەستنی پەیمانی نوێ ئامادە بکات ، بەڵام مۆرکردنەکەی بخاتە ئەستۆی سیاسی‌یەکی‌تر ، چونکە ئەو باش لەوە گەیشتبوو بەستنی پەیمانی ١٩٣٠ تا چ ڕادەیەك لەبەر چاوی هەموانی خست . جگە لەوە ئەگەر پەیمانی ١٩٣٠ لابردنی ئینتیداب‌و وەرگرتنی عیراق لە کۆمەڵەی گەلاندا بە دەمەوە بوو ، خۆ ئەو پەیمانە نوێیەی کۆنەپەرستان‌و ئینگلیز دەیانەوێت لە کۆت‌و زنجیر بەولاوە هیچی‌تری نابێت تێدا بێت . هەمان کات نوری سەعید باش لەوەیش گەیشتبوو کە ڕای گشتی‌ی ناوەندی چلەکان جیاوازی‌ی لەگەڵ ڕای گشتی‌ی سەرەتای سی‌یەکاندا یەکجار زۆرەو هیچ دوور نی‌یە ئەنجام ڕیسەکەی ببێتەوە بە خوری . لەبەر ئەوە هەر ئەوەندە چەند هەنگاوێکی‌تری دژی دەسکەوتە دیموکراسی‌یەکانی گەل نا دەستی لە کار هەڵگرت‌و کارێکی ئەوتۆی کرد دامەزراندنی وەزارەتی نوێ بە ساڵح جەبر بسپێردرێت .

مارتی ساڵی ١٩٤٧ ساڵح جەبر وەزارەتی نوێی دامەزراندو هەر لە سەرەتاوە هەموو تواناای خۆی بۆ ئەوە تەرخان‌کرد کە ڕۆژێك زووتر ئەو پەیمانەی لەندەن دەیویست مۆر بکرێت . لە ڕۆژی ٢٢ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٧وە سەرەتا لە باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغداو ، دواییش لە کۆشکی شاهانە «نوێنەرانی» عیراق‌و بەریتانیا چەند جارێك بە نهێنی کۆبوونەوە . مەبەستی ئەو کۆبونەوانە ، کە تا

ڕۆژی ٤ی کانوونی یەکەمیان خایاند ، دیارکردنی ناوەڕۆک‌و چوارچێوەی پەیمانی نوێ‌و جۆری مۆرکردنی بوو . ڕۆژی ٤ی کانوونی دووەمی ساڵی داهاتو ، واتە پاش مانگێك ،لە بەغدا ناوی ئەندامانی ئەو وەفدە بڵاوکرایەوە کە دەبوو بچێتە لەندەن «بۆ بەستنی پەیمانێکی نوێ لەبریتی پەیمانی ١٩٣٠» . وەفدەکە بە سەرۆکایەتی ساڵح جەبرو ئەندامەتی نوری سەعیدو وەزیری هەندەران فازیل جەمالی‌و وەزیری بەرگری شاکیر وادی‌و چەند کەسانێکی‌تر بوو . دەستوبرد ئەم وەفدە بەرەو لەندەن کەوتە ڕێ‌و ڕۆژی ١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ لە بەندەری پۆرتسمۆث ، کە کەوتۆتە باشووری بەریتانیاوە ، لەگەڵ نوێنەرانی لەندەندا ئەو پەیمانەی گەڵاڵە کرابوو مۆری کردو بەو جۆرە ناوی لە مێژووی هاوچەرخی عیراقدا بووە «پەیمانی پۆرتسمۆث» .

«پەیمانی پۆرتسمۆث» تەنانەت بە نیسبەت پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ شەوە هەنگاوێك بوو بۆ دواوە ، چونکە ئەویان عیراقی توندتر بە بەریتانیاوە دەبەست . ئەگەر بەپێی پەیمانی سی ئینگلیز تەنها لە کاتی شەڕدا مافی ئەوەی هەبوو لەشکری خۆی بهێنێتە ناو خاکی عیراقەوە ، ئەوا بەپێی «پەیمانی پۆرتسمۆث» ئینگلیز ئەو مافەی لە کاتی «مەترسی پەیدابوونی شەڕیشدا» وەرگرت ، واتە هەر کاتێك لەندەن بیویستایە بە هەر بیانویەکەوە بۆی هەبوو لەشکر ڕەوانە بکاتە عیراق . بەپێی بەندی یەکەمی «پۆرتسمۆث» سەرانسەری خاکی عیراق بۆ ماوەی ٢٠ ساڵی ڕەبەق بووە بنکەیەکی بەریتانی ڕووت . بەندەکانی‌تری « پەیمانی پۆرتسمۆث » کلیلی زۆر لایەنی ژیانی سیاسی‌و ئابووری‌و کاروباری سوپای دابووە دەست ئینگلیز[٥] .

هەواڵی بەستنی «پەیمانی پۆرتسمۆث» هەموو عیراقی بە جارێك خرۆشاند . بە هەزاران خۆنیشاندەر ڕژانە سەر شەقامی شارە گەورەکان‌و نارەزایی گەل زۆر بە خێرایی گەیشتە پلەی ڕاپەڕینێکی گەورەو ڕێك‌وپێك کە جڵەوی سەرکردایەتی بە دەست هێزە نیشتمانی‌یە نهێنی‌و ئاشکراکانەوە بوو .

گەلی کورد زۆر بە گەرمی تێکەڵی ئەم ڕاپەڕینە بوو . نیشتمانپەروەرانی کوردی بەغدا هەر لە سەرەتاوە شان بە شانی دانیشتوانی پایتەخت ڕژانە سەر شەقامەکانی

(٥) دەربارەی دەقی بەندەکانی «پەیمانی پۆرتسمۆث» بروانە :
عبدالرزاق الحسني ، تاريخ الوزارات العراقية ، الجزء السابع ، صيدا ، ١٩٦٨ ، ص ٢٣٣ – ٢٣٩ .

شار . لە بەغدا پارتی دیموکراتی کوردستانو حیزبی کۆمۆنیستو حیزبی شەعب کۆمیتەیەکی سێ قۆڵی ی تایبەتی یان دامەزراند کە ئەرکی سەرپەرشتیو رێکخستنی خەباتی گەلو دیارکردنی دروشمە گەورەکانی خەباتی ئەم قۆناغەی کەوتە ئەستۆ. ئەمانە ئەو دروشمە سەرەکی یانەن کە کۆمیتەی ناوبراو دایبەزاندن :

«پوچ کردنەوەی پەیمانی پۆرتسمۆث» ، «روخاندنی حوکمەتی سالح جەبر» ، «هەڵبژاردنی ئازادی نوێنەرانی گەل» ، «دانی مافە دیموکراسی یەکان» ، «نەهێشتنی گرانی» .

جگە لەم دروشمانە لە کاتی رووداوەکانی راپەرینەکە خۆیدا چەند دروشمێکی تر بەرزکرانەوە ، کە بەشێکیان پێوەندیدار بوون بە مافە نەتەوەیی یەکانی گەلی کوردەوە . لۆنگریگ بە شێوازە ژەهراوی یەکەی خۆی ئەم ئاڵوگۆڕە شۆڕشگێری یەی نرخاندووەو دەڵێت :

«ئەو پەیمانە بەهێزەی ساڵی ١٩٤٨ لە نێوان نەتەوەپەرستانو کۆمونیستانی کوردی سەر بە رووسدا بەسترا . ئاژاوەیەکی بێ کۆتایی لە سەر شەقامو قوتابخانەکانی شاری سلێمانیدا نایەوە»[٦] .

هێزە نیشتمانی یەکانی تریش دوورەپەرێز نەوەستان . هێشتا وەفدەکەی سالح جەبر نەچوبووە لەندەن کاتێك پارتی یانی «وطني – دیمقراطي» و «ئیستیقلال» و «ئەحرار» بەیاننامەیەکی سێ قۆڵی یان بلاوکردەوە کە تێیدا داوای لابردنی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ یان کردو رایانگەیاند حوکمەتی سالح جەبر هیچ کاتێك مافی ئەوەی نی یە بە ناوی گەلی عیراقەوە پەیمانێکی نوێ لەگەڵ بەریتانیادا ببەستێت[٧] .

تەقینەوەی گەورەی جەماوەری عیراق لەو رۆژەوە دەستی پێ کرد کە فازیل جەمالی ی وەزیری هەندەران لە لەندەنەوە هەواڵی دەست پێ کردنی «گفتوگۆیەکی

---

(٦)

S.H.Longrigg , Iraq 1900 to 1950 , London , 1953, P . 353.

(٧) بروانە :

«صوت الاحرار» (جريدة) ، بغداد ، ١ و ٢ كانون الثاني ١٩٤٨ ، محمد مهدي كبه ، المصدر السابق ، ص ٢٢٥ – ٢٢٦ .

گرنگی» له نێوان بەریتانیاو عیراقدا ڕاگەیاند . بۆ ڕۆژی داهاتوو ، کە دەیکردە چواری کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ [٨] ، شاری بەغدا بە جارێك خرۆشا . هەر ئەو ڕۆژەش ، لەسەر فەرمانی سەرەك وەزیران ، پۆلیس بەربوونە گیانی خۆنیشاندەرانی پایتەخت . بۆ ڕۆژی داهاتو کاربەدەستان کۆلێجی حقوقیان بەو بیانووەوە داخست کە گوایە بیروباوەڕی گێرەشێوێن لە ناو قوتابیانیدا باوە .

ئەم ڕوداوانەی بەغدا وەزارەتی ساڵح جەبریان لە بەستنی پەیمانێکی نوێ پاشگەز نەکردەوە . ڕۆژی پێنجی کانوونی دووەم ئەندامانی وەفدی «عیراق» بە فڕۆکەیەکی تایبەتی چوونە لەندەن . ئەمە هێندەی‌تر نیشتمانپەروەرانی عیراق بزواند . هەر ئەو ڕۆژە دیسان قوتابیانی بەغدا ڕژانە ناو شەقامانی شارەوەو دەستەو چینەکانی‌تریش دایانە پاڵیان . ئەمجاریش پۆلیس هێرشی هێناو لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە هەردوو لا بریندار بوون . بەلاّم دەزگاکانی میری لەو بەیاننامەیەیاندا کە بەم بۆنەیەوە بلاّویان کردەوە تەنها باسی برینداکردنی ٤٢ پۆلیسیان ڕاگەیاند . هەر زووش دەرکەوت کە ئەوان دەیانەوێت ئەمە بکەنە بیانووی دەست‌وەشاندنی توندوتیژتر ، ئەوەبوو ڕۆژی ٧ی کانوونی دووەم بەیاننامەیەکی‌تریان بلاّوکردەوە کە بە هەڕەشەو گوڕەشەیەکی زۆرەوە دەیگوت :

«حوکمەت زۆر بە توندی لەو کەسانە دەدات ڕێگە بە خۆیان دەدەن هێمنی‌و ئاسایش تێك‌بدەن» .

ئەنجامی ئەم کارو بڕیارانە تەواو بە پێچەوانەی ویستی کاربەدەستانەوە شکایەوە . بەغدای پایتەخت نەك هەر هێمن نەبۆوە . بەڵکو هەمان کات شارەکانی‌تریش تێکەڵ بە ڕاپەڕینی گەل بوون . کاتێك کار گەیشت بەمە جەمال بابانی جێگری ساڵح جەبر ناچار بوو لەگەڵ ژمارەیەك سیاسی‌ی ناسراودا کۆبوونەوەیەکی تایبەتی بکات گوایە بۆ لێکۆڵینەوە لە داخوازی‌یەکانی گەل . هەرچۆن بێت حوکمەت ناچار بوو کەمێك بکشێتە دواوە . ئەوەبوو ڕۆژی ٨ی کانوونی دووەم بڕیاری کردنەوەی کۆلیجی حقوق‌و بەردانی گیراوەکان بە زامن دەرچوو .

بەلاّم ئەم بڕیارانە تەفرەی جەماوەریان نەدا ، چونکە لەگەڵ ئەو هەموو

---

(٨) فازیل جەمالی ئەو هەواڵەی ڕۆژی ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ بلاّوکردەوە .

هەراوبگرەدا هێشتا حوکمەت لە بەستنی «پەیمانی پۆرتسمۆث» پاشگەز نەبۆوە. لەبەر ئەوە لە ڕۆژی ١٦ی مانگەوە خۆنیشاندان دیسان هەموو لایەکی گرتەوە. شاگردانی قوتابخانە ناوەندی‌یەکان‌و دەزگا زانکۆییەکان بڕیاری مانگرتنی سێ ڕۆژیان دا. پاش سێ ڕۆژ جڤاتانی[9] کرێکارانیش داوایان لە ئەندامانی خۆیان کرد ئەوانیش «لە پێناوی جێ بەجێ‌کردنی داخوازێکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی گەلدا ئاگری خەباتیان بەتین‌تر بکەن». هەمان کات هێزە بۆرجوازی‌یە نیشتمانی‌یەکانیش گوڕیان دایە خۆیان‌و کەوتنە هاندانی کۆمەلانی خەلْك بۆ ئەوەی پەرە بە خەباتی سەختی ئەو ڕۆژە ناسکەی مێژووی نیشتمانیان بدەن. بەم بۆنەیەوە دیسان پارتی‌یانی «وطنی – دیمقراطی»و «ئیستیقلال»و «ئەحرار» هەر یەکەیان بە جیا بەیاننامەیەکی دوورو درێژی بلاْوکردەوە کە بەشی زۆری هەرسێکیان بۆ شی‌کردنەوەی ناوەرۆکی «پەیمانی پۆرتسمۆث» و دەرخستنی مەبەستە نەبینراوەکانی تەرخان کرابوو[10].

هەموو ئەمانە بەسەر یەکەوە بە جارێك ولاْتیان هێنایە جۆش. ڕۆژی ١٩ی کانوونی دووەم بە دەیان هەزرا خۆنیشاندەر بە خۆیان‌و دروشمە نیشتمانی‌یەکانیانەوە کەوتنەوە دەربڕینی نارەزایی گەل. خۆنیشاندەرانی بەغدا ئەمجاریان ڕوویان کردە هۆلی پەرلەمان‌و بە یەك دەنگ هاواریان دەکرد: «مەرگ بۆ پەیمانی پۆرتسمۆث»، «بڕوخێ وەزارەتی سالح جەبر».

ڕۆژی داهاتو، واتە ٢٠ی کانوونی دووەم، پۆلیسی پایتەخت دیسان دەسڕێژیان لە خۆنیشاندەران کردو بوونە هۆی شەهید بوونی چوار کەس‌و بریندار بوونی دەیان کەسی‌تر. بۆ سبەینێ کە بە هەزاران نیشتمانپەروەر ڕژانە سەر شەقام‌و تەختانی‌یەکانی نزیك خەستەخانەی مەجیدی‌یەوە[11] بە نیازی بەشداری‌کردن لە ناشتنی

---

(٩) جڤات واتە «نقابة».

(١٠) بۆ دەق ئەو بەیاننامانە بڕوانە:

الدكتور فاضل حسين، تأريخ الحزب الوطني الديمقراطي، بغداد، ١٩٦٣، ص ٢٢٢، عبدالرزاق الحسني، المصدر السابق، الجزء السابع، ص ٢٤١ – ٢٥٣.

(١١) ئەو خەستەخانەیەی کاتی خۆی عوسمانی‌یەکان لە «باب المعظم»ی بەغدا کردیانەوەو بە ناوی سوڵتان عەبدولمەجیدەوە ناویان نا تا ئەمڕۆکانیش هەر پێی دەگوترا «خەستەخانەی مەجیدی». تا ئێستەش بەشێك لە بیناکانی خەستەخانەی مەجیدی ماونەتەوەو خراونەتە سەر «مدينة الطب».

قوربانیێکانی رۆژی رابوردوودا ، دووباره دەسرێژیان لی‌کرایەوەو ئەمجاریان دوو کەس شەهید کران ، که یەکێکیان قوتابی‌ی کۆلێجی دەرمانسازی بوو ، گەلێکیش بریندار بوون .

ئەم هەنگاوەی دوایی میری تەنانەت ئەو دەستەو دایەرانەشی بزواند کە تا ئەو کاتە لەبەر هۆی جیاواز تێکەڵی بە خەباتی جەماوەر نەبوبون . بەرێوەبەرو دەستەیەك مامۆستای کۆلێجی پزیشکی زۆر بە توندی نارەزایی خۆینانیان راگەیاندو لەگەڵ نزیکەی ۱۰۰ پزیشکی شاری بەغدادا دەستیان له کار هەڵگرت[۱۲] .

کاتێك کار گەیشتە ئەم قۆناغە ناسکە ئیتر عەبدولئیلا بۆ خۆی ناچار بوو یەکسەر بێتە کایەوە . رۆژی ۲۱ی کانوونی دووەم لەگەڵ دەستەیەك لە پیاوە سیاسی‌یە ناودارەکاندا کۆبۆوە که نوێنەرانی هەرسێك حیزبە سیاسی‌یە ئاشکراکانیان تێدا بوو[۱۳] . ئەمان بە ئاشکرا داوای لابردنی ساڵح جەبرو گفتی نەبەستنی هیچ جۆرە پەیمانێکیان لێی‌کرد[۱٤] .

عەبدولئیلا کە گلۆلەی کەوتبووە لێژی ناچار بوو نوێنەرانی گەل چی‌یان ویست وا بکات . سەرەتا بەیاننامەیەکی لە ئیزگەوە بلاوکردەوەو تێیدا گفتی دا «هیچ پەیمانێك مافی ولاتو داخوازی‌یە نیشتمانی‌یەکانی رەچاو نەکات ، نەبەسترێت» . بەلام هەمان کات ساڵح جەبر لە لەندەنەوە کەوتە هەرەشەو گورەشەو لە بەیاننامەیەکی تایبەتیدا راپەرینی گەلی لە یەك کاتدا دایە پاڵ ئەوانەی لەخۆیەوە ناوی لی‌نان «کۆمۆنیستو نازی» (! !)و رای‌گەیاند کە بۆ خۆی بەم زوانە بۆ «تەمیەی گێرەشێوێنەران» دەگەرێتەوە بەغدا .

ئەم بەیاننامەیەی سەرەك وەزیران هێندەی‌تر خەڵکەکەی وروژاند . رۆژی ۲۳ی

---

(۱۲) بروانە :

(Revolution in Iraq) , Baghdad , 1958 , PP. 13 — 14.

(۱۳) کاربەدەستان هەر زوو پارتی گەل «الشعب» و یەکیەتی نیشتمانی «الاتحاد الوطني»یان داخست .

(۱٤) بۆ درێژەی ئەم باسە بروانە :

M. Khadduri , Independent Iraq ( 1932 — 1958) , London , 1960 , P. 268 ,

الدکتور فاضل حسين ، المصدر السابق ، ص ۲۲۳ ، عبدالرزاق الحسني ، المصدر السابق ، الجزء السابع . ص ۲۱۰ — ۲۷٦ .

کانوونی دووەم دیسانەوە لە هەموو لاوە کۆمەڵانی خەڵك ڕژانەوە سەر شەقامەکانی پایتەخت و شارە گەورەکان و ئەمجاریان سووربوون لەسەر ئەوەی دەست هەڵنەگرن تاوەکو ئەم دروشمە سەرەکی یانەی خوارەوە جێ بەجێ دەکرێن :

١ - ڕوخاندنی وەزارەتی ساڵح جەبر.
٢ - بەردانی گیراوە سیاسی یەکان .
٣ - هەڵبژاردنێکی ئازاد .

ڕۆژانی ٢٤و ٢٥ی کانوونی دووەم لە ژێر سایەی ئەم دروشمانەدا زنجیرەیەك خۆنیشاندانی زۆر گەورە لە بەغداو شارە گەورەکاندا ڕووی دا . بۆ ڕۆژی داهاتوو ساڵح جەبر گەیشتەوە بەغدا . هاتنەوەی سەرەك وەزیران و کارەکانی بوونە نەوت و کرا بەسەر ئاگری ڕاپەڕینی گەلدا ، ئەو بە ئەوپەڕی برواوە گفتی دایە عەبدولئیلا کە لە ماوەی تەنها ٢٤ سەعاتدا «هێمنی و ئاسایش دەگێڕێتەوە دۆخەکەی جارانی» . جەمال بابانی بەوە تاوانبار کرد کە گوایە ئەو کاتەی بۆ خۆی لە وڵات نەبوو ئەو «بە نەرمی لەگەڵ گێرەشێوێنەراندا ڕەفتاری کردووە» ، ئەو تۆمەتەی وای لە جەمال بابان کرد یەکسەر واز لە وەزارەت بهێنێت . وەزیری کاروباری ناوخۆش بۆ ئەوەی «هەڵە»کەی جەمال بابان دووبارە نەکاتەوە ئەو ڕۆژەی ساڵح جەبر گەیشتەوە بەغدا فەرمانی دا بە پۆلیسی هەموو عیراق بە توندی لە هەموو خۆنیشاندانێکی نوێ بدەن . بۆ ڕۆژی داهاتو ، واتە ٢٧ی کانوونی دووەم ، لە هەموو لاوە پۆلیس بەربوونە گیانی نیشتمانپەروەران . ئەو ڕۆژە لە بەغدا ٢٠ کەس کوژران و گەلێکیش لەوە زیاتر بریندارکران . خۆنیشاندەرانی بەغدا هەر ئەو ڕۆژە چاپخانەی «تایمسی عیراق»ی سەر بە ئینگلیزو مەڵبەندی ڕۆشنبیری ی بەریتانی یان سووتاند . لە کەرکوکیش نیشتمانپەروەران هێرشیان بردە سەر کۆنسولخانەی بەریتانی[١٥] . لە ترسی خۆنیشاندەرانی کەرکوك دەزگاکانی کۆمپانیای نەوت بە پۆلیس تەنران . شاری سلێمانیش لە یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕینی کانوونەوە بە جارێك خرۆشا . لێرەش خۆنیشاندەران هێرشیان کردە سەر مەڵبەندی ڕۆشنبیری ی بەریتانی و سوتاندیان .

---

(١٥)

S.H.Longrigg , Op. Cit., P. 347

ئەم ڕوداوانە بە جارێك مەترسی‌یان خستە ناو ڕیزەکانی زۆربەی فەرمانڕەوایانی وڵاتەوە . بۆنی شۆڕش لە هەموو لاوە بەرز دەبۆوە . هەمان ڕۆژی ٢٧ی کانوونی دووەم وەزیری دارایی‌و وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی‌و سەرۆکی «ئەنجومەنی نوێنەران»و ٢٠ کەس لە ئەندامانی وازیان لە کار هێنا . بەڵام نوری سەعیدو ساڵح جەبرو نزیکەکانیان دەیانویست بە هەر نرخێك بێت ڕاپەڕینی گەل دابمرکێنرێتەوە . لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولئیلا ناچار بوو هەر ئەو ڕۆژە داوا لە سەرەك وەزیران بکات دەست لە کار هەڵبگرێت‌و بۆ خۆی سەعات هەشتی شەو ئەم هەواڵەی لە ڕێگەی ئێزگەوە ڕاگەیاند .

ئەمە یەکەم سەرکەوتنی گەورەی گەل بوو لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی کانووندا‌و دەسکەوتێکی کەم هاوتا بوو نەك تەنها لە مێژووی هاوچەرخی عیراقدا ، بەڵکو هەمان کات لە مێژووی هاوچەرخی سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاستدا ، کۆمەلانی خەڵك لە هەموو لاوە زۆر گەرم پێشوازی‌ی هەواڵی کەوتنی وەزارەتی ساڵح جەبریان کرد .

دەسکەوتی گەورەی ئەو ڕۆژە جەماوەرو پارتی‌یە سیاسی‌یەکانی سارد نەکردەوە ، ئەوان پاشگەزبوونەوەی عیراقیان لە «پەیمانی پۆرتسمۆث» دەویست‌و لەوە دەترسان دوورخستنەوەی ساڵح جەبر تەنها پاشەکشەیەکی تەکتیکی بێت . ئەوەبوو ڕۆژی ٢٨ی کانوونی دووەم توانی‌یان کارێکی ئەوتۆ بکەن نەهێڵن دامەزراندنی کابینەی نوێ بە ئەرشەد عومەری بسپێردرێت کە وەك ساڵح جەبر سیاسی‌یەکی بێزراو بوو . لەبەر ئەوە عەبدولئیلاو ڕاوێژکارانی ناچار بوون بیر لە یەکێکی ئەوتۆ بکەنەوە کە جەماوەر لەو ڕۆژەدا پێی قایل بێت . بۆ ڕۆژی داهاتوو دامەزراندنی کابینەی نوێ بە محەمەد صەدر سپێردرا کە پیاوێکی ئایینی ناسراوو یەکێك لە سەردارانی سۆڕشی بیست بوو . ئەمە بۆ خۆی کشانەوەیەکی تر بوو لە لایەن دەستەی فەرمانڕەواوە ، بە تایبەتی گەر ئەوەش بگرینە بەر چاو کە دوو نوێنەری بۆرجوازی‌ی نیشتمانی لە وەزارەتەکەی محەمەد صەدردا بەشدار بوون ، یەکەمیان محەمە ڕەزا شەبیبی‌و دووەمیان محەمەد مەهدی کوببەی سەرۆکی پارتی ئیستیقلال بوو . بەڵام بەرامبەر بەوان نوێنەرانی دەستەو دایەرە کۆنەکانی وەك جەمیل مەدفەعی‌و ئەرشەد عومەری

بوونە ئەندامی کابینەی نوێ کە هەمان کات پارتی «وطنی دیمقراطی»ی لیٚ دوور خرایەوە . هەرچی پارتی ئەحرار بوو بۆ خۆی نەیویست بەشدار بێت .

زۆری نەبرد ڕۆژگار دەری‌خست ئەم کشانەوەیەی کۆنەپەرستی‌ی عیراق هەنگاوێکی وردکارو دووربین بوو ، بەڵام گەیاندنی بە ئەنجام هێشتا پێویستی بە چەند هەنگاوێکی‌تر بوو . سەرەك وەزیرانی نوێ محەمەد صەدر لە یەکەم بەیاننامەیدا گفتی جیٚ بەجی‌کردنی «داخوازی‌یەکانی گەلی عیراق سەربەرز»ی دا . ڕۆژی یەکی شوباتیش بڕیاری دامەزراندنی کۆمیتەیەکی تایبەتی‌ی بۆ دیارکردنی «گوناهبارانی خوێن ڕشتنی کانوونی دووەمی» دەرکرد . ئەمجا پاش دوو ڕۆژ هەواڵی بڕیاری بەتاڵ‌کردنەوەی «پەیمانی پۆرتسمۆث»ی ڕاگەیاند .

ئەم بڕیارانە هێزە نیشتمانی‌یەکانیان لە خەبات نەخست ، ئەوان دەیانویست هەموو دروشم‌و داخوازی‌یەکانی گەل جیٚ بەجیٚ بکرێن . شایانی باسە خەباتی جەماوەری کوردستانیش لەو ڕۆژانەدا هەمان شێوەی فراوان‌و ڕێکخراوی بەغدای وەرگرت . دانیشتوانی شاری سلێمانی ، بەوێنە ، لە نامەیەکی تایبەتیدا ئەم داخوازی‌یانەی لای خوارەوەیان خستە بەر دەمی وەزارەتی ساڵح جەبر کە لە ناوەرۆکی گشتیدا جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی لەگەڵ دروشمە سەرەکی‌یەکانی ناوچەو مەڵبەندەکانی‌تردا نەبوو :

١ – دانی مافە دیموکراسی‌یەکانی گەل .

٢ – ڕێگەدان بە ژیانی پارتایەتی سەربەخۆ .

٣ – ڕێگەدان بە دامەزراندنی جڤاتی کرێکاران .

٤ – ئازادکردنی هەموو گیراوە سیاسی‌یەکانی عیراق .

٥ – لابردنی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ .

نێرەرانی نامەکە بەم جۆرە کۆتاییان پیٚ‌هێنابوو : «دانیشتوانی شارەکەمان دەست لە خەباتی خۆیان هەڵناگرن هەتاوەکو ئەم داخوازی‌یانە جیٚ بەجیٚ دەکرێن»(١٦) . بۆ جیٚ بەجی‌کردنی هەمان مەبەست شوبات‌و نیسانی ١٩٤٨ چەند وەفدێکی تایبەتی لە

---

(١٦) بڕوانە :

نوري عبدالرزاق حسين ، تيارات سياسية في الحركة الوطنية العراقية ، القاهرة ، بلا ، ص ٦٥ .

کوردستانەوە هاتنە بەغدا . ڕۆژی سیازدەی شوبات نوێنەرانی هەولێرو کۆیە پێکرا ڕژانە سەر شەقامەکانی بەغداو دوای زیارەتی گۆڕی شەهیدانی ٢٧ی کانوون لەگەڵ دانیشتوانی پایتەختدا بەشداری ناشتنی نیشتمانپەروەری کورد حسەین عەلی‌یان کرد کە بەر لەوە لە یەکێك لە خۆنیشاندانەکانی بەغدادا بریندار کرابوو . گۆڤاری «گەلاوێژ» لەم بارەیەوە نووسیوی‌یە دەڵێت :

«لە ڕۆژی ١٩٤٨/٢/١٣دا پۆستەی کۆیەو هەولێر گەیشتنە جێ ، ئەوی پێی بڵێن پیاوەتی نواندیان ، بە شەقامەکانا سەر گۆڕی شەهیدەکان گەڕان . چەپکە گوڵیان بە دیاری بۆ بردن ، پێ‌یان وتن وا مەزانن کە ڕۆیشتوون ! ، نەڕۆیشتوون ، لە گۆشەی دڵمانا جێتان تەرخانە . بەوەش وازیان نەهێنا ، لەگەڵ کورگەلی (کوردا) تەرمەکەی حسەین عەلی‌ی تازەپێگەیشتوویان بردە شارە پیرۆزەکەی نەجەف ، ئەو شارە کە ئامۆزای پێغەمبەری لێ میوانەو ئەهلەکەشی ئەهلی دانش‌و عیرفانە»[17] .

ڕۆژی ٢٦ی شوباتیش وەفدێکی پێنج‌سەد کەسی لە زاخۆو ڕانیەو سلێمانی‌یەوە هاتنە بەغداو لەگەڵ نیشتمانپەروەرانی پایتەختدا خۆنیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست‌و چوونە سەر گۆڕی شەهیدان‌و لەوێ چەند وتارێکیان بە عەرەبی‌و کوردی خوێندەوەو چەند جارێك بە گەرمی باسی ئەوەیان کرد کە دەبێت خەباتی هاوبەشی عەرەب‌و کورد ببێتە بەردی بناغەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوای نیشتمانی تاوەکو گەل بتوانێت بەسەر دوژمندا زاڵ بێت . دیسان « گەلاوێژ» ئەو ڕۆژە مێژووییەی بۆ خستوینەتە ئەم چوارچێوە ڕازاوەیەوە :

«ڕۆژی ١٩٤٨/٢/٢٦ کورگەلی سولەیمانی گەیشتن[18] ، تەنها ئەوان ٣٠٠ کەسێك بوون . لەگەڵ لاوەکانی ڕانیەو زاخۆ یەکیان‌گرت . کە کۆبوونەوە دیمەنی ٥٠٠ کوردی جوامێری دلێری دڵ بریندارت ئەدی کە بۆ پرسەی برایەکی هاوفیکریان ئەچن . لە دەشتی مەلیك فەیصەلدا لە پاش ئەوە کە ڕیزیان بەست ڕووەو گۆڕستانی[19] (باب المعظم) بە شارع ڕەشیدا لە سەعات دوو نیوی پاش

---

(١٧) بڕوانە :

«گەلاوێژ» ، مارتی ١٩٤٨ ، ل ١٤ .

(١٨) لە شوێنی زۆر پێویستدا نەبێت دەستکاری‌ی ڕێنووسەکەی نەکراوە .

(١٩) لە دەقی وتارەکەدا : ڕووەو گۆڕی . . .

نیوەڕۆوە بەڕێ‌کەوتن . . . لە پێشەوە بەیداخی عیراق ، لە پاشا هەندێ لە پیاوماقوڵ‌و ڕیش سپی‌یەکان بە جلوبەرگی کوردی‌یەوە چوار چوار بە شوێن بەیداخەکەوە ، ئینجا بەیداخی پۆستەی سولەیمانی ، ڕانیە ، زاخۆ. بەشوێن ئەوانا کچانی کورد چەپکە گوڵیان بە دەستەوە ، لە پاشا لاوان بە جلوبەرگی کوردی‌و بەیداخی پرسەوە ، بەشوێن ئەوانا جووتە منداڵێکی بچکۆلە بە مراخانی‌و شەرواڵەوە ، دیسان کچان بە چەپکە گوڵ‌و ڕێحانەوە ، لە شوێنیانەوە کوڕیە کوردەکان . . سەرە هاتەوە سەر لاوەکان بە خۆیان‌و بەیداخەکانیانەوە ، لەم بەیداخانەدا هەموو جۆرە شتێك نووسرابوو : «پرسەی شەهیدەکان ، وەفدی کوردەکان ، ژبانی کوردو عەرەب ، برایەتی کوردو عەرەب ، داواکردنی ئاسایشی وڵات» . ئەمانە کە بەم ڕێکوپێکی‌یە ڕێکخرابوون هەر لە بەینی بیست هەنگاوێکدا دوو کورد ، یەکێ لە لای ڕاست‌و یەکێ لە لای چەپ بە جلوبەرگی کوردی‌و بە فیشەك‌و دەمانچەی برنەوەوە ئەڕۆیشتن. ئەمانە هەموو پەردەیەکی کشوماتی ماتەمی‌یان بەسەرا کێشراو هەموو دەستەو کەمەرو لەسەر خۆ ملی ڕێیان گرت بە بێ دەنگ‌و بە بێ ورتە . عالەمی بەغدا هەر لە «ساحەی مەلیك فەیصەل»ەوە تا گۆڕستانی «باب المعظم» بەژن‌و پیاوەوە ئەم بەرو ئەوبەری «شارع رەشید»یان گرت‌و سەیری ئەم دیمەنەو نمایشەیان دەکرد . لە سەعات چوارا گەیشتنە گۆڕستان‌و چوونە ژوورەوە . . .»[٢٠] .

«گەلاوێژ» کاتێك دێتە سەر باسی ئەو وتارەی حەمەی ئەحمەدی تەها لەسەر گۆڕی شەهیدان خوێندوویەتەوە ئەم قسە پڕمانایانەی خۆیشی خستۆتە پاڵ قسەکانی وتەبێژی کورد :

ئەی «شەهیدانی ڕێگەی ئازادی ! دیمەنی ئەم کوڕو کچانە کە لەسەر گۆڕەکانتانا ئەیانبینن پاشەڕۆکی درەوێنەکراوەکانی ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلولن کە بۆ ئازادی هاتنە مەیدانەوەو دەستی پیسی بێگانە دەستی درێژی مەردانەی بەستن‌و لەگەڵ ئێوەدا کردنی بە ناحەز ! ئەو ئامانجە کە ئێوە بۆی هاتنە مەیدانەوە هەر ئەو ئامانجە بوو کە ئەوان بۆی چوونە زیندانەوە ! ئیستە لێك تێگەیشتین کە دڵمان لە

---

(٢٠) «گەلاوێژ» ، هەمان ژمارە ، ل ١٤ – ١٦ .

عاستی یەك پاكەو ئامانجیان ئامانجێكی پیرۆزو دڵیان دڵێكی بێ كەلە ! !»[21] .

ڕۆژی ٥ی مایسی ١٩٤٨ هەموو ئەمانە لە كاتی هاتنی وەفدی خانەقیندا بۆ بەغدا دووبارە كرانەوە[22] .

خەباتی بێ‌وچانی گەل لە سەرانسەری وڵاتدا وەزارەتی محەمەد صەدری ناچاركرد بەشێكی‌تر لە داخوازی‌یەكانی هێزە نیشتمانی‌یەكان جێ بەجێ بكات . دوای دوودڵی‌یەكی زۆر ڕۆژی ٢٢ی شوبات بلاوە بە ئەنجومەنی نوێنەران كراو بڕیاری هەڵبژاردنی نوێ درا ، ژمارەیەكی زۆر لە بەندە سیاسی‌یەكان بەردران ، ڕێگە درایە ڕۆژنامەو گۆڤارە داخراوەكان بكەونەوە دەرچوون . پاش ماوەیەك هەواڵی كشانەوەی دەستەی سوپایی بەریتانی ڕاگەیێنرا ، ئەو كارەی كۆمەلانی خەڵك بە «سەركەوتنێكی نیشتمانی»ی گەورەیان لە قەڵەمدا[23] .

گەلی كوردیش لە ئەنجامی سەركەوتنی ڕاپەڕینی كانوونی دووەمدا بە چەند مافێكی سەرەتایی خۆی گەیشت . بۆ یەكەم جار لە مێژووی عیراقدا ڕێگەی دەرچوونی گۆڤارێكی سیاسی‌ی بە زمانی كوردی درا[24] . ڕۆژی ٢١ی مارتی ١٩٤٨ بۆ یەكەم جار كورد وا فراوان‌و ئاشكرا یادی نەورۆزی لە بەغداو شارەكانی كوردستاندا كردەوە .

بە داخەوە بەهاری نوێی گەلی عیراق زۆر تەمەن كورت بوو . كۆنەپەرستانی عیراق توانی‌یا بەخێرایی ڕیزەكانیان ڕێك بخەنەوەو بكەونەوە هێرش . هێشتا مانگی مارت كۆتایی نەهاتبوو كە وەزارەتی محەمەد صەدر بە دەستووری وەزارەتەكەی سالح جەبر ڕێگەی نەدا بە پارتی گەل (شەعب) دەست بكاتەوە بە كار كردن . ئەم لادانەی وەزارەتی صەدر لە كاتی هەڵبژاردنی نوێدا زیاتر خۆی نواند . لە زۆر شارو ناوچە دەزگاكانی میری بە ئاشكرا دەستیان وەردایە كاری هەڵبژاردن‌و لە چەند

---

(٢١) هەمان سەرچاوە ، ل ١٧ .

(٢٢) هەمان سەرچاوە ، ل ١٨ – ٢٢ .

(٢٣) لەو قسەیە هی لۆنگریگە ، بڕوانە :

S.H.Longrigg Op. Cit., P. 347.

(٢٤) مەبەست گۆڤاری «نەزارە»ە كە خوالێخۆشبوو مامۆستا عەلائەددین سەجادی سەرنووسەری بوو

شوێنێك نیشتمانپەروەران‌و پۆلیس لەسەر ئەوە پێكیانا دا . هەمان كات كاربەدەستان لە چەند شوێنێك لە كرێكارانیان دا . پۆلیس مانگرتنی كرێكارانی شەمەندەفەری هەولێری دامركاندەوە . لەوەیش خراپتر بە كرێكارانی (حدیثە) كرا ، بە تایبەتی چونكە بوونە هۆی زیان گەیاندن بە كۆمپانیای نەوتی عیراق دوای ئەوەی لە پێناوی چەند مافێكی سەرەتاییدا ناچار بوون مان‌بگرن . سەرچاوە هەن ئەو زیانە بە چەند ملیۆنێك دینار لە قەڵەم دەدەن[٢٥] .

كۆنەپەرستان بەمانە قایل نەبوون ، ئەوان دەیانویست عیراق بگێڕنەوە دۆخەكەی جارانی‌و دیسان هێزە نیشتمانی‌یەكان سەركوت بكرێنەوەو كاروباری وڵات بدرێتەوە دەست نوری سەعیدو دەستەودایەرەكەی . بۆ جێ بەجێ‌كردنی ئەم مەبەستەو لاوازكردنی وەزارەتی صەدر ژمارەیەك لە ئەندامانی كشانەوە . لەوەیش زیاتر كۆنەپەرستانی ئەوسای عیراق كەڵكیان لە ڕوداوەكانی فەلەستین وەرگرت . بەو بیانووەوە لە مانگی مایسەوە بە صەدان نیشتمانپەروەر ئاخنرانە بەندیخانەكانی وڵاتەوە . ژمارەیەكی زۆر لە قوتابیانی سلێمانی لە كاتی تاقی‌كردنەوەدا ڕاپێچ‌كران[٢٦] . دوای ئەوەی مزاحم پاچەچی ، كە دۆستێكی نزیكی نووری سەعید بوو ، ڕۆژی ٢٦ی تەمموزی ١٩٤٨ وەزارەتی نوێی دامەزراند هێرشی كۆنەپەرستان بۆ سەر نیشتمانپەروەران هێندەی‌تر توندو تیژ بوو . زۆری نەبرد كۆت‌و زنجیرەكەی جاران خرایەوە گەردنی كۆمەڵانی خەڵك .

گەلێك هۆ یاریدەی كۆنەپەرستانیان دا بتوانن وا خێرا لە دەسكەوتە سەرەتاییەكانی گەل بدەن . بەر لە هەر شتێك دەبێت ئەو ڕاستی‌یە ڕەچاو بكەین كە بەشێك لە هێزە نیشتمانی‌یەكان هەڵوەست‌و ورتە كشانەوەی كۆنەپەرستانیان دووربینانە نەنرخاند ، لەوان وابوو دوژمنیان لە باڵ كردووەو تەنانەت لە گەرمەی كەوتنیدا تا ڕادەیەكی زۆر لەگەڵی نەرم‌و نیان بوون ، وا دیارە «مارەكەی مام هۆمەر» یان لە یاد نەبوو . سەرۆكی پارتی «ئیستیقلال» محەمەد مەهدی كوبە هەر بەوە

---

(٢٥) بە وێنە بڕوانە گۆڤاری «ڕۆژهەڵاتی ئەمڕۆ» ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسكۆ ، ژمارە پێنجی ١٩٥٧ ، ل ١٤ .

(٢٦) دیدەنی لەگەڵ ئەفسەری خانەنشین مستەفا عەبدوڵلا ، ڕۆژی ١٥ی شوباتی ١٩٨٥ .

قایل نەبوو لە وەزارەتەکەی محەمەد صەدردا بەشدار بێت ، بەڵکو بە وەزارەتی تەمونیش قایل بوو کە دەورێکی ئەوتۆی نەبوو ، کەچی بەرامبەر بەوە لە گەرمەی سەرکەوتنی جەماوەردا وەزارەتە هەرە گرنگەکانی وەك کاروباری ناوخۆو هەندەرانو بەرگری درانە دەست ژمارەیەك لە سیاسی یە کۆنەپەرستە قاڵبووە بێزراوەکانی ئەو رۆژگارە . هەمان کات بەشێك لە هێزە نیشتمانی یە بۆرجوازی یەکان لە کاری رۆژانەیاندا بە جۆرێك رەفتاریان دەکرد وەك دووبەرکی یان لەگەڵ چینو دەستە نیشتمانی یەکانی تردا گەیشتبێتە ئاستی تەقینەوە[٢٧] .

بێ گومان لەگەڵ هەموو کەموکورتی یەکانیدا ئینجا راپەرینە پڕ لە قارەمانێتی یەکەی کانوونو روداوو ئەنجامەکانی لاپەرەیەکی پرشنگداری مێژووی هاوچەرخی عیراقو رۆژهەلاتی نزیكو ناوەراستن . وەك مێژوونووسی میسری محەمەد عودە نووسیوی یە ئەم راپەرینە گەورەترین لێدان بوو بۆ «سیاسەتی دەرەوەی ئێرنست بێڤن[٢٨] لە سەرانسەری رۆژهەلاتی عەرەبدا»[٢٩] ، چونکە ، بە راستی ، بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی داوی پیلانێکی گەورە کە لەندەن دەیویست لە رێگەیەوە ولاتانی ناوچەکە لە جاران زیاتر ببەستێت بە خۆیەوە . نیشتمانپەروەرانی ولاتە عەرەبی یەکان هەر زوو لەم راستی یە تێگەیشتن بۆیەکا بە گەرمی پشتگیری ی خەباتی قارەمانانەی گەلی عیراقیان کرد . رۆژانی راپەرینەکە شەقامەکانی قاهیرەو دیمەشقو بێروت زنجیرەیەك خۆنیشاندانی گەورەیان بەخۆیانەوە دی[٣٠] .

راپەرینی کانوون بووە سەرەتای ئاڵوگۆرێکی قوولو پڕئەنجام لە جۆرو شێوازی بیرکردنەوەی سیاسی ی کۆمەلانی خەڵکی عیراقدا بە کوردو عەرەبی یەوە . ئەمەش بەر

---

(٢٧) بە وێنە بڕوانە :

«صوت الاهالي» (جريدة) ، بغداد ، ١٩ أيلول ١٩٤٨ ، محمد مهدي كبه ، المصدر السابق ، ص ٢٤٨ - ٢٤٩ .

(٢٨) کاتی بەستنی «پەیمانی پۆرتسمۆث» ئێرنست بێڤن وەزیری هەندەرانی بەریتانیای گەورە بوو .

(٢٩) محمد عوده ، ثورة العراق ، القاهرة ، بلا ، ص ٦٢ .

(٣٠) بڕوانە :

خالد بكداش ، إنتفاضة الشعب العراقي لسنة ١٩٤٨ واثرها في تطور القضية العربية ، مطبعة المثنى(؟) ، ١٩٤٨ ، ص ١١ .

له هەر شتێکی تر ڕەنگی له شێوەی خەباتیاندا دژی دەوڵەتە ئیمپریالی‌یەکان دایەوە بەوەی ئەو خەباتە چووە چوارچێوەیەکی گشتی‌ی یەکگرتووەوە . هیچ کاتێك بەر له کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ ئاوەها بە صەدان هەزار کەس له سەرانسەری عیراقداو له یەك کاتداو بۆ یەك مەبەست ڕانەپەڕیون . بەپێی هەندێك سەرچاوە ژمارەی بەشدارانی ئەم ڕاپەڕینە له ٣٠٠ هەزار کەس زیاتر بووە[٣١] .

یەکێك له ئەنجامە هەرە گەورەو قووڵەکانی ڕاپەڕینی کانوون بریتی بوو لەوەی کە بە کردەوەو تاقی‌کردنەوە سەرەتاو بایەخی خەباتی هاوبەشی ڕێکخراوی عەرەب‌و کوردی خستە ڕوو ، ئەو ڕاستی‌یەی بووە بەردی بناغەی سەرکەوتن‌و دەسکەوتەکانی ڕاپەڕینەکە خۆی . گەلێك له هێزە پێشکەوتنخوازەکانی عەرەب دانیان بەمەدا ناوە[٣٢] . یەکێك له ئەنجامە گرنگەکانی ئەم دیاردە نوێ‌یە ئەوەبوو کە داخوازی‌یەکانی گەلی کورد تەنها له چوارچێوەی کوردستاندا نەماوە ، بەڵکو تا ڕادەیەك له ناوچەکانی‌تریشدا ڕەنگی دایەوە . هەر له ڕۆژانی ڕاپەڕینەکە خۆیدا له هەر چوار لای عیراقدا دروشمی بەردانی بەندە سیاسی‌یە کوردەکان بەرزکرایەوە ، ئەوەی تەنانەت سەرنجی مێژوونووسەکانی دەرەوەیشی ڕاکێشاوە[٣٣] . له کوردستان خۆشیدا بۆ یەکەم جار له ڕۆژانی ڕاپەڕینی کانووندا هەستی برایەتی نێونەتەوەیی خۆی نواند[٣٤] . کوردو تورکمان‌و ئاسووری له کەرکوك‌و خانەقین‌و شوێنی‌تر یەك سەنگەری خەبات بۆ یەك مەبەست کۆی‌کردتەوە .

کەم شت بە ڕادەی ئەم دیاردە نوێیەی ژیانی سیاسی‌ی گەلی عیراق مەترسی‌ی خستە ناو دڵی ئیمپریالی‌یەکانەوە . زۆر بەسەر ڕاپەڕینی کانووندا تێنەپەڕی کاتێك

---

(٣١) بڕوانە :

(Sovermenay Iraq) , Moscow, 1966 , P . 158.

(٣٢) بە وێنە بڕوانە :

«الاخبار» (جريدة) ، بيروت ، ٩ شباط ١٩٦٤ .

(٣٣) بڕوانە :

S.H.Longrigg , op. Cit. , P. 346

(٣٤) له گاورباغی ئەو جۆرە یەکیەتی‌یە تەنها له ناو کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی عیراقدا له ڕۆژانی مانگرتنەکەی هاوینی ساڵی ١٩٤٦دا خۆی نواند .

«ئینتێلیگێنس سێرڤیس»ی بەریتانی[٣٥] لە یەکێك لە بەڵگە نهێنی‌یەکانیدا داوای لە پیاوەکانی کرد کە بەشێکی زۆری هەوڵ‌و تەقللایان لە عیراق بۆ خۆش‌کردنی ئاگری ناکۆکی نەتەوەیی نێوان عەرەب‌و کورد تەرخان بکەن[٣٦] . بە هەمان دەستوور بەکرێ‌گیراوەکانی کۆمپانیای نەوتیش بۆ جێ بەجێ کردنی هەمان مەبەست چالاکانە کەوتنە خۆ .

یەکێك لە نیشانە جیاکەرەوەکان‌و دەسکەوتێکی دیاری کۆمەلایەتی‌ی راپەرینی کانوون ئەوەبوو کە ئافرەتی شار ، چ عەرەب‌و چ کورد ، بە شێوەیەکی فراوان‌و رێکوپێك تێکەڵی ژیانی سیاسی‌ی بوون‌و شان بە شانی پیاو بۆ روخاندنی «پەیمانی پۆرتسمۆث» هاتنە کۆڕی خەباتەوە . یەکێك لە بەشدارانی ئەم راپەرینە بە تایبەتی باسی شوێنی ئافرەتی کوردی لە خۆنیشاندانەکانی بەغدای پایتەختدا کردووە[٣٧] .

راپەرینی کانوون دەری‌خست چۆن ئیتر شار بۆتە مەڵبەندی سەرەکی بزوتنەوەی سیاسی‌و خەباتی رزگاریخواو چۆن ئیتر ئەم گوندو لادێ بەدووی خۆیدا رادەکێشێت[٣٨] .

ئەمە نیشانەی قاڵ‌بوونی خەباتی رزگاریخواو نابووت‌بوونی چین‌و دەستە دەرەبەگی‌یەکان‌و دروست‌بوونی یەك بازاڕی‌یە . لە رۆژانی راپەرینی کانووندا دیاردەی بەرزبوونەوەی دەوری پێشەنگی‌ی شار لە کوردستانیشدا زۆر بە روونی خۆی نواند ، بە تایبەتی لەو بزوتنەوەیەدا کە لە ناو جوتیارانی عەربەتدا[٣٩] ئەیلولی

---

(٣٥) «ئینتیلیگێنس سێرڤیس» (Intelligence service) دەزگای جاسوسی بەریتانی‌یە کە سەرەتای دامەزراندنی دەگەرێتەوە دەوروبەری کۆتایی سەدەی پازدەمین . بۆ جێ بەجێ کردنی مەبەستەکانی پەنا دەباتە بەر هەموو رێگەیەکی وەك پیلانگێری‌و کرین‌و فریودان‌و نانەوەی تۆوی دووبەرەکی‌و کوشت‌وبڕ .

(٣٦) بڕوانە :

«الغد» ، مجلة ، ؟ ، شباط ١٩٦٤ ، ص ١٢ – ١٣ .

(٣٧) بڕوانە :

نوري عبدالرزاق حسين ، المصدر السابق ، ص ٦٢ .

(٣٨) واتە «المدينة تجر وراءها القرية» . ئەمەش یەکێکە لە دیاردە گرنگەکانی کامڵ بوون‌و بەرەوپێش چوونی خەباتی جەماوەر .

(٣٩) عەربەت کەوتۆتە دەشتی شارەزوورەوە ، وا لە نێوان هەڵەبجەو سلێمانیدا .

١٩٤٨ تەقی‌یەوە . جوتیارانی کوردستان لەم بزوتنەوەیەی عەربەتدا بۆ یەکەم جار بە شێوەیەکی ڕێکخراو دروشمی خەباتی دژ بە چەوساندنەوەی دەرەبەگی‌یان هەڵگرت . ڕاکێشانی لادێ لە لایەن شارەوە لە ڕووی سیاسی‌یەوە لە ڕوداوەکانی عەرەبەتدا لەوەدا دەبینرێت کە جوتیارانی ناوچەکە لە کاتی بزوتنەوەکەیاندا جگە لە داخوازی‌یە ئابووری‌یە تایبەتی‌یەکانی خۆیان چەند دروشمێکی سیاسیشیان هەڵگرت ، وەك لابردنی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠و نەبەستنی هیچ جۆرە پەیمانێکی نوێ لەگەڵ وڵاتە ئیمپریالی‌یەکانو کێشانەوەی دوا سەربازی بێگانە لە خاکی نیشتمانو بەردانی بەندە سیاسی‌یەکانو چەند داخوازی‌یەکی تری لەو جۆرو بابەتە . دەوروبەری ٥٠٠ جوتیاری ناوچەی عەربەت ئەم داخوازی‌یانەیان کردە بروسکەیەكو دایانە کاربەدەستانی بەغداو ڕۆژنامەکانی پایتەخت[٤٠] .

بزوتنەوەی جوتیارانی عەربەت دوو ڕاستی‌تریشی نیشان‌دا ، یەکەمیان قووڵبوونەوەی تەفاعولی عوزوی لە نێوان ڕوداوەکانی شارو لادێکانداو دووەمیان جێگیربوونی خەباتی هاوبەشی عەرەبو کورد بە خێراییەکی کتوپڕ . ڕۆژی ١٧ی ئەیلولی ١٩٤٨ ژمارەیەکی زۆر لە نیشتمانپەروەرانی بەغدا بۆ پشتگیری‌ی جوتیارانی عەربەت خۆنیشاندانێکیان ڕێکخستو هەر دروشمەکانی ئەوانیان هەڵگرت[٤١] . ئەمە بە جارێك کۆنەپەرستی‌ی عیراقی تۆقاندو بێ‌جێ تاقێك لە هێزە بۆرجوازی‌یە نیشتمانی‌یەکانیشی ترساند . پۆلیس لە یەك کاتدا بەربووە گیانی نیشتمانپەروەرانی بەغداو جوتیارانی عەربەت . تەنها لە بەغدا ٨٨ کەس بریندار کرانو پتر لە ٢٥٠ کەسیش گیران[٤٢] .

هەڵسانی جوتیارانی عەربەتو پشتگیری‌کردنیان لە لایەن نیشتمانپەروەرانی پایتەختەوەو ڕوداوەکانی ڕاپەڕینەکەی کانوون بۆ خۆی‌و هێرشی نوێی کۆنەپەرستان لە کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩٤٨وە ، تا ڕادەیەك بایەخی بوونی بەرەیەکی نیشتمانی‌ی یەکگرتووی بە زۆر لایەنی سیاسی سەلماند ، بە تایبەتی چونکە یەکێك لەو هۆیانەی

(٤٠) بڕوانە :

«صوت الاهالي» ، ١٩ أيلول ١٩٤٨ .

(٤١) هەمان سەرچاوە .

(٤٢) بڕوانە :

عبدالرزاق الحسني ، المصدر السابق ، الجزء الثامن ، ص ١٤

ئەركی سەر شانی کۆنەپەرستیی عیراق ئاسان کرد بریتی بوو لەوەی هێشتا هەموو هێزە نیشتمانیی‌یەکان لە نرخی بوونی بەرەیەکی نیشتمانی تێنەگەیشتبوون. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نیی‌یە لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی کانووندا هەرچەندە هێزە نیشتمانیی‌یە پێشکەوتنخوازەکان یەك جۆر دروشمیان هەڵگرتبوو کەچی جاری وا هەبوو شان بە شانی یەك نەدەچوونە کۆڕی خەباتەوە. خوا هەڵناگرێت دوژمن لە لایەن خۆیەوە درێغی نەکردو چەند بیتوانیایە هێند ئاگری ناکۆکیی خۆش دەکرد، کە کەوتیشە گیانی ناحەزانی بێ جیاوازی هەموویانی لە یەك بەندیخانە توند کرد. ئەمە بووە دەرسێکی گەورە بۆ نیشتمانپەروەرانی عیراق‌و دەوری بینی لە خۆش‌کردنی ڕێگەی دامەزراندنی بەرەی نیشتمانیی یەکگرتووی ئایندەدا.

ئیمپریالیی‌یەکان‌و کۆنەپەرستانی ناوخۆش دەرسی کەمیان لە تاقی‌کردنەوەکانی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ وەرنەگرت. سەرکەوتنی جەماوەرو بەتاڵ‌کردنەوەی «پەیمانی پورتسموث» بەر لە هەر شتێك ئەو ڕاستیی‌یەی بۆ دەرخستن کە بۆ عیراق ڕێبازی سیاسەتی کۆلۆنیالیی کلاسیکی ئیتر چەکە بەکارەکەی جاران نیی‌یەو لەوانەیە زیانی لە قازانجی زیاتر بێت بۆیان. بۆیەکا لەوساوە ئیتر پەنایان بردە بەر فێڵ‌و فەرەجی سیاسەتی «کۆلۆنیالیی نوێ»[٤٣]. جارێکی‌تر بیرای بیرا باس‌و خواسی بەستنی پەیمانێکی دووقۆڵیی وەك «پەیمانی پۆرتسموث»یان نەهێنایەوە گۆڕێ، باس بووە باسی «خەباتی هاوبەش دژی دوژمنی هەموان - کۆمۆنیزمی جیهانی !!!». ئەمە تا ناوەندی پەنجاکان ڕێگەی بۆ بەستنی «پەیمانی بەغدا»[٤٤] خۆش کرد.

---

(٤٣) کۆلۆنیالیی نوێ، واتە نیوکۆلۆنیالیزم (Neo – Colonialism) (الاستعمار الجديد)، بریتی‌یە لە بەرگی نوێی ئیمپریالیی جیهانی. دەوڵەتە ئیمپریالیی‌یەکان لە ژێر زەبری بەهێز بوونی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلان‌و دروست‌بوونی بەرەیەکی سۆشیالیزمی فراواندا ناچار بوون بۆ جێ بەجێ کردنی مەبەستەکانی جارانیان پەنا بەرنە بەر شێوازی کاری نوێ، چونکە شێوازی ڕیسوابووی جارانیان ئیتر دەستی نەئەدا. ناوەڕۆکی کۆلۆنیالیی نوێ بریتی‌یە لە «ئیمپریالیزم بێ وڵاتی ژێردەستە». یەکێك لە ڕووە هەرە گرنگەکانی کۆلۆنیالیی نوێ هەوڵ دانە بۆ ڕاکێشانی بۆرجوازیی نیشتمانی، یا هیچ نەبێت نانەوەی داوی زەلەی گەورە بۆی.

(٤٤) هەرچەندە لە زمانی کوردیدا پەیمان لە بریتی «معاهدة» بەکار دەهێنرێت، بەڵام لە ڕاستیدا دەقاو دەق مانای «حلف» دەگەیێنێت. ڕێك‌کەوتنامەش پڕ بە پێستی «إتفاقیە»یە. شایانی باسە ئەوروپایی‌یەکان وشەی پاکت (Pact) بۆ «حلف» بەکار دەهێنن.

له ژێر سایەی ڕێبازی سیاسی ی نوێیاندا کۆلۆنیالی یەکان و کۆنەپەرستانی ناوخۆ بە شێوەیەکی فراوان و لێکۆڵراوە کەوتنە ڕاوی زۆرزانانەی ئەوانەی لە سەنگەری نیشتمانیدا بوون ، هەوڵیان دا لێیان بکڕن ، یا هیچ نەبێت بە هەڵەیانا بەرن . هەمان کات زۆر لە جاران زیاتر کەوتنە خۆش کردنی ئاگری ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێوان هێزە نیشتمانی یەکاندا ، چونکە دەیانویست دوژمنانیان بە کارو کێشەی لابەلاوە خەریك بکەن . سەرۆکی حیزبی «ئیستیقلال» محەمەد مەهدی کوبە لە یادداشتەکانیدا ئاشکرا توخنی ئەم باسە کەوتووەو دەڵێت کاربەدەستان هەوڵیان دەدا حیزبەکەی ئاراستەی نیشتمانپەروەرەکانی تر بکەن تاوەکو لەو ڕێگەیەوە « بە تیرێك دوو نیشان بپێکن . . .»[٤٥] .

بەڵام ئەو دەرسانەی ئیمپریالی یەکان لە ڕاپەڕینی گەورەی کانوونیان وەرگرت وەك دەرمانێکی هێمن کەرەوەی کاتی وابوو بۆ ئەو دەردە کوشندەیەی دابووی لە پەرەی دڵیان . تازە جارێکی تر گەلی عیراق ، دوای ئەوەی تامی سەرکەوتنی کانوونی چێشت ، بەوان دابین نەئەکرا . ڕوخاندنی « پەیمانی پۆرتسموٹ» بە جارێك گەلی عیراق خستە سەر ئەو باوەڕەی دەتوانێت سەر بە کۆنەپەرستی شۆڕو نیشتمانی لە دەست بێگانە ڕزگار بکات . بەڵگەی مێژوویی گەورەی ئەم ڕاستی یە لەوەدا بەدی دەکرێت کە ئەگەر گەلی عیراق دوای «شۆڕشی بیست» پێویستی بە ٢٨ ساڵی ڕەبەق بوو بۆ ئەوەی بتوانێت بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی تری وەك ئەو بەرپا بکات ، ئەوا دوای ئەمیان لە چوار ساڵ زیاتری نەویست بۆ تەقاندنەوەی ڕاپەڕینێکی نوێ[٤٦] ، هەمووی بەسەر یەکەوە دە ساڵ و چەند مانگێکیشی نەخایاند کاتێك شۆڕشی بۆرجوازی ی - دیموکراتی گەلی عیراق[٤٧] تەختوتاراجی ڕژێمی پاشایەتی بە جارێك هەڵتەکاند .

---

(٤٥) محمد مهدي كبه ، المصدر السابق ، ص ٢١٨ - ٢١٩ .

(٤٦) مەبەست ئەو ڕاپەڕینەیە کە ساڵی ١٩٥٢ تەقیەوە .

(٤٧) مەبەست شۆڕشی چواردەی تەمموزە .

دەگمەن نووسەرانی خۆمان‌و بێگانە بیریان لە کرێکاری کورد کردۆتەوە(٭) .
دوور نەرۆین لە هیچ کامێك لە بەرهەمەکانی مامۆستا ئەمین زەکی‌ی مێژوونوسی گەورەماندا زۆرو کەم ناوی کرێکاری کورد نەهاتووە . بێ‌گومان ئەمیش کەلێنێکی‌ترە لەو دەیان کەلێنانەی لە مێژووی نوسراوماندا هەن ، بەڵام کەلێنێکی گەورە ! .
وابزانم لە راستی دوورنا کەومەوە گەر بڵێم ئەدەبی کوردیش ، بەداخەوە ، لەو کەلێنە بێ‌بەش نی‌یە . کرێکاری کوردیش وەك رونا کبیرو جوتیارو هەموو خەڵکێکی‌تر خاوەن دڵ‌و هەستە ، دڵی وەك هەموو کرێکارێکی‌تر ساف‌و هەستی وەك ئەوان بەرزە ، ئەویش لە هەموان زیاتر ئارەق دەرێژێت‌و لە هەموان هیلاك‌و بێ‌کات‌ترە ، بۆیە کەمتر باسی خەڵك دەکات‌و زیاتر لە هیلاکی‌و دەردو ئازارو نەبونی‌و بێ مافی دەگات‌و حەز بە یاریدەی هەموو لێ‌قەوماوێك دەکات . تاڵ لای ئەو تاڵ‌ترو شیرین لای شیرین‌ترە . لەزەت لە هەموو خۆراکێك دەبینێت . وەك هەموان‌و ، رەنگبێ زیاتریش ، حەز بە چاوی کاڵ‌و لێوی ئاڵ‌و گۆنای پڕخاڵ دەکات ، کاتی بوایە ئەویش چاوباز دەبو ! . ژمارەیان زۆرو کێشەیان زۆرتر ، بۆیە ژیانیان پڕ لە چیرۆکی بێ هاوتاو داستانی دانسقەو تابلۆی رەنگینە . . حەیفە دەستی ئەدەبی کوردی دڵ پەرەی گوڵ کە تاڵاوی زوخاوی ژیان زاخاوی مێشك‌و قەڵەمی داوە ، زوو نەگاتە گەوهەرو ئەڵماسی ئەو خەزنە دەوڵەمەندە ! .

× × ×

(٭) شوباتی ١٩٧٩ لە «رۆشنبیری نوێ»دا بلاوکراوەتەوە ( ل ٨ - ١٤) .

لەم وتارەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی چەند ڕوویەکی سەرەتای دروستبون‌و هاتنەکایەی چینی کرێکاری کورد بخەینە بەرچاو کە دور نی‌یە سەرنجی خوێنەر ڕا کێشن .

لە سەردەمی هەرە کۆنی شارستانەتی مرۆڤەوە کرێکارو کری‌گرتە هەیە . بەڵام هیچ کات‌و لە هیچ شوێن ئەو کرێکارە پەرش‌و بڵاوانە نەبونەتە هێزی بنچینەیی هێنانە بەرهەم لە ناو کۆمەڵدا تا پەیدابونی سەرمایەداری‌ی . لەگەڵ ئەمیاندا دوو چینی نوێ دێنە کایەوە — بۆرژوازی‌و کرێکار . لەبەر ئەوەش کە پەیوەندی‌ی سەرمایەداری لە ئەوروپای ڕۆژئاوا بەر لە شوێنی‌تر دروست بو ، هەر لەوێش دەوروبەری سەدەی چواردەو پازدە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئادەمیزادا چینی کرێکار وەك هێزێکی دیاری کۆمەڵ هاتە ناو[1] .

لە زۆربەی وڵاتانی‌تر ، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست ، پەیدابونی چینی کرێکار زۆر لەوە دوا کەوت . جۆرو هۆی دروست‌بونەکەشی گەلێك لەگەڵ ئەو جیاوازە . لە ئەوروپا ئاڵ‌و گۆڕەکانی ناو کۆمەڵ چینی کرێکاریان دروست کرد ، بەڵام لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات ئەو ئاڵ‌و گۆڕانە لە هۆی تێکەڵ‌بون بە بازاری سەرمایەداری‌یەوە کەمتر دەوریان بینی . لە سەدەی نۆزدەوە لێشاوی تێکەڵ‌بونی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست بە بازاری سەرمایەداری‌ی جیهان دەستی پی‌کرد . ئەمەو گەیشتنی ژمارەیەك دەسکەوتی پیشەسازی‌ی نوێی ئەوروپا بونە هۆی دارشتنی بەردی بناغەی دروست‌بونی چینی کرێکاری زۆربەی وڵاتانی ئەم ناوچەیە .

لە کوردستان ئەم دیاردەیە لەبەر هۆی گرنگ تا ڕادەیەك لەو وڵاتانە دوا کەوت ، یەکەمیان هێزی زۆری پەیوەندی‌ی دەرەبەگی‌ی‌و پاشماوەی ژیانی کۆچەری‌و نیمچە کۆچەری‌ی ناو کۆمەڵی کورد بوو . ئەوی‌تریان نەبونی دەربەندێکی سەربەخۆ بوو کە کەلوپەلی کوردستان‌و بەرهەمی هێنراوی پیشەسازی‌ی ئەوروپای تێدا کۆبێتەوەو پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر کرێکارو چەند کۆمپانیایەك بێت .

بەڵام بەرامبەر بەوە مەرجی‌تری پێویست بۆ دروست بونی ئەم چینە تازەیە لە ئارادابون . یەکەمیان دەوڵەمەندی‌ی کوردستانە کە بەرهەمی کشتوکاڵ‌و ئاژەڵی لە

---

(١) بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئادەمیزادا پەیوەندی‌ی سەرمایەداری لە فلۆرەنسەی ئیتالیا دروست‌بوو ، بۆیەکا لەوێش یەکەم چەکەرەی هەردوو چینی نوێی کۆمەڵ — پرۆلیتاریاو بۆرجوازی پەیدابو .

نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە گەیشتە چەند بازارێکی گرنگی ئەوروپا . کەلوپەلی دروست کراوی ئەوێش بەخێرایی گەیشتە کەلاترین شارو گوندی لای خۆمان . تەنانەت بەر لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە ئینگلیزەکان کۆمپانیای تایبەتی‌یان لە شاری وەك دیاربەکر دامەزراند . هەر لە خۆشەوە نی‌یە گێ . ناپییر پێش پەنجا سالٌ شاری کرمانشای ناو ناوە بەندەری کەلوپەلی ئینگلیزی‌و هندی[٢] .

دووەمیان پەرەسەندنی شارە کوردەکان‌و بەهێزبونی پەیوەندی‌ی بازرگانی‌یان لەگەلٌ شارانی‌ترو پێشکەوتنی پیشەسازی‌ی خۆمالی‌یانە . لەم ڕوانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر کوردستان شان‌بەشانی مەلبەندەکانی‌تری ڕۆژهەلاتی نزیك‌و ناوەراست هەنگاوی بەرەوپێش‌چونی دەنا . لە ڕێگەی ژمارەو بەراودەوە دلنیا دەتوانین بلێین سەدەکانی ناوەند شارە کوردەکان لە گەلێك ڕووەوە وەك شارانی‌تری ڕۆژهەلات پەرەی‌دەسەندو قەوارەی خۆی وەردەگرت . گەڕیدەی تورکی ناودارو سەرچاوەی ڕەسەن ئۆلیا چەلەبی (١٦١١ – ١٦٧٩) کە ناوەندی سەدەی حەڤدە هاتۆتە کوردستان لە بەرگی چوارەمی «سیاحەتنامە» کەیدا[٣] باسی گەورەیی ژمارەیەك شاری وەك دیاربەکرو بدلیسی کردووە . ئەو بازارو قەیسەری‌یانەی دیاربەکر کە ئەو باسیان دەکات ئەوسا لە زۆر ناوچەی ڕۆژهەلات کەم وێنەبون . هەر بەپێی قسەی ئەو دیاربەکر ١٢ گەرماو (حەمام)ی گشتی‌ی تیابووەو (١٤٠) مالیش گەرماوی خۆیان هەبووە . بدلیس (٥) گەرماوی گشتی‌و (٦٠٠)ی تایبەتی‌ی تێدا بووە . ئەم ژمارەیەی دوایان بەلگەی پڕ مانای دەولەمەندی‌ی‌و ڕەفاهەتە[٤] .

---

(٢)

G. Napier , The Road from Baghdad to Baku, – ( The Geographical Janrnal ), London, Vol L111, No 1, January, 1919 , P . 18.

(٣) ١٠ بەرگەو سەرچاوەیەکی گرنگ‌و ڕەسەنە بۆ باسی ولاتانی ڕۆژهەلاتی نزیك‌و ناوەراست لە دەوروبەری کۆتایی سەدەکانی ناوەندا . ئۆلیا چەلەبی بەشی زۆری تەمەنی بە ناوچەکانی ئیمپراتۆری‌ی عوسمانی‌و چەند ولاتێکی ئەوروپایدا گەڕاوە .

(٤) بە پێی قسەی شەمسەدین سامی ژمارەی دانیشتوانی میرنشینی بدلیس ٣٠ هەزار کەس بوو . سەرچاوەی‌تر بە دەوروبەری ٥٠ هەزاری لە قەلەم دەدەن (بڕوانە : شمس الدین سامی ، قاموس الاعلام . بەرگی دووەم ، ل ١٣٢٩ ، م . ی . شەمسی ، شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی وەك سەرچاوەی مێژووی گەلی کورد ، باکو ، ١٩٦٧ ، ل ١٦) .

دوای ئۆلیا چەلەبی بە دەوروبەری ١٥٠ ساڵێك نوێنەری ناوداری ئینگلیز لە عیراق کلۆدیۆس جێمس ڕیچ باسی چەند شارێکی‌تری کوردستانی کردووە. قسەکانی ئەویش بەڵگەی مێژوویین دەربارەی ئاڵ‌و گۆڕو بەرەوپێش چونی شارە کوردەکان. سنەی بە (٥) هەزار ماڵ داناوە، کە هەر جۆر لێکی بدەیتەوە لە ٢٠ هەزار کەس تێدەپەڕێ. مانای ژمارەیەکی وا زیاتر خۆ دەنوێنێت گەر بێتو بزانین ژمارەی دانیشتوانی شاری قودس ساڵی ١٨١٤ دەوروبەری ١٢ هەزارو بەغدا ساڵی ١٨٣١ نزیکەی ٢٠ هەزارو عەممانی پایتەختی ئوردونیش ساڵی ١٨٨٠ تەنها هەزار کەس بووە[٥].

پەیوەندی بازرگانی‌ی نێوان شارەکانی کوردستان خۆی‌و ئەو مەڵبەندو ناوچانەی لێوەی نزیك بون بە پێودانی قۆناغی دەرەبەگی خراپ نەبو. بە پێی سەرچاوە کۆنەکان تاوەکو سەدەی نۆزدەش ئەستەموڵ‌و دیمەشق‌و حەڵەب‌و بێروت تا ڕادەیەکی زۆر بە مەڕو بزنی کوردستان بەڕێوە دەچون. تەنها شاری ئەستەموڵ هەر ساڵەی یەك ملیۆن‌و نیو سەر مەڕی لەوێوە بۆ دەهات. ئەو سوپا گەورەیەی بە سەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی گەورەی فەرمانڕەوای میسر ساڵانی ١٨٣١ - ١٨٣٢و ١٨٣٩ هێرشی بردە سەر سوریا بە مەڕومالی کوردەواری دەژیا[٦]. بەر لەوەی سەدەی ڕابوردو کۆتایی بێت تەنها ئەستەموڵ‌و حەڵەب‌و بەغدا هەر ساڵەی ٣ ملیۆن مەڕی کوردستانیان بۆ دەهات. بەندەری سامسۆنیش بە تەنها ساڵی ٢٠ ملیۆن هێلکەی لەوێوە دەهانی[٧]. دروست کردنی پردی قلیاسانیش

---

(٥) بڕوانە:

ل. ن. کاتلۆف، پەیدابونی بزوتنەوەی نەتەوەیی - ڕزگاریخوا لە ڕۆژهەڵاتی عەرەب، بە زمانی ڕوسی، مۆسکۆ، ١٩٧٥، ل ٩٠ - ٩١. ژمارەی دانیشتوانی عەممانی پایتەختی ئوردون ئیمڕۆ لە ملیۆن تێدەپەڕێ.

(٦) بۆ ئەو ژمارانە بڕوانە:

پێترەر لێرخ، لێکۆڵینەوە دەربارەی کوردی ئێران‌و کلدانییەکانی باکوری باوو باپیریان، بە زمانی ڕوسی، کتێبی یەکەم، پەترسبورگ، ١٨٥٦، ل ٢٤.

(٧) بڕوانە:

B. Nikitine, Les Kurdes, Paris, 1956, P. 185, A.R. Ghassemlou, Kurds and the Kurdistan, Prague, 1965, P. 104.

لەلایەن دەوڵەمەندێکی سلێمانی یەوە تەنها کاری خێرنەبو ، ئەگینا دەبو بەر لە قلیاسان لە تانجەرۆ دروستی بکردایە چونکە ئەمیان ئاوی زۆرترو کاتێ لاقاو ترسدارترە .

بە هەمان دەستور پیشەسازی‌ی خۆماڵی کوردستان بەر لە تێکەڵبون بە بازاڕی سەرمایەداری‌ی جیهان هەنگاوی باشی بەرەوپێش ناو هیچی لە پیشەسازی‌ی وڵاتانی دەوروبەری کەمتر نەبو . جل‌وبەرگی نەتەوەیی‌و ژمارەیەك نەریتی تایبەتی هەوێنی باشی ئەو بەرەوپێش‌چونە بون . دیسان لە بەرگی چوارەمی «سیاحەتنامە»کەی ئۆلیا چەلەبیدا گەلێك بەڵگەی پڕ بایەخ‌و مانا لەم بارەوە وەچنگ دەکەون . بە قسەی ئەو لە سەرانسەری جیهاندا لە وێنەی زەرەنگەری دیاربەکر کەم بووە . وەك دەڵێت کاری جۆلاو بەرگدروو دەباخانەکانی بدلیس دەنگی دابۆوە ، بە ڕادەیەك «چەرمی بە دیاری دەبرایە وڵاتی فەرەنگ» .

دوای دەوروبەری دوو سەدە ، واتە ناوەندی سەدەی نۆزدە ، تایلەری گەڕیدەی ئەوروپایی لەو کتێبەیدا کە بە ناوی «گەشتێك بە کوردستاندا» بلاوی کردۆتەوە باسی کوتاڵی ئاوریشمی دیاربەکر دەکات‌و بۆ چاکی لەگەڵ ئاوریشمی بەناوبانگی حەڵەب بەراوردی دەکات‌و دەڵێت ئەویان هەرزانتر دەفرۆشرێت بۆیەکا لە هەموو ئەو ناوچانەی کەوتونە نێوان دیاربەکرو دەریای ڕەشەوە ، بازاڕی گەرمە[8] . ناونانی گەڕەکی شارێکی وەك سلێمانی بە (سابونکەران) شتێکی مانادارە بۆ ئەم مەبەستەی ئێمە باسی لێوە دەکەین . بەرلە شەڕی یەکەمی جیهان بە ماوەیەك دەیان خێزانی ئەم گەڕەکە بە دروست‌کردنی سابونەوە خەریك‌بون[9] و ساڵی بە لای‌کەمەوە ٥٠٠ تەنیان ئەناردە بازاڕەکانی شارو دەوروبەری‌و چەند مەڵبەندێکی ترو تەنانەت لێشی دەگەیشتە شاری وەك بەغداو تەورێز[10] .

---

(٨) بڕوانە :

و . ل . ڤلچێڤسکی ، ژیانی ئابوری کوردە کۆچەرەکانی پشت قەفقاس‌و ناوچەکانی نزیکی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ، بە زمانی ڕوسی ، - گۆڤاری «ئەتنۆگرافیای سۆڤیەتی» ، ژمارە ٥-٦ ، ١٩٣٦ ، ل ١٥٠ .

(٩) بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ لە سلێمانی تەنها پێنج شەش کەس بە دروست‌کردنی سابونەوە خەریك بون (بڕوانە : «احصاء السكان لسنة ١٩٤٧» ، الجزء الثاني ، بغداد ١٩٥٤ ، ص ١٦٣) .

(١٠) جگە لە سابون بەرهەمی‌تری پیشەسازی‌ی خۆماڵی کوردەواری دەگەیشتە شارو وڵاتی‌تر (بڕوانە : R. Berliner und Borchardt, Silberchmidsarbeiten ans Kurdistan, Berlin , 1922, P. 8.)

له کوردستانیش به چەشنی ناوچەکانی‌تری ڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست تێکەڵ‌بونی خێرا له نیوەی دووەمی سەدەی ڕابوردووەوە به بازاڕی سەرمایەداری‌ی جیهان کاری کوشندەی کردە سەر پیشەسازی‌ی خۆماڵی کە تاك تاکە خەریك بو هەنگاو بەرەو قۆناغی مانیفاکتور[11] بنێت. کاری بنەماڵەی موتابچی کە له سلێمانی جەواڵیان دروست دەکرد نیمچە مانیفاکتۆرەیەك بو بۆ خۆی: کرێکاری کرێ‌گرتە کاری تێدا دەکرد، ئەمرازی تا ڕادەیەك پێشکەوتویان بەکاردەهێنا، دابەش‌کردنی کار (تقسیم العمل)[12] تێیدا سیمای ڕونی خۆی وەرگرتبو[13]. جۆری دروست‌کردنی تۆپەکانی وەستا ڕەجەبیش له ڕەواندوز نمونەیەکی‌تری ئەم ڕاستی‌یەیە. شۆرەتی تۆپەکانی کە بۆ میری ڕەواندوزی دروست دەکردن دەنگی دابۆوە[14]. زۆری ئەو ٨٠ تۆپەش کە والی موسڵ هەیبو له دەستکردی کرێکارانی ڕەواندوز بوون. شایانی باسە ئەو مەعدەنەی بۆ دروست‌کردنی تۆپەکان بەکار دەهێنران له دەوروپشتی ڕەواندوز به کاری کرێکاری کرێ‌گرتە دەردەهێنران[15].
له مەیدانی دروست‌کردنی بەرەو جاجم‌و چۆخیشدا خەریك‌بو وردە ئاڵ‌و گۆڕ دەست‌پێ‌بکات.

بەلاْم تەنانەت ئەم جۆرە پیشەسازی‌یانەش نەیانتوانی خۆیان لەبەر لێشاوی کەلوپەلی هەرزان‌و چاکتری کارگەکانی ئەوروپادا ڕابگرن، بۆیەکا یەك له دوای یەك دامودەزگایان پێچایەوە. کارتسۆف ساڵی ١٨٩٦ نووسیویە دەڵێت: «جاران

---

(١١) مانیفاکتۆرە زاراوێکە لە دوو وشەی لاتینی پێك‌هاتووە: (Manus) واتە دەست‌و (Factura) واتە دروست‌کراو. گەیشتنی پیشەسازی‌ی خۆماڵی بە قۆناغی مانیفاکتورە یەکەم هەنگاوی گرنگە بەرەو پەیوەندی‌ی سەرمایەداری. مانیفاکتورە بە عەرەبی «ورشە»یە.

(١٢) لەگەڵ پەیدابونی پەیوەندی سەرمایەداری‌ی دابەش‌کردنی کار زیاتر چەسپ دەبێت. بەر لەو قۆناغە یەك کەس یا ئەندامانی یەك خێزان هەموو، یا زۆربەی کاری دروست‌کردنی بەرهەمێکیان دەگرتە ئەستۆ. دابەش‌کردنی کار دەبێتە هۆی زۆرو چاك بونی بەرهەم.

(١٣) دوکتۆر ئەمین موتابچی ئەو باسەی بۆ گێڕامەوە، خۆشی نیازی‌یە وتارێك لەو بارەیەوە بنووسێت.

(١٤) تۆپی وایان تێدا بوو درێژی‌یەکەی لە ٣ مەترو لولەکەی لە ٤٥ سانتیم کەمتر نەبوو.

(١٥) بڕوانە:
انور المائی، الاکراد في بهدینان، موصل، ١٩٦٠، ص ٣.

چۆخی کورد بەناوبانگ بوو ، بەلاّم ئێستە کوتاڵی ئینگلیز بە جارێك تەنگی پی هەڵچنیوە» [١٦] .

ئەو یەك دوو دوکانی فیشەك پڕکردنەوەیەی دوای شەڕی یەکەمی جیهان خاوەنەکانیان لە سلێمانی بە کولەمەرگی دەژیان پاشماوەی ١٥٠ دوکانی لە خۆیان گەورەتر بوون کە بەر لە شەڕ مارك سایکس لەوێ دیبونی [١٧] .

هەرچۆن بێت لەو جۆرە شوێنانەی بە کاری پیشەسازی‌ی خۆماڵی‌یەوە خەریك بون‌و هەنگاوی باشیان بەرەوپێش نابو یەکەم توێکڵی تەنکی چینی کرێکاری کورد بەدی دەکرێت . لە لایەکی‌ترەوە قەزای ئەو پیشەسازی‌یە لە چینی داهاتوی کرێکاری کورد کەوت ، چونکە بەشی زۆری کارگەرانی چونە ناو ریزەکانی ئەو . چەوساندنەوەی دەرەبەگیش لەلای خۆیەوە بە هەزاران جوتیاری ڕوت‌و قوت‌و برسی ناردە بازاڕی کار لە شارەکان‌و ئەوانیش ، تایبەت لەبەر هەرزانی‌یان ، بونە سەرچاوەی هەرە گرنگی دروست‌بونی چینی نوێی کۆمەڵ . ژمارەی ئەم جۆرە کەسانە کە لە هەندێك ناوچە هەژاریان پێ دەگوتن ، جاری وا هەبو پتر لە نیوەی دانیشتوانی مەڵبەندێکیان پێك‌دەهێنا . بەپێی هەندێك سەرچاوە ئەوانە لە ناوچەیەکی وەك شنۆ (ئوشنۆ)ی نزیك مەهاباد لە ٨٠٪ی هێزی کاریان دروست دەکرد (١٠ هەزار لە ١٢ هەزار کەس) [١٨] . لە وێنەی ئەمە تەنها مەگەر لە ئینگیلتەرەی کۆتایی سەدەکانی ناوەند هەبوبێت کاتێك بەهۆی قازانجی زۆری خوری‌یەوە دەوڵەمەندو دەسەلاّتدارانی ئەو ولاّتە زەوی‌یەکانیان دەکردە لەوەڕگەو بەو جۆرە بە دەیان هەزار جوتیار بێ دالّدەو پەناگە دەمانەوەو ئاوارەی دارستان‌و دەشت‌و دەرو شاران دەبون‌و

---

(١٦) أ . کارتسۆف . تێبینی دەربارەی کورد ، بە زمانی ڕوسی ، تفلیس ، ١٨٩٦ ، ل ٢٤ .

(١٧) بڕوانە :

C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, London , 1957, P. 80.

(١٨) بڕوانە :

گ . ب . ئاکۆپۆف ، دەربارەی سروشتی زەویداری‌ی تایبەتی‌ی کوردستانی ئیمرۆ ، - گۆڤاری «هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری ئەرمینیای سۆڤیەت» . بە زمانی ڕوسی ، یەریڤان ، ژمارە ٥ ، ١٩٦٤ ، ل ٦٧ .

بەگژوگیاو پاشماوەی خەڵکی دەژیان‌و ئەمەش هەستی تۆماس مۆری[19] بەناوبانگی وا بزواند «یۆتۆپیا» بنوسێت‌و قسە بەناوبانگەکەی بکات: «خەریکە مەڕ پیاو بخوات». لێرەدا سەیر ئەوەیە کە دەردو ئازاری هەزارانی کوردیش هەستی شپرۆتی شاعیری جوڵاندووەو باسی ئەوەی کردووە چۆن «برسێتی لە کوردستان زۆری بۆ هەموان هێناوەو بە ڕەوە بەرەو فابریقەکانیان[20] دەنێرێت»[21].

ژمارەی هەژاری شارو تایبەت لادێی کوردستان هێند زۆر بو لەوانە نەبو بازاری کەم دەرامەتی ناو وڵات دادی بەشێکی زۆرکەمیشی بدات. لە قوڕکاری‌و حەماڵی بەولاوە کارێکی‌تری ئەو تۆ دەست نەدەکەوت. لەبەر ئەوە بە هەزاران هەژاری کورد ڕویان دەکردە شاری گەورەی وەك ئەستەموڵ‌و بە هەموو کارو نرخێك قایل دەبون (بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان ژمارەیەکی بێ شومار لە حەماڵی ڕەش‌و ڕوتی کورد بازاڕی ئەستەموڵ‌و بەغداو شاری تریان تەنی‌بو). هی وایان هەبو لە تاو نەبونی دەچونە شاری پچوکی وەك حەڵەبی شام‌و بێروتی لوبنان‌و ئەدەنەی تورکیا، یا ناوچەی وەك ئاق‌چەم‌و قەرەباغی ئازەربایجان. بەڵام توانای بازاڕی‌کاری ئەو جۆرە ناوچەو شارانەش ئەوەندە نەبوو دادی ئەو خەڵکە زۆرە بدات کە دەبونە سەرباری بێ‌کارەی خۆیان. بۆیەکا هەر زوو ژمارەیەکیان ناچار چاویان بڕی‌یە وڵاتانی دەرەوەو خۆیان دایە دەست قەدەرو گەلێکیان دەریای ئەتڵەسی‌یان بڕی‌و گەیشتنە خاکی ئەمەریکا. زۆربەی ئەمانە خەڵکی دەرسیم‌بون[22].

بونی کانە مەعدەن لە ناوچە کوردەواری‌یەکان‌و دەوروبەری هۆیەکی

---

(19) سیاسی‌و نووسەری بەناوبانگی ئینگلیز تۆماس مۆر (١٤٧٨ – ١٥٣٥) بە دامەزرێنەری بیری سۆشیالیزمی یۆتۆپی (الاشتراكية المثالية) دادەنرێت.

(20) دیارە مەبەستی فابریقەکانی دەرەوەی کوردستانە.

(21) بڕوانە:

گ. ب. ئاکۆپۆف، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٦٧.

(22) بڕوانە:

و. ڤلچێفسکی، دەربارەی پەیوەندی کشتوکاڵ لە کوردستان، گۆڤاری «کێشەکانی کشتوکاڵ»، بە زمانی ڕوسی، مۆسکۆ، بەرگی ١-٢، ١٩٣٢، ل ١٣٠، موسی کاظم پاشوزادە، الحان، عادات اکراد، استانبول، ١٩٢١. دوکتۆر ناجی عەباس بۆی گێڕامەوە کە کاتی خۆی لە شاری دیترویت توشی ژمارەیەك لەو کرێکارە کوردانە هاتووە.

باریدەری‌تری پەیدابونی کاری کری‌گرتە بوو لەویٚ بەر لە شەری یەکەمی جیهان. ئەوسا بەشی زۆری کریٚکارانی کانە خەلوزەکانی زەنگوڵداغ کورد بوون. کوردی جۆلەمیٚرگیش ئاسن‌و مس‌و زەرنیخیان دەردەهیٚناو لەوەوە ناوی یەکیٚك لە ناوچەکانی بۆتە زەرنیخ مەیدان. بەشیٚك لەو زەرنیخەی لیٚرە دەردەهیٚنرا دەنیٚررایە بازاری دەرەوە. بەپیٚی ژمارەیەك سەرچاوە ساڵی ۳۰ هەزار قەنتاری لیٚ دەنیٚررایە ئەستەموڵ‌و بەغداو هندستان[٢٣]. هەر ئەو سەردەمە ژمارەیەك کورد بوبونە کریٚکاری کانە خەلوزەکانی نزیك کفری کە بەرهەمی ساڵانەی کاریان بەر لە شەری یەکەم‌و کاتی ئەو شەرە هەزار تەن دەبو[٢٤].

رووداوەکانی شەری یەکەمی جیهان بوونە هۆی پەرەسەندنی ژمارەی کریٚکاری کورد بەجۆریٚکی هەست پی‌کراو. کوردستان بۆ خۆی بووە یەکیٚك لە شەرگە دیارەکانی رۆژهەلاٚتی ناوەراست‌و سوپای چوار وڵاتی تی‌رژا. ئاگری شەر زۆربەی ئەو ناوچانەشی گرتەوە کە لیٚوەی نزیك‌بون. وەك ئاشکراشە تەکنیك‌و خیٚرایی دەوری گەورەیان لەو شەرەدا بینی، بۆیەکا لە هەر چوار لاوە دەست‌کرا بە کردنەوەی ریٚگەو بان‌و دامەزراندنی بنکەی سەربازی. بە هەزاران هەژاری کورد لەو شویٚنانە بونە کریٚکار. ئەم دیاردە نویٚیە بە تەواوبونی شەر کۆتایی نەهات. هەر بۆ نمونە ساڵی ۱۹۲۵ پتر لە ۲۲۵۰ کورد لە عیراق کریٚکاری شەمەنەفەر بون[٢٥]. بە پیٚی هەندیٚك سەرچاوەی باوەر پی‌کراو ناوەندی بیستەکان ئەو کریٚکارانە لە ۲۳٪ هەموو کریٚکارانی شەمەنەفەری عیراق بون[٢٦]. زۆری‌ی ئەم ژمارەیە زیاتر لەوەدا

---

(٢٣) بروانە:

و. ل. ڤلچیڤسکی، ژیانی ئابوری کوردە کۆچەرەکانی پشت قەفقاس، ل ۱۵۱، و. ل. ڤلچیڤسکی، دەربارەی پەیوەندی کشتوکاڵ لە کوردستان، ل ۱۳۰.

(٢٤) بروانە:

عبدالرزاق الحسني، العراق قديما وحديثا، الجزء الثاني، صيدا، ١٩٥٨، ص ٦١.

(٢٥) بروانە:

(Iraq Railways. Administration Report for the year 1924 — 1925), Baghdad, 1925, P. 16.

(٢٦) بروانە:

(Report by Britannic Majesty's Government to the Council of the League of Nations on the admonistration of Iraq for the year 1926), London, 1927, P. 29.

خۆ دەنوێنێ گەر بێتو بزانین زۆربەی هەرە زۆری خەتی شەمەنەفەری ئەوسای عیراق لە باشورو ناوەندی ولاتدا بون ، وە جگە لە عەرەب[٢٧] و کورد ژمارەیەکی زۆر هندی‌ی (١٤٢ر١)و ئێرانی‌و ئەرمەن‌و ئاسوری‌و تورك‌و هی‌تر کرێکاری ئەو دەزگایە بون .

دیسان دوای شەری یەکەمی جیهان ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هەژاری کورد بونە کرێکاری نەوت‌و دامەزراندنی لولەکانی‌و دروست کردنی رێگەوبان‌و خانوبەرەو شتی‌تر . کۆتایی بیستەکان لە هەموو عیراق ٢٥٠ر٤ کەس بە دروست‌کردنی رێگەو بانەوە خەریك بون[٢٨] کە ژمارەیەکی زۆریان کرێکاری رێگەی نێوان کەرکوك‌و سلێمانی‌و کەرکوك‌و هەولێرو هەولێرو موسل‌و هەولێرو رەواندوز - رایات بون . ئینگلیز بایەخێکی زۆریان دابو بە رێگەی دواییان ، واتە هەولێر - رەواندوز - رایات ، چونکە جگە لە بایەخی ستراتیجی دەیانویست بیکەنە یەکێك لە هۆکانی زیاتر بەستنەوەی بازارەکانی رۆژئاوای ئێران بە جیهانی سەرمایەداری‌یەوە ، تا چەند بتوانن ئەوەندە پەیوەندی ئابوری‌ی ئەو ولاتە لەگەل شورەوی کزبکەن[٢٩] .

کرێکاری کورد یەکسەر دلسۆزی‌و پەرۆشی لە کارداو توانای فێربونی خێرای نیشان‌دا . گەلێك بەلگەی سەیر بۆ ئەم راستی‌یە بە دەستەوەیە . وابزانم لە هەمویان گرنگتر لەم لایەنەوە یەکگرتنەوەی نرخاندنی کاربەدەستانی ئینگلیزو ئەلەمانە لە کاتێکدا کە لە دوو خەندەقی جیاوازدا بەرامبەر بە یەك وەستابون . ئەلەمانەکان سەرەتای شەری یەکەمی جیهان دەستو برد کەوتنە دروست کردنی ئەو بەشانەی پرۆژەی ناوداری خەتی شەمەنەفەری بەغدا کە هێشتا تەواو نەبوبون . بەو جۆرە خەتێکیان لە نێوان بەغداو سامەرەدا راکێشا کە کرێکاری کوردیش لە دروست کردنیدا بەشدار بون . نووسەری ئەلەمانی داگو بێرت لەم بارەوە نووسیویە دەلێت :

---

(٢٧) ژمارەیان ٠٥٩ر٤ کەس بو . واتە دوو ئەوەندەی کورد کەمتر .

(٢٨) بروانە :

**(Report of the Majesty/s Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1931), London, 1932, P. 66.**

(٢٩) بە هۆی نزیکی‌یەوە بازرگانی‌ی نێوان روسیاو ناوچەکانی قەفقاس هەر لە زووەوە زۆر گەرم بوو .

ئەندازیارە ئەڵمانەکان لە کوردا «باشترین و دڵسۆزترین کرێکاریان دیبەوە»[۳۰] .

جەنەراڵ هالدێنی فەرماندەی هێزەکانی ئینگلیز لە عیراق دەوروبەری هەمان کات بێ ئەوەی بزانێ داگۆ بێرت کێ‌یە ، یان ڕای ئەندازیارانی ئەڵمان چی‌یە ، بە هەمان دەستور باسی کرێکاری کوردی کردووەو ڕەزامەندی زۆری بەرامبەریان نیشان داوە[۳۱] . هەر لەبەر ئەوەش هیچ سەیر نی‌یە ڕۆژانەی کرێکاری کورد لە هی‌تر زیاتر بوو . ئەوسا هەندێك دەزگا ڕۆژی نزیکەی ۲۱ عانەی دەدا بەو بەرامبەر بە ١٤ عانە کە هی وەك ئەو وەریان دەگرت[۳۲] . لەوەش مانادارتر ئەم نمونەیەیە : دەزگای شەمەنەفەری ئینگلیز لە عیراق لە بیستەکاندا دوو جۆر کرێکاری هەبوو ، یەکەمیان ئەو کرێکارانە بون کە بەکاری ئەساسی‌یەوە (Capital Works) خەریك بون ، دووەمیشیان ئەوانەیان بون کە کاریان لە دروست کردنی خەتی تازەدا دەکرد . ساڵی ١٩٢٤ - ١٩٢٥ لە ٢٧٤ر٢ کرێکاری شەمەنەفەری کورد تەنها ٧٢٩یان لە جۆری دووەم بون و ئەو باقی‌یەکەیان (٥٤٥ر١ کرێکار) لە جۆری یەکەم بون[۳۳] .

دیارە ئەم ڕاستی‌یە نەبووە هۆی ئەوەی تاڵاوی چەوساندنەوەی کرێکاری کورد لەهی هاوەڵەکانی کەمتر بێت ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ژمارەیەك نمونەی هەر ئەو سەردەمە وای نیشان دەدەن کە هەندێك جارو لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی ئەو چەوساندنەوەیە توندتر بووە . لە گشت ناوچەکانی باکوری عیراق ڕۆژانەی کرێکار لە ناوچەکانی‌تر کەمتر بوو . بە وێنە کرێکارانی کۆمپانیا کانی نەوت دەبوو حەفتەی ٥٤

---

(۳۰)

**Dagobert von Mikusch, Mustafa Kemal between Europe and Asia, trans . by J. Linton, London, 1931, P. 360**

(۳۱) بڕوانە :

**A. L. Haldane, The Insurection Mesopotamia, London, 1922, P. 108.**

(۳۲) بڕوانە :

المركز الوطني للوثائق . بغداد . رقم الملف :

**80/19, Establishment General**

(۳۳)

**(Iraq Railways. Administration Report for the year 1924 – 1925), P. 16.**

سەعات کار بکەن‌و بەرامبەر بەوە ٧ تا ١٠ روپیەیان وەردەگرت ، کەچی کرێکاری چنین لە بەغداو کرێکاری بەندەری بەسرە حەفتەی ٤٨ سەعات کاریان دەکردو بەرامبەر بەوە هەر یەکەیان ٣ تا ٦ روپیە زیاتریان لەوان وەردەگرت [٣٤] . باری کارو رۆژانەی ئەو کرێکارە کوردانەی بە دروست کردنی خانوبەرەو ڕێگەو بانەوە خەریك بوون گەلێك لەوەیش خراپتر بوو . ئەوانە زۆر جار مەلابانگان دەچونە سەر کارو لەگەڵ بانگی شێواندا دەستیان لێ هەڵدەگرت‌و بەرامبەر بەو هەموو کارە رۆژی ١٨ فلسیان وەردەگرت کە وەك ئینگلیزەکان خۆیان دانی پێدا دەنێن ئەو پارەیە تەنانەت « بەشی نان‌و جگەرەی نەدەکردن» [٣٥] .

وێڕای ئەوە کرێکاری کورد ، وەك کرێکاری ناوچەکانی‌تر ، ماوەیەکی دورو درێژ نەیتوانی خۆی لە پەیوەندی‌و نەریتی دەرەبەگی قوتار بکات . زۆر جار ئەو کرێکارانە دەگەڕانەوە گوندەکانیان بۆ کاری کشتوکاڵ‌و یاریدەی کەسوکاریان . زۆربەیان بەشێکی داهاتی کرێکاری‌ی خۆیان هەر وەك جاری جاران دەدا بە ئاغاو سەرەك هۆزەکانیان .

بەر لە کۆتایی با ئەوەش بڵێین کە کرێکاری کورد لە سەرەتای سەرەتاوە بە گیانی برایەتی گۆش بووە ، چونکە هەمیشە چ لە خاکی خۆی‌و چ دوور لێی شان بەشانی کرێکاری‌تر کاری کردووەو ئازاری چەوساندنەوەی چێشتووە . جوانترین بەڵگەی ئەم ڕاستی‌یە ڕەنگیێ ئەو قسانە بن کە لەگەڵ تەواوبوونی ڕێگەکەی هەولێر – ڕەواندوز – ڕایات لەسەر تاشە بەردێك نووسیبویان :

«ئێمە کە هەزاران کەسین‌و بە عەرەبی‌و ئەرمەنی‌و ئینگلیزی‌و هندی‌و کوردی‌و ڕوسی‌و تورکی قسە دەکەین ئەم ڕێگەمان بۆ خزمەتی هەموو گەڕیدەیەکی بێ وەی دروست کرد !» [٣٦] .

---

(٣٤)

(Report for the year 1926), P. 29.

(٣٥)

A.M. Hamilton , Road through Kurdistan. The Narrative of an Engineer in Iraq, London, 1937, P. 61.

(٣٦) بڕوانە :

J. Morris, The Hashemite Kings, London, 1959, P. 97.

لیستەی ناوی ئەم زمانانە لە دەزگای شەمەنەفەری عیراق دەگاتە ١٦ ناو . جگە لەوانەی سەرەوە ئەم ناوانەشی دەچنە سەر : سریانیو میسریو فارسیو تونسی[٣٧] و ئیتالیو یۆنانیو هەنگاری[٣٨] . لە گاورباغیش هاوینی ساڵی ١٩٤٦ دەنگی زولاڵو خوێنی گەشی کرێکاری کورد تێکەڵ لەگەڵ دەنگو خوێنی پیرۆزی براکانی ئاوازێکی بەجۆشو لاپەڕەیەکی پڕ شانازیی دروست کرد !

---

(٣٧) دیارە لێرەدا مەبەست لە میسریو تونسی ولأتە نەك زمان .

(٣٨)

(Iraqi Railways . Administration Report for the year 1924 — 1925), P. 16.

**پێشکەشە بەوانەی هیچیان لە باردا نی یەو زۆر بە ئەسڵ و فەسڵەوە دەنازن ، بەوانەی زۆریان لە باردیەو هیچ بە ئەسڵ و فەسڵەوە نانازن !**

دیارە کەس نەبووەو کەس نی یەو کەس نابێ لە ناخی دەروونەوە حەز نەکات ئەوی دەینووسێ بە دڵی خوێندەواران بێ ، وا نەبوایە کەس قەڵەمی نەدەخستە سەر کاغەز . ئەو بەدڵ بوونە لە سەرانسەری جیهانی پان و بەریندا گەورەترین پاداشتە بۆ هەر کەسێك بەرهەمی بیرو خامەو شەونخونی ی خۆی بکاتە دیاری ڕازاوەی دەستی بۆ هاوزمانانی ، بەڵام بۆ کوردێك لەوەیش زیاترە(*) .

ماوەیەك لەمەوبەر لە چەند لایەکەوە پێ یان گوتم بەڕێز دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی دەیەوێ بچمە خزمەتی . یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بەر لە خوشك و دۆست و یاران ڕووم کردە قاپی یەکێك لەوانەی جاران پێ یان دەگوترا گەورە پیاوان و ئێمەو مانان پێ یان دەڵێین پێشەنگی دەستەی ڕووناکبیران . یەکسەر فەرمووی :

**«ڕۆڵە کتێبی (مێژوو)ەکەتم بەدڵ بوو ، دوای خوێندنەوەی بڕیارمدا تۆ وەریسی کتێبخانەکەم بی ، وا هەر لە ئێستەشەوە چەند بەڵگەو بەرهەمێکت پێشکەش دەکەم» .**

---

(*) ئەمە یەکێکە لەو وتارانەی دەبنە تەواوکەری چاپی دووەمی ئەو کتێبەم کە ساڵی ١٩٨٣ بە ناوی «مێژوو»ەوە بڵاوم کردەوە . دەقی وتارەکە لە لاپەڕە ١٠–١٥ی «کاروان»ی ژمارە ١٤ ، تەشرینی دووەمی ١٩٨٣دا بڵاوکراوەتەوە .

لەوەتەی رەمەزانو قوربان رووبان کردۆتە کوردستان ، یا هەر ناوچەیەکی تری خاکی موسڵمان رەنگیێ هیچ جەژنانەیەك خۆشی کەسی وا نەگەیاندبێتە ئاستی ئاسمان . بە خۆمو کۆڵێك گەوهەرو مرواریو برواوە گەرامەوەو چاوو دڵی چەند برایەکی دڵسۆزم روون کردەوەو وا پوختەی یەکەم بەرهەمی ئەو دیارییە بەنرخە دەگەیێنمە تۆماری رووناکبیری ئیمرۆمان .

**یەکەم . . ئیجازەی شێخی سەراجەددین بۆ حاجی رەسوڵی نەقشبەندی**

دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی شاری سلێمانییە[1] . کوڕی حاجی فەتاحی کوڕی مەلا قادری کوڕی حاجی رەسوڵی کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی گودرون ئاغای کوڕی رۆستەم ئاغای کوڕی زۆراب ئاغای کوڕی زولاڵ ئاغای مەرگەییە . زولاڵ ئاغا یەکێك بوو لە دوانزە سوارەی مەریوان ، پیرەمێردی نەمر لە داستانەکەی خۆیدا چەند جارێك بەتایبەتی ناوی هێناوە[2] .

کە برایم پاشا شاری سلێمانیی بنیات ناو بارەگای میرنشینی بابانی لە قەڵاچوالانەوە گواستەوە ئەویێ محەمەد ئاغای نەوەی زۆلاڵ ئاغا[3] یەکێك بوو لەو پیاو ماقووڵانەی بەخۆیو ماڵو منداڵییەوە لە تەکیا هاتە شاری نوێی کوردستان . پاش دوازدە ساڵ ، واتە دەوروبەری ساڵی ۱۷۹۶ ، خوا رەسوڵی بەخشی بە محەمەد ئاغا .

---

(۱) ساڵی ۱۹۰۹ لە سلێمانی لە دایكبووە . سەرەتا لە حوجرەو لای خواجا ئەفەندی خوێندوویەو ئینجا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی کە ساڵی ۱۹۲۵ تەواوی کردووە . ساڵی ۱۹۳۲ لە قوتابخانەی ناوەندیی مەرکەزی بەغدا دەرچووەو بۆ تەواوکردنی خوێندن چۆتە قاهیرەو ساڵی ۱۹۳۷ لەوێ بەکەلۆریۆسی لە بەیطەرەدا وەرگرتووەو پاش ساڵێك چۆتە ئورکیاو رۆژی ۲۵ی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹٤۰ لەوێ دوکتۆرای لە بەکتریۆلۆجیای نەخۆشیی ئاژەڵدا وەرگرتووە . دوای گەڕانەوەیو تا رۆژی خانەنشین کردنی لە ۲۳ی مایسی ساڵی ۱۹٦٤دا فەرمانبەر بووەو وەك دەست پاکێکی کەم هاوتا ناوی دەرکردووە . زۆر بایەخ بە مێژووی کورد دەداتو دەربارەی چەند وتارێکی لە رۆژنامەی «التآخی»دا بلاوکردۆتەوە (بۆ کورتەی ژنامەی بڕوانە : محمود الجندي . دائرة المعارف العراقية العامة ، الجزء الاول ، بغداد ، بلا ، ص ۱۵) .

(۲) بڕوانە :

پیرەمێرد . دوانزە سوارەی مەریوان ، چاپی سێیەم . سلێمانی ، ۱۹۸۳ ، ل۷ ، ۱۰ ، ۳۳ .

(۳) حەمەغایان پێ دەگوت .

ڕەسولْ زوو وەك لاوێكی بەخشندەو زیرەكو وریاو دادپەروەرو یەكجار لە خواترس ناوی دەركردو ڕووی كردە مەككەو مەدینەو پاش گەڕانەوەی بووە حاجی ڕەسولْ . هەر لەوساشەوە ڕێبازی نەقشی دای لە كەلەیو بووە موریدێكی دڵسۆزی . زۆری نەبرد حاجی ڕەسول خانەقایەكی لە تەنیشتماڵی خۆیەوە دروست كردو هەموو ئەركی بەڕێوەبردنی گرتە ئەستۆی خۆی .

دەنگو باوی حاجی ڕەسولْ كەوتە سەر زاری پیاوچاكانی شارو دەوروبەری . سەودای نەقشی بووە كێچو كەوتە كەوڵی ، بە پەرۆشەوە ڕووی كردە بیارەو چووە خزمەت شێخی سەراجەددین . شێخی گەورەی نەقشی حاجی ڕەسوڵی دەچێ بەدڵاو زۆر بەڕێزەوە ئیجازەی ئیرشادی پێ دەبەخشێ . دەقی ئەو ئیجازە پڕ لە شانازی یەی ئێستە تەمەنی گەیشتۆتە صەدو پەنجا ساڵی ڕەبەق[4] یەكەم دیاریی بەنرخ بوو بۆ «مێژوو» .

بارستی ئیجازەكەی شێخی سەراجەددین ٣٤ × ٢١ سانتیمەو بریتی یە لە ٢٣ دێڕ كە بە دەسخەتی زاناو شاعیری ناسراو مەلا حامیدی كاتبی شێخ بە خەتی فارسی نووسراوەتەوە ، پێنج دێڕی یەكەمی عەرەبی و ئەوانی تری فارسین . مۆرو ئیمزای شێخی سەراجەددین وا بە لای چەپی دامێنی یەوە . ئەمە دەقی سەرەتا عەرەبی یەكەیەتی :

«الحمدلله الذي جعل قلوب اوليائه الكاملين محكا لنقد الوجود وصير قبولهم علامة لقبوله والاقتداء بهداهم مرقاة للعروج الى اعلى معارج الشهود وميز من بينهم السادة العلية النقشبندية وخصهم بمزايا لاتعد ولا تحصى منها ان نهاية سائر الطرق مندرجة في بدايتهم فيقاس على هذا شأن كمال طريقتهم وحال نهايتهم . . . » .

دوای ئەو سەرەتایە دیسان بە فارسی باسی ڕێبازی نەقشی و تایبەتی یەكانی دەكات كە چۆن لەسەر بناغەی ئایینی ئیسلام دامەزراوەو هیچ شتێكی دوور لە ئایینی تێدا نی یەو تەنانەت ئەوەی لە تەریقەتەكانی تردا بە چلەكێشانو ڕیازەكردن پەیدا

---

(٤) ساڵی ١٢٥١ی كۆچی ، ١٨٣٥ی عیسایی بەخشراوە .

دەبێ لای نەقشی‌یەکان لە ڕێگەی هاوڕێی پیاوچاکان‌و پیرانی تەریقەتەوە دێتە گۆڕێ . ئەمجا دێتە سەر باسی حاجی ڕەسوڵ‌و دەڵێ یەکێکە لەو کەسانەی بە دڵ دەسەو دامێنی ڕێبازی نەقشی بوون‌و هەمووپایەیەکی‌ئەو ڕێبازەی بڕیوەو «گەیشتۆتە دائیرەی ویلایەتی پچوك» ، بۆیەکا بە فەرمانی لە جیهانی گیانەوە هاتوی پیرانەوە ڕێگەمان‌دا تەریقەت نیشانی خەڵك بداو ڕێی پیران بگرێ‌و «خەتمی خواجەگان» بکا . دوای ئەوە دەڵێ : هیوادارین حاجی ڕەسول لەم ڕێگەدا زۆر بەرز بێتەوەو داواش لەوانە دەکەین کە ئارەزووی گرتنەبەری ڕێگەی ڕێبازی نەقشی‌یان هەیە دەست بدەنە دەستی‌و لێوەی فێربن‌و هاوڕێی ئەو بە هەڵ بزانن چونکە پڕە لە بەرەکەت‌و بەختەوەری .

دوای وەرگرتنی ئەو بەڵگەنامەیە حاجی ڕەسوڵ زیاتر کەوتە کۆشش بۆ پەرەپێدان‌و بڵاوکردنەوەی ڕێبازی نەقشبەندی ، ئەو کارەی ڕقی ژمارەیەك دەسەڵاتداری ناوچەکەی لی‌هەڵساندو لە تاوا ناچار بوو شاری سلێمانی بەجێ بهێڵی‌و ڕوو بکاتە گورگەدەری ناوچەی سورداش کە گوندی خۆی بووەو تا کۆچی دوایی لەوێ نیشتەجێ دەبێ . پاش مردنی لە ساڵی ١٢٨٦ی کۆچی (١٨٦٩/١٨٧٠ ی عیسایی)دا تەرمی حاجی ڕەسوڵ دەهێننەوە سلێمانی‌و لە گردی مەعفوانی گۆڕستانی سەیوان دەینێژن .

بەر لەوەی سلێمانی بەجێ بهێڵێ حاجی ڕەسوڵ خانەقاکەی بە مەلا عوسمانی باڵەخی دەسپێرێ کە زانایەکی ناسراوو سەر بە ڕێبازی نەقشبەندی‌و موجازی شێخ بەهاددینی خەلیفەی شێخی سەراجەددین بووەو دوای کۆچی دوایی حاجی مەلا عەلی‌ی کوری دێتە سەری کە ئەویش زانایەکی پایە بڵند بووەو لەوساوە ئیتر خانەقاکە دەبێتە «خانەقای مەلا عەلی» کە تا ئیستەش هەر ماوە .

### دووەم - محەممەد عەلی‌ی گەورەو کورد

هەموو ئەنسکلوپیدیاو هەموو کتێبێکی مێژووی نوێی میسر کە باس دێتە سەر محەممەد عەلی‌ی گەورە دەڵێن بە ڕەگەز ئەلبانی‌و دانیشتووی شاری قوَلەو[٥] سەرەتا توتن فرۆش بووە .

---

(٥) لە سەرچاوە ئینگلیزی‌یەکاندا «قەوەلە» دەنووسن . دوور نی‌یە قۆلە لە «قلعە»ی عەرەبی‌یەوە هاتبێ

دەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٩٤٩ بە بۆنەی یادی صەد ساڵەی کۆچی دوایی محەمەد عەلی‌ی گەورەوە نووسەری بەناوبانگی میسر عەبباس مەحمود عەققاد بە ناوی گۆڤاری «المصور»ەوە دیدەنی‌یەکی تایبەتی لەگەڵ جێگری فاروق پاشای ئەوسای میسردا کردووە کە ئەویش بە ناوی باپیرە گەورەیەوە ناو نراوە محەمەد عەلی . کاتێك باس هاتۆتە سەر ڕەگەزی محەمەد عەلی‌ی گەورە جێگری تەختی پاشایی میسر گوتوویە :

« . . . دەربارەی بنەماڵەی عەلەوی[٦] شتێکتان پێ دەڵێم لەوانەیە ببێتە هۆی سەرسوڕمانی گەڵێك کەس . وا بلاوە گوایە ئەو بنەماڵەیە لە نزیك قۆلەی ولاتی ئەرناوودەوە[٧] دروست بووە ، بەلام ئەوی من لە ڕێگەی کتێبێکی قازیی میسری ڕۆژگاری محەمەد عەلی‌ی گەورەوە زانیومە ئەو بنەماڵەیە بە بنەچە لە دیاربەکری ولاتی کوردانەوە هاتووە ، لەوێوە باوکی محەمەد عەلی‌و دوو برای چونەتە قۆلە ، دوای ئەوە یەکێك لە مامەکانی محەمەد عەلی چۆتە ئەستەموڵ‌و مامەکەی تریشی دوی بازرگانی کەوتووە ، تەنها باوکی محەمەد عەلی لە قۆلە ماوەتەوە . میر حەلیمیش[٨] ڕەگەزی بنەماڵەی ئێمەی دەگێڕایەوە دیاربەکری ولاتی کوردان‌و ئەوەش بۆ خۆی گێڕانەوەکەی قازیی میسر پتەوتر دەکات» .

وا دیارە ئەو قسانەی محەمەد عەلی‌ی جێگری تەختی پاشایی میسری ئەو ڕۆژگارە تەلی هەستی عەبباس مەحمود عەققادیان بزواندووە چونکە ئەویش ، وەك بۆ خۆی نووسیوی‌یە ، بە ڕەگەز کورد بووە . عەققاد هەر لەوێدا ڕوو دەکاتە نەوەی محەمەد عەلی‌ی گەورەو پێی دەڵێ :

---

(٦) مەبەست بنەماڵەی محەمەد عەلی‌ی گەورەیە کە زۆر جار لە میسر بەنیسبەت دووەم ناوی لێکدراوی محەمەد عەلی‌یەوە پێ‌یان دەگوت عەلەوی .

(٧) مەبەست ئەلبانیایە .

(٨) یەکێك بوو لە نەوەی محەمەد عەلی‌ی گەورە .

«وڵاتی کوردان ئەو شەرەف‌و شانازی‌یەی بەسەکە دوو قارەمانی نەمری دایە جیهانی ئیسلام - صەلاحەددین‌و محەمەد عەلی‌ی گەورە . . .»

ئەم زانیاری‌یە کەم زانراوە لە لاپەرە ٥٦ ی ژمارە (١٣١١)ی رۆژی «٢٥»ی تەشرینی دووەمی ساڵی «١٩٤٩» ی «المصور» دا چاپ‌کراوە کە دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی لەوساوە وەك بەڵگەیەکی مێژوویی لە کتێبخانەکەی خۆیدا پاراستوویە . لە هەمان ژمارەدا وتارێکی حەبیب جاماتی بەم ناونیشانەوە بلاوکراوەتەوە : «کورد دەیەوێ دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێ» کە تێیدا بە تایبەتی باسی مەهابادو قازی محەمەدی کردووە .

بنەماڵەی محەمەد عەلی‌ی گەورە بە رەگەز کورد بێ یا کورد نەبێ هیچ لەو راستی‌یە ناگۆرێ کە جیاوازی لە نێوان گەلاندا نی‌یە ، کە کورد هیچی لە کەس کەمتر نی‌یە ، هەل‌و مەرج‌و دۆخی شوێن‌و قۆناغ جێگەی گەل‌و سەردارو قارەمان لە مێژوودا دیار دەکەن . وا دیارە زۆر لەو کوردە زیرەك‌و جوستانەی باری ژیانی کوردەواری رابوردوو نەیتوانیوە تینوێتی‌یان بشکێنێ روویان کردۆتە ناوچەی‌ترو لەوێ بە لێهاتوویی خۆیان گەیشتوونەتە بەرزترین پلەو پایە .

بۆ زیاتر روون کردنەوەی ئەم بۆ چوونە دەڵێم هەر کۆرپەیەکی ناوچە زەلکاوێکانی ئاسیاو دارستان‌و بیابانەکانی ئەفەریقا لەگەڵ چاوی هەڵێنا بیبەینە ناو خێزانێکی پارەداری ئینگلیزی‌یەوە کە گەورە بوو وەك ئەوانەی دەوروبەری بە کەوچك‌و چەتاڵ نان دەخواو بە چەقۆ میوە پاك دەکاو پایپ دەکێشی‌و سمۆکن لەبەر دەکاو وەك ئەوان دەدوی‌و دەبزوی‌و زۆر لەوانەشە ببێتە پسپۆرێکی ناودار . دیارە هەر کۆرپەیەکی چاو شینی سویدیش بهێنینە ناوچەیەکی زەلکاوی دواکەوتووەوە کە گەورە بوو پاپەتی و نەخوێندەوارو دواکەوتوو دەبی‌و لە هەرشت زیاتر حەز لە گۆشت ماسی‌و رانە مراوی دەکا . بهاتایەو محەمەد عەلی‌ی گەورە لە ئەلبانیا بمایەوە لەوانە بوو ببێتە بازرگانێکی دەوڵەمەندو بەناوبانگ ، بەڵام نەدەبووە ئەو پیاوە سیاسی‌یە لێهاتووەی توانی دوو جار لەشکری سوڵتانی عوسمانی بشکێنی‌و بگاتە نیمچە دۆرگەی عەرەب‌و سودان‌و سوریاو وای لێ بێ هەموو دەوڵەتە گەورەکان حسابی بۆ بکەن .

بێ گومان لە خۆوە نی‌یە یەکێکی وەك مارکس گوتویە «میسری محەمەد عەلی تاکە پارچەی وڵاتی بەرفراوانی عوسمانی‌یە توانای ژیانو مانی هەبێ» .
شایانی باسە محەمەد عەلی بەر لە کۆچی دوایی بە ماوەیەکی کەم ئینجا فێری نووسینو خوێندنەوە بوو !

## سێیەم - یەکەم ساڵی «گەلاوێژ»

سەرەتای ساڵی ١٩٦١ هاورێی خۆشەویستم دوکتۆر عیزەددین مستەفا رەسوڵ دوو دیاری زۆر بەنرخی دامێ ، یەکەمیان هەر شەش بەرگی یادداشتەکەی مامۆستا رەفیق حیلمی[٩] و دووەمیان ژمارەکانی «گەلاوێژ» لە ساڵی سێیەمی‌یەوە بوون .
لەوساوە عەودالی ساڵی یەکەمو دووەمی ئەو گۆڤارە بەرزەمانم ، بەرەکەتدا وا دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی هەموو ژمارەکانی ساڵی یەکەمی پێشکەش کردمو بەو جۆرە کەلێنێکی باش لە کتێبخانەکەمدا پڕبۆوە .
دیسان چاوم بە ناوەرۆکی هەر «١٠» ژمارەکەی ساڵی یەکەمی «گەلاوێژ»دا گێڕایەوە[١٠] . باوەڕ ناکەم کەسێك هەبێ دان بەوەدا نەنێ دەرچونی «گەلاوێژ» بەراستی ڕوداوێکی گەورەی ژیانی ڕووناکبیری هاوچەرخی کورد بوو . دیارە هەر لەبەر ئەوەش «گەلاوێژ» زۆر زوو لە ناو خوێندەوارانی ناوەوەی وڵاتو لە دەرەوەی دەنگی دایەوە . ئێدمۆندس دوای دەرچونی سێ ژمارەی دەربارەی نووسیوی‌یە دەڵێ :

> «گەلاوێژ ئەستێرەی هەرە گەشی ئاسمانە ، بەلای میسری‌یە کۆنەکانەوە مزگێنی دەری خێرو بەرەکەت بوو . ناوەرۆکی یەکەم سێ ژمارەی مژدەی ئەوە دەدەن کە «گەلاوێژ» ناوی خۆی بەخۆیەوەیە» .

---

(٩) بەرگی یەکەمیان خوالێخۆشبو رەفیق حیلمی بە خەتی خۆی پێشکەشی کردووە بە «خۆشەویستی کاك عیزەددین» .

(١٠) ژمارە پێنجو شەشو ژمارە یازدەو دوازدەی ساڵی یەکەمی «گەلاوێژ» پێکەوە دەرچون .

پێم وایە بەشی زۆری وتارەکانی «گەلاوێژ» ئەوە دەهێنن یا وەك خۆیان یا بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە دیسان لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا بڵاوبکرێنەوە .

## چوارەم – «لەهستان» ی مەحمود جەودەت

یەکێك لەو کتێبە نایابانەی بەڕێز دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی پێشکەشی «مێژوو»ی کردن «پۆلۆنیا – پۆڵەندەو یا لەهستان»ەکەی خوالێخۆشبوو مەحمود جەودەتە کە لە لاپەڕە ٣١٢ی «مێژوو»دا ناوی هاتووەو دەمێکە بۆتە یەکێك لە بەرهەمە کوردی‌یە دەگمەنەکان .

دوکتۆر ئیبراهیم وەك هەموو ڕووناکبیرانی هاوتەمەنی خۆی بە ئەوپەڕی ڕێزو هەستەوە باسی ئەو نیشتمانپەروەرە دڵسۆزە دەکات کە ڕۆژی ٢٠ ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٧ لە بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا لە سێدارە دراو مەرگی ناخی دەرونی هەموانی هەژاندو تەلی خامەی شاعیرانی بزواند . کەسێك نی‌یە خوالێخۆشبو مەحمود جەودەتی ناسیبێ‌و باسی ئازایەتی‌و خاوێنی‌و دڵپاکی‌و بەخشندەیی‌و دەست بڵاوی‌و دڵناسکیی نەکات .

مەحمود جەودەت تەنها ئەفسەرێکی لێهاتوو یاریدەرێکی دڵسۆزی شێخ مەحمودو دۆستێکی نزیکی سمکۆو ئاوارەی دەستی مێجەرسۆن نەبووە ، بەڵکو هەمان کات یەکێك بووە لەوانەی بە نووسینیش خزمەتی گەلیان کردووە . دوای خۆی چەند وتارێك‌و دوو کتێبی گەورەی بەجێ‌هێشتووە ، یەکەمیان بەرهەمی ج . أ . سێلمەنی ڕۆژئاوایی‌یە دەربارەی بابی‌و بەهائی کە ئەو کردوویە بە کوردی‌و بە ناوی «بهاء اللەو دەوری نوێ» وە ساڵی ١٩٣٣ لە بەغدا بڵاوی کردۆتەوە (٣٣٦ لاپەڕەیە) . دووەمیشیان ئەو کتێبەیەتی کە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٦ بە ناوی «پولونیا – پولانداو یا لهستان» ەوە(١١) دایناوەو بە داخەوە بۆ خۆی فریا نەکەوت بڵاوی بکاتەوە . ساڵی ١٩٤٠ ، واتە سێ ساڵ دوای کۆچی دوایی خاوەنی لە چاپخانەی «المعارف»ی بەغدایی لە ٢٣٧ لاپەڕەی قەوارە پچوکدا (١٧ × ١٢ سانتیم) لەگەڵ نەخشەیەکی سیاسیی پۆلۆنیادا چاپ‌کراوە .

---

(١١) دەقی ناوی کتێبەکە بەو جۆرە چاپ کراوە .

لەو کتێبەیدا کە بە پشتیوانی ٣ سەرچاوەی تورکی و سەرەچاوەیەکی فەرەنسی و یەکێکی عەرەبی دایناوە مەحمود جەودەت باسی زۆر لایەنی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی و چارەنووسی مێژوویی پۆلۆنیا دەکات. ئەم باسەی دواییان گەلێك سەرنجی دانەریان راکێشاوە، وا دیارە وەك کوردێك زامی دەرونی کولاندۆتەوە. لە دووتوێی «لەهستان» دا لە هەر شت زیاتر هەست بەخۆگری و «هێزی ژیان» و کۆل نەدانی پۆلۆنیە ئازادیخواکان دەکەیت، ئەوانەی بە درێژایی قۆناغێکی سەدان سالەی مێژوو بە دەست جەوری نەمسەو بە تایبەتی رووسیاو پرووسیاوە گیرۆدە بووبوون.

خوالێخۆشبو باسەکانی لەهستانی بە کوردییەکی رەوان هۆنیونەتەوەو بە شێوەیەکی زانستییانە دایرشتوون و هەولی داوە لە رێگەیانەوە زاراوی نوێ بۆ کوردی دابرێژێ یا وەربگرێ، وەك (ئاوەرێژ) کە لە بریتی «مصب النهر» و (لیمان) کە لە بریتی «المیناء» و (قەرال و قەرالیچە) کە لە بریتی «الملك و الملکة» و (ئان) کە لە بریتی «الثانیة» و (پشتان) کە لە بریتی «الأجیال» بەکاری هێناون.

وا دیارە یەکێك، یا دەستەیەك لە دۆستانی مەحمود جەودەت بەرپابوونی شەری دووەمی جیهان و داگیرکردنی پۆلۆنیایان لە لایەن نازییەکانەوە بە هەل زانیوە بۆ بلاوکردنەوەی لەهستانەکەی کە پێنج بەشی یەکەمی و تا لاپەرە ٢١٠ ی لە نووسینی خۆین. هەرچی بەشی شەشەمی کتێبەکەیە (ل ٢١١ – ٢٣٧) باسی ئەو بەسەرهاتانەی پۆلۆنیا دەکات کە دوای وەفاتی مەحمود جەودەت روویان داوە، بەلام بەداخەوە لە هیچ شوێنێکی کتێبەکەدا باسی دانەری ئەو بەشەی نەکراوە. خۆزگە خەبەرداران ئەو لایەنەی «لەهستان»یان بۆ روون دەکردینەوە.

**پێنجەم – مێژووی کۆیە**

لە سەرەتای بەشی «کورتەی بیبلیۆگرافیای مێژوونووسی کوردی»ی کتێبی «مێژوو»دا گوتومە:

**«ئەم بیبلوگرافیایە تەنها هەنگاوێکی سەرەتایییە، هیچ دوور نییە کەموکورتیی زۆری تێدا بێ و. وتاری بایەخدارم بەسەردا تێپەربێ، یا دەستم پێیادا رانەگەیشتێ». ئەمجا لە زمان «باوکی**

**گەورەی مێژووی‌نووسی کوردی شەرەف خانی بدلیسی»یەوە لە «زانایانی پیاوچاك‌و دڵپاك‌و بەوەج» پاراوەمەتەوە کە «زۆر بە وردی لە نووسینەکەم وردبینەوەو ئەگەر پەشێوی‌یەکیان بەرچاو کەوت بە شێوەیەکی مەردانە بەراوردی بکەن ، خۆ ئەگەر هەڵەو لە بیر چوونێکم لەسەر دەدۆزنەوە هەر بە گاڵتە پێ‌کردن‌و تەشەر لێم نەقۆزنەوە ، پیاوەتیم لەگەڵ بکەن‌و بە پارچەیەکی چاکترو بە بژگورێکی تازەترو پاکتر بۆم پینە بکەن» (١٢)**

مامۆستاو هاورێ‌و برای یەکجار خۆشەویستم مەسعود محەمەد یەکەم کەس بوو بەو هەستەوە سەرنجی ڕاکێشام کە لە بیلیۆگرافیای «مێژوو» دا «مێژووی کۆیە یا کۆیسنجق»ی مامۆستا تایەر ئەحمەد حەوێزیم لەیاد کردووە . هەر ئەو ڕۆژەش لە ناو دیاری‌یە بەنرخەکانی دوکتۆر ئیبراهیم حیلمیدا ئەو کتێبەم بەرچاو کەوت .

«مێژووی کۆیە» ساڵی ١٩٦٢ لە بەغدا چاپ‌کراوە (١٣) ، ئەو ساڵە من لە دەوەرەی وڵات دەمخوێند ، بۆیەکا نە من‌و نە ئەو برایانەی وەك من (١٤) ئەوساکە بە مێژووی کوردەوە خەریك بوون ئەو کتێبەمان دەست نەکەوت کە زۆر لایەنی دەهێنن ببونایە سەرچاوەی ڕوون‌کردنەوەی ئەو باسانەی ئێمە لە نامەکانی خۆماندا شیمان کردوونەوە . زۆر بە داخەوە دوای گەڕانەوەشم لە هیچ شوێنێك «مێژووی کۆیە»م بەرچاو نەکەوت ، وا نەبوایە هەڵبەت ئەو کەلێنە نەدەکەوتە «مێژوو»ەوە .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ دان بەوەدا بنێم کە ئەم قسانەم بۆیان نی‌یە دوا پاکەنەم بۆ بکەن هیچ نەبێ لەبەر ئەوەی مامۆستا نەریمان لە لاپەڕە ١٣٣ی

---

(١٢) بڕوانە ل ٢٥٨-٢٦٠ی «مێژوو» .

(١٣) طاهر احمد حویزی . مێژووی کۆیە یا کۆیسنجق ؛ بەرگی یەکەم . بەغدا . ١٩٦٢ ، ١٥٩ل بە بۆنەی دەرچوونی ئەم وتارەمەوە کاك تایەر نامەیەکی ڕازاوەی بۆ ناردم کە ئێستە وەك خەڵاتێکی نازداری‌تری «مێژوو» هەڵمگرتووە ، نیازمە ، خوا یار بێ ، لەگەڵ چاپی دووەمی «مێژوو»دا بڵاوی بکەمەوە .

(١٤) مەبەستم دوکتۆر کاوس قەفتانو دوکتۆر ئەحمەد عوسمانە .

«بیلۆگرافیای کتێبی کوردی»یەکەیدا دروست باسی «مێژووی کۆیە»ی کردووە.
هەرچۆن بێ دەڵێم بریا گەلێك بەرهەمی تری وەك «مێژووی کۆیە» هەبونایەو جا با من لە یادم بکردنایە!

**شەشەم – دوا وشە**

دیاری‌یە بەنرخەکانی دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی فەتاح بۆ «مێژوو» زۆر لەوە زیاترن کە چەند نمونەیەکیانم لەم وتارە گشتی‌یەدا خستە بەرچاو، هیوادارم بتوانم کەڵکیان لێ‌ببینم‌و بۆ مامە برایمیش ئاواتەخوازی تەندروستی‌و تەمەن درێژم.

لە تەمەنی منداڵی‌یەوە هێند ناوی پەری‌و پەری‌زادەمان بیستووە کە هەر یەکەمان بە خەیاڵ وێنەیەکی دڵگیری لە مێشکیدا بۆ پەری کێشابێت . پەری‌ی ڕەحمەت لای هەموان ئافرەتێکی نەرم‌و نیانی ڕۆح‌سوك‌و سەر کلوی سپی‌یە . ئەوی دەیەوێت لە ژیاندا پەری‌یەکی وا بەچاوی خۆی ببینێت دەتوانێت بچێتە خزمەت فاتمە محی‌الدین کە بە داخەوە نەك سەرباز ، بەڵکو ئەفسەرێکی ونی‌تری کوردە .

تەمەنی لە ٨٠ تێپەڕیوە[*] ، بەڵام سەرو سیماو قسەی زۆر لە ٨٠ کەمترە . قەت لەگەڵی بێ‌تاقەت نابیت ، هەگبەکەی پڕ داستانی مرواری‌و گەوهەری تریفەدارە . گەوهەرو مرواری‌یەکانی دانسقەو کەم‌هاوتان ، بە ئارەقی پیرۆزی ناوچەوان‌و دڵسۆزی‌ی ناو قوڵایی گیان‌و شەونخونی‌و دەربەدەری‌و ژانی ژیانی کورد زاخاو دراون .

دەوروبەری سەدەیەك لەمەوبەر فاتمە لە شارێکی وەك بەغدا چاوی کردەوەو ڕێگەی قوتابخانەی «ئیتیحادو تەرەقی»ی زانی . دوور نی‌یە لەمەدا تاقانەی شاری سلێمانی بوبێت . شەڕ هەڵگیرساو زۆری نەبرد تەختۆ تاراجی دەوڵەتی عوسمانی تێکچوو ، فاتمەی دەستە کچ لەگەڵ باوکی کە تا ئەوسا کاربەدەستی دەزگای ڕیژی[1] (توتن) بو ، گەڕایەوە نیشتمان .

---

(*) ئەم وتارە لە لاپەڕە ١٥–١٨ای «ڕۆشنبیری نوێ» ، ژمارە ٧٣ ، مارتی ١٩٧٣دا بلاوکراوەتەوە .

(١) لە سەدەی نۆزدەوە کۆمپانیای «ڕیژی»ی فەرەنسەیی بەرهەم هێنان‌و فرۆشتنی توتنی گشت ئیمپراتۆری‌ی عوسمانی‌ی گرتە دەست خۆی . «ڕیژی» وەك دەزگا لە سەرتاپای ئەو وڵاتانەی کەوتبونە ناو دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە بووە ناوێکی باو .

**هەر زوو پەرەی دڵی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی شاعیر بەتیری عەشقی فاتمەی شۆخ و شەنگ پێکرا . فاتمە کە خۆشی حەزی بە شیعر دەکرد[۲] کەوتە باخی شاعیران و بووە میوانی دیوەخانی کوردپەروەران .**

زۆری نەبرد شێخ مەحمودی نەمر لاپەڕەیەکی پڕ شانازیی خەباتی گەلی کوردی تۆمارو ناوچەیەکی گرنگی نیشتمانی لە رولْم و زۆری ئینگلیزی داگیرکەر ڕزگارکرد . ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ بووە وەزیری دارایی شێخ . فاتمەی ژنە وەزیر داخی ئەوەی ناچێت نەریتی ئەوسای کۆمەڵ ڕێگەی نەئەدا ئافرەت ئاگاداری هەموو شت بێت . بەلاّم باشی لەبیرە چۆن زۆربەی خەڵك دڵخۆش و شەیدای سەربەخۆیی و نەمانی مۆتەکەی مێجەر سۆن و پیاوەکانی بون . قەت ئەحمەد بەگی وا گورج و گۆڵ نەدیوە ، بۆ مزگەوتیش بوایە وای نەدەکرد . بەر لەوە دڵی لە شێخ مەحمود رەنجابوو ، بەلاّم بۆ کوردو خزمەتی پێشەوای هیچی لەدڵدا نەماو چاکی کاری لێکرد بەلادا . زوو زوو سکالاّی لەدەست ئینگلیزو پیلانی ئینگلیز خواکان دەکرد ، خۆزگەی ئەوە بو ئینگلیز لە کورد بگەن و یاری و پەت پەتێنی پیێ نەکەن . سەرەتا ڕقی لێیان نەبو ، هیوای زۆر بوو یاریدەمان بدەن !

هەموو سەروەت و سامانی دەزگاکەی شێخ لە ناو قاسەی ژنی وەزیری داراییدا بوو . بە باجی توتن و گشت داهاتێکی ترەوە بە زەحمەت دەگەیشتە ٦٠ هەزار ڕوپیە کە دەکاتە پێنج شەش هەزار دیناری ئەمڕۆکە[۳] ! ، کەچی هی واش هەبوو ویژدانی خۆی دەخشتە ژێر پیێ و سەروەتی حەمە قەدۆی بەچەند ڕوپیەیەکی کاربەدەستێکی پچوکی کورد دەپێوا . ئەو سەروەتەش کە بوبووە تەحا تەحای چاو برسێکان بەهۆی دڵپاکی و ساکاری فاتمەوە لەگەڵ هەموو پاشەکەوتی حەلاّڵی ئەحمەد بەگ وەك هێلکەی پاك کراو کەوتە دەست ئینگلیزەکان . کە هێرشی ناکاویان هێنایە سەر شار فریای ئەوە کەوت تەنها ۳ لیرەی خۆیان بەرێت و

---

(۲) لەهەرمەتی لاویدا شیعری بەتورکی وتووە .

(۳) ۱۰۰ هەزار ڕوپیە دەیکردە ۷٤٤۸ پاوەنی لیستەرلینی .

قاسەکەی داخستو وەك خۆی بەجێی هێشت بەو هیوایەی زۆری پێ ناچێت دەگەڕێنەوە . . داخم ناچێت وا نەبو . مانگەهای مانگ ئەم دێو ئەو گوندیان کرد . هەر زوو بیستیانەوە ئەوی هەیەو نی یە گورگەو سیكو چەتەی ناکەس بەچەی خۆمان تالآنیان کردووە . کە گەڕانەوە شار ناچار ماوەیەکی باشیان بە کولەمەرگی بردەسەر . . .

**پەردەیەکی تری ژیانی فاتمە کە تا مردن شانازیی پێوە دەکات ئەوەیە کە یەکەم ئافرەتی کوردی عیراقە بووە مامۆستاو ٣٥ ساڵی رەبەق ژیانی بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە بۆ پەروەردەکردنی صەدان کچ ، وەك کۆرپەی جگەر گۆشەی خۆی ، تەرخانکرد . بەدەست ئەو بوایە هەموو کچە کوردی فێری نووسینو خوێندنەوە دەکرد . ئەو پەردەیەی ژیانی پڕ لە بەسەرهاتو سەرگوزەشتەی سەیرو پڕمانایە . وابزانم لاپەڕەکانی یەکەمی زۆر شایانی تۆمارن[٤] .**

ئیستەش لەو وایە ئەمڕۆیە کە خوالێخۆشبو شێخ نوری شێخ ساڵحی شاعیرو خزمی ، خۆی کرد بە ژوراو لە هەموو جار گەرمتر لەگەڵی کەوتە قسە . قەت وای نەدیبو . لەوەی دەکرد بۆکارێك هاتبێ زۆری مەبەست بێ . کەوتە باسی خوێندنو خوێندەواریی و پیاهەڵدانی فاتمە کە دنیا دیدەیەو دەتوانێت ڕێگە نیشانی کەسانی تر بدات . گەلێکیش مەتحو سەنای ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی کردو وتی زۆر حەز بە

---

**(٤) تۆمارکردنی یادداشتی پێشڕەوەکانی مێژووی کوردو ژیانی ڕوناکبیریمان ئەرکێکی پیرۆزە کەوتۆتە ئەستۆی خاوەن خامەی دڵسۆزی گەلەکەمان . ئەو یادداشتانە سەرچاوەی ڕەسەنی ئیمڕۆو دوا ڕۆژمانن ، زۆریمان لە کیس چووەو کەمیان ماوە . تا ئیستە چەند جارێك باسی ئەمەم کردووە . بەش بە حاڵی خۆم هەر دەرفەتێکم لەم بارەیەوە بۆ هەڵکەوتبێت کەڵکم لێ بینیوە . کاتی خۆی یادداشتەکانی خوالێخۆشبو مامۆستا ئیسماعیل حەقی شاوەیسم تۆمار کرد ، خۆی ڕۆی ، ئەمیان باقی . بەشێك لە یادداشتەکانی مامۆستایان فوئاد مەستیو ئەحمەد خواجاشم نوسیوەتەوە . هیوامە مایەی ڕزامەندی بێتو بیێتە هاندەر تا ئەوەی ماوە لەکیس نەچێت .**

پێشکەوتنی کورد دەکات . . دوای ئەوەی شێخی شاعیر شانامەیەکی دورو درێژ بەقسەو لەبزی شیرینی بۆ فاتمەی ژن خوشکی دەخوێنێتەوە دێتە سەر مەبەست :

**«ئەحمەد بەگ نیازی‌یە قوتابخانەیەکی کچان لە سلێمانی بکاتەوەو لە گوزیدە خانی ژنی عەبدولعەزیز یامولکی‌و تۆ زیاتر کەس شك نابات پەنایان بۆ بەرێت . تەزویەك بە لەشمدا هات‌و کەوتمە دەریای خەیاڵەوە . . . ڕاستە خوێندن شتێکی چاکەو باوکم زوو زوو ئەمەی بە گوێماندا دەخوێندو خۆشم لە خێرو چاکە بەولاوە هیچی‌ترم لە خوێندن دەسگیر نەبووە ، بەڵام ئاخۆ خەڵکی شار چیمان پێ بڵێن ؟ . لەسەر خۆ لەگەڵ شێخ نوری کەوتمە هەڵسەنگاندنی مەسەلەکە . . ڕاستێکەی هەرچەندم دەکۆشا زانم نەدەکرد بەڵێنی ڕازی بونی بدەمێ . بەڵام ئەو کۆڵی نەدا ، کەوتەوە هاندانم ، دەیزانی خوا پەرستم بۆیە زوو زوو ئایەت‌و حەدیسی تێکهەڵکێشی قسەکانی دەکرد . بەهەشتی بە حۆری‌یەوە بۆ مسۆگەر کردم . وردە وردە نەرم بوم‌و گفتم‌دا . بەو جۆرە ، وەك بیرم بێت ، ساڵی ١٩٢٦ دەرگای یەکەم قوتابخانەی کچان لە سلێمانی کرایەوە . ئەحمەد بەگ بەناوی منەوە قوتابخانەکەی ناو نا «الزهراء»[٥] کە لە ناو خەڵکدا (زەهرا)یان پێ دەگوت . شوێنەکەی نزیك مزگەوتی گەورە بو ، ئیستەش قوتابخانەی گوڵاڵەی کچانی تێدایە» .**

گوزیدە یامولکی مودیرەو فاتمەش تاقە مامۆستای «زەهرا» بوو . بە هەردووکیان سەرتاپای ئەو ئەرکەیان گرتە ئەستۆ کە لەگەڵ ئەرکی ئەمڕۆکە زۆر جیاواز بوو . . هەرچەند ناوی گوزیدە یامولکی دەهات چاوەکانی پڕ دەبو لە ئاو :

**«گوزیدە کوردی تورکیاو ئافرەتێکی کامڵ‌و تێگەیشتوو بوو ، ماوەیەکی زۆر لە ئەستەموڵ ژیابوو ، زۆر بەکوڵ خزمەتی دەکرد ،**

---

**(٥) لە (فاطمة الزهراء)ەوە .**

**ئەوەندی‌تر هانی منیشی دەدا . ڕاستیکەی ئەو نەبوایە لەوانە بوو وره بەربدەم ، چونکە هەر زوو دەمی خەڵکی دوا کەوتومان لێ‌کرایەوە ، هەزارو یەك قسەیان پی‌دەگوتین . ئەوەیان لێ کردبوینە عەیبە کە کچەکان دوای هاتنە ژورەوەیان عەباو پەچەیان دادەگرت ! . قسەی لەوەش خراپترمان دەبیستەوە . زۆر دایك بەترس‌و لەرز کچەکانیان دەهێناو هەر ئەوە بوو کراسی قورئانیان بۆ لەبەر نەکەین تا دڵنیابن ئاگامان لە شەرەفیان دەبێت‌و بە خوێندن لەکەدار نابن . دایکی وا هەبوو پرسیاری ئەوتۆی دەکرد کە بۆ گێڕانەوە ناشێت» .**

دایکی دڵسۆزی کورد خۆی دایە دەم شەپۆلی ڕابوردووی سەیر ، بەڵام خۆش :

**«یەکەم پۆلی قوتابخانە ساوا کەمان دەستەیەکی یەکجار سەیر بوو . هی وای تێدا بوو تەمەنی لە ۲۰و بڕوا بکە ۲۵یش تێپەڕ یبو ، بە سەروپێچی لارو لاگیرەو مێخەکبەنگ‌و سورو سپیاوێکی باشەوە دەهات ، لەگەڵ هی وا دادەنیشت بە کچی دەشیا . بەڵام هەمویان بۆ فێربون هاتبون ، بە دڵ خۆیان هیلاك دەکرد . هەژارو دەوڵەمەندیان تێدا بوو . ئێستەش بیرمە جارێکیان پرتەقاڵم بۆ قوتابی‌یەکان برد ، هی وایان هەبو نەیدەزانی پرتەقاڵ چی‌یە ، بۆنیان پێوە دەکردو یاری‌یان پی‌دەکرد تا بە دەستی خۆم بۆم پاك‌و قاش کردن‌و تێم گەیاندن میوەیەو دەخورێت» .**

هەستێکی شارراوە قوتابی‌و زیاتر جوتە مامۆستای زەهرایان دەبزواند . حەزیان دەکردو هەوڵیان دەدا هیچیان لە کوڕان‌و پیاوان کەمتر نەبێت . لێرەدا دایکی کورد گوڕی دایە خۆی‌و گەرمتر بوو ، لەوەی دەکرد بیەوێت من بسەلمێنێت ، جا نازانم هەستی دەکرد کە من بە هەموو هۆشمەوە کەوتومەتە پەرستگای دڵسۆزی‌و

لەخۆبوردنی پەری‌یەکی خاوێنی گەلەکەمان یاوەخود نا ؟ . ئەوەیان گرنگ نی‌یە ، سەیرە وا نەبێت ، بەلاّم با لەبەر دڵە ناسکەکەی ئەو منیش گوڕ بدەمە خۆم‌و خۆم وریاتر نیشان بدەم :

«هەر ئەوەندە بیستمان فوئاد ڕەشیدی مامۆستای کوڕان شانۆگەری‌ی «نیرۆنی زۆردار»ی پێشکەش کردووەو بەو کارەی هەستی زۆر کەسی بزواندووە ئێمەش هاتینە مەیدان‌و ویستمان هەنگاوێکی باشتر بنێین . بیری یەکێکمان بۆ ئەوە چو کێشەیەکی ئەوتۆی ناو کۆمەڵەکەی خۆمان باس بکەین کە زۆر ڕۆژ توشی یەکێك لە قوربانی‌یەکانی دەهاتین . بەلاّم کەسمان دەست‌و زانی نوسینمان نەبوو ، بۆیەکا پەنامان بردە بەر شێخ نوری‌و ئەویش لەسەر پێشنیاری‌ی خۆمان شانۆگەری‌ی «دایك»ی بۆ ئامادەکردین . قوتابخانەمان ڕازاندەوەو پەردەمان هەڵواسی‌و نزیکەی حەفتەیەك ژنانی شار ڕوویان تی‌کردین‌و بە پەرۆشەوە سەیری «دایك»یان دەکرد . بەجەی خوشکم دەوری دایك‌و شەفیقە سەعید[٦] کە قوتابی‌یەکی وریای قوتابخانەکەمان بوو دەوری دوکتۆرەی بینی . دیار بوو لەتەلی دڵی بینەرانیان دەدا» .

تا ئیمڕۆش چ خۆی ، چ خوشکی ، ناوەرۆکی «دایك»یان لەبیرە کە بەشێکی بە شیعر هۆنرابۆوە :

«دایکەی نەخوێندەوار بە هەڵە دەرمانێکی عەتارەکان دەرخواردی کۆرپەکەی دەدات ، دەرمانە دەبخاتە گیانەلاّ . هاوارو قیژەو گریەی دایکی کڵۆڵ گەرەکی دێنێنە سەیر . یەکێك لە سەرسپی‌یە ژیرەکانی دراوسێ بەهەڵەداوان خۆی دەکات بە ژووردا و دەپرسێت :

**چی‌یە ئەم گری‌یەو زاری‌یە**
**بۆچیتە هاوارو تەلاش ؟**

دایکە بە شپرزەیی .

---

(٦) بیجە محی‌الدین‌و شەفیقە سەعیدیش دوو پێشڕەوی‌تری مەیدانی خوێندەواری‌ی ئافرەتی کوردن . سەدان کچە کورد لەسەر دەستی ئەوانو دەستە خوشکی ئەواندا فێری خوێندنەوەو نوسین بون ، کە زۆریان پلەی بەرزی خوێندنیان تەواوکردووە .

**هەرگیز خەوی نەبوو منیش**
**چوم دامیّ تۆزێك شیلەی خاش خاش**

دراوسێکەیان کە ئەمە دەبیسێت دەستوبرد دەچێت بە دوای دوکتۆرەی شاردا .
دوکتۆرە بەهەمان دەستور دەپرسێت :

**چی‌یە ئەم گری‌یەو زاری‌یە**
**بۆچیتە هاوراو تەلاش ؟**

دایك :
**هەرگیز خەوی نەبوو منیش**
**چوم دامیّ تۆزێك شیلەی خاش خاش**

دوکتۆرە :

**جا**
**کیّ بەتۆی وت دەوایەکی زەریفەو باشە**
**تولۆی وا قابیل دەرمانی وەك خاش خاشە ؟**
**خێراکە ئەم دەرمانەی بدەریّ**
**بەڵکو بەجارێك چارەی بکریّ**
**ئیتر هەرگیز لەو دەوایانەی نەدەبتیّ**

دایك :

**تۆبە بیّ ، تۆبە بیّ یارەبی**
**هەتا ماوم دەرمانی وای نەدەمیّ»**

گەر ویژدانمان بێت‌و هەموو لایەنی‌ی سەیری باسەکە بکەین ئەوا دان بەوەدا دەنێین لە یەکەم شانۆگەریدا ئافرەتمان بۆری پیاومانی داوە[7] . . مامۆستای یەکەم ئەم قسانەمی بەدڵ‌بو . نەمویست لەوە زیاتر هیلاکی بکەم ، هاتە سەر وەلآمی دووەم پرسیارم :

«گوزەیدە یامولکی سێ ساڵ مودیرە بوو . کە ئەو چووە بەغدا زەهرە خانی کچی مستەفا یامولکی بۆ دەوروبەری سێ ساڵێك چووە جێگەی‌و دوا بە دوای ئەو من بومە مودیرەو نزیکەی ٣٠ ساڵ کاری ئەو قوتابخانەیەم گرتە ئەستۆ . روناکبیری ئەو سەردەمەی شار پشتیان دەگرتم ، بە قسەی پڕ هەستیان دڵیان خۆش دەکردم . جارێکیان نزیك بەردەرکی سەرا یەکێك بە هیواشی دەستێکی دا بە پشتمداو پێی وتم : ئافەرین ، هەزار جار ئافەرین ، سەرت بەرزکردینەوە . . کە ئاوڕم دایەوە پیرەمێردی شاعیرم دی . پیرەمێرد گەلێك قسەی‌تری کرد ، لەوە دەچو بیەوێت هەموو ماڵێك بکاتە قوتابخانەو بە دارعەساکەی بکەوێتە گیانی ئەو دایك‌و باوکانەی منداڵیان ناخەنە بەر خوێندن . . .» .

دوا قسەی یەکەم مامۆستامان :

«ئیستەش هەرچەند چاوم کزو گوێم قورس‌و یادم کەم بووە ، بەلآم گەز گەز بالآ دەکەم کە دەبینم رەنجم بە فیڕۆ نەچووەو کچە کورد چۆتە ریزی برای‌و شان بەشانی ژیانی نوێ بۆ نەوەی داهاتو دروست دەکات» .

سەربازو ئەفسەری ونی وەك فاتمەمان زۆرە ، با جاروبار یادیان بکەینەوە هیچ نەبێت ، تاکاتی خۆی ، پەیکەری پڕ شانازی‌یان لەقولآیی دڵ‌و دەروندا بۆ داتاشین‌و شتی نەزانراوو نوێ‌یان لێوە فێربین تا لە کیسمان نەچون .

---

(٧) روناکبیرانی کوردی تورکیا بەهۆی چەند هۆیەکی تایبەتی‌و گشتی‌یەوە بەر لە ئێمە لە دەرگای زۆر هونەریان داوە . پێش شەڕی یەکەمی جیهان ئەوان شانۆگەری‌یان بە کوردی داناوە . لەگەڵ ئەوەش ئافرەتی کوردی عیراق لەم مەیدانەدا هەر یەکەمە .

ئەرمەن(٠) یەکێك لە گەلە هەرە دێرینەکانی سەرزەمین پێك دەهێنن(١) . بەر لەمەسیح ئەرمەن خاوەنی ژیاری ی پێشکەوتووی خۆیان بوون . ئەرمەنستان یەکێکە لەو وڵاتانەی بە شوێنەواری مێژوویی کۆن دەوڵەمەندن ، تا ئێستە گەلێك پاشماوەی دێرینی تیا دۆزراوەتەوە .

ئەرمەنەکان وەك گەلانی تری ڕۆژهەڵات لە سەرەتادا لەسەر بەردی جیاو تاشەبەردی قەراغ شاخەکان ئەوی دەیانویست بە هەڵکۆڵین دەیاننووسی . بەشێك لەو جۆرە نووسینە دێرینانە دۆزراونەتەوەو ناوەرۆکیان زانراوە . بەڵام دوو هۆی نوێ هەر لە دێرزەمانەوە کاریان کردە سەر پەرەسەندنی نووسین بە زمانی ئەرمەنی – یەکەمیان بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی بوو کە لە سەرەتای سەدەی چوارەمەوەبووە ئایینی ڕەسمی ی ئەرمەن ، دووەمیان وگرنگتریان دانانی ئەلفبای تایبەتی ی ئەرمەنی بوو لە کۆتایی سەدەی چوارەمدا(٢) .

---

(٠) ئەم وتارە لە لاپەرە ٧–١٠ی «بەیان» ، ژمارە ٣٠ ، تەشرینی یەکەمی ١٩٧٥دا بڵاوکراوەتەوە .

(١) بەشی زۆری زانیارییەکانی ناو ئەم وتارە لەلایەن نووسەر خۆیەوە لە ماتێنەدەران کۆکراونەتەوە . ئەو بەشەکەی تری لە هەندێك سەرچاوە وەرگیراون ، بەتایبەتی لە کتێبی :

G. W. Abgar, The Matenadaran, Ereven, 1962.

(٢) میسرۆپ ماشتۆتس ئەلفوبێی ی ئەرمەنی ی دانا . ئەم ئەلفبایە تا ئێستەش لە ناو ئەرمەندا زۆر باوەو هەموو ساڵێك ، بە تایبەتی لە ئەرمینیای سۆڤیەت ، بە سەدان کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەی پێ چاپ دەکرێ . میسرۆپ ماشتۆتس یەکێکە لەو گەورە پیاوانەی ئەرمەن بە حەق شانازی‌یان پێوە دەکەن .

لە دێرزەمانەوە ڕۆڵە هوشیارەکانی ئەرمەنی خاوەن مێژووی پڕ لە ڕوداوو کارەساتی کۆن ، ئەرمەنی خاوەن ئەدەبی ڕەسەن ، ئەرمەنی خاوەن فێرگەی ئایینی هەمەجۆرو کڵێسەی گەورەو پچوك ، کەوتوونەتە تۆمار کردنی هەموو ڕوویەکی ژیانی ڕووناکبیریی باووباپیران‌و سەردەمی خـۆیان سەرەڕای ئەوە زانایانی ئەرمەنستان لە سەرەتای سەدەکانی ناوەندەوە کەوتنە وەرگێڕانی بەرهەمی فەلسەفی‌و زانستیی گەلانی‌تر بۆ سەر زمانی زگماکیان . بەم جۆرە لە زۆر دەمێکەوە نووسین‌و بڵاوبوونەوەو هەڵگرتن‌و پاراستنی دەسنووس لەناو ئەرمەندا بووە کارێکی زانستیی – ئەدەبیی باوو شیاو . بەشی هەرە زۆری ئەو دەسنووسانە لە کتێبخانەی فێرگەو کڵێسەکاندا دەپارێزران . گەورەترین جێگەی پاراستنی ئەو دەسنووسانە بە ناوی ماتێنەدەرانەوە سەدەی پێنجەم لە ئێچمادزینی نزیك یەریڤان دامەزرێنرا . بەم جۆرە گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری دەوڵەمەند لە ئەرمەنستاندا درووست بوو کە ئێستە بە یەکێك لە سەرچاوە ڕەسەنە هەرە گرنگەکانی مێژووی کۆن‌و ناوەڕاستی گەلان دادەنرێ‌و هەر لەبەر ئەوەش بۆتە سامانێکی بایەخداری مرۆڤی ئیمڕۆ . بۆ نموونە زۆر دەسنووسی کۆنی ئەوتۆ هەن کە کاتی خۆی بە زمانی‌تر دانراون ، بەڵام ئێستە تەنها وەرگێڕراوە ئەرمەنی‌یەکانیان ماون‌و ئەسڵ‌و وەرگێڕراوی سەر زمانانی‌تریان لەبەر هۆی ئاشکرا فەوتاون .

لەم ڕووەوە زیانی ئەرمەنەکان خۆیشیان کەم نەبوو . تەنها داگیر کەرە سەلجوقی‌یەکان ساڵی ١١٧٠ پتر لە دە هەزار دەسنووسی بەنرخی ئەرمەنی‌یان لەناوبرد . لە کاتی کوشتارەکانی ئەرمەنی سەردەمی عوسمانی‌یەکاندا (ساڵانی ١٨٩٤ – ١٨٩٦ ، ١٩٠٩ ، ١٩١٥)[٣] ژمارەیەکی زۆر لە دەسنووسە هەرە نایابەکانی ئەرمەن بوونە قوربانیی هەستی کوێرانەی دەستەیەك فەرمانڕەوای کورتبین کە بەو جۆرە زیانێکی گەورەیان بە گەنجینەی ڕووناکبیریی مرۆڤ گەیاند . بەڵام ئەرمەنەکان کە نرخی فیکرو ژیانیان لا وەك یەك بوو توانی‌یان بەهۆی بیری وردو

(٣) نووسەری ئەم وتارە یەکێك لە فەسڵەکانی کتێبی «کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا»ی بۆ باسی ئەو کوشتارانە تەرخان کردووە . هەروەها بڕوانە : «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ژمارە ٣ ، بەرگی ٢ ، لاپەڕە ٧٥ – ١٥٧

زیرەکی ی کەم وێنەو دڵسۆزیی بێسنوورو بە نرخی زێڕ بەشێکی زۆر لە گەوهەری ئەو گەنجینەیە ڕزگار بکەن . لێرەدا تەنها نموونەیەکی پڕ مانا دەهێنمەوە :

ئەرمەنەکان لە ساڵی ١١٧٠وە دڵسۆزانە کەوتنە پەیجۆری ئەو دەسنووسانەی سەلجوقی یەکان لەناویان بردن ، یا زەوتیان کردن . ساڵی ١٢٠٥ توانی یان بە چوار هەزار درهەم ، کە پارەیەکی یەکجار زۆر بوو بۆ ئەو سەردەمە ، یەکێك لە دەسنووسە بەنرخەکانیان هەر لە سەلجوقی یەکان بکڕنەوە کە تا ئیستەش هەر ماوەو بە بارستو قورسایی بە گەورەترین دەسنووسی ئەرمەنی دادەنرێ . لە کاتی کوشتارەکانی ساڵی ١٩١٥شدا دوو پیرێژنی ئەرمەنی توانی یان هەر ئەو دەسنووسە ڕزگار بکەن . هەر یەکەیان بەشێکیان هەڵگرتووەو بەرەو ئەرمینیای ڕۆژهەڵاتی سەر بە ڕووسیا بە جیا کەوتوونەتە ڕێ . یەکێکیان گەیشتووەو ئەوی تریان لەتاو نەخۆشیو برسی یەتی لە ڕێگە گیانی سپاردووە ، بەڵام بەر لە مردن ئەو بەشەکەی تری لە چاڵێکدا شاردۆتەوە . پاش ماوەیەك گەڕیدەیەکی ئەوروپایی لەو ناوانەدا بە ڕێکەوت چەند لاپەڕەیەکی ئەو دەسنووسە بە دەست منداڵانی ناوچەکەوە دەبینێ ، بە چەند نوقڵێك دەمیان شیرین دەکاتو دەیبەنە سەر چاڵەکە . کاتێك کابرای گەڕیدە دەگاتە ئەرمینیای ڕۆژهەڵاتو خەڵکەکە پیّی دەزانن هەوڵ دەدەن نیوە دەسنووسەکەی لێ بکڕنەوەو ناچار دەبن لەناو خۆیاندا ٤٠٠ هەزار پاوەنی بۆ کۆبکەنەوە .

بەم جۆرەو بە هەزار دەردی سەری ئەرمەنەکان توانیویانە ئەو سامانە گەورەیەی خۆیانو جیهان بپارێزن . دوای ئەوەی ئەرمینیای ڕۆژهەڵات لە ساڵی ١٨٢٨وە بووە بەشێك لە ڕووسیای ئەوروپایی گاور ئایین مەودای پاراستنی دەسنووسە ئەرمەنی یەکان لە جاران زۆر زیاتر بوو ، هەرچەندە لێرەش بەشێکی کەم لەو دەسنووسانە نەگوێزرانەوە دەزگا زانیاری یەکانی مۆسکۆو پیترۆگراد .

لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەتدا قۆناغێکی نوێ لە کۆکردنەوەو پاراستنو لێکۆڵینەوەی دەسنووسە دێرینەکانی ئەرمەندا دەستی پێ کرد . لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠وە ماتێنەدەران کرایە دەزگایەکی دەوڵەتی . دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم ئەو ٤٦٦٠ دەسنووسەی لە ساڵی ١٩١٥وە برابوونە مۆسکۆ گێڕڕانەوە

ماتێنەدەران کە بۆ خۆشی لە ساڵی ١٩٣٩وە گوێزرایەوە شاری یەرێڤانی پایتەخت . لە ساڵی ١٩٥٩وە ماتێنەدەران کرایە ئینستیتوتێکی سەربەخۆ بۆ پاراستن‌و لێکۆڵینەوەی دەستنووسی کۆن . کۆشکی ڕازاوەی ماتێنەدەران[4] ئیمڕۆ لە شوێنێکی بەرزەوە بەسەر شاری یەرێڤاندا دەڕوانێ‌و گەوهەرە بەنرخەکانی هەر یەکە بە جۆرێك داستانی پڕ شانازی‌و زانستی بۆ نەوەی ئیمڕۆو دواڕۆژ دەگێڕنەوە .

ژمارەی دەستنووس‌و پارچە دەستنووسەکانی ماتێنەدەران پتر لە ١٥ هەزارە (بەر لە شەڕی یەکەم لە ٥ هەزار کەمتر بوو) ، لەمانە دەوروبەری ١٣ هەزاریان بە زمان‌و ئەلفو بێ‌ی ئەرمەنین‌و ئەوانی تریان بە یۆنانی‌و عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی‌و هیندی‌و رووسی‌و حەبەشەیی‌و زمانی‌ترن . کۆنترین پارچە دەستنووسی ماتێنەدەران هی سەدەکانی پێنج‌و شەش‌و حەوتن . یەکێك لە دەستنووسەکانی بریتی‌یە لە ئینجیلێك ساڵی ٨٨٧ نووسراوەتەوە . گەورەترین دەستنووسی ماتێنەدەران ٣٢-٣٤ کیلۆو ٦٠٩ لاپەڕەیە ، ساڵی ١٢٠١ نووسراوەتەوەو بریتی‌یە لە زنجیرەیەك گوتاری کڵێسەو نووسینی مێژوویی‌و فەلسەفی . نووسینەوەی ئەم دەستنووسە پێستی نزیکەی ٧٠٠ گوێرەکەی پێویست بووە . پچووکترین دەستنووسی تەنها ١٤ گرام‌و ١٠٤ لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە ڕۆژژمێرێکی کڵێسە . ئەم دەستنووسە نایابە ساڵی ١٤٣٦ لەسەر پێستی بزنی ناو سك (هێشتا لە دایك نەبوو) نووسراوەتەوە .

دەستنووسەکانی ماتێنەدەران لە نرخاندن نایەن . بەر لە هەموو شتێك بەهۆی ئەو دەستنووسانەوە بەشی زۆری لاپەڕە گرنگەکانی مێژوو و ئەدەب‌و ژیانی کۆمەڵایەتی گەلی ئەرمەن لە قۆناغی جیاواز جیاوازدا پارێزراون‌و لە ڕێگەیانەوە زانراون . جگە لەوە ئەو دەستنووسانە پڕن لە زانیاری‌ی بەنرخ لە بارەی ژیان‌و مێژووی گەلانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە لەگەڵ ئەرمەندا دراوسێن ، لە بارەی ناوچەکانی قەفقاس‌و ئێرانی سەفەوی‌و ئیمپراتۆری‌ی بیزەنتی‌و دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی‌و شەڕو هێرشی سەلیبی‌و مەغۆل‌و تەتەرو سەلجوق‌و تورك‌و گەلێکی ترەوە . بەشی هەرە گرنگی دەستنووسەکانی ماتێنەدەران بۆ باسی مێژوو تەرجان کراون .

---

(٤) ئەم کۆشکە لەسەر شێوازی خانووبەرە دروست کردنی کۆنی ئەرمەن بنیات نراوەو هەموو کەرەستەیەکی پێویستی بۆ پاراستنی دەستنووس تێدایە .

مێژوونووسە ناودارەکانی ئەرمەن گەلێك نووسراوی بەنرخیان بەجێ هێشتووە کە شان لە شانی دەسنووسە هەرە بایەخدارە ناسراوەکانی جیهان دەدەن . هەر بۆ نموونە : دەسنووسی یەکێك لە مێژوونووسەکانی سەدەی پێنجەم بۆ باسی بلاْوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ئەرمەنستاندا تەرخان کراوە . دەسنووسی «مێژووی خەلیفەکان» باسی ئەو بەسەرهاتانە دەکات کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عەرەبدا لە نێوان سالاْنی ٦٣٢و ١٧٨٨دا ڕوویان داوە . هەر لە ماتێنەدەرانیشدا دەورووبەری ٦٠٠ دەسنووس هەیە کە بە ئەلف و بێی عەرەبی و زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و هی تر نووسراونەتەوە . ناوی ئیبن سیناو شەهابەدینی شیرازی و فیردەوسی و حافزو سەعدی و نیزامی و گەلێك ناوداری تری ڕۆژهەلاْت لە زۆر دەسنووسی ئەم دەزگایەدا دەکەونە بەرچاو .

ژمارەیەکی زور وێنەو نیگاری ڕنگاوڕەنگی کۆن لە ماتێنەدەراندا پارێزراون ، هێندێکیان لە سەدەی پێنجەمدا دروست کراون و هەموویان بەلْگەو نیشانەی هەستی هونەری ی بەرزی ئەرمەنن . ئەو ڕەنگانەی بۆ دروست کردنی ئەو نیگارانە بەکار هێنراون سەدان سالْە هەر وەك خۆیان ماونەتەوە ، دیارە ئەوەیش بۆ خۆی نیشانەی پێشکەوتنە لە کیمیاگەریدا .

لە ڕاستیدا باسی ماتێنەدەران و گەوهەرەکانی ماتێنەدەران و کتێبخانەی ماتێنەدەران و ئەو صەد هەزار دەکومێنت و بەلْگەیەی لە ماتێنەدەران هەلْگیراون لە ویژەی وتارێکی پچووکدا نی یە[٥] .

**گەلی کوردیش وەك یەکێك لە دراوسێ هەرە نزیك و تێکەلْەکانی ئەرمەن بەشی خۆی لە ماتێنەدەراندا هەیە . لە گەلێك دەسنووسی کۆندا ناوی گەلاْنی زاگرۆس و میدێکان و کورد خۆی هاتووەو باسی ناوچە کوردەواری یەکان کراوە . هیچ دوور**

---

(٥) زۆر شتی ماتێنەدەران شایانی باسە . بەجۆرێکی بەرز دەسنووسەکانی لە گەرمایەکی تایبەتیدا دەپارێزرێن ، پتر لە ١٢٠ کەس لە ماتێنەدەران کار دەکەن ، لەمانە ٢٠یان دوکتۆراو ٧یان دوکتۆرای زانست (ناوك)یان هەیە . هەموو سالْێك ژمارەیەکی زۆر کتێب و وتاری زانستی ی بەنرخ لە لایەن ماتێنەدەرانەوە بلاْودەکرێتەوە .

ئەرۆین مینۆرسکی ی بەناوبانگ لە نووسین و لێکۆڵینەوەکانیدا دەربارەی میدێکان و کورد کەڵکی لە کتێبەکانی مێژوونووسی گەورەی ئەرمەن مۆفسیس خۆریناتسی (مایسای خۆرێنسکی) وەرگرتووە[٦] کە لە سەدەی پێنجەمدا نووسیونی و دەسنووسەکانیان لە ماتێنەدەران پارێزراون .

سەرەرای ئەو لایەنە گرنگە ژمارەیەك دەسنووس و پارچە دەسنووسی تایبەتی لەسەر کورد ، یا بە کوردی لە ماتێنەدەران هەیە . ئەوەی بۆ ئێمە شتێکی نوێ و سەرنج راکێشە ئەوەتە کە لە ژمارەیەك دەسنووسی ئەرمەنیدا چەند دێرێکی کوردی بە ئەلف و بێ ی ئەرمەنی نووسراوەتەوە . یەکێك لەو دەسنووسانە دەربارەی رێزمانی ئەرمەنی یەو لە سەدەی پازدەدا دانراوە ، بەلاّم چەند دووعایەکی بە عەرەبی و فارسی و کوردی تێدایە . هەروەها ئینجیلێکی دەسنووس بە زمانی کوردی و پیتی ئەرمەنی هەیە کە دوور نی یە لە سەدەی هەژدەدا نووسرابێتەوە .

جگە لەمانە دوو دەسنووسی زۆر گرنگ لە بارەی کوردەوە لە ماتێنەدەران پارێزراون . یەکەمیان دەسنووسی ژمارە ١٧٩٩ی بەشی عەرەبی یە کە بریتی یە لە دەسنووسێکی رێکوپێکی «شەرفنامە»ی شەرەفخانی بدلیسی . ئەم دەسنووسە سەدەی هەژدە لە ٤١٢ لاپەرەی گەورەی بیستویەك دێریدا نووسراوەتەوە . وابزانم ئەوانەی لەسەر «شەرفنامە»یان نووسیوە کەسیان تاوەکو ئێستە باسی ئەم دەسنووسەی ماتێنەدەرانیان نەکردووە .

دووەمیان دەسنووسی ژمارە ٦٢٢ی هەر بەشی عەرەبی یە کە بریتی یە لە دەسنووسێکی گرنگی دەگمەنی کەم زانراو لەبارەی هۆزی دونبولی یەوە[٧] .

---

(٦) لەم بارەیەوە بروانە :

ف . مینورسکی . الاکراد أحفاد المیدیین . «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» . ژمارە ١ ، بەرگی ١ ، لاپەرە ٥٥٢ - ٥٦٦ .

(٧) بۆ یەکەم جار أ . د . پاپەزیان بە زمانی ئەرمەنی و لەژێر ناوی «سەرچاوەیەکی نوێ دەربارەی مێژووی گەلی کورد» دا وتارێکی لە بارەی ئەم دەسنووسەوە لە ژمارە ٨ی ساڵی ١٩٦٧ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری ئەرمەنستاندا بلاّو کردەوە .

ئەم دەسنووسە پەنابەرە ئەرمەنەکان ساڵی ١٩١٦ لەگەڵ خۆیاندا هێناویانەو کەوتۆتە دەست پرۆفیسۆر ئاشۆت ئەفانیسیان کە ئەویش بە دیاری ناردوویە بۆ ماتێنەدەران .

ئەم دەسنووسە ٢٥٣ لاپەڕەیەو بارستی لاپەڕەکانی (١٥×٢٥سم)ەو سالّی ١٨٥٠ (١٢٦٦ی کۆچی) لە تاران لە «مدرسەی میرزا صالح» لە لایەن عەلی ئەکبەری حوسەینی تەفرەشی‌ی کوڕی حاجی سەید ئیسماعیلەوە نووسراوەتەوەو لە سێ بەش پێکهاتووە : یەکەمیان ناوی «اشارة المذاهب» و دووەمیان ناوی «اشارة الأدیان»ەو هەردووکیان لە دانانی ڕۆستەم خانی کوڕی ئەحمەد خانی دونبولی‌نو بە خەتی نەستەعلیق نووسراونەتەوە . بەشی سێیەم لە دوا لاپەڕەکانی دەسنووسەکەدایەو ناوی «تاریخی دەنابیلە»یەو لە دانانی عەبدولڕەزاق کوڕی نەجەف قولی خانی دونبولی‌یە ، ئەم بەشەیان تەواو نی‌یەو بە خەتی «نەسخ» نووسراوەتەوە .

لە بەشی یەکەم‌و دووەمدا ڕۆستەم خان باسی ئایین‌و مێژووی هۆزی دونبولی دەکات ، هەروەها باسی شا کانی ئێرانی بەر لە ئیسلام‌و بەرمەکی‌یەکانیشی کردووەو دونبولی‌یەکانی بە ڕەسەن گێڕاوەتەوە سەر ئەوان . ئەو باسانەش کە بۆ ڕووداوەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە تەرخان کراون بایەخێکی زۆریان هەیە ، بە تایبەتی چونکە نووسەر ئەوەی باسی دەکات ، یا بە چاو دیویێتی یا تیا بەشدار بووە . لە قەراغ‌و پەراوێزەکانی ئەم دەسنووسەی ماتێنەدەراندا ڕۆستەم خان بە خەتی خۆی تێبینی‌ی نووسیوەو هەندێ شوێنی ڕاست کردۆتەوەو ئەمەش بێ‌گومان لە نرخی دەسنووسەکەی زیاتر کردووە . دەمێکیشە بەڕێوەبەرانی ماتێنەدەران بڕیاری بلاّوکردنەوەی ئەم دەسنووسەیان داوە .

شەڕلە ناوەڕۆكدا دوو جۆرە : شەڕی زۆردارو شەڕی زۆرلێكراو(٭) . یەكەمیان بۆ زوڵمو زۆرو داگیركردنە ، دووەمیشیان بۆ سەرفرازیو ئازادی‌یە . بەڵام چ ئەمیانو چ ئەویان لە زەرەرو زیاندا ، لە فرمێسكو خوێندا چون‌یەكن .

شەڕی دووەمی جیهان كە نزیكەی شەش ساڵی ڕەبەق خایاند (ئەیلوولی ١٩٣٩ – مایسی ١٩٤٥) گەورەترین كارەساتە كە تا ئێستە تووشی مرۆڤو هەموو جیهان هاتبێت . ئەگەر ئەم قسەیە بخەینە چوارچێوەی ژمارەوە بەم جۆرە دەردەچێ :

٧٢ دەوڵەت تێكەڵی ئەم شەڕەبوون (لە شەڕی یەكەمدا ٣٣) ، ١١٠ ملیۆن كەس بە چەكەوە تیا بەشداربوون (لە شەڕی یەكەمدا ٧٤) ، ١٣٨٤ ملیار دۆلاری تێ‌چوو (لە شەڕی یەكەمدا ٢٠٨) ، دەوروبەری ٥٠ ملیۆنی تیا كوژرا (لە شەڕی یەكەمدا ١٠) ، نزیكەی ٢٨ ملیۆنی تیا سەقەتو كەفتەكار بوو (لە شەڕی یەكەمدا ٢٠) .

یەكیەتی‌ی سۆڤیەتو ئەڵەمانیا لەو شەڕەدا لە هەموو لایەك زیاتر تووشی زەرەرو زیانو وێرانی‌هاتن ، ئەڵەمانیا بەهۆی ژێركەوتنەوەو یەكیەتی‌ی سۆڤیەتیش لە ئەنجامی ئەوەدا كە هیتلەری‌یەكان تا دوا ساڵی شەڕ نزیكەی لە ٧٥٪ی هێزە شەڕكەرەكانی خۆیان ئاراستەی ئەو كردبوو . لە دوا ساڵی شەڕیشدا ، واتە دوای كردنەوەی بەرەی دووەم لە لایەن وڵاتە سوێندخۆرەكانی ڕۆژاواوە ، هێشتا هەر دەوروبەری لە ٦٧٪ی هێزی چەكداری ئەڵەمانیا لە بەرەی سۆڤیەتدا دەجەنگین . ئەو زیانانەی لە

(٭) ئەم وتارە لە لاپەڕە یەكی حەفتەی «بەیان» . ژمارە ٢٩ . ئەیلولی ١٩٧٥دا بڵاوكراوەتەوە .

یەکیەتی ی سۆڤیەت کەوتن نیشانەرێکی بێوێنەو هاوتای فرمێسكو خوێنی شەڕن :
بەهۆی شەڕی دووەمەوە ١٧١٠ شاری گەورەو بچووکی سۆڤیەت کاول کرانو ٧٠ هەزار گوندیش لەگەڵ زەویدا تەخت کرانو بەو جۆرە ٢٥ ملیۆن کەس بێ جێوڕێ مانەوە . هەر لەماوەی شەڕدا ٣٢ هەزار دەزگای پیشەسازیی ئەو وڵاتەو ٦٥ ملێون کیلۆمەتر ڕێگەی ئاسن لە بنەڕەتەوە هەڵتەکێنران . بە پارە یەکیەتی ی سۆڤیەت ٥٠٠ ملیار دۆلار زیانی لێکەوت ، واتە لە سێیەکی زیانی هەموو شەڕ زیاتر . نزیکەی نیوەی کوژراوو سەقەتو کەفتەکارەکانی شەڕ سۆڤیەتی بوون .
دەردو بەلای شەڕی دووەم هەموو قوژبنێکی جیهانی گرتەوە . ئەوی نەکوژرا[٦] یا لەشەڕدا بەشدار نەبوو برسێتیو نەبوونیو نەخۆشیی چێشت .
میللەتی کوردی هەژاریش بەشی خۆی لەو مەینەتی یە بینیو هێندەیتر هەژاربوو . ڕاستە کوردستان وەك لە شەڕی یەکەمی جیهاندا نەبووە یەکێك لە مەڵبەندەکانی شەڕ ، نەبووە شەڕگەو لەویان کەمتر تووشی زەرەرو زیانو مردنهات ، بەلام ، لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەویش وەك هەموو گەلانی تری ڕۆژهەلاتی نزیكو ناوەڕاست بەهۆی ڕوداوو کارەساتەکانی شەڕەوە تووشی گەلێك دەردی سەری بوو . پریشکی شەڕی دووەم لە زوڕ لاوەو ، بە زۆر شێوە گەلی کوردیشی گرتەوە . با لێرەدا باسێکی پچووك بگێڕینەو ، باسی پریشکێکی نەزانراوی ئەو شەڕە کە لە دووری ی هەزاران کیلۆمەترەوە ژیانی ڕووناکبیری ی ئێمەشی گرتەوە .
(**ئیڤان یووگەڤ**) لاوێکی خوێن گەرمو ڕەوشتبەرزی سۆڤیەتی بوو . لە خوێندندا دەسەلاتدارو لە ناو هاوڕێکانیو لە کۆمەڵدا خۆشەویست بوو . هەر زوو دەردو ئازارو چارەنوسی گەلی کورد لە دوورەوە سەرنجی ئەم لاوەی ڕاکێشاو دوای تەواو کردنی زانکۆ دەستی کرد بە فێربوونی زمانی کوردیو بووە قوتابی ی دوکتۆرای بەشی مێژوو و چالاکانە دەستی کرد بە ئامادەکردنی نامەی دوکتۆرێکەی لەسەر کورد . بەلام بەداخەوە زۆری نەخایاند ئاگری شەڕی دووەم هەڵگیرساو پاش ماوەیەکی کەم وڵاتەکەی ئەویشی گرتەوە . . .
**ئیڤان یووگەڤ** وەك زۆربەی هەرە زۆری لاوانی سۆڤیەت چەکی کردە شانو

بەرەو شەرگە لەگەڵ هاوەڵەکانی بۆ پارێزگاری لە خاکی نیشتمانو شەرەفی گەل کەوتە رێ . . . بەرەو مردن رۆیشتو **نەگەڕایەوە** . . . بە کەمێك زمانی کوردیو گەلێك خۆشەویستیی کوردەوە سەری نایەوە ! !

بێگومان **ئیڤان یووگەف** بمایە ئیمڕۆ یەکێك دەبوو وەك کوردناسانی سۆڤیەت **خاڵفین و لازەریێف** کە چالاکانە خزمەتی لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد دەکەن . . . ئەگەر شەڕ بمرێو ئاشتی بژی هەزارەها هەزار گوڵی وەك **ئیڤان یووگەف** جوانتر باخی ژیان دەڕازێننەوەو هەڵبەتە ئەوسا کوردیش ، ئەگەرچی لە دووریشەوە بێ ، لە بونو بەرامەیان بێبەری نابێ ! ! .

# پێڕستی ناوو شوێن

## ناو (*)



(*)

– ئەو ناوانەی ، وەك کوردو کوردستان ، زۆر دووبارە دەبنەوە تۆمار نەکراون .

– مەبەست لە (پ) پەراوێزە ، ئەو کەس‌و شوێنەی تەنها لە پەراوێزدا ناوی هاتووە پیتی (پ)ی لاوە دانراوە .

– (هـ)کورتکراوەی هێزو (ر) کورتکراوەی ڕووبارو .

## شوێن

# پێرست

## سوپاسی زۆرم بۆ :

﴿ • مامۆستایان بەڕێوەبەری گشتی‌ی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی مصلح جەلالی‌و محەمەد کەریم فەتحوڵلاو محەمەدی مەلا کەریم‌و صەلاح شوان کە هەر یەکەیان بە جۆرێك دەستی لە دەرچوونی ئەم کتێبەدا هەیە .

• تیپکارانی چاپخانەی «الادیب» ، بە تایبەتی خوشکان سەرپۆهی‌و ئاراکسی‌و شیلان ڕەواندزی .

• هونەرمەندی لێهاتووی کورد کاك عەلی مەندەلاوی کە وێنەی بەرگی ئەم کتێبەی کێشاوە ، هیوادارم کورد لە وێنەی ئەوی زۆر بیت !﴾

رقم الأيداع في المكتبة الوطنية ببغداد
١٩٨٥/٩٠٧
١٩٨٥/٧/١ – ١٠٠٠٠/١٩

شركة مطبعة الاديب البغدادية المحدودة